دوکتۆر مارف خەزنەدار

# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردی‌یە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

بەرگی شەشەم

١٩٤٥ - ١٩٧٥

A



# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

**بەرگی شەشەم**

**١٩٤٥ – ١٩٧٥**

**A**

## دوکتۆر مارف خەزنەدار



کتێب: مێژووی ئەدەبی کوردی – بەرگی شەشەم - A
دانانی: د. مارف خەزنەدار
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٤٢٨
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: تریسکە ئەحمەد حەمید
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر– ٢٠٠٦

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارە (٧١)ی ساڵی ٢٠٠٦ی دراوەتێ

# پێشەکی

ئەوەی پێویست بووە بۆ ڕوونکردنەوەی ناوەڕۆکی «مێژووی ئەدەبی کوردی» لە بەرگەکانی پێشوودا نووسراوە. هەرچی لەم پێشەکییەدا دەخرێتە ڕوو زیاتر پێوەندی بەو ماوەیە هەیە کە لەم بەرگە و لە بەرگی داهاتوودا باسی لێوە کراوە. قۆناغی (١٩٤٥ - ١٩٧٥) لە ئەدەبی کوردیدا گرنگە، چونکە لەم ماوەیەدا «شیعری نوێ» و «پەخشانی هونەری» لەسەر پێ وەستان و بوون بەنەریت و مۆدێل. لەگەڵ ئەوەشدا شیعرە عەرووزییە کلاسیکییەکە هەندێ جار وەکو خۆی مابووەوە و هەندێ جاری دیکە تێکەڵ بە«شیعری نوێ» بووبوو، ئەمە جگە لەو دیاردە گرنگەی شاعیران قاڵبی کۆنی کلاسیکییان بۆ مەبەسی کۆمەڵایەتی و سیاسی بەکار دەهێنا. ئەم دیاردە تازانە لە ئەدەبی کوردیدا: شیعری نوێ و پەخشانی هونەری و تێکەڵکردنی کۆن و تازە بوونەتە هۆی ئەوەی لەم بەرگە و لە بەرگی داهاتوودا بایەخ بەم لایەنە تایبەتییەی ئەدەبی کوردی بدرێ.

شاعیرانی ئەم قۆناغە دەکرێن بەدوو بەشەوە: یەکەمیان پێڕەوانی شیعری کلاسیکی کۆن، دووەمیان پێڕەوانی شیعری نوێ و نوێخوازی لە ئەدەبی کوردیدا. بەشی یەکەمیان زۆرتر بایەخ بەنوێکردنەوەیان دەدرێ لە چوارچێوەی شیعری عەرووزی و ئەدەبی ئیسلامەوی، هەرچی بەشی دووەمیشە بەگشتی زیاتر بایەخیان پێ دەدرێ، چونکە شتی تازە و لەمەوپێش نەبوویان لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

مێژووی ئەدەبی هەموو نەتەوەیێک ئاوێنەی بیروباوەڕ و ئیدیۆلۆجییەت و بۆچوون و خەیاڵی هەموو تاکێکی ئەو نەتەوەیە، هەر بۆچوونێک ئەگەر بۆنی شۆڤێنییەت یا دوژمنایەتی لێ بێ بۆ نەتەوەیێکی دیکە بیروڕای گشتی ناگەیەنێ، بەتایبەتی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ خراپەیان بۆ ناکرێ، لەبەرئەوە دۆستی یەکترن، بەڵکو برای یەکترن. هێرش بردنی شاعیر و نووسەری کورد بۆ سەر تورک و عەجەم و عەرەب لەبەر خراپەی کاربەدەستانیانە، خۆیان خراپەیان نەکردووە. ئەمە و ئەگەر بۆ گاڵتە و پێکەنینیش بێ خەڵکی ناو میللەتانی هاوسێ تیز و قەشمەری بەیەکتری دەکەن، ناو و ناتۆرەی ناشیرین لە یەکتری دەنێن.

کۆمەڵێکی زۆر لەو شاعیر و نووسەرانەی بەشی تایبەتییان بۆ تەرخان کراوە یا ناویان



لەم کتێبەدا هاتووە لەم بەرگە و لە بەرگی داهاتوودا ئاشنایەتی و دۆستایەتییان لەگەڵ نووسەری ئەم کتێبەدا بووە. هەندێکیان زۆر نزیکبوون لێیەوە، برادەرایەتی لەگەڵیانا گیانی بەگیانی بووە. ئاگاداری لە هەندێ لایەنی نهێنی ژیانیاندا هەبووە، مێژووی بەسەرهات و ژیانیان بۆ نووسی بووەوە، نهێنیی شیعری داخراوی خۆیانیان بۆ ڕوون کردبووەوە بەتایبەتی ئەو شیعرانەی بەشێوازی سیمبۆلی (ڕەمزی) هۆنراونەتەوە. زانیاری لە بارەی شاعیر و نووسەرانەوە تەنیا لە خۆیان وەرنەگیراوە، پێوەندی بەکەسوکار و دۆست و برادەرانیانەوە کراوە، ئەوانیش دەوریان بووە لە ڕوونکردنەوەی هەندێ لایەنی ژیان و بەرهەمیان. بەشێکی زۆر لەم زانیارییانە چوونەتە ناو ئەم کتێبەوە.

***

بەپێی ئەو بەرنامەیەی بۆ ئەم قۆناغەی مێژووی ئەدەبی کوردی (١٩٤٥ - ١٩٧٥) دانرا بوو، دەبوو لە دوو توێی بەرگێک بگەیەنرێتە ئەنجام، بەڵام لەبەر فراوانی و زۆری بەرهەمی ئەدەبی لە بەرگێک جێی نەبووەوە ناچار کرا بەدوو بەرگ، بەم پێیە بەرگی شەشەم و حەوتەم مێژووی ئەدەبەکە لەم قۆناغەدا دەگرنە خۆیان.

ئەوەی لە سەرانسەری ئەم کتێبە دەکەوێتە ڕوو ئەوەیە هەموو ئەو شاعیر و نووسەرانەی بەشی تایبەتییان بۆ تەرخان کراوە لەوانەن کۆچی دواییان کردووە، بەڵام ئەوانەی بەشی تایبەتییان بۆ تەرخان کراوە و هێشتا لە ژیان دان ئەوانەن لە ساڵی ١٩٧٥ شاعیری تەواو بوون و لە دوای ئەم ماوەیە و تا ئێستاش وەکو خۆیان ماونەتەوە. ژمارەی ئەمانە لە سێ کەس تێپەڕی نەکردووە.

هەوڵی بێ وچان دەدرێ بەزووترین کات لە دوای ئەم بەرگە بەرگی حەوتەم بکەوێتە بەردەستی خوێنەرانەوە.

هەولێر: مەڵبەندی ڕووناکی مارف خەزنەدار

## بەشی یەکەم

## کوردستان

## لە ساڵانی ١٩٤٥ – ١٩٧٥

ئەو گۆڕانکارییەی لە دوای جەنگی یەکەمی گیتی لە کوردستانی عوسمانی ڕوویدا بنچینەیی بوو. ئەو خاکە کەرت کرا و بوو بەسی بەش، هەر بەشێکی کەوتە وڵاتێکی تازە دروست کراوەوە، تورکیا و عیراق و سووریا. کوردستانەکەی ئێرانیش وەکو خۆی مایەوە لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوییەوە تا ئێستا. کوردستانی گەورەی ئێستا یەک پارچە زەوییە، سنووری دەستکردی سیاسی لە یەکتریانی جیا کردۆتەوە.

کاریگەری جەنگی دووەمی گێتی بەسەر چارەنووسی نەتەوەی کوردەوە کەمتر نەبوو لەو گۆڕانکارییانەی بەسەر کۆمەڵی کورددا هات لە ئەنجامی جەنگی یەکەم. ئەمەیان دابەشکردنی خاکی کوردستانی عوسمانی بوو، ئەوی دیکەیان ئەو گۆڕانە سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابوورییانە بوو کە هەموو ناوچەکانی کوردستانی گەورەی گرتبووەوە.

لەم ماوەیەدا بەکورتی باس لە هەموو پارچەکانی کوردستان دەکرێ لە ماوەی ١٩٤٥ – ١٩٧٥دا.

### کوردستانی تورکیا

لە ڕۆژگارانی جەنگی دووەم و دوای جەنگ هەواڵی جموجۆڵی ڕۆشنبیری و خوێندەواری کوردی عیراق و سووریا بەهۆی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و کۆوار و کتێب دەگەیشتە کوردی تورکیا، ئەمە و لەوەش گرنگتر دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد هاندەرێکی بەهێز بوون بۆ هوشیارکردنەوە و چەسپاندنی گیانی نەتەوایەتی لە کوردستانی تورکیا. لە ساڵی ١٩٤٩ لە هەندێ لە ناوچە کوردنشینەکان شەڕ دەکەوتە نێوان جەندرمەی تورک و کوردی دەشت و ئاوەدانییە کشتوکاڵییەکان، ئەمە تەنیا لە ئەنجامی بێکاری و هەژاری نەبوو بەڵکو گیانێکی نەتەوەیی تازە هانی دەدان هەڵمەت ببەن و داوای ئاوەدانکردنەوەی گوند و دروستکردنی قوتابخانە بکەن و بەزمانی کوردی بخوێنن. هەر لەو ماوەیەدا بوو لە هەڵبژاردنی گشتی ئەنجومەنی نیشتمانی (پەرلەمانی) تورکیا کوردی ویلایەتی ئەرزەڕۆم



بەشار و دێهاتەکانەوە مانیان گرت و دەنگیان لەو هەڵبژاردنەدا نەدا.

لە دوای جەنگی دووەم و بەهۆی بڵاوبوونەوەی بیری نەتەوەیی لە ناو کۆمەڵی ئەوێ دەسەڵات پیلانی دانا بۆ چۆڵکردنی دیوی تورکیا کە سنووری لەگەڵ ئێران و عیراق هەبوو بۆ ئەوەی پێوەندی لە نێوان کوردی لای خۆیان و ئەم دوو وڵاتە نەمێنێ، لانەی جاسووسی هەندێ لە دەوڵەتانی ئەورووپا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەستیان لە دانانی ئەم پیلانانەدا هەبوو بۆ دەسەڵاتی تورکیا. ژمارەیێکی زۆر لە کوردانی سەر سنووریان ئاوارە کرد بۆ ناوچە تورکییەکان لە باکوور و ڕۆژئاوای تورکیا. جگە لەوە ڕەنجبەر و جووتیار و هەژاری کوردیان هان دەدا وەک کرێکار ڕوو بکەنە وڵاتانی ئەورووپا، بەتایبەتی ئەڵمانیای بەزیو لە جەنگی دووەم پێویستی بەهێزی کرێکاری هەبوو.

لە پێش جەنگی دووەم سیستێمی تاکە پارتی سیاسەتی تورکیای بەڕێوە دەبرد. لە دوای جەنگ بەهۆی کاریگەری پاڵەپەستۆی دەوڵەتە سەرکەوتووەکانی ئەورووپا و ئەمەریکا لە جەنگ، سیستێمی فرە پارتییایەتی پەیدا بوو. ئەمە بووە هۆی ئەوەی پارتییە جیاوازەکان لە پێش هەڵبژاردن لە کورد نزیک ببنەوە بۆ ئەوەی دەنگیان بۆ بدەن. ئەمە تا پلەیێک تیۆرییە فاشییەکەی عەسکەریتاری دەوڵەتی تورکیای لە ناو خەڵکیدا کز کرد. هەندێ کەس زاتی ئەوەیان دەکرد بڵێن ئێمە کوردین و تورک نین.

لەو ماوەیەدا بەهۆی لاوازبوونی دەوڵەتەکانی ئەورووپا، لەگەڵ ئەوەی لە جەنگیش سەرکەوتن، ئەمەریکا ئەو هەلە لەبارەی دۆزییەوە بۆ ئەوەی جێ پێی خۆی خۆش بکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. لەو سەردەمەدا لە بەرژەوەندی ئەمەریکا بوو مەسەلەی نیشتمانی کورد بقۆزێتەوە بۆ دەست تێوەردان لە کاروباری ناوەوەی تورکیا و ئێران و عیراق و سووریا کە لە ئەنجامدا قازانجی خۆی تێدا بوو و لە ئایندەیێکی دووردا زیانی ئەو دەوڵەتانەی تێدا بوو، هەرچی کوردیش بوو، بەهەموو جۆرێک زیانی لێ دەکەوت.

دیسانەوە لە پێناوی بەربەرەکانی ڕووسیای سۆڤیەتی هەڵگری بیروباوەڕی مارکسیزم و لەناوبردنی بیری کوردایەتی بۆ چاکەی ئەو دەوڵەتانەی هاووڵاتی کوردیان هەبوو عەدنان مەندەریسی سەرەک وەزیرانی تورکیا لە ساڵی ١٩٥٥ چووە بەغدا و «پەیمانی بەغدا»ی لەگەڵ حوکوومەتی عیراق لە ٢٤ی شوباتی ئەو ساڵەدا مۆر کرد. «لیجنەی ئاسایش» لەو پەیمانەدا گرنگترین دەسگایێک بوو بۆ بەربەرەکانی و لەناوبردنی بزووتنەوەی نیشتمانی کورد لەسەر سنووری هەردوو لایان. لە پاشانا ئێران و پاکستان و بەریتانیا و ئەمەریکا چوونە ناو ئەو پەیمانەوە و ناونرا «پەیمانی سەنتۆ».

له دوای کوودیتا سوپاییبیەکەی تورکیا له ساڵی **١٩٦١** و پەیدابوونی خوێندەواری کورد بەزمانی تورکی و ئاگاداربوونیان له هەڵسوکەوتی سیاسی ناوچەکه و هەموو گێتی بیری بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی کورد چەکەرەی دەرکرد و ڕۆشنبیران کەوتنه خۆ ئامادەکردن بۆ خەباتی خوێندەواری و چەکداری. له ساڵی **١٩٦٣** دەسەڵاتی تورکیا له ناوچه کوردییەکانی ئەو وڵاته ڕێکخراوێکی نهێنییان دۆزییەوه و **٢٣** کەسیان لێ گرتن. له دوای ئەمه حوکوومەت کەوته خۆ، له دوو مەیداندا بەربەرەکانی کوردی دەکرد، له پێشانا لایەنی خوێندەواری ئەمەیان زیاتر له شارەکاندا بوو، ئەوی دیکەیان چەکداری، ئەمەشیان بەزۆری له دەشت و ئاوەدانییه کشتوکاڵییەکاندا بوو. بەتایبەتی له ساڵی **١٩٦٥** بەبایەخدانێکی زۆرەوه چاویان بڕیبووه ئەو کەسانەی کۆششیان لەم لایەنەوه هەبوو. بەمەبەسی قەلاچۆکردنی ئەم کردەوانه له ساڵی **١٩٦٦** ڕاوێژکار و نوێنەرانی **٢١** وەزارەتی تورکیا له کۆبوونەوەیێکی نهێنیدا پرۆگرامێکی بەرفراوانیان دانا بۆ بەڕێوەبردنی **١٦** ویلایەت له ویلایەتەکانی کوردستانی تورکیا که تا ئێستاش به ویلایەتەکانی باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیا ناویان دەبەن. هەروەها بۆ ئەم مەبەسه و دوورخستنەوەی خەڵکی له هەموو سەرچاوەیێکی خوێندەواری بۆنی کوردی لێ بێ له چاپەمەنی و قەوان و تۆماری دەنگ و ڕەنگ و شتی دیکەی لەم بابەته قەدەغه کران و ڕێگه نەدەدران بچنه ناو ویلایەته کوردییەکانەوه. لەگەڵ ئەم هەموو سانسۆره سەختە له ساڵی **١٩٦٨** ئەمین بۆز ئەرسەلان له ئەستەموولّ «مەم و زین»ی خانی بەکوردی لاتینی بڵاو کردەوه لەگەڵ وەرگێڕانی تورکی، ئەوەنده هەیه لەبەر سانسۆر ئەو دێڕه شیعرییانەی سڕیبووەوه که له پێشەکییەکەدا ناوی کوردیان تێدا هات بوو. جگه لەوه بەدزی و ئاشکرا کتێبی ئەلفوبێیان بڵاو دەکردەوه بۆ فێربوونی زمانی کوردی. ئەم کۆششه بەمەبەسی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری کوردی و قەدەغەکردنی له لایەن دەسەڵاتی تورکیاوه بووه هۆی ئەوەی له ئەیلوولی ساڵی **١٩٦٧** کۆمەڵەی ئەوقاتانی نێودەوڵەتی له جنێڤ داوایان له حوکوومەتی تورکیا کرد مافی مرۆڤی میللەتی کورد پێشێل نەکەن.

خەباتی نەتەوەیی زیاتر پەرەی سەند، له ساڵی **١٩٦٩** خۆپیشاندانی گەوره له ناوچه کوردییەکانی تورکیا دەکرا. بزووتنەوەی سیاسی ڕۆژ له دوای ڕۆژ پەرەی دەساند و خۆپیشاندان بەگوڕتر دەبوو. له ساڵی **١٩٧١** کۆماندۆسی جەندرمەی تورک هێرشی توندی برده سەر ناوچەکانی هەکاری و ماردین و سیلفان و باتمان و دیاربەکر و مەلازگەرد و جێگەی دیکه. ئەنجام کوشتنی خەڵک و سووتاندنی دێهات و لەناوبردنی باغ و باغات و



دارستان و کشتوکاڵ بوو بەتاوانی دروستکردنی کوردستان. لەم ماوەیەدا کوودیتا سوپاییبیەکەی دووەم له ١٢ی مارتی **١٩٧١** ڕوویدا. هەڵسوکەوتی کورد له پێشان خراپتر بوو. کۆمەڵێک خەڵک له دیاربەکر گیران، لەوانه **٣٣** کەس له لایەن دادگای سوپاییبیەوه تاوانبار کران بەدامەزراندنی «نێوەندی شۆڕشگێڕی و ڕۆشنبیری کوردستانی تورکیا» له پێناوی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی. هەروەها کۆمەڵێک ڕۆشنبیری کورد خرانه بەندیخانەوه، لەوانه: تاریق زیا ئیکنجی، جانیب ئیلدەمیر، مووسا عەنتەر، کەمال بورقای، ناجی قوتلای، مەهدی زانا، ئەمین بۆز ئەرسەلان، یووسف ئیکنجی و زۆری دیکه. بەهەزاران نیشتمانپەروەر و چەکداری ڕێگەی خەباتی نەتەوەیی گیران. له ئاغستۆسی ساڵی **١٩٧٢** دادگای سوپایی له دیاربەکر مامۆستای زانستگا و پسپۆڕی زانستی کۆمەڵایەتی له زانستگای ئەرزەڕۆم، تورک نەژاد ئیسماعیل بێشکچی دادگایی کرد و بەتاوانی پڕوپاگەندەکردن بۆ بیروباوەڕی کۆمۆنیزم و بیری کوردایەتی فەرمانی **١٣** ساڵ بەندکردنی بۆ دەرکرد.

له دوا ساڵانی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەم ڕێکخراو و پارتی سیاسی و یانه و نێوەند و مەڵبەندی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و هونەری له کوردستانی تورکیا و شاره گەورەکانی دیکەی تورکیا که کوردێکی زۆر تیایاندا دەژێن پەیدابوون. ئەو ڕێکخراوانه گەلێ ڕۆژنامه و کۆوار و چاپەمەنییان دەرکردووه، لەوانه «ڕۆژا وەلات»، «تێکۆشین»، «ژینا نوو»، «ڕزگاری» و هی دیکه. له ناو ئەو پارتییانه «پارتی کرێکارانی کوردستان» هێزی چەکداری دامەزراند، بەنهێنی و له ناو شاخەکاندا دەستیان کرد بەخەباتی چەکداری. دەسەڵاتی تورکیا جاڕی جەنگی دا له دژیان بەڵام خەیاڵی خاوه، ئێستا و ئەوساش ئەوان کۆڵیان نەداوه. ئەوەی پێویسته لێرەدا بخرێته ڕوو ئەوەیه هەندێ له ئاغا و دەرەبەگ و کاربەدەستانی کورد نەژاد لەگەڵ دەسەڵاتی تورک بوون له دژی کورد. لەو کاتەی تا جەنگی دووەمی گێتیی سەدەی بیستەم مەترسی ئەوه هەبوو کورد وەکو نەتەوەیێک له کوردستانی تورکیا له ناو بچێ، ئێستا زانا و ڕۆشنبیر و نووسەر و شاعیر و هونەرمەندیان هەیه، ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و هونەرییان هەیه، چاپەمەنی و ڕادیۆ و تەلەفیزیۆنیان هەیه، سیاسیی ڕۆشنبیریان هەیه. له سەرەتای شەستەکانەوه میللەتی کوردی کوردستانی تورکیا زیندوو بووەوه، ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر پێشدەکەوێ تا ئەو سەردەمەی ئەم کتێبه کۆتایی پێ دێ (**١٩٧٥**)، لەمەش بەدواوه تا ئەمڕۆ خەباتی ڕۆشنبیری و سیاسی ئەو میللەته ئازادیخوازه بەردەوامه.

## کوردستانی ئێران

نەخشەی کوردستانی ئێستای ئێران دەگەڕێتەوە ڕۆژگارانی فەرمانڕەوایی شاهانی سەفەوی (١٥٠١ – ١٧٢٢) بەتایبەتی لە دوای دابەشبوونی کوردستان لە ئەنجامی جەنگی چاڵدێران (١٥١٤) لە نێوان سوڵتانی عوسمانی و شای ئێران. هێڵی سنووری ڕەسمی نێودەوڵەتی لە نێوان ئێران لە لایێک و تورکیا و عیراقی ئێستا لەلایێکی دیکەوە لەگەڵ ئێران لە ناوچەی ورمێوە تا کەنداو هەر ئەو سنوورەیە کە لە کاتی خۆیدا لە دوای جەنگی چاڵدێران لە نێوان عوسمانی و سەفەویدا کێشراوە. واتە چارەنووسی ئەو بەشە کوردە لەو پێنج سەد ساڵەدا لە دەست عەجەم بووە لە سەفەوییەوە تا خومەینی. هەندێ ماوەی فەرمانڕەوایی میرنشینی کورد و فەرمانڕەوایی کەریم خانی زەندی لێ دەرچێ، لە هەموو ئەو ڕۆژگارانەدا کورد کەوتۆتە ژێر باری چەوساندنەوەی نەتەوەیی وەک کوردێک و چەوساندنەوەی ئاینزایی وەک سوننییێک و لە لایەن دەسەڵاتی شیعەی ئێرانەوە بەربەرەکانی کراوە.

لە ماوەی جەنگی گێتیی دووەمدا کە سوپای سووری ڕووسیای سۆڤیەت هاتە ناو ئێرانەوە، بۆ بەرژەوەندی خۆی تەشقەڵەیێکی سیاسی نامەردانەی لەگەڵ کوردی ناوچەی موکریاندا کرد. ئەنجامی خەباتی سیاسی و ڕۆشنبیری کوردی ئەو ناوچەیە دروستبوونی کۆماری کوردستان بوو لە مەهاباد (١٩٤٦) بەیارمەتی ڕووسیا، لە دوای ساڵێک بەرژەوەندی لەوەدا بوو لە دەسەڵاتی تاران نزیک ببێتەوە و بەگوێی بکا. لە پێناوی هێنانە دی ئەم مەبەسە سوپای سوور لە ئێران چووە دەرەوە و کۆمار ڕووخێنرا و سەرکردەکانی کورد لە سێدارە دران و گەلێ لە خەڵکیش ئاوارە کران. ئەمە گەورەترین ڕووداوێک بوو لە مێژووی کوردستانی ئێران و هەموو پارچەکانی دیکەی کوردستان و سەرچاوەیێکی گرنگ بوو بۆ هوشیارکردنەوەی کورد.

لە پاش جەنگی دووەم بزووتنەوەی سیاسی دیموکراتی لە کوردستانی ئێران کز بوو. بزووتنەوەی ڕۆشنبیری و خوێندەواری بەردەوام بوو لە ئاسۆیێکی ئەدەبی کلاسیکیی تەسک دەسووڕایەوە، بایی ئەوەندە هەوێنی تێدا بوو پارێزگاری ئەدگاری نەتەوەیی بکا و لە مردن قورتاری بکا. بەشێکی خەباتی سیاسی و خوێندەواری کوردی ئێران کەوتە هەندەرانەوە. ئەو کۆمەڵە لاوانەی لە سەردەمی کۆماری مەهاباد نێررابوون لە باکۆ لە ئەکادیمیەی سوپایی بخوێنن، لە دوای ڕووخانی کۆمار ناچار بوون واز لە خوێندنی سوپایی



بێنن و بن بەپەنابەری سیاسی و لە مەیدانی زانستییەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی کار بکەن، هەروەها خەریکی خەباتی سیاسیش بن. بۆ ئەم مەبەسە ڕۆژنامەی «کوردستان»ی کۆماریان زیندوو کردەوە تا ساڵی ١٩٦٠ لە باکۆ بەزمانی کوردی بڵاو دەکرایەوە. لەم کارەدا کەسانی وەکو ڕەحیمی قازی و عەلیی گەلاوێژ دەوری گرنگیان هەبوو. لە پاشانا شوێنی دەرچوونی ڕۆژنامەکە و جموجۆڵی سیاسی گوێزرایەوە شاری پراگ لە چیکۆسلۆڤاکیای ئەو سەردەمە. ئینجا بۆ دوا جار نووسینگەی ڕۆژنامەکە و خەباتی سیاسی کوردی ئێران لە دەرەوەی نیشتمان گوێزرایەوە بەغدا و خەبات و کۆششیان تا ساڵی ١٩٧٥ی خایاند. دیارترین خوێندەوار و سیاسی و نیشتمانپەروەری ئەم ڕۆژگارە لە ناو بزووتنەوەکەدا بوون، لە سەرووی هەمووانەوە پێویستە پەنجە بۆ عەبدولڕەحمان قاسملوو درێژ بکرێ.

لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا نێوانی ئێران و عیراق تا پلەیێک ناخۆش بوو، بۆ پروپاگەندە کردن لە دژی کۆماری عیراقی تازە شای ئێران فەرمانی دەرکرد لە ساڵی ١٩٥٩ ڕۆژنامەیێکی هەفتانە بەزمانی کوردی لە تاران بڵاو بکرێتەوە بەناوی «کوردستان»ەوە. هەرچەندە لە ڕووی ئیدیۆلۆجییەوە کەڵکی نەبوو، بەڵام لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە سوودی هەبوو وەک سەرچاوەیێکی ئەدەبی و فیلۆلۆجی بۆ مەبەسی بەراووردکاری گەلێ شتی باشی تێدا بڵاو دەکرایەوە.

لە ماوەی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١، کوردستانی عیراق پێوەندی لە نێوان کوردی هەردوو دیوی ئێران و عیراق هەبوو. ناوچە کوردییەکانی کوردستانی عیراق ئەوانەی لە ژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی بەغدا نەبوون جێگەی داڵدەی کوردی ئێران بوون. تا پلەیێک سنوور ئاواڵە بوو، تەنیا لە ڕووی ئابوورییەوە کەڵکی بۆ هەردوو لا نەبوو بەڵکو لە ڕووی ڕۆشنبیری و خوێندەواری و ئەدەبییەوە کەڵکی زۆر بوو. دەسەڵاتی ئێران بەهۆی لانەی جاسووسییەوە هەلێکی لەباری دەست کەوتبوو، دەسنووس و کتێبی بەنرخی کوردی کۆ دەکردەوە و بێ بەزەییانە لە ناویان دەبردن. نەک تەنیا ئەمە بەڵکو دەستیان بۆ کەلوپەلی شوێنەواری و ئەرکیۆلۆجیش درێژ دەکرد و دەیاندزین بۆ ئەوەی بڵێن کورد مەدەنییەتی نەبووە.

دەسەڵاتی سیاسی ئێران لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سەفەوییەوە تا ئێستا بیروڕای بەرامبەر بەکورد نەگۆڕاوە. بەڕەگەز کورد ئێرانییە، هەروەها هیندۆئەوروپییە، بەزمان

ئێرانی و هیندۆئێرانی و هیندۆئەوروپییە، لەبەرئەوە هیچ گرژییێک لە دەروونیدا پەیدا نابێ بەرامبەر بەوشەی «کورد» یا «کوردستان»، بەڵام لای خۆی کە دەڵێ «کوردستان» ئەمە تەنیا ئوستانی کۆنی ئەردەلانە کە پایتەختی سنەیە. ناوچەکانی دیکەی کوردستان لە «ورمێ»وە تا «کەنداو» بەکوردستان ناژمێرێ، سیاسەتی گشتی تواندنەوەی کوردە لە ناو «پان ئیرانیزم»، ئەمەش سەرۆکایەتی کورد و هەموو نەتەوە گەورە و بچووکەکانی ئێران دەداتە فارس، بەتایبەتی کورد سەرەڕای بەربەرەکانی لە ڕووی نەتەوەییەوە چەوساندنەوەی ئابینزایی وەکو سوننییێک لە ئەوەی پێشوو زیاترە. هەر چۆنێ بێ خەڵکی کوردستانی ئێران هوشیارن، بیر و هۆشیان هەمیشە بۆ پاریزگاری ئەدگاری نەتەوەیی و داواکردنی مافی مرۆڤایەتییانە.

## کوردستانی عیراق

لە دوای کپ بوون و کۆتایی هاتنی هەموو بزووتنەوە و ڕاپەڕینەکانی کوردی عیراق لە پاش جەنگی گێتیی یەکەم، بەڕاستی «قانوونی زمانانی ناوچەیی» هۆیێکی یەکجار گرنگ بوو بۆ مانەوەی سیمای نەتەوەیی لە کوردستانی عیراق و هەموو کوردستانەکانی دیکەدا. ئەگەرچی ئەم قانوونە وەک پێویست بوو پراکتیک نەکرا، ئەو بەشە کەمەی کە چووە ناو پراکتیکەوە لە سلێمانی و کەرکووک و هەولێر، لە دوای ١٤ی تەمووز لە بادینانیش، مەشخەڵێک بوو تا پلەیێک ڕووناکی هەموو کوردستانی گەورەی گرتبووەوە، بەم جۆرە کوردستانی عیراق بوو بەڕەمزی «بوونی» کورد.

لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتیدا لە کوردستانی عیراقدا بیری قەومی دیمۆکراتی لیبیرالی بەهێز بوو، فیکری سۆسیالیستی مارکسیزم سەری هەڵدا بوو. لەبەرئەوەی ئەڵمانیای فاشی بەرەو ڕووخان دەچوو لایەنگرانی کەم بوون، فیکری پان عوسمانیزمی ئیسلامی لە ناو ڕیزی کۆنە پیرەکاندا مابوو، لاوان و گەنجانیش بەربەرەکانی بیری تۆرانیزمی کەمالییان دەکرد. خەڵکی چاوەنۆڕ بوون، لە ئەنجامی جەنگدا ئاڵوگۆڕێک ببێ و کورد ئازادی چنگ بکەوێ، ئەمەیان نەبوو بەڵام بیری نەتەوەیی بەهێز بوو. زۆربەی خەڵکی لە دژی دەسەڵاتی مەلیکی عیراق بوون، لەویش زیاتر کەیفیان بەئینگلیز نەدەهات چونکە کاروباری حوکوومەتی عیراق بەدەست ئەوەوە بوو. لە ڕووی ئیدیۆلۆجییەوە خەڵکی دوو بەش بوون، کۆمەڵێک باوەڕیان بەبیری نەتەوەیی دیمۆکراتی بوو، کۆمەڵی دووەم بەناوی بیری مارکسیزم لە خەباتدا بوون لە پێناوی کوردستان. لە



سەرەتادا بیری مارکسیزم بەهێزتر بوو، بەتایبەتی لە شارەکاندا، بەڵام لەبەرئەوەی کردەوەیان ڕەنگدانەوەی ڕاستەقینەی قسەیان نەبوو لە دواییدا نشستییان هێنا، بیری نەتەوەیی زیاتر پەرەی دەستاند و بڵاو دەبووەوە. لە پەنجاکاندا ڕۆژنامەگەری پێشکەوت، بەغدا و سلێمانی دوو نێوەندی گرنگ بوون. لەبەر نەبوونی خوێندنی زانستگا لە هەموو عیراقدا و تەنیا لە بەغدا هەبوو، لاوی خوێندەواری کورد لەم شارەدا زۆر بوون، بەشێکیان بۆ خوێندن لەوێ دەژیان. لەو ماوەیەدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەوڵی دەدا جێ پێی خۆی خۆش بکا لە عیراق، تا پلەیێک لە دوای عەرەبی عیراق بایەخی بەکورد دەدا. لە پێشانا ڕاگەیاندنی باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە بەغدا بڵاوکراوەی «ئاگا و ڕووداوی هەفتەیی» بەزمانی کوردی بڵاو دەکردەوە، لە پاشانا ناوی گۆڕی و کردی بە«پەیام». لە ڕاگەیاندنی دەرەوە ناوی کورد هەبوو.

گۆڕانی بنچینەیی لە عیراق لە ساڵی ١٩٥٨ بوو، لە ١٤ی تەمووزی ئەو ساڵە سوپای عیراق کوودیتاییێکی هەڵگیرساند، کارە هەرە گەورەکەی ئەوە بوو سیستیمی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی گۆڕی، لە مەلیکییەوە کردی بەکۆماری، قازانجی کورد لە ڕووی تیۆری یا دەستوورییەوە ئەوە بوو کاربەدەستانی تازەی وڵات دانیان بەوەدا هێنا عەرەب و کورد خاوەنی خاکی عیراقن. ئەمە دەسکەوتێکی گرنگ بوو. زۆربەی کورد پشتگیری کۆماری تازە لە دایکبووی کورد و عەرەبی عیراقیان کرد. لە پێناوی بەرژەوەند و چاکەی خۆیان لایەنگرانی مارکسیزم زیادەڕەوییان کرد تا گەیشتنە ئەوەی دەستدرێژی بکەن. سیاسەتی ناهەمواریان گەیشتە ئەوەی گەلێ کەس لێیان دوور بکەوێتەوە. هەڵوێستیان بەرامبەر بەکورد بەناوی ئەنتەناسیۆنالیزمییەوە بۆ خراپەی بیری کوردایەتی دەگەڕایەوە. بەم جۆرە ئاژاوە دەکەوتە ناوەوە لە ئەنجامی دژایەتی هەندێ جار دەگەیشتە دوژمنایەتی لە نێوان هەڵگری بیروباوەڕی مارکسیزم و لایەنگرانی بیری کوردایەتی. زیاد لەسەر ئەمە هەڵسوکەوتی عەرەبە ناسیۆنالیستەکانی عیراقیش لە قازانجی کورد نەبوو. لە لای کورد خۆشیەوە لە پلەیێکی دانایی سیاسی ئەوتۆدا نەبوو بتوانێ بەرگری ئەم هەموو هێزانە بکا، بەتایبەتی پاش ئەوەی سیاسەتی عەبدولکەریم قاسم کەوتە بارێک لە چاکەی نەبوو، هەرچەندە ئەویش لەگەڵ عەرەبە ناسیۆنالیستەکان ڕێک نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەواندا بۆ بەربەرەکانی کورد یەکی دەگرتەوە.

دەست تێوەردانی هێزی دەرەوە لە وڵاتە هاوسێکانی عیراق و ئەمپریالیستی ئینگلیزی و ئەمەریکی و پیلانی کۆمپانیاکانی نەوتی عیراق درزیان خستە نێوان هەردوو بەرەی

کورد و عەرەبی خاکی عیراق بەپشتگیری هەندێ لە دەرەبەگ و دەوڵەمەندانی کورد، مەسەلە گەیشتە ئەو ڕادەیەی سوپای دەسەڵاتی عیراق هێرش بەرێتە سەر هەندێ لە ناوچەکانی کوردستانی عیراق و شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ بەرپا بێ. هەندێ لە ناوچە شاخاوییەکانی نزیک سنووری عیراق و تورکیا و عیراق و ئێران کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی کورد. شۆڕشەکە درێژ خایەن بوو لەبەرئەوە توانیان تا ڕادەیێک کاروباری سوپایی و دارایی ڕێک بخەن. بەڵام مخابن لە ساڵی ١٩٦٤دا دووبەرەکی کەوتە ناو بزووتنەوەی کورد. ئەو کاتە عەبدولکەریم قاسم کوژرا بوو لە پێشانا پارتی بەعس دەسەڵاتی گرتە دەست و لە پاشانا عەرەبە ناسیۆلیستەکان یا ئەوانەی بەناوی ناسیۆنالیستی عەرەبەوە خەباتیان دەکرد لەم دووبەرەکییە سوودیان وەرگرت و بەئارەزووی خۆیان گەمەیان بەمەسەلەی نیشتمانی کورد دەکرد. چەندوچوونی دووبەرەکەی کورد تەنیا بەبیری جیاوازی ئاشتیانە نەوەستا لە ساڵی ١٩٦٦ بەرەنگاری یەکتری بوون. ئەم کارە زۆر کەوت بەسەر مەسەلەی نیشتمانی کوردەوە، تا ڕۆژی ئەمڕۆ شوێنەواری دڵتەزێنی ماوە.

لە ساڵی ١٩٦٧ شەڕەکانی نێوان دەسەڵاتی بەغدا و چەکدارانی کورد هەندێ سووک بوو، تا گەیشتە گفتوگۆ بکەوێتە نێوانیانەوە لەم بابەتەوە و ڕێگە بەدەرکردنی ڕۆژنامە و چاپەمەنی کوردی بدرێ. هەردوو بەرەکەی بزووتنەوەی کورد ئەو کاتە لە بەغدا بوون. لە ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨ بەپێی دانانی پیلانێکی لانەی جاسووسی پارتی بەعس لە بەغدا دەسەڵاتی خستە دەستی خۆی. یەکێ لەو دوو بەرەیە لەو ساڵەدا جموجۆڵی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەری هەبوو. لەگەڵ زویربوونی ئەمە لە ساڵی ١٩٦٩ ئەوەکەی دیکە لە بەغدا کەوتە جموجۆڵی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەرییەوە، لەو ماوەیەدا گفتوگۆ دەستی پێ کرد لە نێوان بزووتنەوەی کورد بەسەرکردایەتیی بارزانی و دەسەڵاتی بەغدا، ئەنجام بەیانی ١١ی مارتی ١٩٧٠ قانوونی «ئەفتۆنۆمی هەرێمی کوردستان»ی بڵاو کردەوە. لە ماوەی چوار ساڵدا زەمینە خۆش بکرێ بۆ چەسپاندنی ئەو کارگێڕییەی بەناوی «کوردستانی عیراق»ەوەیە. دەست تێوەردانی ئێران لە کێشەی نێوان دەوڵەتی عیراق و شۆڕشی کورد بەتێکچوونی هەردوو لا گەڕایەوە و هێرشی سوپایی دەستی پێ کردەوە لە دژی چەکداری کورد لە ناو شاخەکاندا. لە بەهاری ساڵی ١٩٧٤ەوە تا بەهاری ١٩٧٥ی خایاند. لەو کاتەدا کۆنگرەی ئۆپیک لە جەزائیر بەسترا، پێشتر هەندێ لە دەڵاڵانی لانەی جاسووسی نێودەوڵەتی لەوانە یەکێکی وەکو هەواری بومیدیان سەرۆکی دەوڵەتی جەزائیر زەمینەی



خۆش کردبوو بۆ ئاشتکردنەوەی محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی لەگەڵ سەدام حوسێن. لە ماوەی بەستنی کۆنگرەکە «پەیمانی جەزائیر»یان مۆر کرد بەشایەتی بومیدیان. بەپێی ئەو پەیمانە ئێران سنووری داخست بەمەبەسی خنکاندنی شۆڕشی کورد، بەم جۆرە شۆڕشی ئەیلوول دوایی هات. خەباتی قۆناغێکی گرنگ چووە ناو گڵەوە. سەرلەنوێ قۆناغێکی تازە دەستی پێ کردەوە.

نەخشەی ڕۆشنبیری کوردی بەگشتی و ژیانی ئەدەبی بەتایبەتی لە کوردستانی عیراقدا لە نێوان ساڵانی ١٩٤٥ - ١٩٧٥ بەم جۆرە بوو:

١- لە دوای جەنگی دووەمەوە ئەدەبی کوردی تا پلەیێکی بەرز پێش کەوتبوو. ڕۆژنامە و کۆوار و کتێب بەزمانی کوردی لە بەغدا و شارەکانی کوردستانی عیراق سلێمانی و کەرکووک و هەولێر بڵاو دەکرانەوە.

٢- لە ساڵی ١٩٥٨ەوە لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی بەغدا تا ساڵی ١٩٦٠، لە ڕووی ژمارە و قەوارەوە ڕۆژنامەگەری پێش کەوت، سەربەستی لە بڵاوکردنەوە هەبوو، چاپەمەنی زۆر بوو بەڵام پلەی خوێندەواری زۆر بەرز نەبوو. زیاتر بایەخ بەنووسینی سیاسی دەدرا.

٣- ساڵانی ١٩٦١ - ١٩٦٧ بێ بارانترین وەرزی خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردی بوو لە عیراق. بەهۆی شۆڕشی ئەیلوولەوە جموجۆڵی خوێندەواری وەستا بوو بەتایبەتی لە بەرهەمی ئەدەبیدا. ئەو برە شیعر و چیرۆکانەی لەو ماوەیەدا بڵاو کراونەوە زۆر کەمن بەرامبەر بەقەوارە و توانای شاعیر و نووسەرانی ئەو سەردەمە.

٤- ساڵانی ١٩٦٧ - ١٩٧٥ قۆناغی زێڕینی بووژانەوە و پێشکەوتنی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی بوو. نووسەر و ڕۆشنبیرانی هەموو پارچەکانی کوردستان ئاگاداری یەکتری بوون و ئاڵوگۆڕی بیروباوەڕی یەکتریان دەکرد.

## کوردستانی سووریا

لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی و دروستبوونی دەوڵەتی سووریا ناوچەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی باکووری ئەو دەوڵەتە بەشێک بوو لە هەرێمی بۆتانی گەورە. واتە ناوچەکانی باشووری بۆتان بەشی ڕۆژهەڵاتیان کەوتە عیراق (زاخۆ) و بەشی ڕۆژئاوایان کەوتە سووریا. ئەو خاکەی سووریا کە بە«کوردستانی سووریا» ناو دەبرێ خاکێکی درێژکۆلەیە لە

سێ کوچکەی سنووری تورکیا و عیراق و سووریاوە دەست پێ دەکا، لەوێ پان و بەرینە دەکشێ بەرەو ڕۆژئاوا، هەر دێ و تەسک دەبێتەوە تا لە ئەسکەندەروونە کۆتایی دێ. خاکێکی کشتوکاڵی بەپیتە، شار و شارۆچکە و دێهاتی زۆرە. هەندێ لە ناوچە جوگرافییەکانیان جزیرە و کووبانیە و عفرین بەعەرەبی (جبل الاکراد)ی پێ دەڵێن. شارەکانی قامیشلی و عاموودە و دێریک لە شارە بەناوبانگەکانیانن. جگە لەوە کوردێکی زۆر لە شارانی دیمەشق و حەلەب و حەما و لازقیە دەژین.

لە پاش ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و دروستبوونی سووریا کارگێڕی وڵات کەوتە دەست فرەنسا، لەو کاتەوە تا دوای جەنگی دووەمی گێتی کورد مافی ئەوەی هەبوو خۆی بەکورد بزانێ و خەباتی سیاسی و ڕۆشنبیری دەکرد لە پێناوی مافی نەتەوەیی. لە دوای دەرچوونی فرەنسا لە سووریا لە ساڵی ١٩٤٦ کوودیتای سوپایی بەناوی قەومییانی عەرەبەوە، یەک لە دوای یەک دەستی پێ کرد. ئەو عەرەبە شۆڤێنییانە بەرامبەر بەکورد زۆر دڕ بوون. هەوڵی تواندنەوەیان دەدا، سنووریان لەگەڵ تورکیا بتەوتر کرد، پێوەندی لە نێوان کوردی هەردوو دیوی سووریا و تورکیا پچڕا. لەو کاتەوە سیاسەتی بەعەرەبکردنی کورد دەستی پێ کرد، هەر لە سەرەتاوە دەسەڵاتی سووریا کوردی بێ بەش کرد لە شوناسنامە و هاووڵاتییەتی سووری.

لە ساڵی ١٩٦١ەوە بەپێی بەرنامەی تایبەتی، سیاسەتی تواندنەوەی کورد لە سووریا دەستی پێ کرد. بۆ ئەم مەبەسە قانوونی «پشتێندی عەرەبی» (الحزام العربي)یان لە ناوچەیێک دانا درێژایی ٣٥٠کم و پانایی ١٥ - ٣٠کم بوو، دانیشتوانی کورد بوو و هەموویانیان بەڕەسمی بەبێگانە حسێب کرد. ئەو سیاسەتە شۆڤێنییەی تا ئێستاش بەسەر کوردی سووریا سەپێنراوە گیانی کوردایەتییانی بەهێزتر کردووە و خەباتی سیاسی و ڕۆشنبیری و ئەدەبییان توندتر بوو بۆ وەدەست خستنی مافی نەتەوەییان.

**کورد لە ڕووسیا**

کورد لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە بەشێک بووە لە دانیشتوانی ئیمپراتۆرییەتی ڕووسیا. لە دوای پەیمانی گولستان (١٨١٣) لە نێوان ڕووسیا و ئێران بەشێکی زۆر لە ساڵی ١٨٢٣ لە کوردانی ئێران هاتنە ناوچەی یەریڤانی قەفقاسی ڕووسیا. لە پاش نیو سەدە لە ساڵی ١٨٧٨ کۆمەڵێکی زۆری دیکەی کورد لە ناوچەکانی قارس و ئەردەهانی عوسمانییەوە ئاوارەی قەفقاس بوون. بەم جۆرە لە سەدەی نۆزدەمدا لە سوپای ڕووسیا



چوار تیپی سوپایی بەناوی ئیسلامییەوە هەبوو، یەکێکیان تیپی کوردی بوو، لە چوار سەد سەربازی سوارە پێکهاتبوو، سەرۆکیان ڕووس بوو و یاریدەدەری بەگێکی کورد بوو و مەلایێک و (ئیمام تابوور) و پۆستەچی یێکیشیان هەبوو.

لە جەنگی قرم دوو تیپی کوردی لە سوپای ڕووسیا هەبوو، سەرۆکی یەکێکیان مایۆر جەعفەر ئاغا بوو، لە پاشانا بوو بەجەنرال و لە ساڵی ١٨٧٦ کۆچی دوایی کرد. لە دوای ئەو یەکێ لە بنەماڵەی عەلی ئەشرەف شەمسەدینۆڤ بوو بەسەرۆکی کوردی ڕووسیا، پلەی جەنرالی درایە. لە جەنگی ساڵانی ١٨٧٧ - ١٨٧٨ی نێوان ڕووسیا و دەسەڵاتی عوسمانی هەزار و سێ سەد سەربازی کورد لە ناو ڕیزی سوپای ڕووسیا لە دژی عوسمانی بوون.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم دانیشتوانی کورد لە ڕووسیا زۆر بوون، لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی ژمارەیان زیاتر بوو. لەو سەردەمەدا لە کۆمارەکانی ئازربێجان و ئەرمەنستان و گورجستانی قەفقاس و تورکمانستانی ئاسیای ناوەڕاست کورد خاک و جێگە و ڕێگە و گوند و شارۆچکەی هەبوو. لە دوای جێگیربوونی دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان کوردی هەموو ئەو ناوچانە مافی خوێندەواری نەتەوەییان درایە، لە پاشانا دوارۆژیان وا کەوتەوە وەک بەکورتی لە خوارەوە باسی لێوە دەکرێ.

### ١- کوردی ئەرمەنستان

کوردی ئەرمەنستان بەئایین زۆربەیان ئێزیدین، بەشێکی کەمیان موسوڵمانی سوننین. لە گوند و ئاوەدانییەکانی خۆیاندا دەژین لە ناوچەی ئەلەگەز، لە شاری یەریڤان و شارە گەورەکانی دیکەی ئەرمەنستان بەرچاو دەکەون. لە دوای چەسپ بوونی دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان و دروستبوونی کۆماری ئەرمەنستان، مافی ڕەوای نەتەوەییان درایە. قوتابخانە و ڕۆژنامە و کتێب و ڕادیۆ بەزمانی کوردی پەیدابوون، لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی دووەمی گێتی بەپێی سیاسەتی شۆڤێنی و تیرۆریانەی ستالین هەموو مافێک لەو کوردانە سەندرایەوە. لە دوای جەنگ، ئەو مافەیان پێ درایەوە، ئەو دەسگایانەی داخرابوون هەموویان کرانەوە. بەم جۆرە تەنیا کوردی ئەو وڵاتە لە سەرانسەری ڕووسیا لە دوای جەنگی دووەم خاوەنی مافی ڕۆشنبیری و خوێندەواری خۆیانیان بوون. تا ناوەڕاستی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم شانازی ڕووسیا لەوەدا بوو ئەگەر بیووتایە ئێمەش هاووڵاتی کوردمان هەیە، مەبەسی کوردی ئەرمەنستان بوو، ناوچەی ئەلەگەز

کرابووەوە بۆ هەموو بێگانە و پەیامنێرێک وەک پڕوپاگەندە بۆ ئەوەی ڕووسیا مافی نەتەوەیی پێویستی داوەتە کوردی خۆی.

## ٢- کوردی گورجستان

بەگشتی کورد لە گورجستاندا لە شاری تفلیس دەژین، هەروەها لە گوند و ئاوەدانییەکانی دەوروبەری. لەبەرئەوەی لە شاردا کەرەگی تایبەتییان نەبووە، هەروەها دیاردەییێکی واش ڕێک نەکەوتووە چەند ئاوەدانییێک لە پارچە خاکێکدا لە نزیک یەکەوە بن لە مافی خوێندەواری بێ بەش بوون. ئەوان هەرچۆنێ بێ بەشێکن لە کوردی ئەرمەنستان، هاتوچۆیان لەگەڵ یەکتریدا بەهێزە، خزمایەتییان هەیە، لەبەرئەوە لە زمانی خۆیان نەپچڕاون، بەتایبەتی خوێندەوارەکانیان بەشێکن لە خوێندەوارانی کوردی ئەرمەنستان، جگە لەوە لە ئایینیشدا لەگەڵ یەکتری هاوبەشن، هەردوو لایان ئێزیدین. ئەمانە پارێزگاری ئەدگاری نەتەوەیی خۆیانیان کردووە و مافی نەتەوەیی کوردی ئەرمەنستان بەهی خۆیان دەزانن.

## ٣- کوردی ئازربێجان

لە دوای پەیدابوونی کۆماری ئازربێجانی سۆڤیەتی دەسەڵات دانی بەمافی کوردەکانی ئەوێدا هێنا. کوردی ئەو وڵاتە بەئایین ئیسلام و بەئایینزا شیعەن. لەسەر خاکێکی پان و بەرینی شاخاوی لە نێوان ئەرمەنستان و ئازربێجاندا دەژین، ئاوەدانییە گرنگەکانیان زۆرن لەوانە کەلبەجاڕ و لاچین و قوبادلی و زەنگەلان و هی دیکە. قوتابخانە بۆ ئەو کوردانە کرایەوە، ئەلفوبێی لاتینییان بۆ ساز کرا، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی میر جەعفەر باگیرۆڤ پێش جەنگی دووەم ئەم هەموو مافە لە کوردی ئەوێ سەندرایەوە، باگیرۆڤی قوتابیی ستالین لە تیرۆر و بەربەرەکانی کورد، ئازاری کوردی ئەوێی دا، ئاوارەی کردن. هۆی سەرکەوتنی لەم کارەیدا ئەوە بوو کورد و ئازربێجانی هەردوو لا بەئایین موسوڵمان و بەئایینزا شیعە بوون. لە دوای جەنگی دووەمەوە تا ڕادەییێک لە ڕووی زمانەوە کوردی ئەوێ توانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستی نەتەوەیی لە ناو کوردی ئەو وڵاتە ماوە، ڕۆشنبیرانی کورد و هەندێ زانای ئازربێجانی و ڕووس بایەخ بەمێژوو و ئەدەب و ڕۆشنبیری کورد دەدەن.



## ٤- کوردی تورکمانستان

لە سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم لەبەر برسییەتی و قاتوقڕی هەندێ لە کوردانی خۆراسانی ئێران سنووریان بڕیوە و چوونەتە ناو خاکی ئاسیای ناوەڕاستی ئیمپراتۆرییەتی ڕووسیا لە دەوروبەری شاری عەشقابادی پایتەختی تورکمانستان و شاری ماری (مەڕۆی کۆن) ئاوەدانیی کشتوکاڵییان دروست کردووە. ئەم کوردانە بەئایین موسوڵمان و بەئایینزا شیعەن. لە دوای دروستبوونی کۆماری تورکمانستانی سۆڤیەت مافی ڕۆشنبیری و خوێندەوارییان درایە. قوتابخانە بەزمانی کوردی کرایەوە، کتێب بۆ قوتابیان بەزمانی کوردی و تیپی لاتینی چاپ کرا، بەڵام ئەمەشیان زۆری نەخایاند لە پێش جەنگی دووەمی گێتی وەکو هەموو کوردی وڵاتی ڕووسیا، جگە لە ئەرمەنستان، لە هەموو مافێکی ڕەوایان بێ بەش بوون. بەڵام ئەم کوردانە لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاری ئەدگاری نەتەوەیی خۆیانیان کردووە و شانازی بەکوردایەتییانەوە دەکەن. ئەوەی یارمەتیی ئەوەی داون تورکمانی ئەو وڵاتە بەئایینزا سوننین، بۆیە کوردە شیعەکە پارێزگاری سیمای نەتەوەیی خۆی کردووە.

# بەشی دووەم

## ئیدیاڵ و بابەتی ئەدەب

### شیعر

سەرکەوتنی هێزی دیمۆکراتی و مرۆڤایەتی بەسەر هێزی فاشیزمی ئەڵمانیا لە ئەنجامی جەنگی دووەمی گێتیی سەدەی بیستەم بووە هۆی ئەوەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی ڕزگاری نەتەوایەتی پێش بکەوێ لەو وڵاتانەی کەوتبوونە ژێر زوڵم و زۆری ئەمپریالیستەکانی ڕۆژئاوا. لە کوردستاندا بیروباوەڕی نیشتمانی نوێ پەیدا بوو، بەتایبەتی ئیدیۆلۆجییەتی مارکسیزم جێگەی دیاری هەبوو. کۆمەڵی کوردەواری تا پلەیێک وەک خاکێکی وشک بەبارانی بیری تازە هەندێ بووژایەوە. ئەم بیروباوەڕە تازانە هەندێ تێنوویەتی خەڵکیان شکاند. کورد یەکێکە لەو نەتەوانەی لە هەموویان زیاتر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زوڵم و زۆری لێ کراوە. لەبەرئەوە بێ وچان تێدەکۆشا، خەباتی تەنیا لە سەنگەرێکدا بوو، دژی هەموو ئەو زۆردارە بێگانانانە بوو کە دەیان چەوساندەوە. دژی دەوڵەتە ئەمپریالیستەکانی ئەوروپا بوو، چونکە ڕێی پێشکەوتنیان لێ گرتبوو، هەروەها دژی ئەو توێژانەی ناوەوەی خۆشی بوو لە دەرەبەگ و دەوڵەمەند و شێخ و پیاوی ئایینی داردەستی هێزی ئەمپریالیستەکان، ئەمانە چاکە و بەرژەوەندی خۆیان و ئەوانیان دەپاراست.

لە ساڵانی پاش جەنگی دووەم خەباتی ئیدیۆلۆجی تیژتر بوو، ژمارەیێک لە پارتی و ڕێکخراو و یانە دروست کران. بیروباوەڕی هەموو ئەم لایانە یەکتریان دەگرتەوە بۆ ئامانجی ڕزگاری نەتەوەی کورد و بوونی بەخاوەنی خۆی. سەرۆکەکانی دەرەبەگ لە بیستەکانی سەدەی بیستەم تا ڕادەیێک پشتگیری داوای مافی نەتەوەیی کوردیان دەکرد، لە دوای جەنگی دووەم هەندێ لەو سەرۆکانە چوونە ڕیزی ئەو بێگانانەی کوردیان دەچەوساندەوە، چونکە بەلای ئەوانەوە بەرژەوەندی چینی خۆیان لە سەرووی بەرژەوەندی زۆربەی توێژەکانی دیکەی کۆمەڵی کورد بوو. بەڵگەیێکی ڕوون بۆ ئەم مەبەسە ئەوەیە ئاغای عەشرەتێکی کوردی عیراق نامە بۆ بەگی عەشرەتێکی کوردی ئێران دەنووسێ، تێیدا تکا دەکا پشتگیری مەسەلەی نەتەوەیی کورد نەکەن، چونکە ئەوانەی لەسەر ئەم سیاسەتە دەڕۆن لەسەر ئەو باوەڕەن دەبێ بزووتنەوەی کورد لە دەست خوێندەوارانا بێ، ئەمە مانای ئەوەیە دەوری بەگ و ئاغایان لە سەرۆکایەتی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد نامێنێ.



پەرەسەندن و گۆڕانی ئەدەبی کوردی لە ماوەی دوای جەنگی دووەمی گێتی بەرێگەیێکی سەخت و دژوار تێپەڕی، چونکە شیرازەی هەڵسوکەوتی سیاسی شێوا بوو. سانسۆر باڵی بەسەر هەموو لایەنێکی خوێندەواری و ڕۆشنبیریدا کێشا بوو. ڕۆژنامەگەری پێشکەوتنخواز و نیشتمانپەروەر تەنیا بەنهێنی دەیتوانی هەناسە بدا، بەڵام شیعری شاعیرانی نیشتمانپەروەری کورد ڕێگەی خۆیان دەدۆزییەوە و دەگەیشتنە میللەت. بەدەست دەنووسرانەوە و لەبەر دەکران، خەڵکی بەئەزبەر بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە، لە ڕۆژنامە و گۆواری نهێنی بڵاو دەکرانەوە، ئەوەی بیویستایە ئاگاداری ئەو شیعرە قەدەغەکراوانە بێ بەئاسانی دەستی دەکەوت.

لە ساڵی ١٩٤٦ لە ئێران کۆماری دیمۆکراتی کوردستان دروست بوو. هەڵسوکەوتێکی لەباری وا کەوتە ناوەوە خوێندەواری و ڕۆشنبیری بەگشتی و ئەدەبی کوردی بەتایبەتی ماوەی پەرەسەندن و گۆڕانی بۆ هەڵکەوێ. لەبەرئەوە بوو لە ماوەیێکی کەمدا ئەدەبی کوردی لە کوردستانی ئێراندا هەنگاوی گرنگی هاوێشت بۆ پێشەوە. ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ ئەوەیە نوێنەرانی ئەدەبی نیشتمانی پێشکەوتووی کوردی عیراق و ئێران هەوڵیان دەدا پێوەندی لەگەڵ یەکتریدا پەیدا بکەن. ڕۆژنامە و گۆواری کوردی لە عیراقدا لاپەڕەکانیان کردبووەوە بۆ شاعیرانی کوردی ئێران، هەروەها پێچەوانەش دەکەوتە بەرچاو. لە پاش دامرکاندنەوەی بزووتنەوەی نەتەوەیی دیمۆکراتی لە عیراقدا لە ساڵانی ١٩٤٣ – ١٩٤٥ دەست کرا بەگرتن و ڕاونانی نیشتمانپەروەرانی کورد. لەو ماوەیەدا بەناوی یەکێتیی نەتەوە و یەکێتیی خەبات چاپەمەنی کۆماری دیمۆکراتی کوردستانی ئێران گەلێ بەرهەمی شاعیرانی کوردستانی عیراقی بڵاو دەکردەوە، وەکو شیعری پیرەمێرد و بێکەس و فانی و قانیع و هی دیکە.

### ڕۆمانتیزم

ڕێبازی ڕۆمانتیکی بەناوەرۆک لە ئەدەبی کوردیدا لە پاش جەنگی دووەمی گێتیدا، لە ژێر کاریگەری ڕۆمانتیکی ئەوروپا جێی خۆی گرت. ئەو شاعیرانەی بەشدارییان لە پەیدابوونی ئەم ڕێبازە نوێیەدا کرد نووری شێخ ساڵح و گۆران و ڕەشید نەجیب و پیرەمێرد و بێکەس و سەلام و دڵدار و هی دیکە بوون. بەڵام پێویستە ئەوە بزانرێ لە بەرهەمی هەندێ لەم شاعیرانەدا دەبێ ڕۆمانتیزم وا تەماشا بکرێ وەکو جەوهەرێک لە جەوهەرەکانی شێوازی هونەری، واتە ئەو جۆرە شیعرانە ماکی ڕۆمانتیکییان تێدایە و لە

قۆناغی تاقیکردنەوە دان. ڕۆمانتیکێک وەک ناوەڕۆک لە شیعری هەردیدا دەبینرێ. بەرهەمی هەردی لە دیوانی «ڕازی تەنیایی»دا ڕەسەن و نوێ و داهێنراوە، ڕیتم و مۆسیقای ڕەوان بەڕێوەیان دەبا، هەردی وەستایانە توانای ئەوەی هەبوو بە وشە وێنەی هەستی ناوەوەی ئادەمزاد بکێشێ. دیارە ئەمە ڕاستییە با شیعرەکانی تارمایی ڕەشبینی تێیدا بجوولێتەوە.

شاعیر باش دەزانێ دڵداری کارێکی بێ نرخە لە کۆمەڵی دواکەوتوودا، وا پیشان دەدا دڵداری بۆ چاکەی دەوڵەمەندانە، ئەمە ئەو دڵدارییەیە بازرگانی پێوە دەکرێ. بێ گومان لە ناو کۆمەڵی هەژاراندا هەستی بەرزی پاک و بێ گەرد هەیە بەرامبەر بەدڵداری، وەک لە بەندی یەکەمی شیعری «چەپکە گوڵێک بۆ ست فاتیمە» و هی دیکەی دەردەکەوێ.

بەرهەمی هەردی و شاعیرانی دیکەی کورد کە بەگیانێکی ڕۆمانتیکییانە هاتبوونە ناوەوە کارێکی گەورەیان کردە سەر گۆڕانی ئەدەبی کوردی. ئەمانە شیعری کوردییان لە چوارچێوەی دوان (خەتابە) و ڕەوانبێژی و دەستوورەکانی کۆنی دیکەی شیعری کوردی دەرهێنا و پێوەندییێکی بەهێزیان لەگەڵ هەستی ناوەوەی ئادەمزاد پەیدا کرد. لە سەرەتادا بەرهەمی ڕۆمانتیکی کاری لە خەڵکی نەدەکرد، چونکە زۆربەی خوێنەران تێی نەدەگەیشتن، زیاتر لەبەرئەوە بوو چونکە وشەی زۆری ئەوتۆ بەکار دەهێنرا کە لە ناو خەڵکیدا باو نەبوون، بەڵام بەهۆی ئەو جۆرە بەرهەمانەوە لێکسیکۆنی تازە لە دواییدا خۆی گرت و بەشێوەییێکی فراوان لە ناو خوێنەر و خوێندەوارانی کورد بڵاو بووەوە، بەمە شیعری کوردی باڵاتر و دەوڵەمەندتر بوو.

## ڕیالیزم

لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتیدا بەرهەمی شیعری ڕیالیزمی نوێ پەیدا بوو. لە ناو ڕەگ و ڕیشەی ئەم جۆرە هونەرەدا خوێنی بابەتە ڕیالیزمێکی نوێ دەگەڕا. لە پێش ماوەی چلەکاندا ڕیالیزم وەکو ڕێباز و قوتابخانە لە ئەدەبی کوردیدا هێشتا دروست نەبووبوو. ڕاستتر ئەوەیە بوترێ جەوهەر و هەوێنی ڕیالیزم لە ناو بەرهەمی ڕۆمانتیکی ئەو سەردەمەدا هەبوو. بەهێزبوونی بیروباوەڕی دیمۆکراتی و مرۆڤایەتی و ئەنتەرناسیۆنالیزمی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کارێکی گەورەی کردە سەر گۆڕان و پەروەردەی ڕێبازی ڕیالیزمی لە ئەدەبی کوردیدا. لە چلەکاندا لەو کاتەی ئەدەب ڕەنگدانەوەی مەسەلەی ناگزووریی کۆمەڵایەتی و خەباتی ڕزگاریی نەتەوایەتی بوو شیعری ڕیالیزمی خۆی گرت و پتەوتر بوو.



کاروانی دامەزراندنی دامودەسگای ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیدا بەهەنگاوی ورد و لەسەرخۆ و بەهێمنی بەڕێوە دەچوو. یەکێ لە هۆیەکانی ئەمە بەهێزی شیعری لاسایی کلاسیکی بوو. شکاندنی کلاسیک ئەوەی لە ماوەی سەدانساڵ دروست بووبوو و چووبووە ناو ناخی هۆشی خوێندەواری کوردەوە کارێکی ئاسان نەبوو. لە سەرەتادا شاعیران تەنیا هەوڵیان دەدا دەسکاری ناوەڕۆکی شیعر بکەن، نەیاندەتوانی لە ڕوخسار و شێوەی کلاسیکیی کۆن لابدەن. لە ئەنجامی ئەمە بەرهەمی شاعیرانی ئەم قۆناغە دەکرێ لە سووچی هەرسێ ڕێبازی شیعری کلاسیکی و ڕۆمانتیکی و ڕیالیزمییەوە تەماشا بکرێ، واتە لە بەرهەمی ئەمانە جەوهەری هەرسێ ڕێبازەکە بەدی دەکرێ.

لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا لە مەیدانی ئەدەبی کوردی دوو نەوە لە نووسەران لە کاردا بوو. نەوەی لاو یاخود نوێ، ئەمانە بەگیانی نیشتمانپەروەری و ئەنتەرناسیونالیزمی پەروەردە بووبوون؛ نەوەی پیر یاخود کۆن ئەمانە لە بیست ساڵ یا سی ساڵیش پێشتر هاتبوونە ناو ئەم مەیدانەوە. گەلێ لەم نووسەرانە زەحمەتێکی زۆریان کێشا لە وەرگرتنی بیروباوەڕی نوێ، بەڵام هەرچۆنێ بێ نوێگەری توانی بچێتە ناو بەرهەمیانەوە و بەشدارییان لە گۆڕانی ئەدەبی کوردیدا کرد.

ناوەڕۆکی بنچینەیی لە بەرهەمی نووسەرانی کوردی عیراق و ئێران و سووریا و قەفقاسی ڕووسیا بەدرێژایی ئەو قۆناغەی باسی لێوە دەکرێ بابەتی نیشتمانپەروەرییە. ئەدەب بەگیانێکی بەرزەوە وێنەی ئامانجی نەتەوە دەکێشێ و هێزی کین و تووڕەیی بەرامبەر بەزۆرداران دەئاخنێتە ناو مێشک و دڵی میللەتەوە، ئەم ناوەڕۆکە بەهەناسەییێکی شۆڕشگێڕانە خۆی پیشان دەدا، پێوەندییێکی تەواوی لەگەڵ بیروباوەڕی دیمۆکراتی هەیە، ئەوەی دەبێ ببێ بەیاسای کۆمەڵ. ئەم بابەتانە لە زۆربەی بەرهەمی شاعیرانی ئەم قۆناغە ڕەنگیان داوەتەوە.

لەو ڕۆژگارەدا ئەدەب زیاتر چۆتە ناو تەنگوچەڵەمە و ناگزووریی کۆمەڵایەتییەوە. کچ و ژنی کورد هان دەدا بەرەو فێربوون و خوێندن بچن، ئاراستەی ئەوەیان دەکا کار بکەن. لەم لایەنەوە شاعیرێکی وەکو مفتی پێنجوینی لە شیعری «ئامۆژگاری بۆ کچەکەم»دا، کچی خۆی هان دەدا پێویستە کار بکا. لەبەرئەوەی لەم دەورەدا هێشتا ژنی کورد نەهاتبووە ناو مەیدانی کۆمەڵایەتییەوە، کارگە و فابریقە لە ناوەوە نەبوون، تەنیا هەندێ پیشەسازی ساکار و سەرەتایی نەبێ، لەبەرئەوەیە شاعیر بەناوی کچەکەی خۆیەوە، هەموو کچ و ژنی کورد هان دەدا خەریکی ئەو پیشەسازییە ساکارە سەرەتاییە بن.

شاعیری کورد زمانی ڕاستەقینەی ناو دڵی میللەت بوو. بەڕق و کینەوە زەبروزەنگی دەسەڵاتی نێوەندی عیراقی سەر بەئەمپریالیستی ئینگلیزی دەخستە ڕوو. خەڵکی کوردی بانگ دەکرد شتومەکی پیشەسازی ئەوروپاییان نەکڕن، بازاڕی کوردستان بووبووە مەیدانی فرۆشتنی سڕ و سیپاڵی بەکارهێنراوی بێ کەڵک بەنرخێکی هەرزان. شاعیر کوردی هان دەدا هەڵمەت بەرێ، داوای مافی خۆی بکا، کاروانی خەبات لە ڕێگەیە، بەڵام نەگەیشتۆتە ئەنجام. ئەو شاعیرانە چیای ئەفسانەیی قافیان کردووە بەدوا مەنزڵی خەبات، وا لە خەڵکی دەگەیەنن زۆری نەماوە بگەن بەو شاخە. هەموو بەرهەمەکانی لەم بابەتە بەهەناسەییێکی گەشبینی نووسراونەتەوە، مژدەی سەرکەوتن دەدەن بەهەموو ڕۆڵەکانی میللەتی کورد.

## پەخشانی هونەری

قۆناغی دوای جەنگی دووەمی گێتی ماوەییێکی یەکجار گرنگ و بەبەر بوو لە مێژووی گۆڕانی پەخشانی هونەری کوردی. لەم ڕۆژگارەدا پەخشان بەتەواوی لەسەر پێ وەستا و بوو بەئاوزەی شیعر. لەو ساڵانەدا بابەتەکانی وتاری ئەدەبی و چیرۆک پەرەیان سەند، شێوازی دەربڕینی ڕیالیزمی بەرامبەر بەڕووداوی ڕاستی جێی خۆی لە وشەی هونەریدا دۆزییەوە. مەشقی زمانی پەخشانی هونەری کوردی بەڕاستی دەستی پێ کرد، لە گەلێ شتی کۆنی لاسایی ڕەوانبێژی خۆی ڕزگار کرد.

هەڵسوکەوتی بڵاوکردنەوەی پەخشانی کوردی لەم ساڵانەدا نەگۆڕا، هەروەکو پێشان بەرهەمی پەخشانی بەگشتی لە کۆوار و ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەکرایەوە. لە ناوەڕاستی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەم وتاری چیرۆک ئامێز ناوبانگی تەواوی پەیدا کرد و بەشێوەییێکی فراوان بڵاو بووەوە. بەگشتی ئەم جۆرە هونەرە پەخشانییە بۆ کۆمەڵێکی گەورە لە خەڵکی دەنووسرایەوە، لەبەرئەوە هەر دەهات و ساکارتر دەبوو لە ڕووی داڕشتنی ڕستە و بەکارهێنانی وشەی زمانەوە.

لەم ماوەیەدا چیرۆکی کورت سەرکەوتووانە بەردەوام بوو، لە ناو ڕیزی خوێندەواران دەنگ و ناوبانگی پەیدا کردبوو. کۆمەڵێک نووسەری لاو لە گێتیی ئەدەبی کوردیدا پەیدابوون. ئەمانە بەزۆری خەریکی بەرهەمی ئەدەبی بابەتەکانی پەخشان بوون و ناویان بەنووسەر دەرکردبوو، لەمانە: موحەڕەم محەمەدئەمین، جەمال عەبدولقادر بابان، مستەفا



سالّح کەریم، محەمەد مەولوود (مەم)، مارف بەرزنجی، حوسێن عارف، ڕەحیم قازی و هی دیکە. بێ گومان نەوەی پێش ئەوانیش بەردەوام بوون، وەکو پیرەمێرد، سەلام، ئیبراهیم ئەحمەد، عەلائەدین سەجادی، شاکر فەتاح و هی دیکە.

چیرۆکی قۆناغی دوای جەنگی دووەمی گێتی لە ڕووی ڕوخسارەوە جیاواز بوو لەگەڵ وتارە چیرۆک و چیرۆکەکانی قۆناغی پێشووتر. ئەوان زیاتر ڕەچاوی بزووتنەوەی دینامێکی و ناوەرۆکی قووڵی پڕ لە تەنگوچەڵەمە مەبەسیان بوو. بەشێوەییێکی گشتی چیرۆکی کوردی ئەم قۆناغە و قۆناغی پێشووتر دەچووە ناو گیروگرفتی بەسەرهاتی ڕۆژانەی سیاسی و ڕووداوی کۆمەڵایەتی. لە ڕووی پیشاندان و گێڕانەوە شێوەی ڕیپۆرتاجی ڕۆژنامەگەری وەرگرتبوو.

نموونەی ئەم جۆرە چیرۆکانە لە بەرهەمی جەمال بابان دەدۆزرێنەوە، بەتایبەتی ئەو چیرۆکانەی لە دوو توێی کۆکراوەی «خانزاد» (١٩٥٧) بڵاوکراونەتەوە. ئەم چیرۆکانە بەهەناسەییێکی ڕۆژنامەگەری نووسراونەتەوە و وێنەی هەندێ لایەنی ژیانی کوردەواری دەکێشن. لە چیرۆکی «پەڵە هەورێکی چڵکن»دا (١٩٥٨) نووسەر باس لە لافاوێکی سلێمانی دەکا، تاوانی ڕوودانی لافاوەکە دەخاتە سەر شانی میری. دەسەڵات دەیتوانی بەرهەڵستی ئەو لافاوە و کارەساتە بکا ئەگەر بەنداوێکی دروست بکردایە.

نووسەر مستەفا سالّح کەریم لە چیرۆکی «زڕەی زنجیر»دا (١٩٥٩) لە شێوەی ڕیپۆرتاجێکی هونەری باس لە ژیانی قورسی شۆڕشگێڕ دەکا لە عیراقی سەردەمی فەرمانڕەوایی مەلیک. بەهۆی چیرۆکەکانی دیکەیەوە نووسەر باس لە تەنگوچەڵەمەی نایەکسانی دەکا لە کۆمەڵی دواکەوتوودا.

چیرۆکی درێژ و ڕۆمان لە ئەدەبی کوردیدا لە ناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا پێش جەنگی دووەمی گێتی سەری هەڵدا. لە ژێر کاریگەریی ئەوان ڕەحیم قازی ڕۆمانی «پێشمەرگە»ی نووسییەوە، ئەم کارە ئەدەبییە، مەرجەکانی دانانی چیرۆک و ڕۆمانی تێدا هەیە. نووسەر بەشێوەییێکی ڕیالیزمییانە وێنەی ڕێگەی قورسی مێژووی کۆماری کوردستان (١٩٤٦) لە ئێرانا دەکێشی، ئەوەی بەیارمەتیی هێزی بەتوانای ڕووسیا و ئەمەریکا و بەریتانیا بۆ دەسەڵاتی شای ئێران کۆتایی پێ هات. دانەر باس لە بزووتنەوەی جووتیاران دەکا، هەروەها دەوری ڕێکخراوی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی ڕوون دەکاتەوە لە دامەزراندنی کۆمار. ئینجا تاوان و خەیانەتی دەرەبەگە کوردە خۆفرۆشەکان دەخاتە ڕوو.

لەم ساڵانەدا بابەتێکی گرنگ لە پەخشانی ئەدەبی کوردیدا پەیدا بوو، پارچە نووسینێکی کورت سەرچاوەی لە ئەدەبی میللی سەرزار (فۆلکلۆر) وەردەگرێ. ئەدەبی میللەتانی ئەوروپا ئەم جۆرە وتارە یا چیرۆکانەیان ناوناوە «ئەلیگۆری». ئەم بابەتە زوو بڵاوبووەوە و بەشەوقەوە خوێندەواری کورد پێشوازی دەکرد. دەتوانرێ ناوی محەمەد مستەفا کوردی بخرێتە جێگەییێکی دیار لەوانەی خەریکی نووسینەوەی ئەم بابەتە هونەرە بوون لە ئەدەبی کوردیدا. لەسەر بنج و بناوانی قسەی نەستەقی «نە بەکاووڕی تێر شیر بووم نە بەمەڕی تێر گیا» (١٩٦٠) نووسەر وتارێکی داشۆرین و ڕەخنەی سیاسی (پامفلیت) دروست کردووە لە بابەت ڕووداوەکانی جەنگی یەکەمی گێتی. نووسەر ئەوە دەردەبڕی دەسەڵاتی عوسمانی لە ژێر دروشمی «جەنگی پیرۆز» خەڵکی دەناردە مەیدانی کوشتن، جەندرمەی عوسمانی ماڵیان تاڵان دەکرد و دێهاتیان دەسووتاند. لەو سەردەمەدا نووسەر منداڵێکی بچووک بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەی سەردەمێکی درێژ تێپەڕی کرد کەچی تا ئێستاش ڕۆڵەی نەتەوەی کورد ناڵەناڵیانە لە ئەنجامی زوڵم و زۆری بێگانە.

ماوەی دوای جەنگی دووەمی گێتی قۆناغی خەباتی نەتەوەی کورد بوو لە پێناوی مافی مرۆڤایەتی و چارەنووسی نەتەوەی خۆی. لەم گەشتەدا خوێنەر دەتوانێ هەندێ مێشک و خەیاڵی گوڵاو پژێن بکا بەو بەڵگە و نموونانەی لە بەشەکانی ژیان و بەرهەمی نووسەر و شاعیرانی ئەم کتێبە هێنراونەتەوە.



# ڕەنگدانەوەی ڕووداوی ئەفسانەیی
# و
# مێژوویی لە ئەدەبدا

## (١) ڕەنگدانەوەی ڕووداوی ئەفسانەیی

یەکێ لە ئەدگارە گرنگەکانی ئەدەبی کوردی ئەو ماوەیەی باسی لێوە دەکرێ ئەوە بوو نووسەر و شاعیران ئاوڕیان لە ڕابردووی مێژووی پڕ شانازیی میللەتی کورد دەدایەوە. ئەو ڕابردووە دەوڵەمەند بووە بەڕووداوی گرنگ و قارەمانی ئازای بێ وێنە. حیکایەتی کۆنی کوردی لە بابەت شەڕوشۆڕە قارەمانییەکانی میللەتی کورد لە پێناوی ئازادی و سەربەستیدا بەمردنی زۆردار و سەرکەوتنی ڕاستی و یەکسانی کۆتاییان هاتووە. گێڕانەوەی خەباتی بەهێز و بێ وچانی میللەتی کورد لە دژی بێگانە و زۆرداران لە چلەکان و سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەم جارێکی دیکە مانای سیاسی تازە دەدا بەدەستەوە لە ژیانی دووەمیدا. گەڕانەوە بۆ دواوە، بۆ مێژووی کۆن و زیندووکردنەوەی لە قاڵبی ئەدەبی نوێدا لە سییەکاندا لە شیعر ڕەنگی دابووەوە، بەڵام لە دواییدا لە قاڵبی هەموو بابەتە تازەکانی دیکەی ئەدەب بەتایبەتی پەخشان ڕەنگی دایەوە. قەسیدە و لیریک و چیرۆک و چیرۆکی ناوەنجی (پۆڤیست) و درامای شیعری بابەت و ناوەرۆکیان لە ئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) وەردەگرت. بەڕاستی ئەمە سەرچاوەییێکی ئاودار و هەمیشەیی و لە بن نەهاتوو بوو بۆ ئەم مەبەسە.

## نەورۆز و کاوەی ئاسنگەر

یەکێ لە گێڕانەوە هەرە گرنگ و بەناوبانگی ناو کوردەواری ئەو حیکایەت و ئەفسانانەن لە بابەت کاوەی ئاسنگەر و نەورۆزەوە. دیارکردنی سەردەمی پەیدابوونی ئەم حیکایەتە کارێکی ئاسان نییە. بەڵام ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە لە ڕۆژگارانی قۆناغی دیلییەتی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا پەیدا بووە. یەکەمین سەرچاوەی نووسراو لە بابەت کاوەی ئاسنگەر و جەژنی نەورۆزەوە کتێبی «شانامە»ی فیردەوسییە (سەدەی دەیەمی مەسیحی).

شاهنشای زۆردار زەحاک، وەکو فیردەوسی دەیگێڕێتەوە، تووشی نەخۆشییێکی قورسی

سەیری ئەفسانەیی بوو. لەسەر هەردوو شانی دوو مار شین بووبوون، لەسەر مێشکی ئادەمزاد دەژیان. زەحاک فەرمانی دەرکردبوو هەموو ڕۆژێ سەری دوو مێردمنداڵ ببڕن و مێشکیان دەربێنن بۆ ئەوەی ببێ بەخۆراکی مارەکان. وەزیرە دڵسۆزەکانی زەحاک ئەرماییل و گەرماییل لەباتی یەکێ لە لاوەکان کاووڕێکیان سەر دەبڕی. ئەوانەی لەم کارە ڕزگارییان دەبوو لە جێگەیێکی نهێنی دەشاررانەوە. بەدرێژایی ڕۆژگار بوون بەکۆمەڵە خەڵکێک ژمارەیان دوو سەد کەس بوو، لەمانە نەتەوەی کوردی گوردی نەبەردی چاونەترس پەیدا بوو، وەکو شانامە بۆمانی دەگێڕێتەوە:

کنون کرد أز آن تخمه  دارد نژاد
کـــــه ز آباد نايد بدل برش ياد

بەکوردی:

کوردی ئێستەکە لەمانەن نەژاد
کە ئاوەدانیان بەدڵ ناکەن یاد

بەپێی گێڕانەوەی ئەفسانە سی و نۆ کوڕی کاوەی ئاسنگەر بوون بەقوربانی؛ کە سەرە گەیشتە سەر چلەمین، دوا کوڕی بوو، مامەی ئاسنگەر خەڵکی هەڵساند و هێرشیان بردە سەر کۆشک و سەرای شاهنشا. سەری سەرۆکی زۆرداری ورد و خاش کرد، لە جێی زەحاکی زۆردار فەرەیدوونی دڵسۆز و دادپەروەر کرا بە شا و لەسەر تەخت دانیشت.

حیکایەتی میللیی سەرزاری کوردی بەسەرهاتی زەحاکی زۆردار و قارەمانیەتی کاوەی ئاسنگەری پاراستووە بەناوەرۆک و گێڕانەوەیێک لە شانامەوە نزیکە، بەڵام حیکایەتەکانی کوردی لەم بابەتەوە زۆر کۆنترن لە سەردەمی ژیانی فیردەوسی، ئەم شاعیرەش لەو سەرچاوە میللی و سەرزارییانەی وەرگرتووە کە لە ناو نەتەوە ئێرانی و هیندۆئێرانییەکاندا باوبوون. ئەمە لە لایێک، لە لاییێکی دیکەوە حیکایەتی داستانی میللی کوردی هەڵسانی کاوەی ئاسنگەر و کوشتنی زەحاکی زۆردار بەپەیدابوونی جەژنی نەورۆزی میللی دەبەستێتەوە، بەو مانایەی نەورۆز نەوەکو تەنیا جەژنی بەهارە بەڵکو جەژنی سەرکەوتنی کوردیشە لە دژی بێگانەی زۆردار کە لە ئەدگاری زەحاکدا خۆی دەنوێنێ.

فیردەوسی باس لە جەژنی نەورۆزی پێش ئیسلامیش دەکا لە شانامەدا لەو فەسڵەی کە باس لە شاهنشاهییەتی شای چوارەمی ئەفسانەیی جەمشید دەکا، ئەوەی لە سەردەمی



پێش زەحاک فەرمانڕەوایی خاکی ئێرانی کۆنی کردبوو. بەجێهێنانی ڕێوڕەسمی نەورۆز وەکو جەژنێک لە لایەن زۆربەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا پاش بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش هەر مایەوە و تا ئێستاش ماوەتەوە. لە لای عەجەم و کوردی شیعە نەورۆز وەکو دیاردەیێکی ئایینی موسوڵمانی و ئایینزای شیعە خۆی دەنوێنێ، واتە جەژنێکی ئایینییە.

لە ئەدەبی میللیی سەرزاری خەڵکی کورد (فۆلکلۆر) و ئەدەبی کلاسیکی نووسراو ئەو ڕووداوانەی پێوەندییان بەنەورۆز و کاوەی ئاسنگەرەوە هەیە بەیەکترییەوە بەستراون، لە پێش گێڕانەوەی بەسەرهاتی کاوەی ئاسنگەر نەورۆز تەنیا جەژنی بەهار بوو، لە پاش کاوە بوو بەجەژنی سەرکەوتنیش، لەبەرئەوە لای کورد نەورۆز جەژنێکی نەتەوەیییە.

ڕۆژی هەڵسانی کاوەی ئاسنگەر، کوڕی بەئەمەگی خەڵکی ڕەنجبەر و زەحمەتکێش، کە دەستی لە شای زۆردار بڵند کرد، ئەو ڕۆژە بەپێی گێڕانەوەی ئەفسانەی ناو خەڵک بوو بەجەژنێکی نەتەوەیی بەناوی نەورۆزەوە. ڕۆژی ٢١ی ئاداری ڕۆژژمێری مەسیحی ڕۆژی یەکەمی ڕۆژژمێری کۆنی پێش مەسیحە و یەکەمین ڕۆژی سەریساڵی تازەیان بووە، بۆیە ناویان ناوە «نەورۆز» واتە «ڕۆژی نوێ».

لە سەردەمی ئێستادا لەو کاتەی بزووتنەوەی کوردایەتی لە ناو دڵ و مێشکی خەڵکی کوردا چەسپیوە، نەورۆز بووە بەجەژنی بەهار و ئازادی. هەر لەبەرئەوەش بوو هێزی ڕەشی دواکەوتوو هەوڵی دەدا ئەم جەژنەیە قەدەغە بکا و نەهێڵێ خەڵکی ئاهەنگ و زەماوەندی بۆ بگێڕن. بەڵام کورد هەمیشە نەورۆزی خۆی کردووە و ئاهەنگەکانی خستۆتە قاڵبێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە.

لە پاش کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا دەسەڵاتی تازەی عیراق بەڕەسمی دانی بەجەژنی نەورۆز هێنا وەکو جەژنێکی دەوڵەتی لە هەموو عیراقدا. ئەم بڕیارە بۆ ماوەیێکی کەم بڕی کرد. دەسەڵاتی عیراق دەیویست دان بەهەندێ لایەنی ئەم جەژنەیە نەهێنێ، وەک لایەنە قارەمانییەکەی کاوەی ئاسنگەر و سەری ساڵی تازە، بەڵکو نەورۆز بەلایەنی کشتوکاڵ و شینایی ببەستێتەوە. بەم جۆرە ناوی جەژنەکەیان نا «جەژنی دار و درەخت». لەم کارەدا خەیاڵیان خاو بوو و خەڵکی کورد نەورۆزی ڕاستەقینەی خۆیان هەمیشە کردووە و لە دواڕۆژیشدا دەیکەن.

**شانۆگەری**

نووسەر جەمال عەبدولقادر بابان پیەسێکی پەخشانی بەناوی «نەورۆز» (١٩٦٠) نووسیوەتەوە. قارەمانی پیەسەکە لە حیکایەتی ئەفسانەیی فۆلکلۆری وەرگیراوە. نووسەر ئەکتەرێکی تازەش دروست دەکا، ژنێکە ناوی کەلاوزەڕ. ئەوەی شای زۆردار ئەژدەهاک بەزۆر خستبوویە پاڵ خۆی. نووسەر بەشێوەییێکی کاریگەر زۆرداریی شا پیشان دەدا.

پەردەی یەکەم، مۆنۆلۆجی ئەژدەهاکە (لەگەڵ خۆی قسە دەکا)، لێرەدا گیانی زوڵم و ڕق و کینی بەرامبەر بەمیللەت پیشان دەدا، باش دەزانێ میللەت بەوە قایل نییە هەموو ڕۆژێک مێشکی دوو ڕۆڵەی خۆشەویستی بکاتە خۆراکی ئەو مارانەی کە هەرگیز تێر نابن. ئەژدەهاک دەقیرێنێ و بەم جۆرە دەست بەقسە دەکا: فەرمان دەردەکەم، پێویستە هەموو ڕۆژێ لەباتی دوو کەس چوار کەس سەر ببڕێن! مێشکی دووانیان بدرێتە مارەکان و مێشکی ئەوانی تریش بدرێتە سەگەکانی کۆشک و سەرا!

لەم ئانەدا کۆترێکی سپی خۆی دەکاتە ناو کۆشک و سەرا، لە دەوری شای زۆردار دەسووڕێتەوە و لەنجە دەکا. شا دەقیژێنێ و فەرمان دەردەکا: زوو ئەم کۆترە بگرن، سەری هەڵکەنن! هەڵۆ بێنن بۆ ئەوەی لەشی شەق و پەق بکا، کوندەبوو بێنن بۆ ئەوەی چاوی بکۆڵێ.

پەیدابوونی کۆتری سپی ڕەمز و نیشانەی ئەوەیە دەسەڵاتی زۆرداری لەناودەچێ و ئاشتی باڵی بەسەر هەموو زەویدا دەگرێ.

پەردەی دووەم، لە ماڵێکی هەژاری دەرەوەی شار کۆبوونەوەییێکی نهێنی دەبەسترێ، لە کۆبوونەوەکەدا خاوەن ماڵ کە ناوی فەرهادە لەگەڵ فەرەیدوونی هاوڕێی کاوەی ئاسنگەر و گیوی دارتاش و بەرزۆی بازرگان بەشدار دەبن. لە بابەت هەڵسوکەوتی نالەبار و پڕ ئەندێشەی نەتەوە دەدوێن، باس لە کارەساتی کاوە دەکەن لە چل کوڕی سی و نۆی سەربڕان و سەرە هاتۆتە سەر چلەمین بۆ سەر بڕین.

پەردەی سێیەم، خەڵکێکی زۆر لە گۆڕەپانی ناوەندی شار کۆ دەبنەوە، لێرەدا تەنیا هەژارانی شار بەشدارییان نەکردووە، بەڵکو جووتیار و ڕەنجبەری گوندەکانی دەوروبەریش. ڕۆژی یەکەمی نەورۆز بوو ٢١ی مارتی ساڵی ٦١٢ی پێش مەسیح. خەڵکەکە زرێی ئاسنیان لەبەر کردبوو، بە شیر و تیروکەوان و ڕم و خەنجەر خۆیان پڕ چەک کردبوو. فەرەیدوون ڕووی کردە خەڵکەکە و لێی پرسین: ئێوەی شێری شاخەکانی کوردستان، هاوڕێیانمان لە ئێران و مازەندەران! لەبەرچی ئێمە ئەمڕۆ لێرە کۆبووینەتەوە؟! بەشێک هاوار دەکەن و دەڵێن بۆ ئەوە کۆبووینەتەوە ئاگری نەورۆز هەڵگیرسێنین. بەشەکەی دیکە دەڵێن بۆ ئەوە کۆبووینەتەوە باس لە ژیانی پڕ لە شپرزەیی و نائومێدیی خۆمان بکەین.

پەردەی چوارەم، کاوەی ئاسنگەر لە کۆشک و سەرادا لەگەڵ ئەژدەهاک دەدوێ وەکو نوێنەرێک لە لایەن میللەتەوە نێرراوە. باس لە سەربڕینی سی و نۆ کوڕی خۆی دەکا، تکا لە ئەژدەهاک دەکا لە دوا کوڕی ببەخشێ. بەڵام شای زۆردار فەرمان دەردەکا نەوەکو تەنیا دوا کوڕی کاوە سەر ببڕێ بەڵکو سەری خۆشی ببڕن. کاوە کە فەرمانی ئەژدەهاک دەبیستێ هێرش دەباتە سەری و بەچەکوشی ئاسنگەری سەری زۆردار ورد و خاش دەکا. ئەژدەهاک دەتۆپێ، میللەت هێرش دەباتە سەر کۆشک و سەرا. کاوە ڕوو دەکاتە خەڵکی و داوایان لێ دەکا کۆشک و سەرا نەڕووخێنن، چونکە لەوەدەمەدا هەموو ماڵ و سامان و دەوڵەت و دەوڵەمەندی دەبێتە هی میللەت.

میللەتی شۆڕشگێڕ کلاوزەڕ و هەموو خەڵکی زەحمەتکێشیان لە زۆرداری ڕزگار کرد. کاوەی ئاسنگەر و کەلاوزەڕ سەرکەوتنە سەر بانی کۆشک و سەرا بۆ ئەوەی ئاڵای ئەژدەهاکی زۆردار لەتوپەت بکەن و فڕێی دەنە خوارەوە و بەپێ بیشێلن. هەر لەوێ دەست دەکەن بەگفتوگۆ بۆ دیارکردنی ئاڵای نوێ بۆ میللەت. کلاوزەڕ پێشنیاز دەکا بەروانکەی ئاسنگەری کاوە بکرێتە ئاڵا بۆ ئەوەی ببێ بەڕەمز و دروشمی دەوڵەتی کاویانی.

پەردەی دوایی، دادگای گەڵ دادەنیشێ بۆ دادگاکردنی تاوانبار و ترسنۆک و نیشتمانفرۆشان، هەروەها بۆ ڕێزلێنان لە یادی پیرۆزی ئەو کەسانەی لە پێناوی ئازادی نەتەوەدا خوێنی خۆیان ڕشتووە، یا ئەو کەسانەی ماون و بەڵام قارەمانانە جەنگاون و کردەوەی چاکیان بۆ کۆمەڵ بووە. لەمانە وەزیری شا گەرماییل زۆر کەسی لە مردن ڕزگار کردبوو. ئەمە بوو بەدروشمی پیاوچاکی و بەڕێزەوە لە لایەن دەسەڵاتی تازەوە تەماشا دەکرا.

لە کۆتایی پیەسەکەدا کلاوزەڕ پەنجە بۆ ئەو ئاگرە درێژ دەکا لە دوورەوە دیارە و پیشانی خەڵکی دەدا: ئەمە دروشمی هاتنی نەورۆزە، ئەم ئاگرە لە لایەن ئەو لاو و مێردمنداڵانەدا کراوەتەوە کە گەرماییل لە مردن ڕزگاری کردوون.

## دراماى شیعرى

شاعیر و نووسەرێکی دیکەی کورد زەکی ئەحمەد هەناری دراماییێکی شیعری گەورەی نووسیوەتەوە بەناوی «دوارۆژی دەئاکی زۆردار» (١٩٦٠). ئەم شانۆگەرییە لە هەشت پەردە پێکهاتووە. هەر پەردەی چەند دیمەنێکە و کۆمەڵێک ئەکتەر بەشدارییان تێدا کردووە. ئەمانە هەموویان قارەمانی گشتیی حیکایەتی میللی ئەدەبی نەنووسراو (فۆلکلۆری) کوردی و داستانی «شانامە»ی فیردەوسین. شاعیر هەوڵیداوە وێنەی هەرە کۆنی ڕابردوو بخاتە ڕوو و بەپێی توانا ڕووداوەکان یەک لە دوای یەک پیشان بدا. ڕووداوی ئەفسانەیی لە لای زەکی ئەحمەد هەناری لە شێوازی ڕیالیزم خۆی دەنوێنێ، وەکو ڕووداوێکی مێژوویی دەکەوێتە بەرچاو. بەڕوونی وێنەکان بەجۆرێک دەکێشێ وەکو ئێستا ڕوویان دابێ لە بابەت کێشەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەهەموو تەنگوچەڵەمە و ناگزوورییە دژوارەکانیانەوە.

ئەم درامایە باس لەوە دەکا، ئەژدەهاک تەختی شایەتی بەزۆر لە فەرەیدوون داگیر کردووە و شازادەی گەورەی خستۆتە بەندیخانەوە. هەروەها هەردوو خوشکە شازادە جوانەکانی شەهرناز و ئەرنەوازی خستوونەتە پاڵ خۆی و کردوونی بەقەپاتمە. لە دوای تێکدانی تەخت و تاراجی ئەژدەهاک شۆڕشگێڕەکان بەسەرۆکایەتی کاوەی ئاسنگەر هێرشیان بردبووە سەر ئەژدەهاک و فەرەیدوونیان بەسەرەک کۆمار هەڵبژاردبوو.

ئەم پیەسە بەشێوەییێکی سەیری سەرنج ڕاکێشەر ناوەرۆکی حیکایەتی ئەفسانەیی کۆن دەژیێنێتەوە. ئەم کارە ئەدەبییە گەورەیە لە سەرەتاوە تا دوایی هەموو دێڕە شیعرەکانی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی دە بڕگەیی جووت قافیە (مەسنەوی) دانراون، ئەم سیستێمە بۆ شیعری کلاسیکی کۆن بەجێ بوو، بەڵام گوێی خوێنەری تازە هەندێ ماندوو دەکا، لە چەند جێگەییێکیشدا هەستی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕاناکێشێ.

## (٢) ڕەنگدانەوەی ڕووداوی مێژوویی

لەو قۆناغەی باسی لێوە دەکرێ بایەخێکی تەواو دەدرایە ئەو بەرهەمە ئەدەبییەی سەرچاوەی لە ڕووداوی ڕابردووی کۆن وەردەگرێ. نووسەر و شاعیرانی کورد هەوڵیان دەدا ئەو ڕووداوانە بدۆزنەوە کە نموونەی وێنەی خەباتی نەتەوەی کورد بوون لە پێناوی ئازادی و سەربەستی کوردستان یا ئازایی و قارەمانیی خەڵکی کورد. ئەم ڕووداوانە زۆرن لە مێژووی کۆن و تازە و سەردەمی کوردیدا.



لەم ماوەیەدا هەوڵ دەدرێ هەندێ زانیاری لە بابەت گرنگترینی ڕووداوەکان و بەرهەمی ئەدەبییان بخرێنە ڕوو.

## بەرگری لە قەڵای دمدم

لە نێوان سەدەی شازدەم و حەڤدەمدا لە دەوروبەری فەرمانڕەوایی شا عەباسی سەفەوی یەکەم نەتەوەکانی کورد و ئازەری و ئەرمەن و گورج و هی دیکە پاڵەوانانە دەجەنگان و شۆڕشیان بەرپا کردبوو لە پێناوی ئازادی و ڕزگاریی نەتەوەییان. هەڵسانی کورد لە ژێر فەرماندەی خانی لەپ زێڕین و ئازەری لە ژێر فەرماندەی کوێر ئوغڵوو و ئەرمەن لە ژێر فەرماندەی مخلۆ و گورج لە ژێر فەرماندەی باشی ئاچووغ زنجیرەییێک بوون لە هەڵسانی میللەتە چەوسێنراوەکان لە دژی دەسەڵاتی شا عەباسی یەکەم.

لە بابەت خەباتی میللەتی کورد و شەڕی پاڵەوانانەی لە قەڵای دمدم مێژوونووس و پەیامنێری شا عەباس ئەسکەندەر تورکمان، ڕووداوەکانی ئەم شەڕەی بەچاوی خۆی دیبوو و لە کتێبی «تاریخی عالەم ئارایی عەباسی»دا زانیاری گرنگ دەدا بەدەستەوە. هەروەها زانیارییەکانی مێژوونووسی کورد محەمەدئەمین زەکی لە کتێبی «مێژووی کورد و کوردستان»دا سەرچاوەییێکی گرنگە بۆ زانینی ڕاستیی ئەم ڕووداوە.

سەرچاوەکان لە بابەت شەڕی قەڵای دمدمەوە دەڵێن: «خانی لەپ زێڕین فەرمانڕەوایی ناوچەکانی تەرگەوەر و مەرگەوەر و ورمێ و شنۆی کوردستانی ئێرانی دەکرد بەناوی سەرۆکی عەشرەتی برادۆست. قەڵاییێکی دروست کرد لە جێی خرابەی قەڵای دمدمی کۆن کە پاشماوەی سەردەمی فەرمانڕەوایی ساسانییەکان بوو. بۆ بەهێزکردنی پاراستنی قەڵاکە لە هێرشی دوژمنان لە ناو قەڵای دمدم قەڵاییێکی دیکەی دروست کرد، لە دواییدا بەناوی قەڵای نارین ناوبانگی پەیدا کرد. لەو کاتەی میر و شازادەکانی هاوسێیانی سەر بەعەجەم بەمەیان زانی شڵەژان و دەستیان کرد بەپڕوپاگەندە لە لای شا لە دژی خانی لەپ زێڕین. لەم ماوەیەدا بیست هەزار چەکدار لە عەشرەتی جەلالی لە کوردستانی عوسمانییەوە ڕوویان کردە کوردستانی ئێران. شا عەباس بڕیاری دا هەشت هەزار کەس لەمانە لە ناوچەی برادۆست نیشتەجێ بکا. خانی لەپ زێڕین یەکسەر لە دژی ئەم بڕیارەی شا عەباس وەستا. هەلێکی لەبار بۆ شا عەباس هەڵکەوت دەسەڵاتی خانی لەپ زێڕین لەو ناوچەیەدا لەناوببا. شا هێرشی بردە سەر قەڵای دمدم بەشی زۆری سوپاکەی لە عەشرەتی جەلالی بوون. بۆ ماوەی چوار مانگ قارەمانانە جەنگاوەری کورد بەرگرییان لە قەڵای

خۆیان کرد. دوژمن سەرچاوەی ئاوی قەڵای بڕی، لە ناو قەڵا نەخۆشی بڵاوبووەوە، گەلێ لە جەنگاوەران بەنەخۆشی و لە تینووانا سەریان نایەوە. بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو کارەساتەشدا کوردەکان بەردەوام بوون لە بەرگری کردنێک وێنەی لە مێژوودا نەبووە. سوپای شا تەنیا لەو کاتەدا توانییان قەڵا داگیر بکەن کە تاقە جەنگاوەرێکیش لە جەنگاوەرەکانی کورد لە ژیانا نەما».

ڕووداوە قارەمانییەکانی بەرگریی قەڵای دمدم لە ناو دڵی میللەتی کورد ماوەتەوە. لە ڕۆژگارانی نزیکەی چوار سەدە بەشێوەییێکی فراوان لە ئەدەبی میلليی سەرزاری کوردی (فۆلکلۆر) ڕەنگیان داوەتەوە. تا ئێستا گەلێ تێکستی جیاوازی دمدم (خانی لەپ زێڕین) لە بەشی زۆری ناوچە جیاوازەکانی کوردستان کۆکراونەتەوە و بڵاوکراونەتەوە، لەوانە:

١- کوردناس ئەلبێرت سۆتسین لە ناوچەی بۆتان تێکستێکی (٥٣٠) دێڕە شیعری لە بەیتی قەڵای دمدم لە ساڵی ١٨٩٠ لە سانت پیترسبورگی ڕووسیا بڵاوکردۆتەوە.
٢- ئۆسکارمان لە ناوچەی موکریان تێکستێکی دیکەی (٤٠٩) دێڕە شیعری لە بەیتی قەڵای دمدم لە ساڵی ١٩٠٦ لە بەرلین بڵاوکردۆتەوە.
٣- حاجیی جندی تێکستێکی ناو کوردانی قەفقاسی ڕووسیای لە ساڵی ١٩٣٦ لە یەریڤان بڵاوکردۆتەوە.
٤- ئۆردیخانی جەلیل کتێبی تایبەتی هەیە لە بابەت قەڵای دمدم و خانی لەپ زێڕینەوە، هەروەها کۆمەڵێک تێکستی شیعری و پەخشانی لەم بابەتەوە بڵاوکردۆتەوە.
٥- لە ڕۆژنامەگەری کوردی عیراقدا هەندێ تێکستی ڕووداوەکانی قەڵای دمدم بڵاوکراوەتەوە، بەتایبەتی لە کۆواری «دەنگی گێتیی تازە»دا (١٩٤٣ - ١٩٤٦).

### شەهیدانی قەڵای دمدم

لەسەر بنج و بناوانی ئەم ڕووداوە مێژووییییە نووسەر مستەفا ساڵح کەریم چیرۆکی «شەهیدانی قەڵای دمدم»ی (١٩٦٠) نووسییەوە. قارەمانی سەرەکی چیرۆکەکە ئەبداڵ بەگی کوڕی خانی لەپ زێڕینە. ئەمە سەرۆکێکی سوپایی بلیمەت و هەڵکەوتوو بوو، سەرۆکی بەرگریی قەڵای دمدم بوو. نووسەر خانی لەپ زێڕین وەکو مرۆڤێکی ئاسایی پیشان دەدا، بەڵام سەرۆکێکی ژیر و بەهۆش دروشمی هەڵسانی میللەتی کورد بوو.



لەم چیرۆکەدا شێوەی ژنی کوردیش لە ناوەوەیە. ئەمە لە «ڤیان»ی جوان و نازەنیندا دەبینرێ. ڤیان دلبەری ئەبدال بەگ بوو. ئەم دووانە بەڵگەی دڵداری و نیشتمانپەروەری و قارەمانی بوون. خۆشەویستیی بەرامبەر بەنیشتمان ئازایی ڕاستەقینەی لە دەروونیاندا دروست کردبوو. سەربەستیی نەتەوە ئامانجی پیرۆزی دڵسۆزترین ڕۆڵەی میللەتی کوردە. لە گەرمەی جەنگدا ئەبدال بەگ لە ڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرانی کورد بوو. ئاوڕی لە ڤیان دەدایەوە و پێی دەیووت: لە وەختی تەنگانە و لە کاتی سەرکەوتنیشماندا، لەسەر لێوی من، تەنیا یەک وشە هەیە «کوردستان» ئەمە بۆ من ناوی تۆشە.

لە شەڕەکەدا لە پێشانا ڤیان دەکوژرێ و دوا ماڵئاوایی لە ئەبدال بەگ دەکا، بەم وتانە سەر دەنێتەوە: من بەو هیوایە بووم بەبووکی بۆ تۆ بێمە ناو قەڵای نارین، ئەوا هاتم. تۆ بەدەستی خۆت منت هێنا، ئەمە شانازییێکی گەورەیە بۆ من. مردنی ڤیان ئەبدال بەگی بەهێزتر کرد و ڕق و کینی بەرامبەر بەدوژمن هاتبووە جۆش. ئەبدال بەگ هەرگیز ناتوانێ وشەکانی ڤیان لە بیر بکا: ئەگەر من نەکوژرێم، یەکێکی تر لە تینووانا نەمرێ، سێیەم زامی سەخت نەبێ، ئێمە چۆن دەتوانین ئەم نیشتمانە جوانەمان ئازاد بکەین؟

خاوەن چیرۆک گەشبینە. نووسەر بەزمانی خانی لەپ زێڕین ئەم وشانە دەپژێنێ: ئێمە پێویستە تەماشای پێشەوە بکەین، باوەڕمان بەوە بێ ئەو ڕێگەیەی دەمانبا بەرەو ئازادی مێرگ و گوڵ و گوڵزار نییە، بەپێچەوانەوە لەم ڕێیەدا هەزاران هەزار دڕک و داڵ ڕواوە.

نووسەر دەوری جەماوەر لە بزووتنەوەی مێژوو بەڕاستی پیشان دەدا. بەدرێژایی ڕووداوەکانی چیرۆکەکە ئەوە دەردەخا کە تاقە پاڵەوانێک ناتوانێ ڕووداوی مێژوو لە یەکتری جیا بکاتەوە، ئەگەرچی کاری تێدەکا، بەڵام میللەت هەموو کارێکی گەورەی مێژوو دروست دەکا. ئەم بیروڕایانە لە قسەکانی خانی لەپ زێڕین خۆی دەنوێنێ: کوڕی خۆم - پەنجە بۆ جەنگاوەرانی کورد درێژ دەکا - تا ئەم کەسانە لەگەڵ مندا بن، هیچ هۆیێک نییە من غەمبار بکا!

نووسەر دوایی بەچیرۆکەکەی دێنێ وەکو مێژوو باس لە ڕووداوەکانی قەڵای دمدم دەکا، بەوەی جەنگاوەران هەموویان دەکوژرێن، ئینجا قەڵا داگیر دەکرێ.

بەسەرهاتی قەڵای دمدم بووە بەسەرچاوە بۆ نووسینەوەی ڕۆمانێکی گرنگ لە لایەن عەرەبی شەمۆوە. لە باسی تایبەتی لە بابەت ژیان و بەرهەمی ئەو نووسەرەوە باسی لێوە دەکرێ.

## دوازدەسوارەی مەریوان

ڕووداوێکی مــێــژوویی بەناوی «دوازدەســوارەی مــەریوان» لە ناوچەی سلێــمــانــی بووە بەسەرچاوە بۆ دروستبــوونی حیکایەتێکی میــللیی سەرزار. لە پاشانا ئەم بەرهەمە بووە بەسەرچاوە بۆ نووسینی چیرۆکێکی هونەریی هاوچەرخی نوێ. ئەم حیکایەتە ڕاستەوخۆ لە ڕووداو وەرگــیــراوە و بەجــموجــۆڵی خــەباتی نەتەوەیی بەســتــراوەتەوە لە دژی خــراپەکــاریی عــەجــەمــان بەرامــبــەر بەکــورد. ڕووداوی دوازدەسوارەی مەریوان لە سەردەمی فــەرمــانــڕەوایی ئەحــمــەد پاشــای بابــان لە نیــوەی یەکــەمی ســەدەی نۆزدەم قــەومــاوە. لە ناو دوازدەســوارە بەناوبانگەکاندا سەلیم بەگی بابانی مامی ئەحمەد پاشا بەئازایی و سوارچاکی جێگەیێکی تایبــەتی بووە، هەروەها لە پاش ئەو ئازاترینیــان ئەکــرەمی مــەلا هەمــزەی ئەفــغــانی بوو. دوازدەســوارەی کورد لەگەڵ دوازدەسوارەی عــەجەم دەکــەونە جــەنگەوە. ئۆردوگــای ســوپــای عــەجەم لە ناوچەی مەریوان بووە. سوارەی کورد بەشــەو لەناکاو هێرش دەبەنە سەر ســوپــای عــەجــەمــان. ئەم هەواڵــە زوو بەزوو لە ناو کــورددا بڵاو دەبێــتــەوە بەتایبــەتی لە ناو کــوردی ناوچەی سلێمانی و لە ئەدەبی مــیللیی سەرزار ڕەنگ دەداتەوە، وەک لاپەڕەیێکی ڕووناک لە خەباتی قارەمانانەی نەتەوەی کورد خۆی دەنوێنێ.

پیــرەمــێــرد لەبەر ڕۆشنایی دوازدەســوارەی فــۆلکلۆری بەو ناوەوە چیــرۆکــێکی هونەریی نووسیوەتەوە، لە کاتی خۆیدا بەشەوقەوە لە لایەن ڕۆشنبیر و خوێندەواری کورد پێشوازی کراوە. پیرەمێرد دەسکاری حیکایەتە میللییەکەی کردووە، بەوەی سەلیم بەگ و ئەکرەمی لەگەڵ دوازدەسوارەکە داناوە، بەمە ژمارەیان بووە بەچواردە. هەر چۆنێ بێ چیرۆکەکە ژیانی ســەخــتی مــیــرنشــینی بابان دەخــاتە ڕوو، لە ڕۆژهەڵاتدا ســوپای عــەجــەم دەوری دەدا، لە ڕۆژئاوا جەندرمەی عــوسمانی هەڕەشەی لێ دەکرد. پیرەمێرد بەرهەمەکەی بەوەسفکردنی ڕاوە بەراز دەست پێ کردووە لە شارەزوور. لە کاتی ڕاوکردندا دوازدەسوارە هەواڵ دەبیستن سوپای عــەجەم بەرەو قەڵای مەریوان کەوتۆتە ڕێ. ئیتر سوارەکان بڕیار دەدەن قەڵا بپارێزن و بەم جۆرە لە ڕووی دوازدە هەزار سەربازی عەجەم دەوەستن.

بەشێوازێکی هونەریی باڵا پیرەمێرد وەسفی قارەمانیەتی سوارەکان و هونەر و تەکنیکی جەنگــیــان دەکا. بەشــەوی تاریک لەناکــاو سوارەکان بەسەر ئۆردووگــای سوپای عــەجەم دادەدەن لەو کاتەی هەموویان لە خەودا بوون. ئیتر شڵەژان و ئاژاوە بەشێوەیێک دەکەوێتە ناوەوە ئەوســەری دیار نەبێ، کەس بەکەس نەبێ. سوپای عــەجــەم دەکــەونە ناو یەکــتــری،



گەلێکیان لێ دەکوژرێ و زۆریشیان بەڕاکردن خۆیان ڕزگار دەکەن. لەو شەڕەدا سەلیم بەگ بریندار دەبێ، ڕوو دەکاتە جوامێر ئاغا و پێی دەڵێ: هێرشی ئێمە لەو موبالەغانە دەکا کە لە حیکایەتی فارساندا هەیە، دوازدە سوار بچن بەگژ سوپاییێکی دوازدە هەزار عەسکەری، ئەمە بەتەواوی وەکو شانامە وایە!! جگە لەوە هەست بەهەناسەییێکی نیشتــمانپەروەری دەکرێ لەم وشانەی لەسەر زاری سەلیم بەگ دێنە دەرەوە: هێرشی ئێمە ڕووداوێکە سەری کوردستان بەرز دەکاتەوە! با ئێمە بمرین، بەڵام هەتا هەتایە لە ناو دڵی میللەتدا دەژین!

ئێستــە زۆر ئاسانە پیــاو باوەڕی بەخــۆی بێ لە ئەنجــامی وردبوونەوە لەم بەڵگانەی لەم مــاوەیەدا خــرانە بەرچاو وەک نموونەییێکی پڕ لە شــانازی لاپەڕەی مــێــژووی مــیللەتیــان ڕازاندۆتەوە. ئەم بەرهەمانە هەستی نەتەوەییــیان بزواندووە، خەڵکیــان ئامادە کردووە بۆ خەبات و تێکۆشان، ئازایەتییــان لە ناو دڵی مــیللەتدا چاندووە. ئەمە هێــزێکە زۆرداری لەناودەبا. لەبەرئەوە ئەم بەرهەمــانە بوون بەســەرچاوە بۆ پەروەردەی نوێ، خــوێندەوار و ڕۆشنبیری نوێ. ئەمە هەمووی بوو بەهۆی پێشکەوتنی کۆمەڵی کوردەواری لەو ساڵانەدا.

***

بەکــورتی بــاس لە ئیــدیاڵ و بیــروباوەڕ و بابەت و هەندێ لایەنی ڕێبــازی نوێی ئەدەبی کــوردی کــرا. لەمــەودوا هەوڵ دەدرێ باس لە ژیان و بەرهەمی شــاعــیــر و نووســەرە بەرچاوەکــانی مــاوەی پاش جــەنگی دووەمی گــێــتــیی ســەدەی بیــســتــەم بکرێ. دوان و لێکۆڵینەوە لەو شاعیر و نووسەرانە خۆی لە خۆیدا ڕوونکردنەوەی داهاتنی شیعری نوێیە و لە ئەنجامدا دەتوانرێ بەشداریی هەر شاعیرێک لەم بزووتنەوە ئەدەبییەدا دیاری بکرێ.

نووسەرە لاوەکانی چیرۆک و ڕۆمان و بابەتەکانی دیکەی پەخشان ئەوانەی جوانەمەرگ بوون پێــویست بوو ناویان بچــێــتــە ناو ئەم تۆمــارەوە، بەڵام ئەوانەی لە ژیاندا مــاون، بەتایبەتی ئەو نووسەرانەی لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لەسەر پێ وەستان و هێشتا کەسێتیی ئەدەبییان بەردەوامە، ژیان و بەرهەمی ئەو نووسەرانە دەکەوێتە ماوەی چارەکی دوایی سەدەی بیســتــەم و چارەکی یەکــەمی سەدەی بیست و یەکەم (١٩٧٥ – ٢٠٢٥). تا ئێستا ئەم مــاوەیە نەچۆتە ناو بەرنامەی ئەم زنجیرە کتێبەوە «مێژووی ئەدەبی کوردی». ئەمە لە ساڵی ١٩٧٥ دەوەستێ.

بەلای ئێمەوە ژیان و بەرهەمی ئەدەبی لە پەخشــانی هونەری کــۆمــەڵێک لە نووســەرانی کوردی عیراق دەبێتە سەرچاوە بۆ نووسینەوەی لایەنە گرنگەکەی مێژووی ئەدەبی کوردی

سەردەم کە پەخشانی هونەرییە بەهەموو بابەتەکانیەوە: وتار، چیرۆک، ڕۆمان، دراما، شانۆگەری، پیەس و هەموو بابەت و هونەرەکانی دیکەی پەخشان.

ئەو کەسانەی لێرەدا ناویان تۆمار دەکرێ، هەموو ئەو نووسەرانە نین، بەڵام بەشێکی گرنگن: محەمەد عەلی کوردی، مەحموود جەودەت، ڕەفیق چالاک، ڕەمزی قەزاز، جەمال نەبەز، کاوس قەفتان، ساجید ئاوارە، کاکەمەم بۆتانی، مستەفا ساڵح کەریم، جیهان عومەر، حوسێن عارف، ئەمین میرزا کەریم، جەمال بابان، فازیل نیزامەدین، مەحموود ئەحمەد، محەمەد نووری تۆفیق، کامیل ژیر، جەوهەر غەمگین، محەمەد ڕەشید فەتاح، جەمال نووری، عەبدوڵڵا میدیا، أ. ب. هەوری، تایەر ساڵح سەعید، محەمەد فەریق حەسەن، سەلام مەنمی، ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، محەمەد ساڵح سەعید، ڕەئووف حەسەن، عەبدوڵڵا ئاگرین، ئەحمەد سەید عەلی، ئەحمەد سەلام، محەمەد سەعید حەسەن، جیهان عومەر، مارف خەزنەدار.

# بەشی سێیەم

## ئەدەبی کوردی لە قەفقاسی ڕووسیا

لە سەدەی بیستەمدا لە ناو کۆمەڵی کوردی وڵاتی ڕووسیادا تەنیا لە ناو کوردی ئەرمەنستان لە قەفقاس ئەدەبی نووسراوی هونەری بەزمانی کوردی پەیدا بوو. خەڵکەکە بەگشتی هەژار و نەخوێندەوار و ئاوارەی وڵاتانی عوسمانی و ئێران بوون. لە ناو کوردی ئەوێ ئەو قسەیێک هەیە دەڵێ: «لە پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ تاکە یەک کەس خوێندن و نووسینی بووە ئەویش عەرەبی شەمۆیە». ئەم قسەیە لەوانەیە بەڕاستی هەندێ ورد نەبێ، بەڵام لە ڕاستییەوە زۆر نزیکە. بۆ بەڵگە ف. مینۆرسکی ئەوە دەگێڕێتەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەم کوردی ئێران و عوسمانی لە هاتۆچۆدا بوون، هیچ هۆیێک نەبوو ڕێگەیان لێ بگرێ لە بڕینی سنوور و نیشتەجێ بوون لە قەفقاس. لە یەریڤان دوو قوتابخانەی کوردی هەبووە، هەروەها قونسوڵی ڕووس لە شاری خۆی لە ئێران قوتابخانەیێکی بۆ کورد کردبووەوە، ڕەنگە ئەم قوتابخانانە بەو ناوەوە کوردی بووبن چونکە بۆ قوتابییانی کورد کرابوونەوە، ئەگینا باوەڕ ناکرێ بەکوردی وانەیان تێدا وترابێتەوە. دەڵێن لەو سەردەمەدا پێش جەنگی یەکەمی گێتی لە شارانی خارکۆڤ و کییێڤ لە هەریەکەیانا قوتابییێکی کورد هەبوو.

کوردی ئەو وڵاتە هەرچەندە خوێندن و نووسین و بەرهەمی ئەدەبی نووسراویان نەبوو، بەڵام لە ئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) زۆر دەوڵەمەند بوون و خاوەن گەنجینەیێکی بێ هاوتا بوون، لەبەرئەوە هەرکە خوێندەواری لەناویاندا بڵاوبووەوە بایەخێکی زۆریان بەکۆکردنەوە و تۆمارکردنی تێکستی ئەو بەرهەمە میللییانە دەدا بەشیعر و پەخشانەوە. لە دواییدا دەستیان کرد بەلێکۆڵینەوە لە ناوەرۆکی کۆکراوەکان. تا ئێستا پسپۆڕانی ئەوێ لە مەیدانی فۆلکلۆردا لە ڕیزی پێشەوەن لە هەموو کوردستاندا.

### لە نەخوێندەوارییەوە بۆ خوێندەواری

لە ساڵی ١٩٢٩ عەرەبی شەمۆ و مامۆستای قوتابخانەی ئەرمەنی ئی. مارۆگوولۆڤ یەکەمین ئەلفوبێی کوردی بەتیپی لاتینییان بڵاوکردەوە بۆ نووسینی کوردی. کتێبەکە بەناوی «خۆ خۆ هینبوونا خاندنا نڤیسارا کرمانجی» بوو. لە یەریڤان ٢٥٠٠ دانەی لێ



چاپ کرابوو. لە پاشانا هەزاران دانەیان بەلیست بڵاوکردەوە. دەوڵەت بڕیاری لەسەردا و بەڕەسمی وەک ئەلفوبێییێکی زانستی کەوتە کارەوە. ئەم ئەلفوبێیە تا ساڵی ١٩٣٧ بەردەوام بوو. سەدان کتێبی کوردی پێ چاپ کرا. لە ساڵی ١٩٣٨ تەنیا یەک کتێبی کوردی لە یەریڤان بڵاوکرایەوە، ئەویش دیارە پاشماوەی کتێبەکانی ساڵی پێشوو بوو. بەم جۆرە بەپێی سیاسەتی فاشی و تیرۆریبیانەی ستالین زمانی کوردی و ئەدەب و خوێندەواری و ڕۆشنبیری کورد قەدەغە کرا تا دوای جەنگی دووەمی گێتی. ئەم کارە کوردی هەموو ناوچەکانی ڕووسیای گرتەوە لە قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاستدا. لە دوای جەنگی دووەم لە ساڵی ١٩٤٦ تەنیا دانیان بەمافی کوردی ئەرمەنستان هێنا. لەو کاتەی پێویست بوو ئەلفوبێ لاتینییە کۆنەکە زیندوو بکەنەوە، وازیان لەو هێنا و ئەلفوبێییێکی دیکەیان دانا لەسەر بنچینەی ئەلفوبێ کیریلی یا (سیریلی) کە زمانی ڕووسیشی پێ دەنووسرێتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی ئەم ئەلفوبێیە لە لاتینی باشترە چونکە تاکی کورد لە ئەرمەنستان سێ زمان فێر دەبێ، زمانی خۆی و ئەرمەنی و ڕووسی. زمانی ئەرمەنی ئەلفوبێی تایبەتیی خۆی هەیە، ئەگەر ئەلفوبێی زمانی کوردی بەتیپی لاتینی بێ ئەو کاتە پێویستە سێ جۆرە ئەلفوبێ بزانێ، بەڵام ئەگەر ئەلفوبێی ڕووسی بەکار بێنێ مانای ئەوەیە قوتابیی کورد دوو جۆرە ئەلفوبێ فێر دەبێ لەباتی سێ جۆر. ئەم ڕایە تا ڕادەیێک بەجێیە، بەڵام بێ گومان ئەو ئەلفوبێیە تەنیا بۆ کوردی ئەرمەنستان کەڵکی دەبێ، بەمیلیۆن کوردی دەرەوەی کوردستانی گەورە سوودی لێ وەرناگرن.

لە ساڵی ١٩٤٦ ئەو مافەی لە کوردی ئەرمەنستان زەوت کرابوو درایەوە پێی. ڕۆژنامەی «ڕیاتازە» دەستی کردەوە بەدەرچوون، لە ساڵی ١٩٤٦ و ١٩٤٧ دوو سێ کتێب و لە ساڵانی دوای ئەو چەند کتێبێکی دیکەی بەنرخ بڵاوکرانەوە لە بابەت زمانی کوردی و ئەلفوبێی تازە لەسەر بنچینەی ئەلفوبێی کیریلی، هەروەها چەند کتێبێکی زۆر بەنرخ لە بابەت ئەدەبی میللی (فۆلکلۆری) کوردی بڵاوکرانەوە. ئیتر لەمە بەدواوە بایەخێکی زۆر بەچاپەمەنی کوردی دەدرا، هەموو ساڵ کتێبێکی زۆری قوتابخانەکان بەچاپ دەگەیەنران، لە ئەوانیش زیاتر بایەخ بەبەرهەمی ئەدەبی دەدرا شیعر و وتار و چیرۆک و ڕۆمان و بابەتی دیکە. ژمارەی چاپکردنی کتێب لە هەڵبەزین و دابەزیندا بوو هەندێ ساڵ دوو سێ کتێب، هەندێ ساڵی دیکە زیاتر لە دە کتێب بڵاو دەکرانەوە. بۆ بەڵگە لە ساڵی ١٩٦٠ سێزدە کتێبی کوردی جۆراوجۆر لە شاری یەریڤان بڵاوکراوەتەوە.

## پەیدابوونی ئەدەبی نووسراوی هونەری

پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەری ۱۹۱۷ میللەتی کوردی ئەرمەنستان نەخوێندەوار بوو، بەڵام ئەدەبێکی بەرزی هەبوو جێی نرخ پێدان و شانازی بوو لە لایەن گەلێ لە کوردناسان و ڕۆژهەڵاتناسانی ڕووس و ئەوروپاییانی دیکە، ئەگەر قسەی باشیان بکردایە دەیانووت میللەتێکە بەشاعیر خوڵقاوە. لە پاش پەیدابوونی خوێندەواری لە ناو ئەم کوردانەدا، لە ژێر کاریگەریی ئەو ئەدەبە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە ئەدەبێکی نوێ پەیدا بوو، واتە کلاسیکی بەمانا ئەدەبی نووسراوی بەرز (مومتاز). ئەو بەرهەمە لە پلەی ئەدەبی هونەری نووسراوی هەمـوو نەتەوەکـانی ڕووسـیـای سۆڤـیـەتی ئەو سـەردەمـە بوو، واتە نەتەوە ئەوروپایی و ئاسیاییەکان. لێرەدا نەوەکو تەنیا کورد بەڵکو هەموو نەتەوەکانی ئەو وڵاتە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی ئەدەبی کلاسیکیی پێشکەوتووی ڕووس، ئینجا لە بابەت کوردەوە زیاد لەسەر کاریگەریی ئەدەبی ڕووسی ئەدەبی ئەرمەنیش تا ڕادەیێک کاریگەریی بەسەر ئەدەبی کوردی ئەو وڵاتەوە هەبوو.

بەگشتی ئەدەبی کوردی لە قەفقاسی ڕووسیا لەسەر قانوون و تیۆرییێکی دەوڵەت بەرێوە دەچوو، دەڵێ «بەرهەمی ئەدەبی و هونەری پێـویستـە بەڕوخسـار نەتەوەیی و بەناوەڕۆک سۆسیالیستی بێ» واتە زمانی بەرهەمەکە قەومییە، بەڵام ناوەڕۆکی پێویستە لە پێناوی دروستکردنی کۆمەڵی سۆسیالیستی بێ و لە دوای ئەوەدا کۆمۆنیزم هەموو ئازادی سـەر ڕووی زەوی بەرێوە ببـا. هەرچەندە ئەم تیـۆرییـە هەڵە بوو، چونکە بەفەرمانی دەسەڵات و دانانی تیۆری داهێنانی ئەدەبی لە ڕووی جوانکارییەوە دروست نابێ. ئەدەبی کوردی و ئەدەبی هەموو نەتەوەکانی ئەم وڵاتە بەشێوەیێکی ڕەسمی و بەزۆر کەوتبووە ژێر باری ئەم ئارەزووە قورسەوە. بەڕاستی هەرچەند پێڕەوی ئەم تیۆرییە کرابێ و بەرهەمی ئەدەبی بێ تام کەوتبێتە ناوەوە، نموونەیێکی زۆری بەرهەمێکی جوان و ڕەنگینی ئەدەبی کوردی نووسراو بۆ یەکەمین جار لە ناو کوردانی قەفقاسی ڕووسیا پەیدا بوو، ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و بیری کوردایەتی و دڵداری ناو دڵ و دەروونی ئادەمزادی کورد بوو.

بۆ یەکەمین جار کۆمەڵێک وتار و شیعر و چیرۆک لە کتێبێکدا لە ساڵی ۱۹۳۲ لە یەریڤان بڵاوکرایەوە بەناوی «عەفراندنا ئەولن» – تۆپکرنا نڤیسارا سێکسیا کرمانجا رەخ ئەسۆسیاسیا نڤیسکارا فلستانێ – لە لایەن «نەشرا حوکمەتا شەورا فلستانێ» بڵاوکراوەتەوە. ئەم بەرهەمە لقی کوردی لە یەکێتیی نووسەرانی ئەرمەنستان کۆی کردۆتەوە و بڵاوی کردۆتەوە. ئەمینی عەبدال پێشەکی بۆ نووسیوە.

ئەم کتێبە بۆ یەکەمین جار نموونەی شیعری تازە لە دایکبووی کوردی ئەو ناوچەیەی بڵاوکردۆتەوە. چەند نموونەیێکی پەخشانیش لە کورتە وتار و کورتە چیرۆک تیایدا بەرچاو دەکەون. کتێبەکە بڕێک لە پارچە لیریکی کورت و وتاری ئەدەبی ئەم شاعیر و نووسەرانەی گرتۆتە خۆ: حاجی جندی، ئازات ئوشتوونی، ئەمینی عەبدال، عەتاری شەرۆ، فەتی، ساڵح، بایلۆزی چەچان.

شیعر و نووسینی کوردی ناو کتێبەکە بەزمانێکی میلليی ڕەوان نووسراونەتەوە، لە ئەدەبی میللی سەرزارەوە زۆر نزیکن. شاعیران کێشی سیلابی خۆماڵی میللیی لاوک و گۆرانی ناو خەڵکی کوردیان بەکارهێناوە. لە هەموو ڕوویێکەوە نزیکترە لە ئەدەبی میللی، چونکە یەکەمین تاقیکردنەوەیە بۆ دروستبوونی ئەدەبێکی ڕۆشنبیرانەی سەردەم. ئەوەی تازە و گرنگ بێ ناوەڕۆکی ئەو نووسین و شیعرە نوێیەیە هەمووی بەپێی بڕیارێکی دەسەڵاتی دەوڵەت لە دەوروبەری بیروڕای دروستکردنی کۆمەڵێکی سۆسیالیستی بەپێی تیۆریی مارکسیزم بەرێوە دەچێ. ناوەڕۆکی لە ئایین و سۆفیزم و دڵداری و هەستی دەروونی ناوەوەی ئادەمزاد دوورە. هەرچۆنێ بێ لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە دیاردەیێکی نوێیە لە ئەدەبی کوردیدا، وەک ئەو بزووتنەوە ئەدەبییە گرنگەی لەو ماوەیەدا کەوتە ناوەوە لە کوردستانی باشوور، لە شاری سلێمانی واتە بزووتنەوە «شیعری نوێ»، لەگەڵ جیاوازی لە نێوان ئەم دوو ڕینیسانسە، هەردووکیان ئەدەبی کوردییان دەوڵەمەندتر کرد.

لەم ماوەیەدا هەندێ نموونە لە یەکەمین عەفراندنی کوردی قەفقاس دەخرێتە ڕوو.

عەتاری شەرۆ لە لیریکی «ئەم ژ دخونن»دا دەڵێ:

خـوەندنا مـە رۆنایە، فـرەیە
عـولمێ وێ زەف زێدەیە
چێکرنا سۆسیالیزمێ ل بەر مەیە
دەورانا مـە، دەورانەکـا زێدەیە

***

خوەندنا مە خوەشە ئو ئەشقە
ئەم هەڤرا دخوونن تفـاقـە

خوەندنا مە ب زمانێ دێیە
ئەم زوو بقەدینن گۆتنا شێورێیە

***

زمانێ مەیی لال ڤەبوو
خەڤاتچی تەف شا بوون
ملێ مەیی گریدایی ئازا بوو
دەورانا کەڤن ئوندا بوو

شاعیر لەم لیریکەدا باس لە کەڵکی خوێندن دەکا، بۆ هاوزمانانی خۆی ئەوانەی تا ئەو سەردەمە خوێندەواریان تێدا نەبووە. لە شیعرەکەدا بەپێی پێویست هەندێ وشەی فەرهەنگی و زاراوەی نوێ بەکار دێنێ وەکو سۆسیالیزم و شێورێ یا شۆرەوی بۆ زاراوەی «سۆڤیەت». شاعیر بەراوورد لە نێوان ژیانی کۆن و تازەی کورد دەکا، چۆن لە پێشانا زمانیان لاڵ بوو و خوێندەوار نەبوون ئێستا بەهۆی خوێندن زمانیان کراوەتەوە. لە پێشانا دیل بوون، ملیان لە کۆت و زنجیردا بوو، ئێستا لە ئازادی و ژیانی سەربەستی دان.

لە لیریکێکی بەناوی «سلاڤ (ریاتازە) را» شاعیری ئەو ڕۆژگارەیان فەتی دەڵێ:

هەی سلاڤ تەرا «ریاتەزە»
تو خێرهاتی مەرا هەرتم
چقا پاکی چقا لازم
بەر کوولاکا چاوا دژمن

***

تو «ریاتەزە» چقاس دەلال
تو بچووکی تەنێ دوو سال
زووکە پێشدا هەرە
قەت نەترسە بەر چەتنیا

***

تو کۆم دکی، تو راست دکی
تو بەر دژمنا حازر دکی
ب سیاسەتی پێشدا تینی
پێشیا دژمن کە سبیا



شاعیر لەم لیریکەدا پیرۆزبایی ڕۆژنامەی «ریاتازە» دەکا کە بەزمانی کوردی لە یەریڤان هەفتانە بڵاودەکرایەوە. بەهۆی بیرەوەریی دووەمین ساڵی دەرچوونی ڕۆژنامەکە نووسراوەتەوە. لە شیعرەکەدا ئەوە دەردەبڕی ڕۆژنامەکە خەبات دەکا لە دژی کوولاک، ئەمە وشەیێکی ڕووسییە مانای ئەو کەسانە دەگەیەنێ لە سەردەمی فەرمانڕەوایی قەیسەری دەوڵەمەند و خاوەن زەوی بوون، واتە وەک ئاغا و دەرەبەگی لای ئێمە.

قەناتی کوردۆ لە لیریکێکیدا بەناوی «سەردار»ەوە دەڵێ:

رابە تو سەردارۆ
رابە تو خەباتکارۆ
گهیشتییە زەڤیا جەهد، گەنم
عوزڤێ کۆلخۆزێ، وەختە دەمان

***

دبینی ڤێرا خوەدا
چقاس د خەبتێ ناڤ زەڤیا
قیزن، ژنن ئو مێرن
ئەو نە دەرێ ژێ هلتینن

***

نها ئەم د خەبتن، چەتنە
پەشیا مە هەنە چەتنی
ئەمێ هلدن چەتنیا
سەبا عمرێ تێ تەڤایی

***

وێ عەمر، ببە دیوانا مە
جیێ لێ هەیە خوەندن
ئالکی خەبات، تراکتۆر
جیێ لێ توننەبە مفتەخۆر

قەناتی کوردۆ لەم لیریکەدا ڕوو دەکاتە خەڵکی کورد، هانیان دەدا کار بکەن، خۆیان خاوەنی گەنم و جۆی خۆیانن. هەندێ زاراوەی نوێ لە شیعردا بەکار دێنێ وەکو وشەی

«کۆلخۆز» ، ئەمە زاراوەییێکە لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧دا پەیدا بووە، لە دوو وشەی ڕووسیی لێکدراو دروست کراوە، مانای «کێڵگەی هەرەوەزی» دەگەیەنێ. هەروەها شاعیر وشەی «تراکتۆر»ی بەکار هێناوە، گرنگترین ئامێرێک لە کاروباری کشتوکاڵدا.

ساڵح شاعیرێکی دیکەی قۆناغی یەکەمی پەیدابوونی ئەدەبی کوردییە لە قەفقاسی ڕووسیا، لە شیعرێکیدا بەناوی «یەکێ گولانێ»دا دەڵێ:

عیدا یەکێ گولانێ
سەر ملێ پرۆلێتارا بەیرەقێ سۆرن
دکشن ژ کووچێ بەرلینی، لوندۆنێ
بەیرەقێ سۆر هەر ئالیا دفرن
ژ وان نامێن پرۆلێتارێ دن
گشکی سازی دەزگەنە
سیلح و چەک دەستێ وان دانە
جێرگە ب جێرگە دکشن
گاڤێ درێژ داڤێژن
بهەڤرا کلامێ ئینگلابێ دڤێژن
دەف زورنە بەر وان د هەژن
پێشدا جمعەتا خەڤاتچیا
قەت تالاشێ نەکشێن ژ فاشیستا
بسەرکاریا تفاقا کۆمۆنیستا
ببرن کۆکا کاپیتالیستا
دیوانا زولومدارا هلشێن
قەید جیدارا بقەتێن
هەڤالا ژ کەلا، زندانا دەرخێن
بەیراقا سۆر هەر دەرا دا جکێن

شاعیری کورد ساڵح بەم لیریکە پێشوازی لە جەژنی یەکی ئەیاری کرێکارانی گێتی دەکا. ئەمە جەژنێکی پیرۆز بوو لە ڕووسیای سۆڤیەت. بەهۆی پێویستی ناوەرۆکی لیریکەکە شاعیر هەندێ وشەی فەرهەنگی و زاراوەی سیاسی و ئابووری بەکار دێنێ



بەپێی بیروباوەڕی مارکسیزم. ئاڵای سوور ڕەمزی دەوڵەتی ڕووسیای سۆڤیەت و هەموو کرێکارانی گێتی بوو. شاعیر تەنیا بەمە نەوەستاوە هەندێ زاراوەی دیکەی بەکارهێناوە وەکو پرۆلیتاریا، فاشیست، کۆمۆنیست، کەپیتالیست، هەروەها ئینقیلاب بەمانای شۆڕش. ئەم وشانە بۆ یەکەمین جار هاتوونەتە ناو بەرهەمی ئەدەبی کوردی (شیعر و پەخشان) لە ئەنجامی ڕەنگدانەوەی سیستێمی تازە لە فەرمانڕەوایی سەردەمی سۆڤیەتەکان لە ڕووسیای دوایی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧.

بەگشتی گۆڕانێکی قووڵ بەسەر ئەدەبی کوردی ئەو وڵاتەدا هات، بەتایبەتی لە پاش جەنگی دووەمی گێتی کە بۆ جاری دووەم کورد هەندێ مافی خوێندن بەزمانی خۆی وەدەست هێنا.

## بەرهەمی ئەدەبی لە ڕووی ڕوخسارەوە

کەرەستەی نووسینی ئەدەبی کوردی لەو وڵاتەدا لەسەر بنج و بناوانی ئەدەبی میللیی سەرزاری کورد بوو. زمانی قسەکردنی کوردی بەکار دەهێنرا، شاعیران بەرهەمیان لەسەر کێشی سیلابی میللی و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی لاوک و گۆرانی دەهۆنییەوە، بەڵام شێوە و بابەتەکانی لاساییکردنەوەی ئەدەبی ئەوروپایی بوو، بەتایبەتی ئەدەبی ڕووسی. لەبەرئەوە ئەدەبی کوردی وڵاتی قەفقاسی ڕووسیا لەم ڕووەوە وەک ئەدەبێکی ئەورووپی پەیدا بوو. شاعیر یا نووسەر بەرهەمی بەپەخشان و شیعر دەنووسییەوە، وەکو دەستووری ئەوروپاییەیان، ئەوانەی کوردیش زۆربەیان لەم بابەتە بوون، ئەگەرچی بەگشتی هەردوو نووسەری گەورە و بەناوبانگیان عەرەبی شەمۆ و عەلی عەبدولڕەحمان بەرهەمی ئەدەبییان پەخشان بووە.

بەرهەمی ئەدەبی کوردی ئەو وڵاتە لە قاڵبی ئەم بابەتانەی لای خوارەوە بەرچاو دەکەوێ:

١- وتار: بابەتێکی گرنگە لە ئەدەبدا، لایەنی هەموو زانستییە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەوە. ئەوەی لە ئەدەبی داهێنراوەوە نزیکە ئەو وتارانەن لە وەسف و دڵداری و کۆمەڵایەتی و تا پلەییێکیش لە سیاسەت و ئابووری دەدوێن، ڕەخنە و پێکەنین و ناوەرۆکی قەشمەری ئامێزیان تێدایە، بەزۆری ئەو نووسەرانە بەکاری دێنن ئەوانەی ڕۆژنامەنووسن و لە کۆوار و ڕۆژنامەکاندا کار دەکەن. وتار لە ناو کوردانی ئەو وڵاتەدا بەهۆی ڕۆژنامەی «ڕیاتەزە»وە زۆر پێش کەوت، لە دوای جەنگی دووەمی گێتییەوە بەبێ پسانەوە هەفتەی دوو جار بڵاو دەکرایەوە تا ڕووخانی دەسەڵاتی سۆڤیەت (١٩٩١).

٢- چیرۆک: سەرچاوەی بنچینەیی نووسەرانی کورد لەم لایەنەوە گێتیی چیرۆکی ڕووسی دەوڵەمەند بوو، ئەوان ئاگاداری ئەدەبی کوردی دەرەوە نەبوون، هەروەها ئەدەبی هاوسێکانی کوردی دەرەوەش، چونکە بەشێکی زۆر کەمیان نەبێ زمانانی عەرەبی و تورکی و فارسییان نەدەزانی. لەگەڵ سەرچاوەی ڕووسی ئاگاداری ئەدەبی ئەرمەنی و گورجی بوون، ئەمانەش زیاتر دەشکێنەوە سەر ئەدەبی ڕووسی و ئەورووپایی. لەبەرئەوە مەشقی نووسەرانی کورد بۆ نووسینەوەی چیرۆک بەلاساییکردنەوەی ئەدەبی نەتەوەکانی ئەورووپا بوو. گەلێ جاریش وەکو ئەوان بەبێ ئەوەی هەست بکەن وتار و چیرۆک تێکەڵ بەیەکتری دەبوون. بەڵام بەلای ئەوانەوە وەکو دەستوور هەموو نووسینێک ماکی جوانکاری تێدا بێ دەچێتە ناو بەرهەمی ئەدەبییەوە هەتا ئەگەر لە لایەن ڕەخنەگر و مێژوونووسانی ئەدەبەوە ناویشی بۆ نەدۆزرێتەوە.

٣- ڕۆمان: ئەگەر مێژووی ئەم بابەتە بەرزە لە ئەدەبی کوردیدا بنووسرێتەوە، پێویستە سەرەتای پەیدابوونی لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی لە ناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا دەست پێ بکا و بەناوی یەکەمین ڕۆماننووسی کورد عەرەبی شەمۆ ببەسترێتەوە. لە پاش ماوەییێکی زۆر بۆ دووەمین جار بابەتی ڕۆمان لە کوردستانی عێراق لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم سەری هەڵدا. بێ گومان ڕۆمانی «پێشمەرگە»ی ڕەحیمی قازی ئەویش لە ژێر کاریگەریی ئەدەبی ڕووسی و لاساییکردنەوەی عەرەبی شەمۆ بوو. چونکە ڕەحیم لە دوای نیشتەجێ بوونی لە باکۆ لە ساڵی ١٩٤٦ەوە تا کۆچی دوایی لە ژێر کاریگەریی ڕۆشنبیری ئەورووپا ڕۆمانەکەی نووسییەوە. هونەری ڕۆمان پایەیێکی بەرزی هەبوو، لە ئەدەبی کوردی ئەوێدا پێش کەوت، ڕۆماننووسی گەورە هەڵکەوتن. عەرەبی شەمۆ و عەلی عەبدولڕەحمان لە دامەزرێنەران بوون، نەوەی پاش ئەوان بەرهەمی بەپێزیان لەم لایەنەوە داهێناوە، نەوەی سێیەمی ئەو وڵاتە کەمتەرخەمی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەی تەگەرەی زۆر ڕێگەی پێشکەوتنیانی گرتبوو، بەرهەمی باش و جوانیان بڵاوکردۆتەوە.

٤- لیریک: لە ڕووی ڕوخسارەوە و بەژمارەی دێڕ ئەم جۆرە شیعرە ئەورووپاییییە لە پارچە و غەزەلی شیعری کلاسیکی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکا. کوردی ئەو وڵاتە ڕاستەوخۆ لە شیعری ڕووسییان وەرگرتووە و زۆریش لە لاوک و گۆرانیی ئەدەبی میللیی خۆیان دەکا. وەکو چۆن لیریک لە ئەدەبی هەموو گێتی هونەرێکی سەرەکییە و هەموو لایەنەکانی ژیانی ئادەمزادی گرتۆتەوە لای کوردی ئەو ناوەش بایەخی پێ دراوە. نووسەر و شاعیرانی نەوەی دووەم و سێیەمی ئەم ڕینیسانسە ئەدەبییە لە نیوەی دووەمی



سەدەی بیستەم ئەم جۆرە شیعرەیان بۆ هەموو هەست و نەستێکی کەسێتی و سایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و کوردایەتی بەکارهێناوە. دەرچوونی ڕۆژنامەی «ریاتەزە» بەرێکوپێکی بۆ ماوەییێکی زۆر هۆیێکی گرنگ بوو نووسەر و شاعیرانی هان دەدا ئەم بابەتە شیعرە بهۆننەوە بۆ ئەوەی لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکەی پێ ڕەنگین بکەن.

٥- پۆییم (قەسیدەی درێژ، بەیتی ئەدەبی میللیی سەرزار): ئەم بابەتە شیعرە لە کۆنەوە لە ئەدەبی کلاسیکی ڕۆژئاوا بووە، لە ڕۆژهەڵاتدا قەسیدە (چامە)ی پێ دەڵێن، لە ئەدەبی میللیی سەرزاری کوردی «بەیت»ی پێ دەڵێن. شاعیرانی ئەدەبی کوردی نوێی ئەو وڵاتە وەک لاساییییێک لە ئەدەبی ڕووسی و تا ڕادەییێکیش لە ئەدەبی ئەرمەنی و گورجییان وەرگرتووە، ئیتر هەستیان پێ کردبێ یا نەکردبێ، زۆر باش لەگەڵ ڕێبازی ئەدەبی کوردیدا گونجاوە، چونکە «بەیت» بابەتێکی زۆر گرنگە لە ئەدەبی میللیی سەرزاری کورد، لەبەرئەوە ئەگەر بەزۆریش سەپێندرابێتە سەر شاعیران ئەوان لە خۆیانەوە ئەو جۆرە شیعرە پێویستەیان هێناوەتە ناو ئەدەبی نوێوە، چونکە شتێکی نامۆ نییە لە لای ئەوانەوە.

## نووسەر و شاعیران

لە سەرەتای دروستبوونی ئەدەبی نووسراوی کوردی شاعیری خوێندەوار نەبوو، ئەوانەی دەستیان بەشیعر نووسین کرد، شاعیر نەبوون، هەستی شیعرایەتییان هەبوو، یا شاعیر میللی بوون و گوێی مۆسیقییان بەهێز بوو، قوتابی و خوێندەواری هەموو لایەنەکانی زانستییە پراکتیکی و کۆمەڵایەتییەکان مەشقی نووسینی شیعریان دەکرد، لە نەوەی دووەم و سێیەمدا نووسەر و شاعیری بەڕاستی پەیدابوون و دەوری گرنگییان هەبوو لە پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا. مێژووی ئەدەبی کوردی ناوی گەلێکیان دەور دەکاتەوە. هەندێ لەمانە دەچنە ناو نەوەی یەکەمەوە، واتە ئەوانەی تەمەنیان درێژ بوو. لەم ماوەیەدا پێویستە یادی هەندێکیان بکرێتەوە. ئەمانە نووسەر و شاعیر بوون، بەرهەمی پەخشانی و شیعرییان هەیە.

ئەحمەد مرازی (١٩٠٢ - ١٩٦١)، جەردۆی گەنجۆ (١٩٠٦ - ١٩٤٥)، نادۆی خدۆ (١٩٠٧)، میرۆیی ئەسەد (١٩١٩)، ئوسفی بەکۆ (١٩٠٩ - ١٩٦٩)، سەمەند سیابەندۆڤ، لە بەرهەمهێنانی ئەدەبی داهێنراو جێ پەنجەیان دیارە. ئەمانە لە نەوەی یەکەمی بزووتنەوەکە بوون، لە خوێندەواریدا گەیشتنە ئەوەی ببن بەشاعیر و نووسەر و

دەوریان لە پێشخستنی ئەدەبدا هەبێ.

لە نەوەی دووەم و سێیەم، هەندێکیان تا ئێستا لە ژیان دان پێویستە ئاماژە بۆ ئەم شاعیر و نووسەرانە بکرێ:

سەعیدی ئیبۆ (١٩٢٤)، سمۆی شەمۆ (١٩٢٨)، کارلێنی چەچانی (١٩٢٩)، فەریکی ئوسب (١٩٣٤)، عەمەریکی سەردار (١٩٣٥)، جەردۆی ئەسەد، باخچۆی ئیسکۆ، ئۆردیخانی جەلیل، وەزیری ئەشۆ و هی دیکە.

ئەو شاعیر و نووسەرانەی وەک نموونە هەڵبژێردراون لە ئەدەبی کوردی قەفقاسی ڕووسیا، ژیان و کردەوەی ئەدەبییان بەپێی سەردەمی لە دایکبوونیان دەچێتە ناو لیستی هەموو شاعیر و نووسەرانی کوردستان کە ناویان لەم کتێبەدا هاتووە.

# بەشی چوارەم

## ئەدەبی کوردی لە سووریا

ناوچەکانی باشووری هەرێمی بۆتان لە باکووری کوردستان لە دوای جەنگی دووەمی گێتی کەوتە وڵاتی سووریا. جزیری بۆتان نێوەندێکی گرنگی ئەدەب و خوێندەواری کوردی بوو، بەڵام بزووتنەوەی ئەدەبی بەرادەی پێویست بەهێز نەبوو لەو ناوچانەی کەوتنە ناو دەوڵەتی تازە دروستبووی سووریا. ئەو خوێندەوارە کوردانەی لە ناو کوردی سووریا پەیدابوون لە بنج و بناواندا خەڵکی ناوچەکانی دیکەی کوردستانی باکوور بوون، بەتایبەتی ناوچەکانی باکووری جزیرە و دیاربەکر. لەوانە بەشی زۆری بەدرخانییەکانیش، بەدرخان پاشا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە لە دیمەشق بوو و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد، هەندێ لە منداڵەکانی لە وڵاتی شام زیندەگانییان دەکرد و منداڵی ئەمانە واتە نەوەی بەدرخانی پاشا لە ئاوەدانییە جیاوازەکانی شام لە دایک بوون، بەم هۆیەوە زمانی عەرەبی و تورکییان دەزانی لەگەڵ زمانی دایکیان. شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیر و خوێندەوارەکانی کوردی سووریا بەمنداڵی بەتەنیا یا لەگەڵ کەسوکاریان لە کوردستانی عوسمانی لە پاشانا کوردستانی تورکیا لە دەست زوڵم و زۆرداری ڕایان کردووە و ئاوارەی وڵاتی شام بوون.

کوردستانی باکوور لە دوای جەنگی دووەم و دامەزراندنی کۆماری تورکیا، لەبەرئەوەی بەشی زۆری کەوتە ناو ئەو وڵاتەوە و دەسەڵاتی کەمالی دانی بەمافی کورد نەهێنا، ئەدەب و خوێندەواری لەوێدا وەستا. ناوچەی بادینان و زاخۆش لە عیراقدا سوودی بۆ ئەدەب و خوێندەواری کوردی نەبوو، کوردی سووریا و قەفقاسی ڕووسیا بوون بەنوێنەری هەموو کوردستانی باکوور و تا ڕادەیێک ئەدەب و کولتووری کوردییان پاراست، پێویستە ئەوەش لە لای هەموو کەسێک ڕوون بێ کوردستانی باکوور لە لایەن ئەدەبەوە بناغە و بنکەیێکی ئەوەندە بەهێزی هەبوو هیچ مەترسییێک لە ناوەوە نەبوو ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی لەو ناوچانەدا لەناوبچن، بەبەڵگەی ئەوەی لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا لە ناوچەکانی بادینان و زاخۆ زوو خۆیان گرتەوە.

لەبەر دواکەوتوویی ناوچە کوردنشینەکانی سووریا لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و نەخوێندەوارییەوە زۆربەی ڕۆشنبیرانی کورد لە شارەکاندا دەژیان، بەتایبەتی دیمەشق و بێرووت، لەبەرئەوە پایتەختی سووریا نێوەندێکی گرنگی بزووتنەوەی ئەدەبی و خوێندەواریی کوردی سووریا بوو. بزووتنەوەی ڕزگاری لە سەرەتای سییەکانی سەدەی



بیستەم دەستی پێ کرد، بەسروشت سیاسی و ئەدەبی و ڕۆشنبیری بوو. دامەزراندنی کۆمەڵەی خۆیبوون و پێوەندی کوردانی سووریا بەکوردی تورکیا هۆیێکی گرنگ بوو بۆ بڵاوبوونەوەی هوشیاریی سیاسی و بیری نەتەوەیی.

ماوەی جموجۆڵی کوردی سووریا بەئازادی لەم ڕووەوە زۆر درێژ نەبوو، لە سەرەتای سییەکانەوە تا دوایی جەنگی دووەم، واتە تەنیا چوارده پازده ساڵێک بوو، لە پاش دەرچوونی فەرەنسا لە سووریا (١٩٤٦) مافی کورد لەوێ بەتەواوی پێشێل کرا.

### ڕۆژنامەگەری و بڵاوەخانەی هاوار

بەدرخانییەکان بەتایبەتی جەلادەت و کامیران لە گۆڕەپانی ڕۆژنامەگەری و بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردی کۆششی پڕ سوود و کاری بەکەڵکیان هەبوو. لە شاری دیمەشق هەموو کەرەستە و کەلوپەلی چاپەمەنی پەیدا دەبوو. لە پێش هەموو شتێک ئەم دوو برایە نەخشەی ئەلفوبێی زمانی کوردییان دانا لەسەر بنچینەی ئەلفوبێی لاتینی، ماوەیێک پێش ئەوان لە بەغدا توفیق وەهبی نەخشەییێکی بۆ ئەلفوبێی کوردی لاتینی دانابوو، هەروەها عەرەبی شەمۆ و مارۆگوولۆڤ لە قەفقاسی ڕووسیا کارێکی لەم جۆرەیان بەئەنجام گەیاند. لە پاشانا ئەم سێ هەوڵ و تەقەلایە بوو بەسەرچاوە بۆ دروستبوونی ئەلفوبێیێک پڕ بەپێستی زمانی کوردی بێ لەسەر بنچینەی تیپی لاتینی.

ئەم دوو برایە جەلادەت و کامیران بەدرخان لە دیمەشق و بێرووت دوو بنکەی ڕۆژنامەگەریی کوردییان دامەزراند، لە دیمەشق کاریان بەڕێوە دەبرد، لە پێشانا لە دیمەشق هاوکار بوون، لە پاشانا کامیران لە بێرووت و جەلادەت لە دیمەشق خەریکی کاری ڕۆژنامەگەری بوون. لە ساڵی ١٩٣٢ تا ساڵی ١٩٤٣ جەلادەت (٥٧) ژمارەی لە کۆواری «هاوار» بڵاو کردەوە. لەگەڵ ئەمە ماوەیێکیش خەریکی بڵاوکردنەوەی کۆواری «ڕۆناهی» (١٩٤٢ - ١٩٤٥) بوو، ئەمەیان بایەخی بەهەواڵی جەنگ دەدا. هەر بۆ مەبەسی هەواڵی جەنگ کامیرانیش لە بێرووت ڕۆژنامەی «ڕۆژا نوو» (١٩٤٣ - ١٩٤٦)ی بڵاو دەکردەوە. ئەم دوو ڕۆژنامەیە بایەخیان بەهەواڵی جەنگ دەدا و دەوری سوێندخۆرانی جەنگی دووەمی گێتییان دەخستە ڕوو بەتایبەتی فەرەنسا، هەردووکیان یارمەتییان لە دەوڵەتی فەرەنسا وەردەگرت. جگە لە ڕۆژنامەی «ڕۆژا نوو» کامیران پاشکۆیێکی ئەدەبی مانگانەشی بڵاو دەکردەوە بەناوی «ستێر».

لە سەرەتادا «هاوار» یەکێک بوو لە کۆوارە بەنرخەکانی کوردی. مەسەلەی زمان و

ئەدەبی کوردی بەتایبەتی و سامانی نەتەوەیی بەگشتی لە مەبەسە گرنگەکانی بوو. لە دوای دەستپێکردنی جەنگی دووەمی گێتی کۆوارەکانی دیکەیان شکانەوە سەر بڵاوکردنەوەی هەواڵ و ڕووداوەکانی جەنگ، لەگەڵ ئەوەشدا لایەنی زمان و ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردییان نەخستبووە پشتگوێ.

بەناوی «کتێبخانا هاوارێ» جەلادەت و کامیران نزیکەی بیست کتێبیان بڵاو کردەوە، لە بابەت ئەدەب و خوێندەواریی گشتییەوە، کتێبەکان ئەگەرچی بەقەوارە بچووک بوون، بەڵام بەناوەرۆک نرخی خۆیان هەبوو، بەتایبەتی بۆ بڵاوبوونەوەی نووسینی کوردی بەئەلفوبێی لاتینی. لە بڵاوکردنەوەی کتێبەکاندا دانەرانیان ڕەچاوی وەرگێڕانیان کردبوو لە زمانانی بێگانەوە بۆ زمانی کوردی.

## ڕۆشنبیرانی کورد لە سووریا

لە دوای جەنگی دووەم و دروستبوونی دەوڵەتی سووریا بەهۆی ئەوەی وڵاتەکە دەستبەسەری فەرەنسا بوو تا دوای جەنگ (١٩٤٦) و چوونە دەرەوەی فەرەنسا کورد جۆرە ئازادییەکی هەبوو ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و هونەری و یانەی وەرزش و شانۆی دامەزراندبوو. چاپەمەنی بەزمانی کوردی و لەسەر کورد بەزمانی عەرەبی بڵاو دەکرایەوە. ئەم جموجۆڵییە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییە ناوەرۆکی سیاسی هەبوو، تا ڕادەیێک پێوەندییان بەکوردی عیراقەوە هەبوو، زیاتر بەهۆی ئەوەی زمانی دووەمی هەردوو لایان عەرەبی بوو.

لە پاش دەرچوونی فرەنسا لە سووریا کە سیاسەتی قەومی شۆڤێنی عەرەب بەسەر کورددا سەپێنرا خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد لە دوو لاوە خەباتیان دەکرد، لایێکی سیاسی و لایەکەی دیکە ڕۆشنبیری. ئەگەر جیاوازییێک لە بیروڕای سیاسی لە ناو ڕۆشنبیراندا هەبووبێ، هەندێ لە یەکتری دوور بکەوتنایە هەڵوێستیان لە کاروباری ئەدەب و ڕۆشنبیری یەک بوو و لەگەڵ یەکتریدا کۆک بوون. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لەگەڵ نەوەی یەکەمی ڕۆشنبیری کورد نەوەی دووەمیش پەیدا بوو. لەو سەردەمەدا ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەری وەکو عوسمان سەبری و قەدری جان و جیگەرخوێن و ڕەشیدی کورد و نوورەدین زازا و هی دیکە لە مەیداندا بوون، جەلادەت بەدرخان کۆچی دوایی کردبوو، کامیران بەدرخانیش لە سووریا دەرچووبوو و جێنشینی پاریس بوو. داواکردنی مافی نەتەوەیی و مرۆڤایەتی بۆ کورد لە ڕووی سیاسییەوە و پاراستنی کولتووری کورد و



پەرەپێدانی کەوتبووە سەر شانی ئەو ڕۆشنبیرانەوە، بەتایبەتی لە دوای کوودیتاکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا. ڕۆشنبیرانی کوردی سووریا لە ناو بازنەیێکی سنوور کێشراو تا سەرەتای چارەکی دوایی سەدەی بیستەم هەموو هەلێکی لەباریان دەقۆستەوە بۆ داواکردنی مافێکی سیاسی، یا بڵاوکردنەوەی کتێبێکی کوردی. شیعر لە هەموو ڕۆژگارێکدا ئەگەر سانسۆری لەسەر بێ و چاپخانە نەبینێ بەئەزبەر لە ناو خەڵکی بڵاو دەبێتەوە. گەلێ لە بەرهەمی شیعری سیاسی و بیری کوردایەتی دەکەوتە بەر گوێی لاوان و سنووری دەبڕی و لە دەرەوەی سووریا بڵاو دەکرایەوە.

هەستی نەتەوەیی کوردی لە سووریا تەنیا لە ناو دڵ و دەروونی ئەو کەسانە نەبوو کە ژیانیان تەرخان کردبوو لە ڕێگەی سیاسەت و ئەدەب و ڕۆشنبیرییەوە خزمەتی کورد بکەن. کەسانی هەڵگری ئیدیۆلۆجییەتی دوور لە بیری نەتەوەیی هەڵوێستی تایبەتییان هەبوو بەرامبەر بەمیللەتی ستەمدیدە و زوڵم لێکراوی خۆیان. مەلا و مامۆستایێکی ناوداری هەموو گێتیی ئیسلام محەمەد سەعید ڕەمەزان بۆتی لە ساڵی ١٩٥٧ لە دیمەشق وەرگێڕانی «مەم و زین»ی خانی بەزمانی عەرەبی بڵاوکردۆتەوە. وەرگێڕانەکەی بەپەخشانە. ئەویش ناچار بووە ئەو دێڕانەی لە پێشەکی «مەم و زین»دا لە بابەت کوردەوە چاپی نەکا، چونکە سانسۆری سووریا ڕێگەی نەداوە. تەنیا ئەم دیاردەیە لە ناو کوردی سووریا لە ناوەوە نەبووە، لە هەموو کوردستانا گەلێ کەس لەسەر هەر بیروباوەڕ و ئیدیۆلۆجییەتێک بووبێ بەشێوازێکی تایبەتی کوردایەتی کردووە، ئەمە تاپۆی ڕۆشنبیرییێک و فیکرێکی دیاریکراو نەبووە.

## بەرهەمی ئەدەبی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە

ئەدەبی کوردی لەو وڵاتەدا ڕەنگدانەوەی قوتابخانەی ئەدەبی کوردییە لە باکووری کوردستان، هوشیارانە ئەدەبی کلاسیکی ئەو هەرێمەی پێش خستووە لە سەدەی بیستەمدا تا ئەمڕۆ. لە ڕووی بیناسازی ئەندازیاری شیعری کلاسیکییەوە هەموو مەرجەکانی پاراستووە، لە ناو قاڵبی کۆن ناوەرۆکی تازەی داهێناوە، جگە لەمە لە بابەتی «شیعری نوێ»دا هەنگاوی باشی هاویشتووە. واتە بەرهەمی شاعیرانی سووریا بووە بەنموونەی داهێنانێکی سەرکەوتوو لە ئەدەبی کوردستانی باکووردا.

بۆ بەڵگە شاعیری نوێخوازی کوردی سووریا تیرێژ لە قاڵبی شیعری عەرووزی کۆندا سکاڵا لەگەڵ میللەتی کورد دەکا و دەڵێ:

ئەی وەلات ئەز جانفیدایێ دەشت و زۆزانێ تەمە
جانفیدایێ ئاڤ و دەغل و باغ و بیستانێ تەمە
دەست لەسەر دارێ تفنگم چۆک ژ عەردی نابرم
پاسیبان و لەشکرێ ئارمانج و نیشانێ تەمە
سوند و پەیمان بێ لەسەر من دێ تە پارێزکم وەلات
خوێنا نارنجی برێژم مەردێ پێوانێ تەمە
جان بسۆژم دێ ب پێت و ئاگرێ جەنگا وەلات
ئاگرێ زەردەشتە بی ئەز ب خوە پەروانێ تەمە
بۆستەکی ئەز ژ تە نادەم ب وەلاتی هند و چین
تو بەهەشتا مللەتە ئەز سوور و گەردانێ تەمە
دێ ببڕم ئەز ب شوور و خەنجەران دەستێ چەپەل
هیمێ بنتار و ئەساسێ برج و ئەیوانێ تەمە
دێ ب هێز و هنەرا خوە ئەز دێ تە پارێزکم وەلات
ئالا رەنگین ژۆرڤە هلدەم ئەز ل سەربانێ تەمە

وەک ئاشکرایە شاعیر ئەم شیعرەی لەسەر بەحری عەرووز ڕێکخستووە، تەنیا بەیەکێتیی قافیە نەوەستاوە، لەسەر بنچینەی پاش قافیە دایناوە. شیعرێکە بەهەوایێکی کلاسیکییانەی پڕ لە ئاهەنگ و زەمزەمە دەکەوێتە بەر گوێ. بەڵام بەناوەرۆک موناجاتێکە شاعیر لەگەڵ هاووڵاتییانی کورد و نیشتمانی کوردستانی دەکا، سۆزی ئەڤین و خۆشەویستی لێ دەتکێ.

هەر ئەو شاعیرە بەشێوازێکی شیعری دیکەی جیاواز لە شیعری پێشوو گفتوگۆ لەگەڵ کورد دەکا و دەڵێ:

بشکێن ڤان قەید و زنجیرا
بب هەڤالەک سەرکەتی
وا ل ئیران و عیراقێ
جەنگ و حالان و شەڕە
خوین د ڕێژە وا ژ جانێ
خورتین کورد یێن ب هەڤ کەتی



هەروەکی (تیرێژ) دبێژە
سەرفرازییا مەیە
ئەم خوە دی مافن بزانن
یێ کو ئایل تم کەتی

تیرێژ ئەم شیعرەی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی حەوت و هەشت بڕگەیی داناوە، ئەمانە لە کێشە هەرە سووکەکانی شیعری کوردین. دە نیوە دێڕی دابەش کردووە، بوون بەتاکێک و دوو چوارین بە مەرجێک قافیە تاکەکە و نیوە دێڕی دوایی هەردوو چوارین لەسەر یەک قافیەن، ئەمە ئاهەنگێکی تایبەتی بەشیعرەکە داوە. بێ گومان لیریکەکە بەڕوخسار و ناوەرۆکەوە دەچێتە ناو چوارچێوەی «شیعری نوێ»وە.

لیریک وەکو نموونەی لەو بەڵگانەی پێشوو بەرچاو کەوت، بابەتی سەرەکی بەرهەمی ئەدەبی کوردی سووریایە، جگە لەوە ئەم بابەتانەی لای خوارەوەش دەکەونە بەرچاو:

١- شاعیران بایەخی زۆریان بەپۆبێم (چیرۆکی شیعری) داوە، ئەمە بابەتێکی هەرە گرنگە لە مێژووی شیعری کلاسیکی و شیعری میللیی سەرزاری (فۆلکلۆری) کوردیدا. لە ناو ئەدەبی کوردی ئەو وڵاتەدا هەردوو بابەتی ئەم جۆرە شیعرە هەیە، واتە کورت و درێژ، کورتەکەیان بۆ ناوەرۆکی کورتە چیرۆک بەکار دەهێنرێ بەشیعر، درێژەکەشیان بۆ چیرۆکی درێژ (ڕۆمان) بەکار دەهێنرێ بەزۆری بۆ بەسەرهاتی دڵداری کوڕ و کچەکانی وەک مەم و زین، لەیلا و مەجنوون، شیرین و فەرهاد و هی دیکە.

٢- پەخشان جێگەی دیاری هەیە لە ناو ئەدەبی کوردی سووریا. بابەتەکانی وتار و چیرۆک پێشکەوتوون. کاریگەریی پەخشانی کوردی عیراق بەسەریانەوە هەیە یا ڕاستەوخۆ، یا بەهۆی زمانی عەرەبییەوە، چونکە کوردی هەردوو لایان سووریا و عیراق ئاگاداری زمانی عەرەبین و پەخشانی عەرەبی بەتایبەتی بابەتی وتار و چیرۆکی کورت لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە دەوریان بووە بۆ خەملاندنی وتاری هونەری و چیرۆکی کوردی.

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم ڕۆشنبیر و نووسەر و شاعیرانی کورد لە سووریا هەنگاوی گەورەیان نا بۆ پارێزگاری کولتووری کورد، بەتایبەتی ئەدەب. هەروەها بۆ پێشخستنی ئەو ئەدەبە و ئێستا بووە بەنموونەی سامانی نەتەوەیی هەموو میللەتی کورد.

لەو ماوەیەدا لە کوردستانی سووریا کۆمەڵێک شاعیر و نووسەر هەڵکەوتن، ڕۆڵی

گرنگیان هەبوو لە پێشخستنی ئەدەبی کوردی. پیشان دان و لێکۆڵینەوە لە ژیان و بەرهەمی ئەدەبیی هەندێکیان بەپێی سەردەمی ژیانی ئەو شاعیر و نووسەرانە دەکەوێتە ناو ئەو بەشانەی بۆ شاعیر و نووسەران لەم کتێبەدا تەرخان کراون.

***

ئەدەبی کوردی لە سووریا نموونەی ئەدەبی کوردستانی گەورەی تورکیایە. لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بەهۆی سیاسەتی شۆڤێنی تورک زمانی کوردی قەدەغە بوو، بەڵام لە دوای جەنگی دووەمی گێتییەوە بزووتنەوەی سیاسی لە ناو کوردی تورکیا بەهێز بوو، لە پاڵ ئەو ڕێنیسانسێکی ڕۆشنبیری و ئەدەبی دەستی پێ کرد، ئەمە هەمووی یەکی گرتەوە لە ناو چوارچێوەی کوردستانی گەورەدا. پێشکەوتنی ئەدەبی لە کوردستانی عیراق و ئێران پاڵپشت بوو بۆ بووژانەوە و پێشکەوتنی ئەدەبی کوردی لە کوردستانی باکووردا.

# بەشی پێنجەم

## جەوهەری

## ١٨٧٥ - ١٩٥٨

### ژیانی

حەسەن کوڕی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی مەلا حەسەنی زەردەڕووە، زەردەڕوو گوندێکە لە ناوچەی ئالانی سەردەشت، لە ساڵی ١٨٧٥ لەو گوندە لە دایک بووە. لە پاشانا ماڵیان گوێزراوەتەوە گوندی کوێرەگوێز لە ناوچەی سەقز. هەموو قۆناغەکانی خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت تەواو کردووە. ژیانی فەقێیەتی لە زۆر جێگەی کوردستان بردۆتە سەر، لەوانە لە گوندی جامەرد لە ناوچەی بۆکان خەریکی خوێندن بووە، لە پاشانا هەر لەو ناوچەیەدا ماوەتەوە لە گوندی عەمبار هەندێکی دیکەی خوێندنی تەواو کردووە، ئەوجا ڕووی کردۆتە سابڵاغ (مەهاباد) و لە مزگەوتی سوور نیشتۆتەوە. ئینجا بۆ خوێندن بەرەو سلێمانی و کەرکووک و هەولێر کەوتۆتە ڕێ، زۆر لەو ناوە نەماوەتەوە، وا دەردەکەوێ هۆی خوێندنی بۆ نەڕەخساوە و ژیانی ئەو ناوەی زۆر بەدڵ نەبووە. لەبەرئەوە ئەم جارەیان بەرەو شاری سنە دەبێتەوە و لە مزگەوتی دارولئیحسان نیشتەجێ دەبێ و لەوێ خوێندنی تەواو دەکا. بەم جۆرە خەریکی پیشەی مەلایەتی دەبێ و ماوەیێکی زۆر لە ژیانیدا لە ئاوایی و گوندەکانی ناوچەی بۆکان و سابڵاغ (مەهاباد) دەباتە سەر و مەلایەتی بۆ خەڵکەکە دەکا.

حەسەن بۆ گێتیی شیعر نازناوی «جەوهەری» هەڵبژاردووە، شیعری بەم ناوە تۆمار کردووە. خۆی بەمریدی بنەماڵەی سەیدانی نەهریی شەمدینان زانیوە بەتایبەتی شێخ عەبدوڵڵای نەهری. بەپیری تووشی کارەساتێکی جەرگبڕ بووە بەهۆی مردنی مەلا عەلیی کوڕی، لە تەمەنی لاویدا جوانەمەرگبوونی ئەم کوڕە تاقانەیەی کارێکی زۆری لێ دەکا، بیر و هۆشی تێک دەچێ، واز لە خۆشی ژیانی سەر ڕووی زەوی دێنێ. ناچار خۆی دەگەیەنێتە نزیک شێخ عەبدوڵڵای نەهری لە سایەی ئەودا خۆی گۆشەگیر دەکا. لێرەشدا ئۆقرە ناگرێ و پێش مردنی دەگەڕێتەوە گوندی کوێرەگوێز و لە ماڵی مەلا ساڵحی برای دەژی تا کۆتایی تەمەنی. لە ساڵی ١٩٥٨ لەو گوندە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە.



### شیعری

هەستی کاریگەری گوێی مۆسیقی جەوهەری کردووە بەشاعیر، گەڕانی لە کوردستانی ئێران و عوسمانی کردوویەتی بەشارەزا لە هەڵسوکەوتی ڕۆشنبیری و خوێندەواری نەتەوەیی. شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە لە نێوان شیعری کلاسیکی بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی دەوەستێ. هەندێ جار هەردوو بابەت تێکەڵ بەیەکتری بوون و هەندێ جاری دیکە بەتەنیا وێنەی هەردوو بابەتەکە دەخەنە ڕوو. لە کێشدا بەحری عەرووزی هەزەج و ڕەمەلی بەکارهێناوە، لە کێشی خۆماڵیدا هەشت بڕگەیی و دە بڕگەیی هەیە. لە شیعری کلاسیکیدا پەیڕەوی یەکێتیی قافیەی کردووە، لە شیعری کێشی خۆماڵیشدا جووت قافیە (مەسنەوی) بەکارهێناوە. شیعری درێژ (قەسیدە)ی کەمە، زۆربەی بەرهەمی لە بابەتی لیریکی کورتن، واتە نێوان حەوت تا دوازدە دێڕە شیعر، بەڵام پارچە (قیتعە)ی زۆرە، شیعری نێوان سێ نیوە دێڕ شیعر تا حەوت نیوە دێڕ. هەروەها لە دیوانی شیعریدا قەسیدەی بەندی شەشین دەکەوێتە بەرچاو (ا ا ا ا ب ب).

شیعری جەوهەری لە ڕووی ناوەرۆکەوە، هەندێ تەسکە، بۆ هەموو مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی نەچووە. بابەتە بنچینەییەکانی بەرهەمی شیعری بریتین لە:

١- نەعتی پێغەمبەر، لەمەدا وەک پڕ باوەڕێک بەئایینی ئیسلام خۆی پیشان دەدا.

٢- ئامۆژگاری و پەند و پاڕانەوە، لە پاڵ ئەمەدا هەندێ تەنگوچەڵەمەی ژیانی خۆی و گیروگرفتی کۆمەڵایەتی دەخاتە ڕوو.

٣- گیرۆدە و گرفتاری بنەماڵەی شێخانی نەهرییە، خۆی بەمرید و دەروێشی تەریقەتەکەیان دەزانێ. شینی بۆ شێخ عەبدولقادری نەهری کردووە، بەهەناسەیێکی ئایینییانەی ئیسلام هێرش دەباتە سەر کەمالییەکان، بەناوی ئایینەوە کوردایەتی دەکا. هەروەها ستایش و پێدا هەڵدانی زۆرە بۆ شێخ عەبدوڵڵای نەهری و شانازی بەبنەماڵەیان دەکا.

٤- شیعری موناسەباتی زۆرە، دەکرێ بەیەکێک لە شاعیرە دیارەکانی ئەم جۆرە شیعرە بژمێررێ، بەم هۆیەوە نامەی شیعری ستایش و پێدا هەڵدانی زۆرە بۆ سەردار و ئاغا و میر و شێخانی کورد، لە پاڵ ئەوانەوە مەدح و ستایشی بۆ ڕەزا شای پەهلەویش هەیە، لەو کاتەی جەوهەری پیرۆزبایی لە سەردارێکی کورد دەکا بەهۆی ئەوەی شا دار

عەساییێکی بەنرخی بۆ سەرداری کورد بەدیاری ناردووە، ستایشێکی زۆری ڕەزا شاش دەکا و دار عەساکەی لەگەڵ عەساکەی مووسا پێغەمبەر بەراوورد دەکا.

٥- لە ساڵی ١٩٣٦ شەریعەتی ئیسلامی بەپێی ئایینزای ئیمامی شافعی بەفارسی لێکداوەتەوە بۆ کوردانی ئێران بەڵام دەسەڵاتی تاران ڕێگەی بڵاوکردنەوەی نەداوە. لە پاشانا لە ساڵی ١٩٤٨ عەقیدەی بەکوردی نووسیوەتەوە، ئینجا مەولوودنامەی بەپەخشان داناوە، لە کۆمەڵی کوردەواری ئێراندا دەخوێندرێتەوە.

شیعری جەوهەری ئەوەی لە بەردەستدایە کەمە. شارەزایانی ئەدەبی کوردی لەسەر ئەو باوەڕەن شیعری لەوەی لە ناوەوەیە زیاترە. بەگشتی زمانی شیعری جەوهەری ڕەوان و ئاسانە، مانا لە ڕووە، بەخوێندنەوە لە ناو تیپ و وشە و ڕستەکاندا دەجووڵێتەوە.

## نموونەی شیعری

١

لە پارچە شیعرێکیدا جەوهەری بەموقتەدیری پیاو و سەرکاری سەرداری بۆکان حەمە حوسێن خان دەڵێ:

ئەی جەنابی موقتەدیر ئەی هەمدەمی شەوگاری دوور
بۆچ ڕەفیقی خۆت بەجێ هێشت و بەتەنیا چوویە ژوور
گەر دەڵێی تۆ ئەهلی عیلمی ئێرە جێگای تۆ نییە
خێر لە حەق گەر لانەدەی هەر بۆ مەیە حوور و قوسوور
داری تووبا سێبەر و بەرگ و بەری هەر بۆ مەیە
هەر دەبێ من بچمە ژێری و تۆ تەماشاکەی لە دوور
تاقەتی هیجرم نییە توخودا لە من دووری مەکە
یا ئەتو زوو بێرە دەر، یا فەرموو تا منیش بێمە ژوور

سەرداری بۆکان خوشکێکی بووە بەناوی تووبا خانم لە گوندی حاجی لەک لە ناوچەی بۆکان دانیشتووە و خێزانی عەبدوڵڵا خانی شێخ ئالی خان بووە. جەوهەری شاعیر ئارەزووی بینینی تووبا دەکا، سەرداری موقتەدیری پیاوی لەگەڵدا دەنێرێ، بەسواری ولاغ ڕوو لە گوندی حاجی لەک دەکەن. کە دەگەنە ماڵی خانەخوێ موقتەدیر جەوهەری لە دیوەخانە دادەنێ و خۆشی دەچێتە حەرەم لای تووبا خانم. ماوەیێکی پێ دەچێ شاعیر بێ



تاقەت دەبێ. دەست دەداتە قەڵەم و ئەم دێڕە شیعرانە دەنووسی و دەینێرێتە ژوورەوە. موقتەدیر بۆ تووبا خانمی دەخوێنێتەوە هەرچەندە ئەو ژنە نەخوێندەوار دەبێ و ڕەنگە لە شیعرەکەش نەگەیشتبێ، بەڵام ئاگاداری جێ و مەقامی جەوهەری بووە وەکو شاعیرێک و مەلاییێک، پێشوازییێکی گەرمی لێ دەکا و پۆزشی بۆ دەهێنێتەوە.

لە شیعرەکەدا وێنەی هونەری ڕەوانبێژی جوان دەکەوێتە بەرچاو، کە بەراوورد لە نێوان ناوی ئەو ژنە دەکا کە تووبایە لەگەڵ ناوی درەختی تووبا کە لە نزیک بارەگای خوایە لە بەهەشتدا. جەوهەری خوێندەوار و شاعیر و زانا، دیارە جێگەی بەهەشتە و پێویستە لە کۆشک و باڵەخانەی بەهەشتدا بژی لە سایەی داری تووبا بحەسێتەوە، موقتەدیریش وەکو نەخوێندەوارێک دەبێ لە دوورەوە تەماشا بکا.

٢

جەوهەری شیعرێک لە وەسفی ئاش دادەنێ بەناوی «ئاشی جامەرد»ەوە، تێیدا دەڵێ:

ئوستادی دانا میرزای خۆش ئەخلاق
بەعیلم و سەنعەت مەشهووری ئافاق
وەستا ئەحمەدی ئەڵڵا مرادی
نێوت ڕۆیشتووە وادی بەوادی
ئەتۆ شەخسێکی ڕەند و جەوانمەرد
زەحمەت قەبوول کە تاکو جەوانمەرد
تەمامە ئاشێک لە نوێ بیناکەم
بەشیعری کوردی با بۆت تەواوکەم
دوو جۆگەی ببێ بەڕۆژ و نسار
نەمەند و نەخوڕ تەرازوو هەموار
سەرەنیای تەراز مەند و بەمیزان
بەڕاستە و گونیا وەک حەوزی بۆکان
دۆڵی داری بێ ساف و بێ گرێ
هێندە لەبار بێ دەستی لێ نەدرێ
زەمبوورەی گەورە ساف و مودەووەر
کیسەڵ بێ زەحمەت پێیدا بێتە دەر

ئاشێک بێ سەخرە ڕێی پێ نەبردبێ
بینای وا عالی هیچ کەس نەی کردبێ
بەردە ئاشەکەی حەوبست و گێڕ بێ
گرمە و زرمەکەی وەک نەڕڕەشێر بێ
گەنم بکا بەئارد ڕۆژێ سێ تەغار
گرمە گرمی بێ وەک هەوری بەهار
چەقەنەی وا بێ لە هاتنی داندا
نەزیری نەبێ لە ڕووی دنیادا
ئا لەم تاریفە هیچی کەم نەبێ
خەڵاتت دەکەم ئەگەر ئاوا بێ
تەوەرە و بستە و پەڕە و تۆپەکەی
ژێر دۆزەقە و ئاو مووڕووە سەنگەکەی
هەمووی ڕێکوپێک ڕاست و مونەززەم
هیچ نەقسی نەبێ نە زۆر و نە کەم

جەوهەری لە ساڵی **١٩٥٣** لە ئاوایی جامەرد لە ناوچەی بۆکان مەلای گوند بووە. قاسم ئاغای جامەرد پرۆژەی دروستکردنی ئاشێک دادەنێ، بۆ ئەم مەبەسە داوا لە شاعیر دەکا نامەیێک بۆ وەستا ئەحمەدی ئەڵڵا مرادی بنووسێ بۆ ئەوەی سەرپەرشتی دروستکردنی ئەو ئاشەی بۆ بکا. ئیتر شاعیر ئەم شیعرەی بۆ دەنووسێ و وەکو نامەیێک بۆ وەستای پسپۆڕی دەنێرێ. نرخی هونەریی ئەم شیعرە لەوەدایە شاعیر هێندەی وەستای دەست ڕەنگین لە نهێنییەکانی پیشەسازی ئاش دەزانی و شارەزا و ئاگاداری هەموو ئەو زاراوانەیە کە بۆ کەلوپەلی بەکار دەهێنرێن. ئەم شیعرە لەو کاتەی وەک نەخشە و دیزاینێک دەکەوێتە بەرچاو بۆ ئەو وەستایەی ئاشەکە دروست دەکا، هەر لەو کاتەدا وەک داهێنانێکی ئەدەبیی جوان خۆی دەنوێنێ.

شاعیر کۆمەڵێک زاراوە و ناوی ئەو ئامێر و کەلوپەل و شتومەکانە دێنێ کە پێوەندییان بەئاشەوە هەیە، لەوانە:

سەرەنیا، دۆڵ، زەمبوورە، ئاشی حەوت بست، چەقەنە، تەوەرە، بست، پەڕە، تۆپ، دۆزەقە، مووڕووە سەنگ.



### ٣

لە بابەت بەفر و سەرما و سۆڵەوە جەوهەری دەڵێ:

بەفر هاتە خوار بۆ دەوری دزێ
لە ترسی سەرما دڵم دەلەرزێ
کە بێتو وا زوو کوورە دانەنرێ
بێ شک (جەوهەری) لە سەرما دەمرێ

جەوهەری ئەم چوارینەی بەو هۆیەوە نووسیوە، جارێکیان ڕوو دەکاتە گوندی دزە بۆ لای شێخ عەبدوڵڵای نەهری، تووشی بەفرێکی زۆر دێ دەوری گوندی دزەی داوە. لێرەدا شاعیر کارێکی باشی کردووە، لەسەر دەستووری کۆن لە نیوە دێڕی دوایی چوارینەکەی نازناوی خۆی تۆمار کردووە، ئەگەر نا ئەمە نەبووایە شیعرەکە وەکو گۆرانییێکی میللیی سەرزار دەکەوتە بەرچاو.

### ٤

جەوهەری لە گوندی دزە یادی مەلا ساڵحی برای و کەسوکاری بەم نامە شیعرییە دەکاتەوە:

هەوای دیداری یارانی وەتەن کەوتۆتە سەر فیکرم
هەتا ئەم جار دەیانبینم بەچاوانم خودا نەمرم
لە هیجرانی مەلا ساڵحی برام و دوو نەوەی دایم
بەچاوی پڕ لە فرمێسکم کوڵی گریان و شین دەگرم
بەئیزنی حەزرەتی شێخ چەندە پێم خۆشە بەدڵ خۆشی
لە وورمێ سواری ماشێن بم جەوازی ڕێگە وەربگرم
لە سابڵاغ و لە میاندواو و لە بۆکان تێپەڕم یەکسەر
لە هیچ لایێ هەتا سەر مەرقەدانی باغچە خۆ نەگرم
لە نێو ئەو سێ خەلیفانە بەئیخلاس و بەهوشیاری
لە ئەرواحی ئەوان زاتانە فەیز و بەهرە وەربگرم
لە بەرپێی دایک و باوک و ژوورسەری کاکە عەلی چەند ڕۆژ
بەگریان سەر لەسەر ئەو مەرقەدانە ساتێ هەڵنەگرم

بەچاوی پڕ لە ئەســـرین دەست هەڵێنم ڕەببی ئەمـــجـــارە
بەئیـــمـــانێکی زۆر کـــامـــیل بەلوتف و ڕوحـــمی تۆ بمرم

ئاهێکی قـــووڵ و فـــرمـــێـــسکێکی گـــەرم لە دڵ و دەروونێکی ســـووتاو و چاوێکی خوێناوییـیـەوە هەڵقوڵاون لە حەژمـەت دووری لە زێدی لە دایکبـوون و گەمـەی سـەردەمی منداڵی. جەوهەری لەم شیعرە پڕ سۆزەدا یادی نزیکەکانی خۆی دەکاتەوە، بەتایبـەتی مەلا سـاڵحی برای، هەروەها باس لە شـێـخی تەریقـەتی دەروێشـیـزمی دەکـا، گـیـانی ئەو خۆشەویستییە لە پەیکەری شێخ عەبدوڵڵای نەهریدا دەبینێ، یادی سێ خۆشەویستانی دەکـاتەوە لە یاوەرانی ڕێکخـراوی دەروێشـیـدا. مـەبەسی لەو سێ کـەسـە، یا ئەو سێ خەلیـفەیەی تەریقەتی دەروێشی ئەم زاتانەن: خەلیفە مەلا عـەبدوڵڵای زەردەڕوو و خەلیفە مەلا محەمەدی ئەمینی باغچە و خەلیفە شێخ قەیوومی مەهابادی.

ئەم شیعرە ڕەنگدانەوەی دڵێکی خاوەن هەستە بەرامبەر بەخاک و بەرامبەر بەمرۆڤ، لە نیازێکی ڕاستەوە هەڵقوڵاوە، ڕەشبینییەکەی لە ئەنجامی کارەساتێکە لە جەوهەری شاعیر ڕووی داوە بەهۆی جـوانەمـەرگـبـوونی تاقـانەکـەی، لەبەرئەوەیە تەعـبـیـر لە واقـیـعـێکی سایکۆلۆجی دەکا.

***

حەسەن کـوڕی مەلا عـەبدوڵڵای جـەوهەری، شـاعـیـرێکە بەرهەمی کەم بوو. شـیـعـری لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە لە قالبی شیعری لاسایی و ئاسایی نەچۆتە دەرەوە. لە هەندێ بابەتەکـانی شـیـعـری وتووە، بەتایبـەتی لـە وەسفـدا هونەری نواندووە. زمـانی ئاسـانە، لە ئەدەبی میللییەوە نزیکە. کێشە سووکەکانی عەرووزی و سیلابی خۆماڵی بەکار هێناوە. لە شیعری ستایش و موناسەبەت سەرکەوتووە. کەسێک بووە باوەڕی بەئاین بەهێز بووە، شـەریعـەت و تـەریقـەتی تێکەڵ بەیەکـتـری کـردووە، بەهەناسـەیێکی ئاییـنی ئیـسـلامی کوردایەتی کردووە.

## بەشی شەشەم

## بێخود

## ١٨٧٨ - ١٩٥٥

### ژیانی

مەحموود کوڕی مەلا ئەمین کوڕی مەلا ئەحمەدی چاومارە. لەقەبی بنەماڵەی مفتییە. بێخودی وەک نازناو بۆ تۆماری شیعری هەڵبژاردووە. لە ساڵی ١٨٧٨ لە سلێمانی لە دایک بووە. هەموو قۆناغەکانی خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت تەواو کردووە بەپێی ئەو بەرنامەیەی بۆ خوێندنی ئایینی دانرا بوو لە زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی. لە ناو خەڵکی بەمەلا مەحموودی بێخود ناسراوە لەگەڵ ئەوەی مەلایەتی نەکردووە بەپیشە و لەسەری نەژیاوە.

لە ساڵی ١٩٠٠ لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی بووە بەمووچەخۆر و کاروباری دادگای هەڵەبجەی پێ سپێرراوە. لە دوای ئەوە ماوەیێکیش مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بووە لە سلێمانی لەگەڵ ڕەفیق حیلمی و مەلا عەبدوڵڵای زێوەر پێکەوە مامۆستاییبیان کردووە. لە پاش ماوەیێک لەم کارە دوورکەوتۆتەوە و بەدرێژایی ژیانی لە کاروباری میری نزیک نەکەوتۆتەوە. هەموو ژیانی لە سلێمانی بردۆتە سەر. کەسوکاری بێخود دەستڕۆیشتوو بوون، یارمەتیان دەدا، بۆیە دەست کورتی بەخۆیەوە نەدیوە و ژیانی نەرمونۆڵ بووە، لە سایەی خزمەکانییەوە باش ژیاوە. گەشتی زۆر بووە بەتایبەتی بۆ کەرکووک، لەو گەشتوگوزارانەیدا ماوەیێکی زۆر لای خزمەکانی ماوەتەوە. بەم جۆرە لە ژیانی بێخوددا بەگشتی ڕووداوی گرنگ و ناخۆش نابینرێ. شاعیر لە ڕۆژی ٢٥ی ئاغستۆسی ١٩٥٥ لە سلێمانی سەری ناوەتەوە.

### شیعری

#### لە ڕووی ڕوخسارەوە

١- کێشی شیعری بێخود هەمووی لەسەر بەحرەکانی عەرووز ڕێک خراون. لەسەر دەستووری شیعری کلاسیکی ڕۆیشتووە و لە یەکێتیی قافیە لای نەداوە. بەشێکی زۆر لە بەحرەکانی عەرووز لە شیعریدا بەکارهێنراون، لەوانە: هەزەج، ڕەمەل، موزاریع، موجتەس، ڕەجەز، خەفیف، کامیل.

٢- لە دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی تەنیا ئەم دەنگانەی بەکارهێناوە: ا ت ث ح د ر ف ل م ن و وو (ـە - ە) ی ێ. بەپێی کەمی شیعری پاش قافیەی زۆرە. لەم وشانەدا دەبینرێن: ئەکا، هات، غەوس (غەوث)، گوناح، کرد، کورد، خورشید، پێغەمبەر، دڵ، کووەیت (شاری کوێت)، خادیم، خۆم، دڵی من، منە یارەب، ئاخۆ، کێ بێ، ئەو، بوو، یا ڕەسووڵەڵڵا، بەرزنجە، بۆچییە، ئەگری.

٣- دیوانی شیعری بێخود بەگشتی لە غەزەل و قەسیدە پێکهاتووە، زۆربەی غەزەلە، لەمانە ڕەچاوی ژمارەی دێڕە شیعری کردووە کە بریتییە لە حەوت و نۆ و دە و دوازدە دێڕە شیعر.

بایەخی زۆری بەقەسیدە داوە، دەوروبەری پازدە قەسیدە لە دیوانیدا بەرچاو دەکەون، ژمارەی دێڕەکانیان لە ١٥ دێڕەوە تا ٣٢ دێڕن. لە بابەتەکانی دیکەی شیعر لە ڕووی ڕوخسارەوە پێنجینێکی ١٩ بەندی هەیە لەگەڵ کۆمەڵێک چواربن و تاک. شیعری دوو شاعیریشی کردووە بەپێنج خشتەکی فەوزی و زێوەر.

٤- لە ڕووی زمانەوە بێخود دەوڵەمەندە. ڕاستە لە فەرهەنگی زمانی کلاسیکیی سەدەی نۆزدەم لای نەداوە، لەگەڵ ئەوەشدا وشە و زاراوەی ئەوتۆی بەکار هێناوە یەکسەر دەزانرێ شیعرەکە لە نیوەی یەکەم و ناوەڕاستی سەدەی بیستەم وتراوە، لەوانە: ڕەئیسی سیححە (حەکیم باشی)، موستەشفا (نەخۆشخانە)، ڕۆماتیزم (نەخۆشی باداری)، عیرقونیسا (باداری لاق)، تیفۆس (مەلاریا، لەرزوتا)، کنین (دەرمانی لەرزوتا)، شرینقە (دەرزی)، سینەما، مەلها، ڕەققاسە و مەدامە (ژنی سەماکەر)، ڕادیۆ، پاتری، ئەلەکتریک (کارەبا)، مەغازە، ماکینە (ئامێر و فابریقە)، قۆڵۆنیا (عەتر)، پۆتینی باتا، موفەتیش، لیجنەی ئینتیخاب، نادی (یانە)، سکرتێر، جوگرافیا، فڕن، سەموون (نان)، قونبولەی زەڕڕی (ئەتۆم) و هی دیکە.

ئەم وشە و تەعبیرە تازانەی بێخود بەکاری هێناون لە دوای دروستبوونی دەوڵەتی عیراق هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە. بەڕاستی ئەگەر ئەم وشانە نەکەوتبانایە ناو ئەم شیعرانەوە کەس هەستی بەوە نەدەکرد شیعرەکان زادەی بیری شاعیرێکن لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ژیاوە.

نموونەی وێنە ڕەوانبێژییەکانی شیعری کلاسیکی کوردی کە لە ئەنجامی دروستبوونی شیعری ئیسلامەوی هاتبووە ناوەوە لە شیعری بێخوددا زۆر نییە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ لەم لایەنەوە شیعری لاوازە، بەپێچەوانەوە داهێنانی تایبەتی بەخۆی لە ڕەوانبێژیدا هەیە.

## لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

بێخود یەکێکە لە مامۆستاکانی شیعری لاسایی کلاسیکی کوردستانی باشوور لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا. هەموو مەرجەکانی پاراستووە، بەتایبەتی لە ناوەڕۆکە تازە بابەتەکانی وەکو کوردایەتی و نیشتمانپەروەری و سیاسەت لای داوە، لەو کاتەی شاعیرانی هاوتەمەن و هاوڕێی خۆی لەگەڵ شیعری دڵداری هەوای کۆن بایەخی زۆریان بەنیشتمانپەروەری دابوو.

دیوانی بێخود شیعری ئیلاهییات (موناجات و نعت) و غەزەل و وەسف و ستایش و پێداهەڵدان و شیوەن دەور دەکاتەوە. ژیانی کۆمەڵایەتی لای بێخود تەنیا لەو پێوەندییە دەبینرێ کە لەگەڵ دۆست و ناسیاوی خۆی هەیبووە. بەم پێیە ناوی کەسان لە شیعریدا زۆر هاتووە، بەتایبەتی ئەوانەی ستایشی کردوون یا فرمێسکی بۆ ڕشتوون بەشیعر. زۆر یادی کەرکووک دەکاتەوە چونکە خزم و کەسی نیشتەجێی ئەوێ بوون هەمیشە بەسەری دەکردنەوە و ماوەیێکی زۆر لەگەڵیاندا دەمایەوە.

لە شیعری بێخوددا هەست بەدڵدارییێکی وێنە کێشراو ناکرێ. ئەمە ئەوە ناگەیەنی سۆزی بەکوڵ نەبووە. بەگشتی شاعیر وا خۆی پیشان دەدا لە ناو دڵیدا هەڵگری دڵدارییێکی ئاسمانی و زەمینییە. لە ئاسمانییەکەیدا خۆی کردووە بەدەروێش و سۆفی واتە سەر بەتەریقەتی قادری و نەقشبەندی، بەڵام بەڕاستی هیچ یەکێکیان نەبووە، جگە لەوەی نابێ مرۆڤێک سەر بەدوو تەریقەت بێ. لە خوێندنەوەی شیعری بێخوددا ڕاستییێک دەردەکەوێ ئەویش ئەوەیە ئەگەر مەیلی سۆفیزمی هەبووبێ شێخە گەورەکەی پێغەمبەرە، واتە شەریعەت و تەریقەتی تێکەڵ بەیەکتری کردووە، جگە لەوەی لە شیعریدا هەست بەداهێنانی شیعری سۆفیزم و سیمبۆلیزم (ڕەمز) ناکرێ، بەڵکو وێنەی وەسفی سۆفیزمی هەیە، ئەویشیان زۆر نییە.



## نموونەی شیعری

### وەسف و دڵداری

١

بێخود وەسفی پەرێشانی خۆی دەکا لە ئاوڕنەدانەوەی دلبەر:

لە دلبەر گفتوگۆیێکم نەبیست ئەی سینە ئەفغانێ
لە لێوی پێکەنینێکم نەدی ئەی دیدە گریانێ
دەسم ناگاتە شووشەی گەردنی مینایی ئەی ساقی
دەمم ناگاتە چاوی ئەی عەرەقخۆرینە فنجانێ
پەرێشانم لە ڕووی ئەو شۆخە لاچۆ ساتێ ئەی پەرچەم
دڵم بەینێکە زۆر تاریکە ئەی شەوماهی تابانێ
گەهێ زامداری تیغی ناز و غەمزەم چارێ ئەی جەڕڕاح
گەهێ بیماری چاوم ئەی ڕەئیسی سیحە دەرمانێ
بەشەو شێواوی زولفی عەنبەرم ئیمدادێ ئەی سونبول
بەڕۆژ چەوتاوی باڵای دلبەرم ئەی سەر و جەولانێ
لە شەوقی ماهی ڕووی ئەو شۆخە توخوا پرتەوێ ئەی ڕۆژ
بەیادی چاکی سینەی ئەی سەحەر سادەی گریبانێ
بەتاو هات لەشکری غەم سا لە خۆ ڕۆیشتنێ ئەی دڵ
منالێ زۆرە شاری سینە ئەی مەجنوون بیابانێ
زەلیلم بگرە دەستم کەوتووم سا ڕەحمێ ئەی گەردوون
فەقیرم نامرادم بێ نەوام ئەی مونعیم ئیحسانێ
وەکو (بێخود) لەمەولا بگرە بۆ خۆت ڕێگەیێ ئەی پێ
لەمەولای خۆت بووێ تۆش چەشنی ئەو ئەی دەست دامانێ

وەستایەتی هونەری بێخود لەم شیعرەدا لەوە دەردەکەوێ وەسفی چەند وێنەیێکی پەرێشانی و دڵگوشراوی خۆی دەکا، بۆ چارەسەری هەر کێشەیێکی دەروونی پڕ لە ڕەشبینی پەنا بۆ ئەندامێکی دلبەر یا کەسێک دەبا بگەنە هانای و لەو گیروگرفتە ڕزگاری

بکەن، لە هەندێ لەو وێنانەدا شاعیر پەرێشانە بەوەی پەرچەم ڕووی دلبەری داپۆشتووە، داوا لە شەو دەکا مانگی چواردەی بۆ بێنێ. کە بریندارێ تیری غەمزە دەبێ، هاوار بۆ نشتەرگەر دەبا، کە چاوێشەش تووشی دەبێ دەرمان لە حەکیم باشی داوا دەکا. ئەمەو هەندێ وێنەی دیکەش لەم بابەتەوە بەرچاو دەکەون.

۲

بێخود لە داد و فیغان ناکەوێ لە دەست ڕوو وەرگێڕانی ئەو دلبەرە:

ئەی دڵ! لە داخی ئەو مــەهە بتلێ بەدەردەوە
بڕژێنە ئەشکی گــەرم بەدەم ئاهی ســەردەوە
دەرچوو بەداخی عەشقەوە ڕووحی ڕەوانییان
فەرهاد بەبێستوونەوە مەجنوون بەهەردەوە
گەر وەسفی گەنجی ڕووی ببینێ جارێ باغەوان
وێران ئەکا چەمەن بەهەموو دار و بەردەوە
شۆرێ بەیادی لێوی بلێ ئەی حەمەی عەلۆ
ئەمما بەشیعری مونتەخەب و بەیتی فەردەوە
(بێخود) لەباتی سورمە لەسەر چاوی دادەنێ
ناڵی وولاغی ئەو بەهەموو تۆز و گەردەوە

لەم پارچە شیعرەدا بێخود لە دۆخی شاعیرانی کلاسیکی پێش خۆی نەچۆتە دەرەوە. دڵ وەک هێلانەی دلدار دەبێ بتلێتەوە لە حەژمەت ڕوو وەرگێڕانی ئەو دلبەرە. تەنیا دڵی ئەو تووشی ئەم دەردە نەبووە، فەرهاد و مەجنوون بوون بەقوربانی. ئەگەر باغەوان جوانی ڕووی دلبەر ببینێ باغ وێران دەکا، چونکە ئەویان لەویان جوانترە. بێخود هاوار بۆ حەمەی عەلۆی گۆرانیبێژی سلێمانی سەدەی نۆزدەم دەبا بەشیعرێکی جوان لە ئاوازی مەقامی شۆر لە وەسفی لێوی دلبەر بۆی بچڕێ.

۳

دڵی بێخود هەمیشە لە گریان دایە بۆ جانان:

دڵم بۆ زوڵف و ڕووی جانانە ئەگری
مناڵە و بۆ گوڵ و ڕەیحانە ئەگری



چرا ئیمشەو کەوا فرمێسک ئەرێژێ
ئەڵێی هەر بۆ منی پەروانە ئەگری
ئەکا شاباشی کێ دەریایی دیدەم
کە چەشنی گەوهەری یەک دانە ئەگری
چییە پیری دڵ ئیمشەو وەک عەرەقخۆر
لە کونجی تەکیە بۆ مەیخانە ئەگری
شەوێ بێ زولفی ئەو مەه پارە تا ڕۆژ
دڵم بۆ سینە چاکی شانە ئەگری
غەزالی من ئەگەر ساتێ نەبینێ
بیابان قوڕ ئەپێوێ لانە ئەگری
کەوان ئەبرۆ بەتیغی غەمزە تاکەی
لە جەرگم بێ گونەه نیشانە ئەگری
لە بەزمێکا کە ساقی چاوی تۆ بێ
مەی ئەرژێ دڵ ئەچێ پەیمانە ئەگری
بەیادی نەوبەهاری ڕوویی تۆیە
کە چاوم هەوری زستانانە ئەگری
برا تا نەبیە تۆز و گەردی بەرپێی
بەزەحمەت چاکی ئەو دامانە ئەگری
لە دڵتا گەنجی یادی کێیە (بێخود)
کە ئیمشەو نۆبەتی وێرانە ئەگری

کە دڵی بێخود هەمیشە لە گریاندا بێ بۆ زولف و ڕووی دلبەر، هەموو گەردوون دەورووژێنێ وەکو ئەو بۆ ئەو زولفە یاخود بۆ ئەو کارەساتەی شاعیر تووشی بووە. وێنەی داهێنراوی جوان لەم شیعرەدا دەبینرێ وەک ئەو سۆفییەی لە کونجێ ئێشکی گرتووە کەچی لە بیری سۆفیزم لای داوە و داوای پێچەوانەکەی دەکا کە مەیخانەیە. هەموو «ئەگری»یەکانی شاعیر کردوونی بەپاش قافیە مانای تەنیا گریان ناگەیەنن، هەندێکیان بەمانای «دەگرن» وەک فرمانی «گرتی» لە مەسدەری «گرتن»ەوەیە.

٤

لە لیریکێکیدا بێخود دڵی گیرۆدەی دلبەرێکی قسەزان و بزێو بووە:

دڵم مەفتوونی چاوی دلبەرێکی نیکتە پەردازە
کە مەحزی حوسنە عەینی شۆخییە سەرچاوەیی نازە
لە باغی نازکیدا موعتەدیل سەروێکی ساوایە
لە دیوانی چەمەنزاری دڵا فەردێکی مومتازە
بەزۆری حوسنی خۆی ئیقلیمی ئەرز و ئاسمانی گرت
لەسەر تەختی زەمین شاهی زەمان ماهی فەلەک نازە
سووەیدای پەرچەمی وەک فەجری کازیب زوڵمەت ئەفشانە
بەیازی گەردەنی وەک سوبحی سادیق پرتەو ئەندازە
هەرێمی چاو و بەینی ڕوومەت و تاقی خەمی ئەبرۆی
مەتافی نازە کەعبەی ئیمتیازە قیبلەیی ڕازە
لە بازاڕی مەحەببەتدا هەزار لۆمەم بکەن ئیخوان
ئەڵێم ئەم یووسفە پێغەمبەرێکی خاوەن ئیعجازە
دەخیلت بم بڵێ ڕازی دڵی خۆی دەرنەخا (بێخود)
کە ئەم کەرکووکە جێی ڕاوی شەهێن و واشە و بازە

لە خوێندنەوەی ئەم شیعرەدا مەیلی خوێنەر بۆ ئەوە دەچێ بێخود خەریکی وەسفی دلبەرێکە هەموو وەسفەکانی شیعری کلاسیکی کۆکردۆتەوە لە جوانی و قسە خۆشی و بزێوی و ناز و نووز بۆ ئەوەی لەو خۆشەویستەیدا بەرجەستەی بکا. ئەندامەکانی ئەوەندە جوانن بوون بەشای ئەرز و ئاسمان و هەموو گەردوون. دلبەر لەسەر تەختی شاهەنشای زەوی دانیشتووە، بەڵام ئاسمان نازی پێوە دەکا. ئەم بۆچوونانەی خوێنەر ڕاست دەردەچن، لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر بناغەی شیعرەکەی لەسەر ئەوە داناوە ستایشی شاری کەرکووک بکا و دلبەرە بێ وێنەکانی بکا بەنموونەی جوانترین کەنیشکانی کوردستان.



## فرمێسکی بەکوڵ

١

شیعری چوارینە بەندی «لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە» لە نێوەندی ئەدەبیدا بەناوبانگ و دڵگیرە. بێخود لەم شیعرەدا بۆ برازاییێکی دەلاوێنێتەوە لە ڕووباری دیجلە لە بەغدا خنکاوە، سەرەتا بەم چوارینانە دەست پێ دەکا:

لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دڵی من
هەرچەند ئەگەڕێم بێ سەروشوێن ماوە دڵی من
ئاخۆ بەچ شاخێکەوە گیرساوە دڵی من
یاخۆ بەچ داخێکەوە سووتاوە دڵی من

***

ئەو هەمدەمی غەمخوار و نەدیمی منە یارەب
ئەو مەحرەمی ئەسرار و قەدیمی منە یارەب
ئەو گەوهەری شەهوار و یەتیمی منە یارەب
کەوتۆتە چ بەحرێکەوە خنکاوە دڵی من

***

مەجنوونی دوو گێسوویی چ لەیلاییێکە ئاخۆ
یا وامیقی جادوویی چ عەزراییێکە ئاخۆ
دێوانەیی ئاهوویی چ سەحراییێکە ئاخۆ
کام چەهرەپەری دیوە کە ترساوە دڵی من

***

ئەتلێتەوە گاهێ بەخەیاڵی خەت و خاڵی
ئەخولێتەوە گاهێ بەچرای شەوقی جەماڵی
نازانی ئەگەر چۆنە بەدەس دەردەوە حاڵی
وەک پووش و پەڵاشێکە بەدەم باوە دڵی من

لەو بەندانەدا بێخود وەسفی هەست و نەستی دەروونی خۆی دەکا لە دوای خنکانی ئەو لاوە لە ناو ڕووباری دیجلە. بەزمانی دڵی باس لە چارەنووسی ئەو جوانەمەرگە دەکا،

هەموو وەسفەکانی پرسیارن: دەبێ لە کوێ بێ! شێتی چی لەیلاییێک بێ! یا چی عەزراییێک جادووی لێ کردبێ! یا مامزی هەتڵەی چی سارایێک بێ! ئاخۆ دڵی شاعیر کە حیکاتخوێنی ئەو کارەساتەیە چارەی کامە پەری دیوە بەم جۆرە ترساوە! لە ناو ئەفسانەی کوردەواریدا ئەوە هاتووە منداڵ ئەگەر چاوی بەپەری بکەوی دەترسێ، لەوانەیە شێتیش بێ.

شاعیر لە لیریکە نایابەکەی بەردەوامە:

لەو چۆڵ و بیابانە ئەبێ یاوەری کێ بێ
یا بەو کەژ و کێوانەوە سەوداسەری کێ بێ
یا لەت لەت و ئەفگاری موژەی خەنجەری کێ بێ
چۆن ماوە لە سەد لاوە کە کوژراوە دڵی من

***

بۆچی نەڕژێ سەیلی سروشکم وەکو باران
بۆچی وەکو یەعقووب نەمە شوهرەیی شاران
لەو یووسفە پرسیمە لە بێگانە وو یاران
هەرگیز نییە سۆراغی لە هیچ لاوە دڵی من

***

بۆ خۆی بگریم یا نەفەسی پەردە دڕاوی
یا بۆ جگەری کون کون و سەد پارە کراوی
چی کردووە یارەب کە خەو و خواردن و ئاوی
دایم غەم و بێداریی و خوێناوە دڵی من

***

چبکەم چ بڵێم بۆ دڵەکەی کارییە دەردم
شاهێدی منن موویی سپی و چەهرەیی زەردم
خۆڕایی نییە ناڵەیی گەرم و دەمی سەردم
هەلبەت بەبەڵایێکەوە ئالاوە دڵی من

دڵی شاعیر لەگەڵ یادی کۆچ کردوودا دەژی. نازانێ لە کوێیە! لە بیابان و کەژ و کێوان دایە، یا لە ناو بیرەکەی یووسفە، بێخودی ماڵوێران وەکو یەعقووب نازانی جوانەمەرگ لە



کوێیە! شاعیر بەجۆرێک شپرزە بووە نازانێ هاوار بۆ کێ بەرێ! لە کاتێکدا دەرمانی ئەو دەردە دەدۆزێتەوە، بەم بەندانە کۆتایی بەشیعرە ڕەنگینەکەی دێنێ:

ئەو سینە لە غەش خاڵییە ئەو بێ ڕق و کینە
ئەو خادیمی شەرعی نەبەوی و میللەت و دینە
مەعلوومە چووە بۆ خزمەتی سالاری مەدینە
وامزانی کە فەوتاوە نەفەوتاوە دڵی من

***

قوربانی کەسێ بم کە بەقوربانی نەبی بێ
وەک بەندە سەگی دەرگەهی شاهی عەرەبی بێ
شاهی عەرەبی یەعنی قوڕەیشی نەسەبی بێ
جەرگی بەدوو ئەبرۆی ئەوە جنراوە دڵی من

***

زاتێکی وەهای گرتووە ڕووحم بەفیدای ئەو
شاهان شەو و ڕۆژ دەبنە قەدەم بۆسی گەدای ئەو
(بێخود) مەبە ئیتر بەئومێد و بەتەمای ئەو
نایێتەوە لات گەر سەری داناوە دڵی من

بێخود دڵی بەوە خۆش بووە کە داڵدە و پەنای لە پێغەمبەردا دۆزیوەتەوە. دڵی کە هەمیشە لەگەڵ جوانەمەرگ دایە هەردووکیان چوون بۆ خزمەتی سالاری شاری مەدینە. ئیتر شاعیر دەکەوێتە ستایش و پێدا هەڵدانی پێغەمبەر. بەوە زۆر بەختیارە کۆچ کردوو جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە، ئەوەی بەدیدەنی پێغەمبەر شاد بێ لە شاری مەدینە چۆن لەو خاکە پیرۆزە دوور دەکەوێتەوە!.

٢

لە لیریکێکیدا بێخود شیوەن بۆ حەپسە خانی نەقیب دەکا:

بەخوڕ دیسان ڕژا فرمێسکی باران
لە هەوری چاوی سووری دوڕ نیساران
تەمی ماتەم وڵاتی کوردی داگرت
لەپڕ وەک دووکەڵی ماکینە شاران

زەمین بۆ قورِ نەپێوێ وەک من و تۆ
زەمان بۆچی نەشێوێ چەشنی جاران
جەنابی حەپسە خان تەشریفی ڕۆیی
شکا پشتی فەقیران و هەژاران
ژن ئەمما فیلحەقیقە خادیمەی قەوم
کە یەعنی سەییدەی غیرەت شکاران
ڕەئیسە و خانەدان زادەی سیادەت
ئەمیرە و شای ژنانی بەختیاران
تەبیبەی دەردی بیمارانی برسی
کەرەم بەخشی برینی دڵ فگاران
مشوورخۆری گرۆهی ئادەمیزاد
لە منداڵ تا دەگاتە دەست بەداران
لە کوورەی ئاگری غەمدا مەپرسن
لە سۆزی ئاه و ناڵەی بێ قەراران
ئەشێ حەسرەت نشینی شینی ئەو بن
مەلا و شێخ و گەدا تا تاجداران
فیداکاری غەریب و خۆ وولاتی
وەفاداری لەبار و نالەباران
بەخۆڕایی لەبەر پێیانە کەوتوون
لە پیرێژن هەتا سیمین عوزاران
کە گوڵ ڕۆیی لە باغا بۆ نەناڵن
هەتا مردن هەزاران وەک هەزاران
بەمیلادی وەفاتی گەر ئەپرسن
(درێغ بۆ حەپسە خان) تەئریخە یاران
ئەگەر هیجریش ئەلین (ئەو بوو مشورخۆر)
بەجیددی بۆ زەلیل و لەش بەباران



ئەتۆش (بێخود) بڵێ دایم ڕووەو بەیت
بەهاوین و بەزستان و بەهاران
خودا جێگەی بەهەشتی جاویدان کەی
بەجاهی جەددی خۆی و ئال و یاران

هەندێ کەس لە شیعری شیوەن و ماتەمنامە دەسڵەمێنەوە بەناوی ئەوەی ڕاستی تێدا نابێ، چونکە کەسی مردوو لایەنی چاکەی دەخرێتە ڕوو و لایەنی خراپەی ون دەبێ. ڕەنگە ئەو لایەنە چاکانەی باسیان لێوە دەکرێ هەندێکیان لە ڕاستی دوور بن. ئەم مەسەلەیە داهێنانی ئەدەبی جێبەجێی دەکا بەپێی ئەو تیۆرییەی دەڵێ هەموو قسەیێک هەرچی بێ ڕاست یا درۆ جوانکاری تێدا بێ بەبەرهەمی هونەری بەرز دەژمێررێ، سەرەڕای ئەوەش بەپێی گێڕانەوەی ئەو کەسانەی لە حەپسە خانەوە نزیکبوون (لە **١٩٥٣** کۆچی دوایی کردووە) قسەی بێخود لە بابەت ئەوەوە هەمووی ڕاستە. ئەو ژنە دەستی کەساس و هەژارانی گرتووە، یارمەتی لێقەوماوانی داوە، هەڵوێستی نیشتمانپەروەری هەبوو، ڕەنگدانەوەی خەباتی شێخ مەحموود بووە لە کوردایەتیدا.

## ٣

بۆ کۆچی دوایی پیرەمێرد، شاعیر ماتەمنامەی نووسیوە، قەسیدەیێکی درێژە، لە گوڵبژێرێ ئەو شیعرەدا دەڵێ:

ئاخ لە دەس دنیایی دوون و بێ وەفا
داد لە دەس گەردوون و چەرخی کەچڕەوی
ڕەببی ئەی دنیا دەوامت قەت نەبێ
ئەی فەلەک تۆ تا قیامەت نەسرەوی
وەک گڕت بەردایە عالەم هەر وەکو
قونبولەی زەڕڕی لەسەردا بۆ زەوی
خادیمێکی جان فیدا و میللەت پەرست
داهییێکی گۆشەگیر و مونزەوی
خاوەنی ژین و قسەی پێشینییان
ساحیبی ئینشا وو ڕووحی مەولەوی

رۆژی رووناکت مەگەر ئاوا بووە
بۆیە (بێخود) تیرە دڵ چەشنی شەوی
تۆ ئەگەیتە ئەوجی مەحبووبی خودا
گەر بەمیعراجی سەخادا سەرکەوی

سەرەتای شیعرەکە وەکو پێشەکییێک بۆ هەموو شیعرێکی شیوەن و ماتەمنامە دەبێ. لە دوای ئەوە ئاماژە بۆ پیرەمێرد هەیە، بەوەی هەندێ لە کارە ئەدەبی و شیعرییەکانی دەخاتە ڕوو. ئەوەی گرنگ بێ لێرەدا ئەوەیە بێخودێکی دوور لە سیاسەت و کوردایەتی و ئازاری کۆمەڵ لە شیعریدا، پێنج ساڵیش بەسەر کارەساتەکەی هیرۆشیما و ناگازاکی تێپەڕی بوو کە پیرەمێرد کۆچی دوایی کرد، بەڵام تاوانەکەی ئەمەریکا و سەرۆکی ئەو کاتە هاری تروومان ئەوەندە گەورە بوو بێخود لە بیری نەچووبووەوە مردنی پیرەمێرد بەکارەساتەکەی هیرۆشیما و ناگازاکی یابان (١٩٤٥) بچوێنێ.

## بێخود خۆی لاڵ دەکا و شیعر دادەنێ

بەزمانی لاڵێکەوە شاعیر ئەم پارچەیەی داناوە:

کاکا کابرا شە شەو و ڕۆژ خەخەریکی بەزمە
خە خە خەلقیش لە لە داخا ئەئەکاتن شیوەن
تۆ تۆ تۆ وا لە لە بەرتا سە سە سەڵتەی حەلەبی
ممن وا لە لەبەرما پا پا پاڵتۆی جەرمەن
ممن هەم نە نەخۆشم چە چە چەشنی تۆ تۆ تۆ
تۆ تۆ تۆ هەم نە نەخۆشی چە چە چنی ممن

ئەگەر لاڵییەکە لە شیعرەکەدا بکرێتەوە، بەم جۆرە خۆی دەنوێنێ:

کابرا شەو و ڕۆژ خەریکی بەزمە
خەڵقیش لە داخا ئەکاتن شیوەن
تۆ وا لەبەرتا سەڵتەی حەلەبی
من وا لەبەرما پاڵتۆی جەرمەن
من هەم نەخۆشم چەشنی تۆ
تۆ هەم نەخۆشی چەشنی من



ئەم قسانە ئەگەرچی لە ڕووی دەستووری زمانەوە هەڵەیان تێدا نییە، بەڵام ڕستەی سادە و هیچ جوانییێکی ئەدەبی و داهێنانێکی هونەرییان تێدا نییە. وەستایەتی بێخود لەوەدایە ئەم ڕستە ساکارانەی خستۆتە ناو قاڵبی کێش و قافیەوە و لەسەر زمانی کەسێکی لاڵ ئەو پارچە شیعرەی دروست کردووە، کە پیاو دەیخوێنێتەوە چێژی هونەری لێ وەردەگرێ.

## دڵداری و دانایی و دۆستایەتی

١

لە شیعرێکیدا بێخود دەڵێ:

لە کونجی خەڵوەتی غەمدا کە مەشغوولی ڕیازاتم
شەو و ڕۆژ حەسری فیکری پەرچەم و ڕووی تۆیە ئەوقاتم
بڵێسەی دۆزەخی عەشقت منی ئاوارە کرد وەرنێ
بەخۆڕایی نییە ئەی جەننەتی عیرفان تەوەللاتم
ئەگەر بۆ خزمەتت کاغەز نەنووسم چاوەکەم حەقمە
لەبەر بێ چاوییە دوور بێ لە تۆ گەر بێ مووبالاتم
ئەگەر بێ باوەڕی بڕوانە ئاوێنەی دڵی خۆشت
کە قوربانی دڵی ئاوێنە وو حوسنی تەماشاتم
لە دیوانی چەمەنزاری مەحەبیەت هەر وەکو قومری
بەڵا گەردانی سەروی میسرەعی مەوزوونی باڵاتم
لە بۆ میحرابی ئەبرۆی تۆیە گەر مەجبووری مزگەوتم
لە نەشئەی چاوی مەستی تۆیە مەفتوونی خەراباتم
ئەگەر فیلم لە بەردەست ئەسپی تۆدا فەرزە بەیدەق بێ
وە گەر شاهم لە عەرسەی عەشقی تۆدا بێ ڕوخت ماتم
لە بەزمی حوسنی خۆتا توخودا جار جارە یادم کە
کە من پەروانەکەی ڕوخساری شەمعی مەجلیس ئاراتم
بەشێخ نووری بفەرموو چاوەکانت ماچ ئەکا (بێخود)
بەیادی خانەیی خەمماری ئەو مەستانە وا هاتم

خوێنەر لە سەرانسەری شیعرەکەدا وا دەزانێ شاعیر موناجات لەگەڵ دلبەری خۆشەویست دەکا. ئەو سیفەتانەی لەم شیعرەدا هاتوون بۆ مێیینە بەکار دەهێنرێن. ئەوەی ڕاستی بێ بێخود ئەم شیعرەی بۆ (کەمالی عەلی باپیر) نووسیوە. بەپێی پێویستییەکانی شیعری دڵداریی حەقیقی هەموو ئەدگارەکانی مێیینەی بۆ نێرینە بەکارهێناوە. لەبەرئەوەیە بێخود لە ستایشی بۆ کەمالی سڵاو بۆ شاعیری ڕەند نووری شێخ ساڵح دەنێرێ.

٢

لە شیعرێکیدا بێخود ڕووی ئامۆژگاری لە مرۆڤ دەکا ئاگاداری خۆی بێ، لە چاکە نزیک و لە خراپە دوور بکەوێتەوە:

برا خۆ تۆ لای خۆت مەخزەنی عەقڵ و کەمالاتی
کەچی تا دەوڵەمەندتر بی فەقیر و سواڵکەر و لاتی
بەتەحریکی هەوا دێیت و دەچی چەشنی شەپۆلی ئاو
سەراپا غەرقی گێژاوی غەم و بەحری خەیالاتی
ئەگەر مازیت لە دەس چوو هێندە بێ حاڵیشی ئەی غافڵ
لە ئیستیقبالی خۆت ئاگات نییە چۆن بێ موبالاتی
بەقەسری ڕووی زەمین تێر نابی قەت چاوت وەکو فیرعەون
خودا دەستت نەدا دەستت ببێ ڕوو بۆ سەماواتی
بەجاهی خۆت مەنازە ڕۆستەمی قابیز لە ڕێتایە
ئەگەر سەد شاهی چینیش بی کشێکت هاتە بەر ماتی
سولەیمان کوا نگین و ئاسەف و عیفریت و بەلقیسی
سکەندەر کوا شکۆهـ و تەپڵ و بەیداغ و موهیماتی
برا ناپرسی جارێ چی بەسەرهات حاڵی کەیخوسرەو
تەمیزێکت نییە تا تێبگەی لە کوێیە میرئاتی

لەم شیعرەدا بێخود ئامۆژگاری دەوڵەمەندی بەهۆش دەکا، پێی دەڵێ نابێ خۆی بەهەژار بزانێ و هەوڵ بدا دەوڵەمەندتر بێ. نابێ هەڵ پەرست بێ، ئەگەر ڕابردووی لە دەست بچێ پێویستە بیر لە داوارۆژ بکاتەوە. گەردوون بەزەیی بەکەس نایێتەوە. فیرعەون و ڕۆستەم و خاقانی چین هەموویان لەناوچوون. ئەموستیلە و ئاسەف و عەفریت و بەلقیس بۆ سلێمان نەمانەوە، شکۆ و تەپڵ و بەیداغیش لە دەست ئەسکەندەر دەرچوون.



## یانەی سەرکەوتنی کوردان

بێخود بەم شیعرە پیرۆزبایی لە دامەزراندنی یانەی سەرکەوتنی کوردان کردووە لە ساڵی ١٩٣٠ لە بەغدا:

یانەی سەرکەوتن کە نادی ناوە
لە شاری بەغدا بینا کراوە
بانی ئەم یانەش مەعرووف جیاووکە
کە بۆ قەومی خۆی ئەلحەق باوکە
لە ساحەی سەعیا ئازا و دەسوبرد
موومائیلەیهی گۆی سەبقەتی برد
ڕەئیس و ڕوکنی ئەم یانە بەرزە
چونکە هۆ ناکەن لە شێری شێرزە
ئەگەر ئەویانە و ئەگەر ئەمیانە
خوا سەربەرزیان کا ئەعزای ئەم یانە
لەگەڵ سکرتێر کە ئەوڕەحمانە
ئەو ئەوڕەحمانەی کە نووری جانە
وەتەن پەرستە و خادیمی کوردە
لە هەموو عیلما شارەزا و ووردە
گەر ئەو تەئریخەش نازانی چییە
ساڵی میلادی نۆ سەد و سییە
غایەی نادیمان بۆ ئەم کوردانە
بڵاوکردنەوەی عیلم و عیرفانە
وەک ئەخلاق ئەدەب تەئریخ جوغرافی
لەگەڵ یەکیەتی بەدڵێکی سافی
وەکو بەکوردی دانانی لوغات
وەک تەشجیع کردن لەسەر مەسنووعات
بۆ کتێب دانان لەگەڵ تەرجەمە
هەرچەند تێکۆشین هێشتا هەر کەمە

له موساعه‌ده‌ی ته‌ڵه‌به‌ی فه‌قیر
تکامان وایه هیچ نه‌که‌ین ته‌قسیر
قوتابی زیره‌ک بنێرین ئاوا
بۆ وولاتی دوور یانی ڕۆژئاوا
ئه‌مجا یارمه‌تی و ژینی ئه‌م یانه
له میلله‌تی کورد زۆر هیوامانه
چونکه پێویسته بکرێ سه‌رفی ماڵ
چ بۆ ئیستیقبال چ بۆ ئیستیقلال
ئیتر هه‌ر بژی لاوانی وه‌ته‌ن
یانێ ئاوا بێ باوانی وه‌ته‌ن

له‌م لیریکه‌دا بێخود له شیعری کلاسیکی عه‌رووزی لای داوه، کێشی سیلابی خۆماڵی ده بڕگه‌یی و جووت قافیه (مه‌سنه‌وی) به‌کارهێناوه. له‌به‌رئه‌وه‌ی بێخود له دۆخی شیعری کلاسیکی چۆته ده‌ره‌وه، هه‌ناسه‌ی سوار بووه، شێوازی شیعر دانانی بێخود تێیدا ون بووه، به‌رهه‌مه‌که له شیعری په‌روه‌رده‌یی (دیداکتیکی) نزیک بۆته‌وه. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا هه‌ندێ زانیاری تێدایه له بابه‌ت یانه‌ی سه‌رکه‌وتنی کوردانه‌وه. ئه‌و یانه‌یه له ساڵی ١٩٣٠ به‌کۆششی مه‌عرووف جیاووکی باڵه‌کی ڕۆشنبیری کورد و کۆمه‌ڵێک له لاوانی کورد دروست کرا. یه‌که‌مین سه‌رۆک جیاووک و یه‌که‌مین سکرتێری یانه‌که عه‌بدولڕه‌حمان نوور جانی کۆیی بوون. شاعیر له کرده‌وه‌ی یانه‌که ده‌دوێ له پێگه‌یاندنی لاوانی کورد و یاریده‌دانیان له به‌غدا، چونکه له‌و سه‌رده‌مه‌دا له عیراق ته‌نیا له به‌غدا کۆلێج و ئامۆژگای پاش خوێندنی قوتابخانه‌ی ئاماده‌یی هه‌بوون. ئه‌و یانه‌یه ده‌ورێکی گرنگی له ژیانی خوێنده‌واری کوردیدا هه‌بوو.

## چوارین

١

له چوارینێکیدا بێخود ده‌ڵێ:

بێخود له ڕووی نیازه‌وه ئه‌ی نازه‌نین ئه‌ڵێ
جار جار به‌چاوی لوتفه‌وه بڕوانه سووره‌تم



من بۆیه سه‌یری تۆ ئه‌که‌م و ڕووم له که‌س نییه
تا تێبگه‌ی که تۆی هه‌ده‌فی تیری حه‌یره‌تم

شاعیر که ته‌ماشای وێنه‌یێکی فۆتۆگرافی خۆی کردووه، ئه‌م چوارینه‌ی بۆ هاتووه. ئیتر له‌و وێنه‌یه یا ئاوێنه‌یه‌دا خۆی دیبێ بیری له‌وه کردۆته‌وه و له‌گه‌ڵ خۆیدا وتوویه‌تی: ئه‌من چیم!.

٢

له چوارینێکدا بێخود نازانێ چی ده‌وێ، ئاواز و مه‌ی یا مه‌یگێڕ و گۆرانیبێژی خراپ:

ئه‌مجا له عوود و ڕوود و نه‌ی و مه‌ی شه‌راب ئه‌دووم
یه‌عنی له غه‌یری ساقیی و موتریبی خراپ ئه‌دووم
له‌وساوه عاشقم به‌برۆ و ڕوویی دلبه‌ران
دایم له مانگی یه‌کشه‌و و ئافتاب ئه‌دووم

شاعیر که دوودڵ بووه له ئاواز و مه‌ی و خاوه‌نه خراپه‌کانیان مه‌یگێڕ و گۆرانیبێژ، له پاشانا گرفتاری برۆ و ڕووی دلبه‌ران بووه، له‌وساوه له مانگی یه‌کشه‌وه و خۆر ده‌گه‌ڕێ، واته ئه‌و دوو شته‌ی له برۆ و ڕوومه‌ت ده‌که‌ن.

٣

له‌و سه‌رده‌مه‌ی شێخ مه‌حموود حوکمداری کوردستانی باشوور بووه له سلێمانی دووڕوو و پیاوخراپ وایان له شێخ گه‌یاندووه گۆیا بێخود توکچیه‌تی (تۆرانیچیه‌تی) ده‌کا. شاعیر به‌م چوارینه وه‌رامی ئه‌و ئاژاوه‌چیانه ده‌داته‌وه:

من که ئیسلامم له سایه‌ی موعجیزه‌ی پێغه‌مبه‌ری
ئه‌م ئه‌بوو جه‌هلانه (بێخود) پێم ئه‌ڵێن تۆ کافری
ڕه‌ببی ڕووڕه‌ش بم ئه‌گه‌ر نێزیکی ئه‌م بوختانه بم
خۆ ئه‌گه‌ر دوورم ئیلاهی ڕووسپی بێ موفته‌ری

بێخود به‌رگری له خۆی ده‌کا و ده‌ڵێ من موسوڵمانم. ئاژاوه‌چیان به‌ئه‌بووجه‌هل ده‌چوێنێ. جا ئه‌بووجه‌هل به‌یه‌کێک بڵێ کافر، چۆن ده‌بێ باوه‌ڕ به‌قسه‌ی بکرێ! زۆر جوان و به‌داهێنانێکی ئیستێتیکییانه ده‌ڵێ: با ڕووم ڕه‌ش بێ ئه‌گه‌ر له‌م بوختانه‌وه نزیک بم. ئه‌گه‌ر نا بوختانکه‌ر دیاره ڕووسپییه. وشه‌ی ڕووسپی به‌مانای قه‌حبه هاتووه.

٤

لە چوارینێکدا شاعیر ئامۆژگاری خۆی دەکا:

بێخود لە خەوی غەفڵەت ئەگەر هەڵساوی
ئەم پەندە بەگوێیی دڵ ببیێ تا ماوی
وەک تەرکی تەماشایی ژنت کردووە هەتیو
مەڕوانە لیباسیشی ئەگەر تۆ پیاوی

شاعیر بەخۆی دەڵێ ئەگەر لە خەوی بێ ئاگایی هوشیار بوویتەوە لەسەر ئەم پەندە بڕۆ. تۆ کە ژنت نەهێناوە و بەتەواوی ئافرەتت خستۆتە لاوە، مەنوارە جلوبەرگیشی بەناوی ئەوەی من تەماشای ژنەکە ناکەم و دەنوارمە جلوبەرگی، وەکو ئەوە وایە گۆشت ناخۆی و گۆشتاو دەخۆیتەوە.

**تاک**

١

تاکە شیعرێکی وەک ستایش و پێدا هەڵدان بۆ شێخ مەحموود وتووە:

ئەی گوڵی گوڵستانی کوردستان
وەی مەلی نەشئە بەخشی پیر و جەوان

٢

لە تاکێکیدا دەڵێ:

کاغەزم نووسی بەخوێنی دیدەکەم
نووری چاوم ڕووحەکەم بیخوێنەوە

ئەم شیعرە ئامۆژگارییە بۆ هەموو دۆست و برادەرێکی شاعیر، دەڵێ ئەگەر بەخوێنی چاوم کاغەز یا شیعر بۆ تۆ بنووسم، مخابنە ئەگەر نەیخوێنیتەوە!.

٣

بۆ جەژنە پیرۆزەی هەر کەسێکی خۆشەویست بێ بێخود وتوویەتی:

لە ئەسبابی فەرەح سالۆنی بەزمت پڕ تەدارک بێ
شەوت هەر ڕۆژ و ڕۆژت جەژن و جەژنت لێ موبارەک بێ



ڕەوانبێژی ئەم شیعرە لە ڕیتم و مۆسیقا و دووبارەکردنەوەی ئەو وشانەی دەنگی «ژ»یان تێدایە دەکەوێتە بەرگوێ.

***

مەحموودی کوڕی مەلا ئەمینی چاومار لە شیعردا ناسراو بەبێخود یەکێکە لەو چەند شاعیرە گەورانەی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم قوتابیانی نالی بوون و دەرچووی قوتابخانەی شیعری کلاسیکی کوردستانی باشووری سەدەی نۆزدەم بوون. بێخود لەوانی دیکە زیاتر پارێزگاری دەستووری ئەو قوتابخانەیەی کردووە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە. ئەگەر لە شیعریدا هەندێ وشە و زاراوە و تەعبیری تازەی بەکار نەهێنایە کەس نەیدەزانی ئەو شیعرانەی لە سەدەی بیستەمدا نووسراونەتەوە. جگە لەوە ئەگەر شیعرێکی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی و جووت قافیە دانا بێ، یا وەسفی هەندێ دیاردەی تازەی کردبێ لە کۆمەڵی کوردەواری کوردستانی عیراقی سەدەی بیستەم دوور نەبووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دیوانی بێخود نموونەیێکی گرنگ و بریقەدارە لە دیوانی شیعری کلاسیکیی کوردیدا.

# بەشی حەوتەم

## بابە

## عەبدولڕەحمان بەگی بابان

## ١٨٨٠ – ١٩٦٧

### ژیانی

عەبدولڕەحمان کوڕی ئەحمەد بەگ کوڕی خالید بەگ کوڕی سلێمان پاشای بابان لە ساڵی ١٨٨٠ لە سلێمانی لە دایک بووە. خوێندنی بەرایی لە حوجرەی مزگەوت بووە. قورئانی خەتم کردووە و هەندێ لە وردە کتێبەکانی بەرنامەی ئەو سەردەمەی خوێندووە. لە پاشانا ڕووی کردۆتە قوتابخانەی ڕوشدییەی سوپایی، خوێندنی لەوێ تەواو نەکردووە و لە پاش ماوەیێک گەڕاوەتەوە حوجرەی مزگەوت. ئەمجارەیان قۆناغێکی زۆری لەم خوێندنەدا بڕیوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی نەداوە خوێندنی ئایینی تەواو بکا و ئیجازەی دوازدە زانستییەکەی ئیسلامەتی وەربگرێ و ببێ بەمەلا، بەڵکو هەوڵی داوە ببێ بەمیرزا یا ئەفەندی ئەو ڕۆژگارە.

بۆ مەبەسی نازناوی شیعری عەبدولڕەحمان بەگ لە ساڵی ١٩١٨ وشەی «بابە»ی هەڵبژاردووە و لە شیعریدا بەم ناوەوە خۆی بەخەڵکی ناساندووە. لە ناو خەڵکیدا بەعەبدولڕەحمان بەگی بابان و عەبدولڕەحمان بەگی نوفووس ناسراوە چونکە هەر لەو ساڵەدا بۆ یەکەمین جار ماوەیێک مووچەخۆری میری بووە لە بەڕێوەبەرایەتی سەرژمێریدا (دائیرەی نوفووس). ئەم کارەی زۆری نەخایاندووە. لەو کاتەدا سلێمانی کەوتە بن دەستی بەڕێوەبەرایەتی کۆلۆنیالیستی بەریتانی داگیرکەر، بابە بووەوە بەمووچەخۆری میری، بەڵام لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا دژی ئینگلیز بوو و لەگەڵ سیاسەتی ئەو ڕێک نەدەکەوت زوو وازی لە کارەکەی هێنا.

لە ٢٠ی مایسی ١٩١٩ لە بزووتنەوەی شێخ مەحموود نزیک بووەوە. باوەڕی زۆری پێ هەبوو، لەبەرئەوە شێخ بابەی کرد بەیاوەری خۆی. بۆ مەبەسێکی دیپلۆماسی ناردیە ساباڵاغ (مەهاباد) و تەورێز. لەوێوە بەتەلگراف پێوەندی بەباڵیۆزانی ئەمەریکا و فەرەنسا و ئیتاڵیا کردووە لە تاران، بەناوی شێخ مەحموودەوە تێیان دەگەیەنی هەڵوێستی ئینگلیز



بەرامبەر بەشێخ مەحموود خراپە و لە جێی خۆی نییە. لە دوای ئەوەی بابە ئەم کارەی دەگەیەنێتە ئەنجام لە ڕێی گەڕانەوەیدا کە لە بانە دەبێ و شێخ لە شەڕی دەربەندی بازیان دەشکێ بەدیل دەگیرێ ناچار دەبێ لە بانە بمێنێتەوە. ماوەیێک بەقاچاغی و خۆشاردنەوە لەوناوە دەمێنێتەوە. لە پاشانا حاکمی سیاسی ئی. سۆن لێی خۆش دەبێ و دەگەڕێتەوە سلێمانی، بەڵام لە کاروباری میری دوور دەکەوێتەوە.

لە ساڵی ١٩٢٢ بەپیلانێکی تایبەتی خۆیان ئینگلیز شاری سلێمانی چۆڵ کردووە و لەگەڵ خەڵکی دیکە بابەیان خستۆتە بەندیخانەوە و لە دواییدا ئازادیان کردوون. لە پاشانا کە شێخ مەحموود کرا بەسەردار لە لایەن دەسەڵاتی ئینگلیزەوە بابە لە دژی ئەو کارگێڕییەی شێخ وەستا.

لەو سەردەمەی شێخ مەحموود لە ئەشکەوتی جاسەنەی ناوچەی سورداش لەگەڵ ئەفسەرانی تورک خەریکی وتووێژ بوو عەسکەری ئینگلیز لە ٦ی مایسی ١٩٢٣ بەسەر سلێمانیان دادا، بابە جارێکی دیکەش گیرایەوە و ماڵی تاڵان کرا و دیوان و کتێبی شیعری بوو بەخۆراکی ئاگر. گیرانی ئەو جارەی لە گرتووخانەی ئۆردووی ئینگلیزەکان لە قلیاسان بردەسەر. بابە لە ژیانیدا گەلێ جار لە لایەن ئینگلیزەوە گیراوە. دوا گرتنی لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی بیستەمدا بوو، فەرمانی دوو ساڵ بەندکردنی بۆ دەرچوو بوو، ماوەی بەندییەکەی لە مووسڵ بردبووە سەر و شەش مانگیش هەر لەوێ بەدەسبەسەری مابووەوە، ئینجا گەڕابووەوە سلێمانی.

لە ساڵی ١٩٣٠ ماوەیێک خەریکی کشتوکاڵ بووە، لە پاشانا گەڕاوەتەوە سەر کاروباری میری و بووە بەمووچەخۆر لە بەڕێوەبەرایەتی سەرژمێری، ئەوەی لەمەوپێش جارێکی دیکەش کاری تێدا کردبوو. تا ساڵی ١٩٤٠ لەم کارەیدا ماوەتەوە و ئەوجا خانەنشین کراوە. لە دوای ئەمە بەهۆی جەنگی دووەمی گێتییەوە و پەیدابوونی بەڕێوەبەرایەتی دابەشکردنی ئازووقە (تەموین) بۆ ماوەیێکی کەم لەم دەسگایەدا مووچەخۆر بووە و لە ساڵی ١٩٤١ بەیەکجاری خۆی خانەنشین کردووە و گەڕاوەتەوە سەر پیشەی کشتوکاڵی. لەمە بەدواوە خەریکی خوێندنەوە و نووسینی کتێب بووە. ژیانی ڕۆژانەی لەگەڵ برادەر و دۆستانی زانا و نووسەر و شاعیر بردۆتە سەر. قوتابی و گەنجانی لە ماڵی خۆی کۆدەکردەوە و زانست و زانیاری فێر دەکردن، پێشوازی هەموو جۆرە میوانێکی دەکرد بەتایبەتی خوێندەوار و ڕۆشنبیران.

بابە لە مایسی ساڵی ١٩٦٧ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لەسەر داوای خۆی لە گردی مامەیارە نێژراوە.

## پلەی ڕۆشنبیری شاعیر

بابە لە تەمەنی مێردمنداڵییەوە ڕەوشت و بیرکردنەوەی گەورانە بووە، حەزی لە ژیانی سەربەستی و ئازادی کردووە، ناحەزی ئەمپریالیزم بەتایبەتی ئینگلیز بووە، خۆشی بەنوێخوازی هاتووە، نەیاری دەرەبەگ و دەسەڵاتی زۆرداری میری بووە. هەڵوێستی بەرامبەر بەبزووتنەوەی شێخ مەحموود و مەلیکایەتییەکەی حوکوومەتی کوردستانی باشوور واقیعییانە بووە، لە بەرژەوەند و چاکەی میللەتی کورد هەڵقوڵاوە، لەبەرئەوە هەڵوێستی بابە بەرامبەر بەشێخ مەحموود لە گۆڕاندا بووە. ئەگەر کردەوەی چاکی لێ دیبێ لێی نزیک بۆتەوە، ئەگەر نا ڕەخنەی لێ گرتووە و لێی دوور کەوتۆتەوە.

بابە یەکێک بوو لە ڕۆشنبیرە بەدیمەنەکانی سەدەی بیستەم، بەڵام وەک شاعیرێکی لێهاتوو لە ناو خەڵکیدا ناوبانگی نەبوو، هەروەها لە گۆڕەپانی خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردیشدا لە بەرچاو نەبوو چونکە لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە بەتەنگ شیعر و نووسینییەوە نەبوو و هەوڵی نەدەدا بلاویان بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا زانیارییێکی ئەنسیکلۆپیدی فراوانی هەبوو لە بابەت کوردەوە لە هەموو ڕوویێکەوە بەتایبەتی لە مێژوودا، جگە لەمە ئاگادارییێکی هەمە لایەنی هەبوو لە بناغە لێدانی شاری سلێمانی و ژیانی ئەو شارە لە سەرەدەمی دروستبوونیەوە تا دەوروبەری ژیانی بابە خۆی. دیارە ئەوەی یاریدەی داوە ببێ بەشارەزای ئەو شارە ئەوەیە سلێمان پاشای میری میرنشینی بابان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم باپیرە گەورەی بوو و پشتاوپشت ئەو زانیارییانە بۆی مابوونەوە.

نووسەری ئەم کتێبە ئاگاداری بەشێک لە ژیانی بابەیە، لە کاتی خۆیدا لە دیوەخانە و نامەخانەی تۆفیق وەهبی لە بەغدا ناسیاوی لەگەڵدا پەیدا کردبوو تا کۆچی دوایی بابە پێوەندییان بەیەکەوە هەبوو. بابە دەسنووسی کتێبێکی مێژووی ئامادە کردبوو لە بابەت کوردەوە بەگشتی و شاری سلێمانی بەتایبەتی. ماوەیێک ئەو کتێبە لای مابووەوە و هەمووی خوێندبووەوە. ئەو کتێبە بەڵگەنامەیێکی گرنگ بوو لە بابەت دروستبوونی شاری سلێمانی و هەڵسوکەوتی خێزان و بنەماڵەکانی شار، نەژاد و بنەچە و مەڵبەندی ژیانیان پێش ئەوەی لە زێدی کۆنیان کۆچ بکەن بۆ سلێمانی و لەوێ نیشتەجێ بن. زانیارییەکانی بەڕاستی و بەبێ ترس تۆمار کردبوو بەبێ ئەوەی گوێ بداتە هەندێ ڕەوشتی بەنابەجێ



دەژمێررێن و ناوی بنەماڵەکانیان پێ دەزرێ. زانیاری وا لە ناو کتێبەکەدا هەبوو لە دژی بنەماڵەی خۆی بوون و بەرژەوەندیی بابانەکانیان تێدا نەبوو.

## شیعری بابە

کەسایەتی بابە تا داگیرکردنی سلێمانی لە دوای جەنگی یەکەمی گیتی لە لایەن ئینگلیزەوە وەکو شاعیرێک ئاشکرا نییە. لە نێوەندی ئەدەبیدا ئەوە باوە ئەم شاعیرە یەکێک بووە لەگەڵ نووری شێخ ساڵح و عەبدوڵلا گۆران و ڕەشید نەجیب (فەرامەرز) بەشداری لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی کردووە. لە نوێکردنەوەکەدا بەشیعری لاسایی ئەدەبی عوسمانی بەشداری کردووە. شیعری لەم بابەتەی بووە و لە تالانی ماڵی لە سلێمانی لەناوچوون. ئەم هەواڵە ڕەنگە ڕاست بێ، چونکە ئەو شیعرانەی ئێستا لە بەردەستدان شەقڵی شیعری ڕۆمانتیکی عوسمانییان پێوەیە.

بەگشتی بابە شیعری زۆر نییە. ئەوەی هەیەتی بەشی هەرە زۆری نیشتمانپەروەری و کۆمەڵایەتی و ستایش و ماتەمنامەیە. شیعری دڵداری زۆر نییە. لە ڕووی قەوارەوە شیعری لیریکی کورتی زیاترە لە شیعری درێژ (قەسیدە).

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

بابە لە هەردوو جۆرە شیعری بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی وەستا بووە. یەکەمیان لە دیوانیدا زۆرە و دووەمیان کەمترە. لە بەحرە عەرووزییەکان ڕەمەل و موزاریع و هەزەج و موجتەس و خەفیفی بەکارهێناوە، لە کێشە خۆماڵییەکاندا دە بڕگەیی بەکارهێناوە. لە قافیەدا شیعری بابە دەوڵەمەندە، لە هەموو جۆرە قافیەکانی هەیە:

١- یەکێتی قافیە، ئەم جۆرەیان لە شیعرە عەرووزی و خۆماڵییەکانیدا دەبینرێن.

٢- زۆرینەی شیعری دەچنە سەر قافیەی ڕەنگاوڕەنگ، بەڕاستی لەمەدا شۆڕشێکی ناوەتەوە. هەندێ کەس ئەم جۆرە قافیانە بەتەرکیب بەند دادەنێن. ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەم جۆرە شیعرانەی لەسەر بنچینەی بەند داناوە. بەندەکان سنووریان بۆ نییە. بەندی درێژ و بەندی کورتی هەیە. بەندەکان لەسەر یەکێتیی قافیە دەڕۆن، لەبەرئەوە لە هەر لیریکێکدا چەند جۆرە قافیەیێک دەکەوێتە بەرچاو.

٣- جووت قافیە (مەسنەوی)، بابە ئەم جۆرە قافیەیەی (ا ا، ب ب، جـ جـ...) لە هەردوو بەشە شیعرەکەیدا عەرووزی و خۆماڵی بەکاری هێناوە.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

بەگشتی شیعری بابە لە ژیانی ئادەمزاد دەدوێ، لەبەرئەوەی سەردەمی ژیانی ئەو لە ڕووی سیاسییەوە گەرم بوو، ڕووداو زۆر بوو بایەخی بەشیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی دەدا، ئەمە هەندێ جار ڕای دەکێشا بۆ ئەوەی شیعرێک بهۆنێتەوە یەکێتی بابەت (وحدة الموضوع)ی تێدا بێ.

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە شیعری بابە زۆربەی مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی گرتۆتە خۆ. جگە لە شیعری داشۆرین و کراوەی بێ پەردە (ئیرۆتیک) شیعری دڵداری و وەسف و نیشتمانپەروەری و ستایش و شیوەن و ماتەمنامە بەرچاو دەکەون.

بابە ماتەمنامەی بۆ کۆمەڵێک شاعیر و ناودارانی کورد نووسیوە، وەکو ئەمین زەکی، فایەق بێکەس، حەسەن تۆفیق (ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەری کورد)، سەید ئەحمەدی خانەقا، پیرەمێرد. هەروەها ستایشی کۆمەڵێکی دیکەی کردووە وەکو محەمەد عەلی عەونی، شێخ ڕەئووفی سەید نووری نەقیب، میرزا مارف، شێخ محەمەدی خاڵ، ئایەتوڵڵای محەمەد مەردۆخی کوردستانی.

## نموونەی شیعری

### وەسف و دڵداری

١

لە شیعرێکیدا بابە بەناوی «ئارایشی بەهار» بەم جۆرە وەسفی بەهار دەکا:

شنەی هەوای بەیانی بۆنی بەهاری هێنا
ئەم بۆنە عەتر بێزە نەشئە و خوماری هێنا
کۆتر بەیاهوو یاهوو قومری بەبانگی کووکوو
بازی تەوار بەقووقوو کۆچ و هەواری هێنا
پۆڕ هاتە دەر لە پەردە ڕەنگین و شین و زەردە
پۆل پۆل لە دەشت و هەردە ڕاووشکاری هێنا
ئاوازی زاری بولبول لەسەر لق و لەسەر چڵ
خەندە و تەبەسسومی گوڵ خەیاڵی یاری هێنا



شەونم لەسەر گوڵاڵە جامی شەرابی ئاڵە
دار ئەرخەوان و ژاڵە نەقش و نیگاری هێنا
هەر جۆبی و جۆیبیارە هەر سەروە هەر چنارە
بەهەشتە یا بەهارە خۆشی دیاری هێنا
سەبزە وا لە دەماغا چین چین لە دەشت و شاخا
نەسرین و گوڵ لە باغا نەفخەی عەتاری هێنا
ئەو دلبەرە قەشەنگە ئەو یارە شۆخ و شەنگە
بەپێکەنین و خەندە بۆسە و کەناری هێنا
ئەو نازک و نازەنینە مەلائیکەی زەمینە
بەو تۆزە پێکەنینە دووسەد بەهاری هێنا
(بابە) ئەو گوڵە گەشە ئیمڕۆ بەکەیف و نەشە
وەختی بۆسە و باوەشە بەختی بەکاری هێنا

لە وەسفی بەهاردا لەوانەیە هەندێ وێنەی وەک ئەم لیریکەی بابە بکەوێتە بەرچاو. ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە ئەم شیعرە وێنەیێکی زۆری لە دیمەنی بەهاری ڕەنگینی کوردستان کۆکردۆتەوە. لە تەنیا لیریکێکدا ئەم هەموو وێنانە کۆکراونەتەوە. زۆربەی باڵندە ژیکەڵە و دەنگخۆش و جوانەکانی کۆکردۆتەوە. لەم چڵ بۆ ئەو چڵ، ئینجا کانی و جۆگە و سولاوکە، لە پاشانا بەشێکی زۆر لە گوڵە ڕەنگاوڕەنگەکان و دار و دەوەن. سەرتۆپی ئەم هەموو جوانانە دلبەری قەشەنگە. شاعیر ئەم هەموو جوانانەی لە سروشتدا دۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی دلبەر لە هەموویان جوانتر بکەوێتە ڕوو، چونکە هەموو دیاردەکانی سروشت جوانییان لەو وەرگرتووە. شاعیر لە مەرجەکانی وەسفی سروشت نەچۆتە دەرەوە بەڵام نوێگەری تێدا نواندووە.

٢

لە غەزەلێکی بەناوی «هۆنراوە» بابە دەڵێ:

مانگی چواردە و یەک شەوە گردن لە ڕووی ئەو دلبەرە
موعجیزەی شۆخی نەبێ چۆن مانگەشەو نەرم و تەڕە
پیاڵەگێڕی مەیکەدەی ئەو نێرگسی شەهلایەیە
یاخۆ موژگانە لەبەر بەدمەستی دەستە و خەنجەرە

رائیحە و بۆنی بەهەشتە نەشئە بەخشی رووحمە
یاخۆ خەندە و پێکەنینی لێوی لەعلی دلبەرە
تاقە خاڵی شینی سەر گۆنای مەتافی عالەمە
بەردی ناو کەعبەی دزیوە ئەم چەتیوە کافرە
خاریقەی ئیعجازی شۆخی سەروی هێناوەتە بەر
قەددی بەرزی دوو شەمامەی گرتووە بۆ نۆبەرە
ماچی لێو و ناودەمم کرد دەستی کردە بۆڵە بۆڵ
پیری وەک تۆ لێی حەرامە ئەم شەرابی کەوسەرە
(بابە) ئەو لاوێکی وەک خۆی شۆخ و لاوچاکی ئەوێ
تۆ بەواتە ڕاوی ناکەی ئەم فریشتە پەیکەرە

لەم لیریکەشدا بابە لە مەرجەکانی وەسف و دڵداری کلاسیکی نەچۆتە دەرەوە. لە ناو ئەو چوارچێوە کۆنەدا داهێنانی بەدەستهێناوە، بەوەی مانگی یەک شەوە و چواردەی لە جێییێک کۆکردۆتەوە. خاڵی شینی سەر گۆنای بەردەڕەشی کەعبەیە ئەو کچەتیوە دزیویەتی. خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەم غەزەلە وا دەزانێ وەکو دڵداری ئاسایی ئەنجامی میتافیزیکییانە دەبێ، چونکە دلبەر بەتەمەن دەبێ بچووک بێ، دڵداریش حسێبی بۆ نییە هەتا ئەگەر پیرێکی ڕزیوی سەد ساڵەش بێ، لەم هەڵوێستە دڵدارییەدا بابە تووشی گرێی سایکۆلۆجی بووە، کیژی گەنجی تازە هەڵکەوتوو چۆن بەماچ و مووچی پیرێکی ڕزیو تێر دەبێ! داهێنانی بابە لەوە دایە کە دەمی بۆ دەمی ئەو جوانە دەبا پێی دەڵێ لێت حەرامە. لێرەدا ئاماژەیێکی هونەرییانە هەیە تەعبیر لە دڵداری زەمینی دەکا کە دەڵێ: کیژەکە لاوێکی وەک خۆی شۆخ و لاوچاکی ئەوێ. ئەو جۆرە دڵدارییەی بابە لێرەدا باسی لێوە دەکا وێنەی لە ئەدەبی کوردیدا کەمە، لەبەرئەوە داهێنانی نوێی لەم لایەنەوە بەدەستهێناوە.

٣

بەهەناسەی شیعرەکەی پێشوو لە لیریکێکیدا بابە دەڵێ:

ئەم دلبەرە دێکانییە ڕاوی دڵی کردم
هەودایی لە مووی بەندی دڵی سەر چڵی کردم
تیرێ لە موژەی تێکەڵی خوێن و گڵی کردم
لەب خەندەیێکی غەرقی گوڵاڵەی گوڵی کردم



بەم پیرییە دڵ هاتەوە سەر دەردی جەوانی
ڕایکرد لە منی غەمزەدە خۆی خستە ئەمانی
لەوساوە بەمیوانی کە پێی ناوەتە ماڵم
عیشقی وەکو تیر داویە لە هەستیم و لە باڵم
وەک مورغی زەخم دیدە ئەگەوزێم و ئەناڵم
زۆر کافر و بێ دینە نییە ڕەحمی بەحاڵم
خەسمی منی بێ چارەیە دۆستی کوڕی لاوە
من پیرم و ئەو پیری لە لا پیس و گڵاوە
شێلراوە بەدەستاوی عیشق چی لە گڵم کەم
دڵ دادەیی ئەو دلبەرەیە چی لە دڵم کەم!
ئالاوە داوێن و قەدی چی لە گوڵم کەم!
فێلاویی و سرکە چ لە نێچیری سڵم کەم!
من پیری گرێ حەوتم و ئەو حەڤدەیی ڕێکە
چۆن ڕێ ئەکەوین (بابە) ئەتۆ تیرت نەپێکە

لە وەسفی دلبەریدا لە پێشانا بابە لەسەر دەستووری شیعری کلاسیکی کۆن دەڕوا و ئەوە دەردەبڕێ دلبەر ئەوەندە جوانە ئەو پیرەی کردووە بەلاو. بەڵام لە دواییدا پاشگەز دەبێتەوە و هەر بەپیری حەفتا ساڵی دەمێنێتەوە، کەچی دلبەر تەمەنی حەڤدە بەهارییە. ناچار دەبێ بەخۆی بڵێ: تۆ و ئەو ڕێک ناکەون، چونکە لە دڵداریی زەمینی و ماچ و مووچ و چوونە ناویەکەوە تیری تۆ هێلانەی ئەو ناپێکی. بەمە بابە سیمبۆلییانە وێنەیێکی ڕەوانبێژی جوان دەکێشێ.

٤

بابە واز لە تەمەنی حەفتا ساڵەی خۆی و حەڤدە ساڵەی دلبەر ناهێنێ:

من بەحەفتا ساڵەوە کەوتوومە داوی ئاسکێ
چاو غەزالێ وردە خاڵێ بەژن و باڵا ناسکێ
ئەو بەحەڤدە ساڵەوە وەک دار گوڵی تازە و تەڕە
دڵ فڕێنە دڵ ستێنە دڵ شکێنە دلبەرە

من وەکو بەرگی خەزان لەرزۆک و پەژموردە و هەژار
ئەو وەکو تۆپی گولّی تازە و تەڕی فەسلّی بەهار
زولفی چین چینی ڕەشی پەخشە لەسەر سەفحەی بلوور
موعجیزەی شۆخی نەبێ چۆن جووت ئەبێ زولّمات و نوور
دوو شەمامەی نازکی خستۆتە سەر سنگ و یەخەی
پێم ئەلّێ هێشتاکو تالّە و کالّە دەستی لێ نەخەی
وەک دوو غونچەی پڕ نەزاکەت تازە پشکوتوو و گەشە
تۆ بەدەستە چرچەکەت ڕاوەستە جارێ مەیگوشە
ئەو کچەی تەرسا نەژادەی کافرەی عیسا دەمە
کوشتنی زۆرە بەلّام ئیحیای شەهیدانی کەمە
غەمزەکەی ڕووحی دەرێنام لێوی پێی بەخشیمەوە
ئاسمان جێگەی مەسیحە من لە ئەرزا دیمەوە
گەردنی بەرزی شەهێنی غەبغەبی نارنجی ئالّ
لێوی یاقووتی ڕوخی گولّ ڕەنگ و غەمزەی چاوی کالّ
نەک بەتەنها هەر منی شەیدا وو ڕیسوا کردووە
شۆڕشی سەد مەحشەری عوششاقی بەرپا کردووە
ڕامی کەس نابێ غەزالم سلّ لە دانە و داو ئەکا
ڕاوی چۆن ئەکرێ کە خۆی ڕۆژی دووسەد دلّ ڕاو ئەکا
بۆ ئەوەی داوێنی بگرم (بابە) ئەچمە ڕێگە باز
هەرکە دیمی دەست ئەکاتە لا تریسکە و ووردە ناز

ئەم لیریکەی بابە لە بەرهەمە داهێنەرە سەرکەوتووەکانی دیوانی شیعریەتی. لە ڕووی ڕوخسارەوە بەحری ڕەمەلی عەرووزی بەکارهێناوە، کەچی لە قافیەدا جووت قافیەی (مەسنەوی) هەلّبژاردووە، لەو کاتەی بەزۆری شیعری بەحری عەرووزی لە قافیەدا یەکێتیی قافیەی بۆ بەکار دەهێنرێ.

لە پاشانا شاعیر بەراوورد لە نێوان پیر و گەنج دەکا، پاییز و بەهار، سیسی و ڕەونەق. لووتکەی داهێنانی شاعیر لەوەدایە دلبەر دەکا بەگاور، کەچی کوشتنی زۆرە و بەزیندووکردنەوەی شەهیدانی کەمە. بەپێچەوانەی عیسا پێغەمبەری مەسیحییان خەلّکی نەدەکوشت بەلّکو مردووی زیندوو دەکردەوە.



**دژی ژن**

لە دژی ژن بابە لە لیریکێکیدا دەلّێ:

ژن مەهێنە ئاگری نەمروود لە عومرت بەرمەدە
خوێن و زووخاوی دلّ و جەرگت بەکەوچک دەرمەدە
بەو هەوایە تاکو ماوی خۆت بەدەردی سەر مەدە
ژینی حوڕ تەنهاییيە داوێنی بگرە و بەرمەدە
ژن مەهێنە کامی شۆخە حوسنی سەرپشکی هەیە
تینەیی مەلعوون و پیسە نێشی دووپشکی هەیە
ژن سروشتی ماری دێمە مەیخەرە ناو جێتەوە
با دەماری غیرەتت نەمژێ و نەداتن پێتەوە
بۆ زەڕ و زینەت بەوێنەی سەگی هار نەڕشێتەوە
گەر فەقیر بوویت ڕابکات و دانەنیشێ پێتەوە
عوقمی خۆی ڕانەگرت شیرین لەبەر نەفس و هەوا
کۆهکەندی دا بەکوشت خۆی دا بەکێری خوسرەوا
ژن بەقەد مووی پرچ و ئەگریجەی زمانی پێوەیە
هەر زمانێکی هەزار سیحر و بەیانی پێوەیە
ناو دلّی پڕ کینەیە ڕازی نیهانی پێوەیە
کینە وو ڕازی دلّی ئاشووبی جانی پێوەیە
هەر زولەیخایێ هەبوو تەنها لە حوسن و شێوەدا
شەو چووە لای یووسف و دەرگای لەسەر خۆی پێوەدا
ژن بەجوانی و حوسنی ڕوو جینسی لەتیفی ئادەمە
چوون بەهۆی حەیز و منالّ و شیرەوە خوێنی کەمە
فیکری دووربینی نییە ئیشی هەموو واتەی دەمە
نەفسی ئەممارەی بجوولّێ هەر لە عالەم بێ غەمە
ژن ئەگەر لەیلایە (بابە) ئارەزووی وەسلّی نەکەی
حالّی مەجنوون بوو بەعیبرەت بۆ قەبیلە و شێخی تەی

ئەم شیعرەی بابە ڕەنگدانەوەی ئەو واقیعەیە لە کۆمەڵی ئادەمزادی سەر ڕووی زەوی کە ژن بەگونەهبار حسێب دەکرێ. ئەم بیروڕایە لە هەڵەی دایکی هەمووان حەوواوە هاتووە کە بووە هۆی دەرکردنی ئادەمی مێردی لە بەهەشتەوە بۆ دۆزەخ کە ژیانی ئەم گێتییەیە. جگە لەوە فەلسەفەی ئەفلاتوون بەنزمی تەماشای ژن دەکا. لە ژیاندا پیاو دوای ژن دەکەوێ بۆ ئەوەی ڕاوی بکا، ژن ناچارە بەرگری لە خۆی بکا. لەبەرئەوە بەدرێژایی ڕۆژگار بووە بەپسپۆڕ لە بەرگریکردن لە خۆی. ئەم دیاردەیە بووە بەسەرچاوەیێکی گرنگ بۆ پەیدابوونی ئەدەبی «مەکری ژنان» لە ناو هەموو نەتەوەکانی گێتی بەتایبەتی لە ئەدەبی میللیی سەرزاردا. لەم لایەنەوە ئەدەبی میللی کوردی (فۆلکلۆر) زۆر دەوڵەمەندە.

بابە لە جۆری دڵدارییەکەی، دوو شتی پێچەوانەی یەکترین، خۆی حەفتا ساڵی و دلبەر حەڤدە ساڵی ڕەشبینە. لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە ئەم هەڵوێستە لە مێشکیدا دروست بووە، لەبەرئەوە ئەم ئادەمزادە ناسکەی داوەتە بەر نەشتەری خوو و ڕەوشتێکی ناشیرینی ئەوتۆ بۆ ئەو پەیکەرە جوانە ناشێ. لە ڕووی واقیعییەوە دەکرێ ئەمە بەقسەی نابەجێ بژمێررێ وەک شیعری داشۆرین، بەڵام بابە ڕەنگێکی هونەری پێ بەخشیووە و بووە بەبەرهەمێک هەندێ ڕاستی ژیانی ئادەمزادی تێدا دیارە.

بابە دەتوانێ لە دڵدارییە سۆفیزمییەکانی میللەتانی سەر ڕووی زەوی وێنە و مانای تازە دروست بکا. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە شیرین فەرهادی بەکوشت دا لە پێناوی خوسرەو. زولەیخا ویستی یووسف لە خوای خۆی بکا و لە پێغەمبەری لابکەوێ، هەروەها لەیلاش تاوانبار دەکا چونکە مەجنوونی لە کەسوکاری کرد. هەر چۆنێ بێ ئەم جۆرە بەرهەمە ئەدەبیانە ڕەنگدانەوەی واقیعی ژیانی ئادەمزادن، ئەگەر ڕووداوی ناشیرینیش بن، جوان کراون و بوون بەبەرهەمی ئەدەبیی سەرکەوتوو.

### دژی ئاغای دەرەبەگ

لە شیعرێکیدا بابە دەڵێ:

ئاغە مولکی تۆ ئەکێلم بەندە و و مسکێنی تۆم
ڕۆژی سەغڵەت نۆکەری خەنجەروەشێنی شوێنی تۆم
شیر و ماستی ڕۆژ بەڕۆژ و گیسک و کاوڕهێنی تۆم
هەر ڕقی هەڵسا بەدایک و باوکەوە پڕ جوێنی تۆم
بێ زمان و کەس نەزان و فێری بارکێشی و کەرم
بارەکەت زۆر قورسە ئاغا! جۆ لە ژێری دەربەرم



گەنم و جۆکەم پێ گەیشت هاتی بەدوو سێ جەردەوە
کەوتیە ناو شارا و مەلۆکانم بەبگرە و بەردەوە
دەورەیێکی ناو پەرێزت دا بەشێف و وەردەوە
خەمڵی شارا و جێ پەرێزت کرد بەشیو و هەردەوە
ڕەحمی کرد گوایا بەحاڵم گەنمی دانا شەش تەغار
نەموێرا هاوار بکەم ترسام لە زللە و داری پار
گەنمەکەم سوور بوو حەقم دانێ بەوەرزێر و سەپان
یەک بەیەک پێوام لە خەرمان ڕەسمی کۆڵکێش و شوان
مام ڕەزاش هات پێی ووتم کوا ئوجرەتی گاگێڕەکان
هەروەکو بڕیار درابوو شەش ڕبەیشم دا بەوان
شەش تەغار بوو خەملەکەم مەوجوودەکەم ئێستا دووە
ئەم ڕسوومی ناوبراوەش هەر لە خەرمان دەرچووە
یەک تەغارم مایەوە کردمە جەواڵ و نام لە کەر
وورده وورده لێم خوڕی تا گەیمە دیواخان و دەر
کاتی تەسلیم کردنم ئاغا ووتی ئەی بێ خەبەر
چل ڕبە مەڵکانەتە دە ڕبەی ترت ماوە لەسەر
من پەژارەی نانی ووشکم بوو ئەمیشی هاتە بان
زۆری لێ پاڕامەوە خێری نەبوو گریە و فیغان
گایێکم مابوو فرۆتم دام بەئاغا پارەکەی
ڕستگارم بوو لە زنجیر و فەلاقە و دارەکەی
یا مریشک و هێلکە بردن بۆ کوڕی سەرکارەکەی
ڕەببی مەحوی کەیتەوە خۆی و زەوی و ئاوبارەکەی
پەتک و گونیەم نایە کۆڵ وێنەی فەلای تر هاتمە شار
چاوەڕوانم (بابە) ڕۆژێ غیرەتوڵڵا بێتە کار

ئەم قەسیدەیە ڕاپۆرتێکی شیعری جوانە لە بارەی پێوەندیی جووتیار و ڕەنجبەری کورد لە دێهاتی کوردستان بەئاغای دەرەبەگەوە. داگیرکەرانی عەجەمی ئێران و تورکی عوسمانی دەسەڵاتیان دابووە ئاغای دەرەبەگ لە هەموو ئاواییەکی کوردستاندا بۆ

چەوساندنەوەی خەڵکی. ئەم ئاغایانە بەرپرسیاری ئەوە بوون سەرانە بۆ شای عەجەم و سوڵتانی عوسمانی دابین بکەن. ئیتر پێوەندی خۆشیان لەگەڵ خەڵکی کورد ئەوەیە بابە لەم شیعرەدا ڕوونی کردۆتەوە. جووتیار و ڕەنجبەر شەو و ڕۆژ ئارەقیان دەڕشت کەچی لە ئەنجامدا مایە پووچ دەبوون، خۆیان و ماڵ و منداڵیان لە ناو بێ نانی و هەژاری دەتلانەوە.

### دانایی

لە شیعرێکیدا بابە وەسفی ڕەوشت و کار و کردەوەی خۆی دەکا:

بۆچی هاتوومە جیهان لەم هاتوچۆیە چیم ئەوێ!
من نەبووم مادام کە بووم ژینێکی پڕ هەستیم ئەوێ
ڕۆژی ئەووەل خالیقم فیکری حوڕی بەخشیوە پێم
دەرسی ئازادی ئەخوێنم ژینی سەربەستیم ئەوێ
هەرکەسێ مەستی شەرابێکە لە مەیخانەی ژیان
من لە بادەی عیلم و عیرفان و ئەدەب مەستیم ئەوێ
تێئەکۆشم ببمە زانای عیلمی تازە و عیلمی کۆن
چونکە بۆ قەوم و وەتەن من خزمەتی ڕاستیم ئەوێ
(بابە) ژینی خۆم لە ڕێی بەرزی وەتەندا دائەنێم
بۆ فیداکاری لە لاوان هێز و هاودەستیم ئەوێ

ئەم شیعرەی بابە بریتییە لە ئامۆژگاری گشتی، باس لەو سیفەت و ڕەوشتانە دەکا پێویستە هەموو کەسێک هەیبێ و پێڕەوی بکا. بەڕاستی ئەوەی شاعیر دەری دەبڕێ بەزیادەوە لە خۆیدا هەبوو.

### کوردایەتی و نیشتمانپەروەری

١

لە ڕۆژی ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٨ مایۆری سوپای ئینگلیز نۆئیل بەسەرۆکایەتی چل سەربازی هیندۆکی هاتە ناو شاری سلێمانی، شێخ مەحموود نامەی تایبەتی بۆ نووسی بوو بەهۆی عەبدوڵڵا ئاغای حاجی سەعید و فایەق تۆفیقەوە بۆی ناردبوو. بەم هۆیەوە بابە شیعرێکی هۆنیوەتەوە:



سەد درێغ دەوری ئەسیری قەومی کورد نەبڕایەوە
تاکو ئێستا ئەم گرێیە هەر بەکەس نەکرایەوە
میللەتی گەورە و بچووک گشتی بەسەربەستی ئەوێ
میللەتی کورد هەر لە ژێر بارا بەدیلی مایەوە
تاکو ئێستا هەر دراوسێ بوون عەدووی خاکی وەتەن
سەیری نەگبەت کەن کە ئینگلیز هاتە کۆڕ و کایەوە
سەر زمانی وەعدەیی شیرینی ئازادی وەتەن
ژێر زمانی بۆ ئەسیری دام و دانەی نایەوە
سەر زمانی حامییە بۆ قەومی لێقەوماوی کورد
ژێر زمانی زوڵمەکەی زەحاکی بۆ هێناوە
سەر زمانی ڕەهبەرە بۆ قەومی بێچارە و زەبوون
ژێر زمانی زەهر ئەڕێژێ گەر یەکێ جوولایەوە
ماددە چواردەی مەنهەجی ویلسۆنی پێش خۆی خست و هات
ماددە کە بۆ قەومی کورد دیلی ئەبەد خوێنرایەوە
هەرچی قەومێ کەوتە ڕێ بۆ سەربەخۆیی سەرکەوێ
سیاسەتی ئینگلیز بەدوو پاشقول لە ڕێ گێڕایەوە
(بابە) ئینگلیز هاتە ناو ئومێدی سەربەستی نەما
ڕەحمی یەزدانی نەبێ ئەمرین هەموو بەم غایەوە

لەم شیعرەدا بابە لە دواکەوتوویی کورد دەدوێ، بەلایەوە تا ئەو کاتە دراوسێکانی دوژمنی بوون و دەیانچەوساندەوە، کەچی سەرباری ئەمانە دوژمنێکی دیکەش پەیدا بوو ئینگلیز بوو. لە سەرەوە خۆی بەدۆستی کورد پیشان دەدا، بەڵام بەناوەرۆک زەحاک بوو. لە شیعرەکەدا ئاماژە هەیە بۆ پەراگرافی ١٤ی بەیاننامەی ویلسۆنی ئەمەریکی کە تیایدا هاتووە هەموو نەتەوەیێک مافی ئەوەی هەیە دەوڵەتی تایبەتی خۆی ببێ. ئەگەر ئەو بەڵێنە بۆ خەڵکی دیکە کەڵکی بووبێ بۆ کوردی نەبووە و لە بەرژەوەندیی ئینگلیز نەبووە کورد سەربەخۆیی دەست کەوێ.

۲

بۆ لێکدانەوەی شیعرەکەی پێشوو بابە دەڵێ:

ئەسیری دوێنێ ئەمڕۆ ئەحرارە
ڕەنجبەری دوێنێ ئەمڕۆ سەرکارە
بەندی و کەلەبچە دیلی و سێدارە
هەر خاسسەی قەومی کوردی هەژارە
ئەی کورد! هۆشت بێ عەسری بیستەمە
لە جوولە جاوە بلێ چیت کەمە
شەرقی ناوەوە دەشت و شاخانی
دیجلە و فورات و زاب و سیروانی
هەر لە لوڕستان تاکو بۆتانی
لە شیمالەوە تا ئەریوانی
هەمووی هی تۆیە تێیدا نۆکەری
ئاغای ماڵت بە بەسیە ڕەنجبەری
بەفێڵ و فڕی وەعزی دیانەت
بوویتە پێشمەرگەی سوپای خەلافەت
یارییەی تورکت دا بۆ جومهوورییەت
ئێستا پێت دەڵێ تورکی بەد تینەت
کورد میللەت نییە تورکی شاخییە
بێ مێشک و هۆشە لە من یاخییە
چل حوکمەتی کورد ئازا و سەربەخۆ
تورک ئەیدان بەکوشت هەموو خۆ بەخۆ
بۆ بەرزی تەختی خەلیفەی درۆ
(بابە) بەسی بێ مەبن دەسخەرۆ
کرمانج و زازا دوازدە میلیۆنن
دەس بدەنە یەک تۆڵە بسێنن



لەم شیعرەدا بابە ئامۆژگاری کورد دەکا، باسی جوگرافیای کوردستان دەگێڕێتەوە، وڵاتێکی گەورە و فراوانە، ئاوی زۆرە، دەوڵەمەندە. یارمەتی تورکی عوسمانی دا بۆ دروستکردنی دەوڵەتی تورکیای مۆدێرن، کەچی بۆرجوازی تورک دەڵێ، کورد میللەت نییە، «تورکی شاخاوی»یە. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە کورد بەشۆڕش نەبێ مافی خۆی ناستێنێ. ئەو سەردەمە بەچەک و سیلاح نەبووایە مافی نەتەوەیی دەست نەدەکەوت.

۳

لە شیعرێکیدا بابە بەزمانی ژنە جافێک گورگانە شەوێ بۆ ڕۆڵەی ساوای دەکا:

ڕۆڵەکەم بنوو خەوی خۆشت بێ
شیری حەڵاڵم شیفا و نۆشت بێ
پەڕی جوبرەئیل بەڕووپۆشت بێ
بۆ بەرزی وەتەن بیر و هۆشت بێ
ڕۆڵەکەم بنوو هیوام بەتۆیە
سەرۆکی هۆزم دوو لا و دوو هۆیە
دوژمن دوو نەوعە بێگانە و خۆیە
لە نیشتمانا هەر باوکەڕۆیە
هۆزم نەزانە و هەژارە و نەفام
ڕۆڵەی شیرینم! بگەرە فریام
ڕۆڵەکەم بنوو بەلای لایەوە
بەلاوانەوەی دەنگی دایەوە
کاتی گەورە بووی هاتیە کایەوە
بنوارە وەتەن لە گەشت لایەوە
خوێنمژ و عەدوو کەوتوونە وڵات
بگرە و بەردەیە بۆ فەقیر و لات
ڕۆڵەکەم! بنوو وەتەن وێرانە
میللەت بێ کەسە مات و حەیرانە
دوژمنی وەتەن هەر لە خۆمانە
ئەمەت لە بیر بێ ڕۆژ و زەمانە

وەختێ گەورە بووی دەستت دایە چەک
جیای نەکەیتەوە شێخ و ئاغە و بەگ
ڕۆڵەکەم بنوو کاتێ بووی بەلاو
ئەحوالی وەتەن بێنەرە بەرچاو
قەومت ڕزگار کە لە زنجیر و داو
تۆڵە بسێنە یەک و سەد تەواو
ئەمجا وەک (بابە) ڕوودەرە دوژمن
فەرقی قەت نەکەی بچووک و مەزن

لای لایەی شاعیر پڕ لە سۆزی دایکیەتی و گیانی کوردایەتی. ئامۆژگارییەکانی دایک بۆ ڕۆڵەی ئەوەیە، تەنیا بێگانە دوژمنی کورد نییە، بەڵکو خۆخۆری و نەتەوەخۆری و کوردخۆری لە ناو کورددا باوە. دایکی ڕۆڵەی خەو لێ کەوتووی ژنە جافە، بەناوی هۆز و نەتەوەوە قسە دەکا. سەرۆک و بەگ لە هۆز دابڕاون، لەبەرئەوە بەڕۆڵەی دەڵێ کە گەورە بوو لە پێشانا دژی شێخ و ئاغا و بەگ بوەستێ. بەڕاستی تا ئێستا هەوڵ دراوە ئەوەندەی باس لە دوژمنی دەرەوە دەکرێ وەکو هاوسێکانی کورد و ئەمپریالیستی جیهانی ئەوەندە باس لە دوژمنی ناوەوە نەکراوە، بەڕاستی کاریگەریی دووبەرەکی ناوەوە لە دواکەوتن و بەئامانج نەگەیشتنی کورد لە کاریگەریی دوژمنی دەرەوە کەمتر نەبووە.

## ٤

دەسەڵاتی شای ئێران لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٠ بەزەبری هێزی هەوایی و زەمینی هێرشێکی نامەردانەی کردە سەر عەشرەتی جوانڕۆ بەناوی ئەوەی چەکیان بکا. بێ گومان شای ئێران لە بزووتنەوەی هەستی نەتەوەیی کورد دەترسا و نەیدەویست چەک و سیلاح لە ناو کۆمەڵی عەشایەردا هەبێ. بۆ ئەم مەبەسە بابە شیعری داناوە:

گەلێ دوژمن لە گشت لاوە خەریکی کوشتنی تۆیە
لە هەر گۆشەی وەتەن گوێ بگرە دەنگی شین و ڕۆ ڕۆیە
ئەسیری و کوشتنی کورد دەمێکە تەوقی ئەستۆیە
لە پاش کوشتاری موکری ئێستەکە نۆرەی جوانڕۆیە
لەبەرچی خوێنی ئەم قەومە موباحە لای هەموو قەومێ
لەسەر ئەم قەومە مەزڵوومە قیامەت بۆچی ناقەومێ



لە قانوونی ژیان هەر قەومی کورد مەئیووس و مەحروومە
جەزای دارە ئەوی ژینی بوێ لەم قەومە مەزڵوومە
بەری ئەم دارە ئەستۆ و گەردنی لاوانی مەحکوومە
لە دنیادا ژیان بۆ قەومی کورد نایاب و مەعدوومە
لە کوێی ئەی ڕووحی کاوە هەڵگری بەیداغی حوڕڕییەت
نەجاتی میللەتی کورد دەی لە دیلی و مەینەت و زیللەت
مەپرسە سیروان بۆ سوورە! دیجلە بۆچی لێڵاوە!
بەڕاستی ئاوی ئەم نەهرانە سێ سەد ساڵە خوێناوە
چ خوێنێ! خوێنی کورد و لاوی کوردستانە ڕێژراوە
لە لای تورک و عەجەم کوشتاری ئێمە مۆدەیە و باوە
لە مێژووی کۆمەڵا (بابە)یەک و سەد تۆڵە نووسراوە
ئەمە دەورێکی زەححاکە نزیکە هەڵکەوێ کاوە

دوژمنایەتی و چەوساندنەوەی دەسەڵاتی ئێران بۆ سەر کورد گەلێ دژوار بوو. لەو سەردەمەدا گیانی کوردایەتی لە ناوچەی موکریان گەرم بوو. ئەنجامی کۆمارەکەی کوردستان لە موکریان ڕووخان و لە سێدارەدانی سەرۆکەکانی کورد بوو بەتایبەتی قازی محەمەد. ئینجا دەسەڵاتی شا خۆی لە مارغە نابوو بۆ عەشرەتێکی نەبەز و ئازای کورد، بۆ جوانڕۆی شانازی میللەتی کورد.

شاعیر هاواریەتی، هانا بۆ گیانی کاوەی ئاسنگەر دەبا، لەو سەرکەوتن و سەربەستی دەبینێ. چونکە نەتەوەی لە زۆرداری زەححاک ڕزگار کرد. ئێستاش تورک و عەجەم کوردستانیان کردووە بەدۆزەخستان. ئەم کارە بەکاوەیێک نەبێ ناچێتە سەر، جا ئەو کاوەیە کەی پەیدا دەبێ!.

## ٥

لە سوورەتی «فەتح» لە قورئاندا ئایەتێک هاتووە دەڵێ: «سَتُدْعَوْنَ إلی قَوْمٍ أولی بَأسٍ شَدَیْدٍ» (میللەتێک بەهاناتان دەگا ئازا و قارەمان). لە هەندێ لە تەفسیرەکانی قورئان ئەوە هاتووە ئەو میللەتەی لەم ئایەتەدا باس کراوە میللەتی کوردە. بابە ئەم ئایەتەی کردووە بەسەرچاوە و لیریکێکی هۆنیوەتەوە:

لە سوورەی فەتح دا بەم ئایەتە دڵ شاد و مەسرووره
(ستودعەونە ئیلا قەومێن) ئیشارەی کوردی غەییبووره
(ئولی بەئسین شەدیدین) وەسفی قەومێ بێ لە قورئانا
بەئازادی ئەژی دائیم لە دیلی و ئیستیلا دووره
لە گێژ و مەوجی دەریای عالەما غەرقن گەلێ ئەقوام
بەقای ئەم میللەتە کوردە بەنەسسی ئایە مەستووره
نەوەی مادی مەزن لاوی دلێری خاکی کوردستان
بەئەمری ئێزەدی بۆ حیفزی ئەم میراتە مەئمووره
نەبۆتە دیلی هیچ دنیا گرێ ئەم میللەتی کوردە
چ ئەسکەندەر چ جەنگیز و هۆلاکۆ بێ چ تەیمووره
تولووعی ڕۆژی ئازادی لە شوێنی ئەم شەوی تاره
نزیکە ڕۆژ هەڵێ ئاسۆی وەتەن ڕووناک و پڕ نووره
قەراری داوە لاوچاکی وەتەن ڕۆژێ کە فرسەت بوو
پەتی کا هەروەکو سەگ دوژمنی هەرچەند مل ئەستووره
ئەوانەی خوێنی میللەت ئەمژن و جاسووس و بێگانەن
قەلاچۆیان لە لای لاوچاکی کورد قانوون و دەستووره
دەمێکە شێت و شەیدای ڕێگەیی ئازادییە (بابە)
هەتا ماوە بەسەرفی ماڵ و سەر لەم ڕێیە مەجبووره

بابە لەم شیعرەدا لە ڕووی گەورەیی قورئانەوە باس لە کورد دەکا، بەلای ئەوەوە قەومێک لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کرابێ، دەبێ چەندە گەورە بێ، چۆن دەبێ ڕێزی لێ نەگیرێ! لە پاشانا شانازی بەوەوە دەکا باپیرانی کورد نەتەوەی مادی سەردەمی مێژووی کۆنی ئەرکیۆلۆجی بوون، لەو ڕۆژگارە کۆنانەدا میدیا یا مادستانیان پێ دەووت. لە مێژووی کۆنیدا نەبووە بەدیلی ئەسکەندەر و جەنگیز و هۆلاکۆ و تەیموور. ئەوجا شاعیر پڕ باوەڕە کورد بەهۆی خەباتی لاوانی دەگاتە هیوا و ئامانجی.



## ٦

مەدەنییەتی مادی کۆن جگە لە کوردستانی گەورە گەلێ لە ناوچەکانی قەفقاس و ئاسیای بچووک (تورکیای ئێستا)ی گرتبووەوە. خەڵکی ئەم هەرێمانە بەنەژاد هیندۆئەورووپی بوون، لەمانە خەڵکی تورکیای ئێستا و ئازربێجان (ئێران و ڕووسیا) بەنەژاد هیندۆئەورووپین، بەڵام بەزمان تورکی مەغۆلین.

بابە خۆی دەڵێ ئازربێجانی ئێران لە مێژوودا ناوی مادی بچووک بووە. چەند جارێک داوای لە تۆفیق وەهبی کردووە مێژووی مادی بچووک بنووسێتەوە. بۆ ئەم مەبەسە بەشیعر داوای لە تۆفیق وەهبی کردووە مێژووی ماد بنووسێتەوە:

تەورێزی خۆش و گەورە هەتا عەسری پێنجەمین
واتە و وشەی بەکوردییێ بوو ڕێک و دڵنشین
ئەو شارە گەورە قەومی تری تیا نەبوو مەکین
چۆن هاتنە جێی ئەمانە ئەوانەی لەوێ ئەژین!
حەوتەم عەسر کە حوکمەتی ئێلخانی هاتە ناو
گۆڕاو و دەرکرا گەلی کوردی لەیەک بڕاو
ئەم لاپەڕە لە مێژووی کوردا ڕەشە و غەشە
زانیاری کورد لە شۆڕشی ئەو دەورە بێ بەشە
بۆ عەلەمی پان و بەرز و بڵاوت کە زۆر گەشە
نووسین و نەشری لازمە ئەم حادیسەی ڕەشە
قەوم گەلی لە کۆمەڵی تردا توانەوەی
پێویست بەمێژوویێکە بۆ هاوخوێن و بۆ نەوەی

لەم شیعرەدا بابە ڕاستییێکی مێژووی کۆن دەگێڕێتەوە، ئەو گۆڕانکارییە نەژادییەی لەو ناوچانەدا بووە کارێکی ئاسایی بووە. لێرەدا ئەو ڕاستییە مێژووییەش دەکەوێتە گۆڕێ کە زانایان «پاکی نەژاد» لە تەعریفی «نەتەوە» دەخەنە دەرەوە، چونکە بەئاشکرا دیارە زۆربەی نەتەوە گەورە و بچووکەکانی قەفقاس و تورکیای ئێستا بەنەژاد تورکی مەغۆلی نین، تەنیا بەزمان لەو نەژادەن، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ زمان مەرجی بنچینەیی و سەرەکییە بۆ دیارکردنی ناسنامەی هەر قەومێک.

## ٧

له دوای کوودیتا سوپاییپیەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ له بەغدا، بابه له ساڵی ١٩٥٩ بەم جۆره له پێوەندی نێوان کورد و عەرەب دەدوێ:

کاکی عارەب تۆ لەگەڵ من عەهد و پەیمانت هەیه
تۆ بەهەستی و هێزی من بڕوا وو ئیمانت هەیه
وا بەدەستوور قەومی وەک من دۆستی هاوشانت هەیه
بۆ له کوردستانی من پارێز و پەنهانت هەیه
تۆ له واتەی دوژمن و خەسمی وەتەن گوێت کەڕ بکه
هەر بەسیدقی کورد و کوردستانی من باوەڕ بکه
کاکی عارەب من وەکو تۆ بنج و تار و پۆم هەیه
قەومی مێژوودارم پیت و زمانی خۆم هەیه
چل عوسووره بەم زمانه شیعر و گفتوگۆم هەیه
مافی تۆ چی بێ منیش لەم خاکه مافی تۆم هەیه
تۆ جونووب و ناوەوه من شاخ و ئەنهاری شیمال
بووه بەیەک ئەمجا عیراقی پێ گەیشتۆته کەمال
من بەدووربینی فیکر زوو کەشفی ئاسۆم کردووه
بۆ عیراقی خۆشەویستم خزمەتی خۆم کردووه
هەرچی خوێناوم هەیه لەم ڕێیەدا ڕۆم کردووه
پێشەوا خۆی عالمه بەو خزمەتی بۆم کردووه
کاکی عارەب تۆ بزانه کورد برای هاوشیرته
سەیری مێژووی خۆت بکه ڕووناکی بەخشی بیرته
دوو براین لەم خاکەدا من نیشتمانی خۆم هەیه
نووسەر و نووسراوی خۆم بیر و بەیانی خۆم هەیه
بۆ دەبوستان و دەبیرستان زمانی خۆم هەیه
من عیراقیم و بەڵام تەرزی ژیانی خۆم هەیه
ئەم قەڵای گەورەی عیراقه وا لەسەر دوو پایەیه



کورد و عارەب هەریەکه یەک پایەیی پڕ مایەیه
کوردم و ڕاست و دروست قەت فێڵ و فیشاڵم نییه
وا گەییومه سینني ڕوشد ئیتر گڕوگاڵم نییه
ئێسته ئازاد و حورڕم هەڵپەی پەڕ و باڵم نییه
غەیری مێژوو گۆڕی گەوره پرسەری حاڵم نییه
بۆ کەریمی کورد و عارەب (بابه) سەربازی ئەکەم
جانفیدای جومهوورم و قەوم و وەتەن ڕازی ئەکەم

لەم شیعرەدا بابه لەگەڵ عەرەب قسه دەکا، نویشکی بیروبۆچوونەکانی ئەوەیه ئەو مەدەنییەت و مێژوو و سامانەی عەرەب هەیەتی، کوردیش لەوه بێ بەش نییه. کورد شیعری هەیه، خاکی هەیه، زمانی هەیه تەرزی ژیانی تایبەتیی خۆی هەیه. لەو سەردەمەدا ئەم بیروڕایانەی بابه له مێشک و خەیاڵی هەموو کوردێکی دڵسۆزدا بوون. خوێندەوار و ڕۆشنبیر و ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد لەو پلەیەدا نەبوون یەکسانی کورد و عەرەب له مافی سیاسی بەعەرەبی عیراق و هەموو گێتی بگەیەنن. لەبەرئەوه تەنیا دوو ساڵ بەسەر ئەم شیعرەدا تێپەڕی بوو که بزووتنەوەی میللەتی کورد له دژی دەسەڵاتی بەغدا دەستی پێ کرد (شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١). له دوا دێڕی شیعرەکەیدا بابه ستایشی عەبدولکەریم قاسم دەکا، لەو کاتەدا ئەمه تەنیا بیروڕای شاعیر نەبوو بەڵکو هەڵوێستی هەموو نیشتمانپەروەرێکی ئەو وڵاته بوو بەکورد و عەرەبەوه.

***

عەبدولڕەحمان بەگی بابان، نازناوی شیعری بابه. شاعیرێکی دیار و بەدیمەنه له ئەدەبی کوردیدا. جێ پەنجەی دیاره له نوێکردنەوەی شیعری کلاسیکی له ڕووی ڕوخسار و ئەدگار و ناوەرۆک و مەبەسی شیعرییەوه. هەموو جۆره کێشەکانی له بەرهەمی شیعریدا بەکارهێناوه. شۆڕشێکی گەورەی له قافیەدا کردووه، لەگەڵ بەکارهێنانی یەکێتیی قافیه و جووت قافیه (مەسنەوی) له شیعرێکدا، قافیەی ڕەنگاوڕەنگیشی هەیه.

له ناوەرۆکی شیعریدا له ناو مەبەسه کلاسیکییەکانیدا داهێنانی هەیه. دڵداری له نێوان پیری حەفتا ساڵه و گەنجی حەڤده ساڵه، هەڵوێستی بەرامبەر بەژن، ئاوڕدانەوەی له ژیانی کۆمەڵایەتی، مەبەسی سەرەکی شیعری بابه کوردایەتییه، ئەوەی تێکەڵ بەناگزووریی کۆمەڵایەتی و بەسەرهاتی مێژوویی و پێوەندی کورد بەهاوسێکانییەوه کردووه. بابه یەکێکه له شاعیره گەورەکانی کورد له سەدەی بیستەمدا.

## بەشی هەشتەم

## مفتی پێنجوینی

## ١٨٨١ - ١٩٥٢

### ژیانی

عەبدوڵڵا کوڕی مەلا کەریم لە ساڵی ١٨٨١ لە گوندی بێستانەی نزیک پێنجوین لە دایک بووە. هێشتا منداڵ بووە کە باوکی مردووە. بەشێک لە خوێندنی حوجرەی مزگەوتی لای برا گەورەی مەلا ئەحمەد گەیاندۆتە ئەنجام. ئینجا چووە بۆ سەقز و سابلاغ (مەهاباد) و بۆکان بۆ مەبەسی خوێندن. لە پاشانا ڕووی کردۆتە مەریوان و ماوەیێک لەوێ ماوەتەوە هەندێ لە خزمەکانی بەسەرکردۆتەوە، لە دوای ئەمە گەڕاوەتەوە گوندی و لەوێش لای مەلا ئەحمەدی برای دەستی کردۆتەوە بەخوێندن. ئینجا بەشێک لە خوێندنی لە بیارە بووە لە لای مەلا عەبدولقادری بیارەیی. ئەم مامۆستایە نازناوی مفتی بۆ هەڵبژاردووە وەک ڕێزلێنانێک لە مفتی ئەو سەردەمەی شاری سنە ناوی مەلا عەبدوڵڵای مفتی بووە، لەبەرئەوەی ئەم شاعیرەی دوارۆژیش ناوی عەبدوڵڵا بووە بەم ناوە پیرۆز کراوە. لە دوای ماوەیێک دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە، ئیتر بڕیاری داوە ئیجازەی خوێندنی حوجرە وەرنەگرێ و مەلایەتیش نەکا. بەم جۆرە گەڕاوەتەوە پێنجوین و ملی داوەتە کاسبی و دوکانی تووتنچی داناوە لەگەڵ فرۆشتنی شتومەکی وردەواڵە.

هەڵسوکەوتی مفتی لە ناو کۆمەڵی کۆنەپەرست و دواکەوتوودا جێی ڕەزامەندی نەبووە، تا گەیشتۆتە ئەوەی هەوڵی کوشتنیان داوە، لە سووتانەکەی ساڵی ١٩٣٦ی پێنجوین دوکانی سووتاوە و هەندێ لە ڕەشنووسی شیعری لەناوچووە. لە مانگی ئاغستۆسی ١٩٤٠ گیراوە. بەپەنجا دینار سزا و نۆزدە ڕۆژ بەندی وازیان لێ هێناوە. لە بوومەلەرزەی ساڵی ١٩٤٧ی پێنجوین بەماڵەوە باری کردووە و چووە بۆ سلێمانی، لە پاشانا گەڕاوەتەوە پێنجوین ئینجا ڕووی کردۆتەوە مەهاباد، لە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان گەڕاوەتەوە پێنجوین.

مفتی کەسێکی دەست کورت بووە، خاوەنی بیروڕای خۆی بووە، بەندیخانەی دیوە، گیانی کوردایەتی بەهێز بووە، بەقەڵەم لە دژی دەرەبەگ و ئاغا و شێخ و مەلا جەنگاوە.



لایەنگری مافی ژن بووە، لە هاندانی بۆ زانست زانیاری چالاک و بێ وێنە بووە، لەسەر هەژار و بێ نەوایانی کردۆتەوە، لە چاکە و بەرژەوەندیی کرێکار و جووتیار و ڕەنجبەر گەڕاوە. بیروباوەڕی مفتی تەنیا بەقسە نەبووە بەپراکتیکیش دەری بڕیوە، تەنیا کوڕەکانی خۆی لە بەرخوێندن دانەناوە، بەڵکو کچەکانیشی فێری خوێندن و نووسین کردووە. لەو سەردەمانەی دوکانی لە پێنجوین بووە ئەگەر بۆی نەکرابێ لە دوکان بێ یەکێ لە کچەکانی خۆی لەوێ داناوە بۆ فرۆشتنی شتومەک.

شاعیر لە ڕۆژی ١٥ی حوزەیرانی ١٩٥٢ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە، تەرمەکەیان بردۆتەوە پێنجوین و لە گۆڕستانی حاجی شێخ بەخاک سپێرراوە. لە دوای ناشتنی بەچەند ڕۆژێک وەسیەتنامەی گەیشتۆتە دەست بنەماڵەی. لەو تۆمارەدا پێشنیازی کردووە لە گردی سەیوان لە سلێمانی بنێژرێ.

وەسیەتنامەکەی ئەم چوارینەیە:

ئەگەر مردم تکایە گردی سەیوان ماڵ و قەبرم بێ
گەڵای ئەو دارە جوانانە لە جێی سابات و کەپرم بێ
تکاکارم لە ئاخردا لە قاپی حەزرەتی یەزدان
لەگەڵ یارانی هاودەم هەر ئەوێ مەیدانی حەشرم بێ

مخابن لە دوای ناشتنی لە پێنجوین لە توانای کەسوکاری نەبووە بیگوێزنەوە گۆڕستانی گردی سەیوانی سلێمانی.

### شیعری

مفتی یەکەمین شیعری لە ساڵی ١٩٣٦ لە کۆواری ژیان بڵاوکردۆتەوە، تا مردنی پیرەمێرد (١٩٥٠) پێوەندی بەڕۆژنامەی «ژین»ەوە هەبووە و شیعری لەم ڕۆژنامەیە و کۆواری «گەلاوێژ» بڵاوکردۆتەوە. لە سەردەمی کۆماری کوردستان (١٩٤٦) لە مەهاباد بووە، شیعری لە کۆواری «هەڵاڵە» بڵاوکردۆتەوە. لە نزیکەوە ئاشنایەتی لەگەڵ شاعیرانی وەکو پیرەمێرد و قانیع و بەنگینە بووە.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

لە ڕووی کێشەوە مفتی هەردوو بابەتە شیعری بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی هەیە. عەرووزییەکانی لەسەر بەحری هەزەج و ڕەمەل و موزاریع و خەفیف و ڕەجەز و

بەسیت هۆنراونەتەوە. لە قافیە و پاش قافیە دەوڵەمەند نییە. ئەو دەنگانەی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکاری هێناون ئەمانەن: د ر ل م ن (ە – ـە) ی ێ. لە پاش قافیەدا ئەم وشانەی بەکارهێناوە: ئەکەم، کورد، وەتەن، بێ، ناکەم، ژن، ئەگرم، ببێ.

بەشێکی زۆر لە شیعری لەسەر بنچینەی بەندی چوارین و پێنجین و شەشین ڕێکخراون. بەزۆری قافیەی ڕەنگاوڕەنگی لەم جۆرە شیعرانەدا بەکارهێناوە. لەو شیعرانەدا ئەم قافیانە بەرچاو دەکەون (ا ا ا ا)، (ا ا ب ا)، (ا ب ا ب)، (ا ب جـ ب)، لە پێنجینەکاندا (ا ا ا ا ب)؛ لە شەشینەکاندا (ا ا ا ا ب ب). لە شیعرە خۆماڵییەکانیدا هەموو کێشەکانی بەکارهێناوە، بەتایبەتی دە بڕگەیی، کەمتر هەشت بڕگەیی. لە قافیەشدا جووت قافیە (مەسنەوی) لەم جۆرە شیعرەیدا بەکارهێناوە.

## شیعری مفتی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

بەرهەمی مفتی لە بابەت مەرجەکانی شیعرەوە بێ کەموکوورییە. لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر بایەخی بەناوەڕۆک (مانا) داوە نەک ڕوخسار، لەبەرئەوە زۆربەی بەرهەمی لە شیعری پەروەردەیی و فێرکردن (دیداکتیکی) نزیک بۆتەوە. شیعری کۆمەڵایەتی و دوان لە کەموکووڕی ناو کۆمەڵ هەوەسی بنچینەیی مفتی بووە. لەوانە بایەخی زۆری بەکردەوەی خراپی چینەکانی سەرەوە داوە، لەسەر هەژار و بێ دەسەڵاتانی کردۆتەوە، داوای مافی ڕەوای ژنانی کردووە، کەچی ئەوەندە بایەخی بەجوانی و وەسف و دڵداری نەداوە. لەم بابەتەوە شیعری کەمە. شاعیر ژنی زۆر خۆشویستووە لەبەرئەوە بەلایەوە بەرگریکردن لێ و داواکردنی مافی وەک ئادەمزاد پێویستترە لە لایەنی گیانی و دڵداری و خۆشەویستی.

## نموونەی شیعری

### نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

لە شیعرێکیدا بەهۆی زیندانیکردن و دوورخستنەوەی لە زێدی خۆیدا دەڵێ:

بۆ تۆیە وەتەن من لە وەتەن توونا کراوم
دێوانە سیفەت ژینمە بەدناویە ناوم
بێ حورمەتی لای خزم و برا ناحەزی واعیز
جێ داری یەزیدم بەبەدی ناوی زڕاوم



من دێتە دڵم بمکوژن و هەروەکو مەنسووڕ
بڕوا بەهەدەر خوێنی نەبێ خوێنی ڕژاوم
باری غەمی تۆ بوو لەسەرم ئێستەکە وا من
وەک چینی فەنەر وایە قەفی پشتی چەماوم
شەو تاکو سەحەر شیوەن و زاریمە هەتاکەی
بڕوانە خوڕەی خوێنی گەشی چەشمەیی چاوم
قاچ و دەسم ئیفلیجە نەما هێز و تەکانی
ئەسپی هونەری هۆش و ووتەی توند و بەتاوم
بۆ غایەپەرستی وەرە بنوارە لە داخت
وەک تار و نەی و عوودە کزەی جەرگی بڕاوم
قەستەم بەچیا و شاخ و هەموو دەشت و نزارت
قەهر و غەمی تۆم نانە لەگەڵ گۆشت و پڵاوم
نایدەم بەگشت پارچە قوماشی هەموو دنیا
نانێکی بەڕووی تاڵ و لەگەڵ شاڵی دڕاوم
جێی بەرد و پلارم لە هەموو لاوە لەسەر تۆ
بێ عاریی و سەرسەختییە بەم جۆرە کە ماوم
(مفتی) لە قوڕی سوور و ڕەش و شین بەسەراکە
ئەوساکە ئەڵێم خاوەنی سەد تاج و کڵاوم

لەم شیعرەدا مفتی موناجات لەگەڵ نیشتماندا دەکا، ئەوەی تێ دەگەیەنی گرتن و زیندانی کردن و ئازاردانی لەبەرئەوەیە چونکە کوردایەتی دەکا. بەڵام هەزار ئەوەندەش ئازار بچێژێ و وەکو مەنسووڕی هەلاجی بەسەر بێ باکی پێ نییە و زیاتر هۆگری نیشتمان دەبێ. لووتکەی خۆشەویستی بەرامبەر بەکوردستان دەگاتە ئەوەی بڵێ کار و پیشەم قوڕپێوانە، ئەگەر قوڕی سوور و ڕەش و شین بکەم بەسەرما ئەو کاتە شانازی بەو قوڕەوە دەکەم بەکڵاوی تاجداری شاهانەی دەزانم چونکە بۆ پێشکەوتنی کوردستان کردوومە بەسەرما.

## ٢

لە لیریکێکیدا لەو کاتەی ستایشی کوردستان دەکا، گلەیی هەیە لە هەندێ کردەوەی خراپی ناو کۆمەڵ:

هەر قەومە قەولی سەفەربەریەتی
ئەم کوردە دایم شەڕ لەسەریەتی
یا بەچەپۆکی دوژمن پەشێوە
پۆلێ لە زیندان پۆلێ لە کێوە
یا هەر خۆ بەخۆ ئەنیشنە یەک
دار یەکێتی دەردێنن لە ڕەگ
ئەم داخە ئاخۆ کەی سامانی بێ
ئەم دەردە ئاخۆ کەی دەرمانی بێ
لە کوردستانا دەمانچە و تفەنگ
خۆزگە نەم ئەبیست نەم ئەدی بەرەنگ
وەختێ کە ئەچین پاسیان بۆ ئەبرین
بۆ ئەوەی دز و جەردەی پێ بگرین
کەچی هەر خۆمان ئەبین بەجەردە
چەتەیی ئەکەین لەم کێو و هەردە
هەزار کار ئەکەین لە دێهات و شار
بەهۆی پاسەوە وون و نادیار
ئەو بێچارانەی کەوا ئەکوژرێن
پاسدار ئەیکوژن بەڵکو نەناسرێن
ئەگەر نا ئەوەی چەتەی ناوادارە
ڕاووڕووت ئەکا بۆ پوول و پارە
خۆی هاوار ئەکا من فلان کەسم
چیت پێیە و بێنە زوو بیدە دەسم
یا برێک حەیوان ئەداتە بەردەم



ئەیانداتەوە بەقیمەتی کەم
ئاخ ئەمدی تفەنگ کۆ ئەکرایەوە
شەڕ و کوشتن و شین ببڕایەوە
فەقیریش بۆ خۆی ئەحەسایەوە
مناڵی سیسیش ئەگەشایەوە

شاعیر لەم لیریکەدا هەندێ لایەنی خراپەکاری ناو کۆمەڵ دەخاتە ڕوو وەکو ڕێگری و تاڵانکردن و پیاو کوشتن. بۆ بەڵگە ئەوە دەڵێ لە کاتێکدا دەسەڵاتی میری پاس (مۆڵەت) دەداتە خەڵکی بۆ تفەنگ و دەمانچە هەڵگرتن بۆ ئەوەی خۆیانی پێ پاس بکەن و بپارێزن، کەچی ئەوان بۆ ڕێگری و تاڵانکردن بەکاری دێنن. مفتی خۆزگە دەخوازێ چەک و سیلاح کۆ بکرایەوە بۆ ئەوەی شوێنەواری کوشتن لەسەر ڕووی زەوی نەمایە.

## ٣

لە شیعرێکیدا باس لە کار و کردەوەییێک دەکا بۆ ئەو سەردەمەی میللەت دەستی نەدەدا و دەبوو بگۆڕێ:

لەمەولا خانەقا ناچم بەمەولا تۆبە ئەشکێنم
حەقی ئەم کوردە بێچارە لە چاودا بەستی ئەستێنم
کەوای پەستی و نەزانینم دڕی و یەک دەفعە دام ماڵی
بەلافاوی خەیالاتم نەمامی عیلم ئەڕوێنم
لە پیری کۆن و پاشکەوتووی وەکو خۆم لازمە لادەم
کوڕانی پێگەیشتووی مەکتەبم ئەمجارە ئەدوێنم
هەموو فێڵ و قوماربازیت ئەبێ یەکسەر بەیانی کەم
ئەگەر سەد دەفعە ماچی کەی قوڕی ژێر کەوش و داوێنم
ئەگەر تۆ ئەهلی دینی خوێنی عالەم بۆ ئەکەی نۆشت
وەرە سەیری دڵی من کە کە چەندە پاک و خاوێنم
لەسەر ئەم پارچە شیعرانە ئەگەر گیراوی مەحبەس بم
دەمێکە حازری دار و شەلاخ و ئەزیەت و جوێنم
وەکو ماسی بەسەربەستی غەوواسی گێژی بن ئاوم
لە بنکی بەحری فیکرا گەوهەری عەنتیکە دەردێنم

بەدەستێ چەپڵە لێدەم داخەکەم دەنگ و تەقەی نایە
گەلێ کەس وا ئەزانن خەو ئەبینم یان ئەڕاوێنم
فلیمی سینەما چەرخە ئەگۆڕێ ڕۆژی سێ سەد جار
دە چیبکەم کەس بەگوێم ناکا کە ئاغا نیم و مسکێنم

بەلای مفتییەوە بەپاڕانەوەی بیری ئایینی مافی کورد وەرناگیرێ. پێویستە نەزانی قەلاچۆ بکرێ، نەمامی زانین بروێنرێ. هەرچەندە پیرەمێردی کۆن دەوری هەیە، بەڵام پێویستە لاوی تازەی قوتابخانە پێ بگا. ئەوانەی خۆیان بەئیماندار دەزانن لەوانەیە مفتی وەک یەکێکی لە ڕێز دەرچوو بژمێرن، کەچی ئەو لەوان خاوێنترە، بۆ ئەمە مفتی بەڵگەی بەدەستەوەیە، ئەو قسانەی دەیانکا، ئەو شیعرانەی دایاندەنێ سەرێشەی بۆ پەیدا دەکەن، چونکە بەدڵی ئەو ئیماندارانە نییە. شاعیر ئاخ هەڵدەکێشی، بەڵام بەقسەی ناکەن، چونکە ئاغا نییە و مسکێنە. ڕاستییەکەش ئەوەیە مسکێنێکی ژێر کاربەدەست بێ لە ئاغاییێکی بێ هۆش و گەمژە باشترە.

## وەسفی قوتابخانە

مفتی وەسفی هەموو شتێک دەکا کەڵکی بۆ کۆمەڵ هەبی کەچی دژی شاعیرانی دڵداری کلاسیکی و وەسفی خەت و خاڵی کیژانی جوانە.

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «خوێندن» لە ساڵی **١٩٣٦** هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

مەکتەب ژیانی میللەتە
باغی حەیات و وەسلەتە
بۆ ئەهلی دنیا جەننەتە
هەرکەس نەچێ بێ هیممەتە
باغێکە مەکتەب پڕ سەمەر
ڕووناکە وەک شەمس و قەمەر
شوعلەی ئەچێ بۆ دەشت و دەر
پڕ عەیش و نۆش و عوشرەتە



ئەی کورد ئەگەر تۆ عاقڵی
وەک بولبولی شەیدای گوڵی
بۆچی لە مەکتەب غافڵی
زانست بەپیری زەحمەتە
عیلم و مەعاریف بۆ بەشەر
گەنجێکە پڕ لەعل و گوهەر
وەک تاجی شاهی بیکە سەر
ساحیب بەها وو قیمەتە
گەنجی ساحیب بەقا نییە
زەحمەت بەبێ بەها نییە
سستی لە سەنعەت چا نییە
دووری لە مەکتەب وەحشەتە
ئینسانی بێ عیلم و عەمەل
وەحشێکە وەک حەیوانی شەل
مەهتووکە تا ڕۆژی ئەجەل
بێ قیمەت و بێ حورمەتە
هەرکەس کەوا هونەروەرە
لە فیکرا زۆر مونەووەرە
بەوێنەی ماه و ئەختەرە
هەر مەکتەب و هەر سەنعەتە
ئەی کورد هەتا کەی غافڵی
خۆ تۆ لە عومرا کامڵی
بۆ هیچ نەزان باتڵی
تاکەی لەسەر ئەم حاڵەتە
مەجبووری خۆراکیت و جل
عومرت کە چوو بۆ دەوری چل
چی فێر ئەبیت خاکت بەمل
ئەمڕۆکە ڕۆژی دەرفەتە

(مفتی) لە ڕێی چاکی وەتەن
دووسەد جنێوت پێ ئەدەن
بشکێنە ئێسقان و بەدەن
بۆ تۆمە ئالی ڕەحمەتە

مفتی ئەم لیریکەی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی هەشت بڕگەیی داناوە، لەسەر سیستێمی چوارینی قافیە (ا ا ا ب)، وەک بەیتی شیعری میللی بەشەوقەوە خەڵکی دەیخوێننەوە و چێژی لێ وەردەگرن. لە شیعرەکەدا باس لە قوتابخانە دەکا، ئەو دەسگایەی بنچینەی پێشکەوتنی کۆمەڵە. شاعیر لەگەڵ کورد قسە دەکا، دەمێک گلەیی لێ دەکا، دەمێکی دیکە ئامۆژگاری دەکا. ئەم شیعرە بۆ قوتابییان سروودێکە دەشێ بەئاوازەوە بووترێ، هەروەها بۆ فێربوونی زمانی کوردی لەبەر بکرێ.

٢

لە لیریکێکی دیکەیدا دیسانەوە بەیادی قوتابخانەوە لە ساڵی **١٩٤٣** مفتی دەڵێ:

من ئەزانم سێبەری مەکتەب ئەساسی ژینمە
حورمەتی خاکی وەتەن ڕوکن و حەساری دینمە
تازە خەلفێکم لە باغی مەکتەبا ئەشنێمەوە
باغەوانی من موعەللیم عیلم و فەن پەرژینمە
کوردم و ئەولادی کوردم بشمرم وەسیەت ئەکەم
پێم بڵێن ئەی کوردە هۆشت بێ لە جێی تەلقینمە
چاوەڕێی بەرزی وولاتم سەرکەوێت و بەرکەوێ
بۆ ئەمە شەو تا بەیانی ئاھ و ناڵە و شینمە
حەز ئەکەم خاکی وولاتم سەوز و پاراو بێ بەئاو
شاهیدم لافاوی ئاوی چاوی پڕ ئەسرینمە
من چ باکم باغی شاهی یا حەدیقەی گەورەیە
دڕک و داڵی هەرد و کێوم نێرگس و نەسرینمە
گەر ئەپرسن شۆرەت و ناوم بڵێن عەبدولکەریم
بێچووە تووتنچی نەوەی (مفتی) وەتەن پێنجوینمە



مفتی لە وەسفی قوتابخانە و مامۆستای ڕێبەری قوتابیان وێنەی وردی هونەری دروست کردووە. ئەگەر قوتابخانە باغ بێ مامۆستا باغەوانە، قوتابی نەمامە، زانست و هونەر پەرژینی باغەکەن. شاعیر بەڵێن دەدا خۆی و منداڵەکانی فێری زمانی کوردی دەبن و بەزمانی کوردی تەلقین دەدرێن. هەر لەو شیعرەدا مفتی بەناوی عەبدولکەریمی کوڕیەوە خۆی بەخوێنەر دەناسێنێ و دەڵێ: عەبدولکەریم بێچووە تووتنچییە، کوڕی مفتییە ئەوەی خەڵکی پێنجوینە.

## ستایش

١

لە لیریکێکیدا مفتی لە ساڵی **١٩٤٥** هۆنیوەیەتییەوە ستایشی مەعرووف جیاووک دەکا لەو کاتەی موتەسەڕیفی سلێمانی بووە لە پێنجوین و هەندێ ئاوایی دیکە قوتابخانەی کردۆتەوە:

سوپاسی خوا ئەکەین و شوکری عیززەت
کچی پێنجوین بەمەکتەب گەییە عیززەت
هەناری کچم و لیمۆ وا بەزستان
ئەوا بەم مژدەیە گیان هاتە بەریان
بەڕاستی ڕووحی خستە شاری پێنجوین
کچانمان بانگ ئەکەن وا ئێستە زیندووین
لە نووری ڕۆژەوە مانگ شوعلەدارە
جیاووک خۆش بێ عیززەت وا بەکارە
خودای گەورە ئەمانە هەر بمێنن
کەوا تۆوی ژیانمان بۆ دەچێنن

لەم شیعرەدا مفتی ستایشی مەعرووف جیاووکی موتەسەڕیفی سلێمانی و عیززەتی تەل دەکا، ئەو کاتە کارگێڕی ناحیەی پێنجوین بووە، قوتابخانەیان لە پێنجوین و گوندەکانی دەوروبەری کردۆتەوە. شاعیر بەوە زۆر شادە کە کچانیش دەخوێنن، بەتایبەتی دوو کچی خۆی یەکێکیان ناوی هەنارە و ئەوی دیکەیان لیمۆیە.

### ٢

له شیعرێکی دیکەیدا له ساڵی ١٩٤٦ بەناوی «ناساندن»ەوه دایناوه، ستایشی ئینگلیز دەکا چونکه خەڵکی هان داوه بۆ فێربوونی خوێندن و نووسین بەزمانی کوردی:

من خاسی ئینگلیز ناچێ له بیرم
که پێمی ناسی باوک و باپیرم
هەرکەسێ سپلّه و حوقووق نەزانه
نابێ به بەشەر هەرچەند ئینسانه
با بلّێن ئینگلیز ئایینی جوێیه
بەلّام کردەوه و دادی بەجێیه
هەر ئەو بوو کەوا بەدەستوبردی
بۆ فێرکردنی زمانی کوردی
ئەو فێری کردین کوردی بنووسین
هەواڵی قەومی و میللی بپرسین
هەرکەسێ ئیشی چاکی بۆ کردی
تۆیش چاکی بلّێ گەر کوڕی مەردی

گومان لەوەدا نییه مفتی ناوی ئینگلیزی بەچاکه نەبردووه، چونکه ئەمپریالیست بووه. شاعیر ئەوەنده هۆگری قوتابخانه و خوێندەواری بووه لەم لایەنەوه ستایشی ئینگلیزی کردووه. ئەم بیروڕایەی زیاتر ڕەنگدانەوەی کردەوەکانی کوردناسی ئینگلیز ئی. سۆن بووه، ئەوەی له دوای جەنگی یەکەمی گێتی له سلێمانی بایەخی زۆری بەخوێندنی کوردی داوه و پاداشی تایبەتی بۆ نووسینی کوردی پەتی داناوه.

## خوێندنی کچ و شووکردنی

### ١

له بابەت خوێندنی کچەوه مفتی دەڵێ:

جاران ئەیانووت له زەمانی زوو
گەر کچ بخوێنێ زوو ئەبێ بەدخوو



بەهۆی نووسینی نامەی پەنهانی
دێنێته بەرهەم سەد دۆستی گیانی
ئیتر بەکاغەز دنیا تاڵ ئەکا
حەیای قەومەکەی پایەماڵ ئەکا
ئەی باشتر نییه هەر دوو بەدوو بێ
بۆچ فەرهادکوژێ له هاتوچۆ بێ
له هەردوو لاوه زەخیرەی ماڵی
بکێشێ بۆ خۆی لەگەڵ منالّی
سوێندیان بۆ ئەخوا بەخوا و بەئایەت
گل لێم نابیه هەتا قیامەت
ئەوانیش لەبەر تەزبیحی جوانی
بەرماڵی کۆڵی و نوێژی بەیانی
هەردوو بەجارێ تەسلیمی ئەبن
ئەڕۆن لەگەڵیا قوژبن بەقوژبن
وەختێ ئەزانن له شار و له دێ
وەک بەیتی ڕۆستەم ناویان دەرئەچێ
ناموسیان ئەچێ ماڵیشیان سەربار
ناویان ئەزڕێ له دێهات و شار
بەکورتی هەردوو هەتاکو ماون
له لای داپیره چاو دانەواون
کەوا بوو خوێندن بۆ پیاو و بۆ ژن
ئەبێته سوپەر ڕووبەڕووی دوژمن
بێ عیلم و زانین ژیانی ئینسان
نەختێ باشتره له ژینی حەیوان
ئەم له سەرخانه و ئەو له ژێرخانه
ئەو ژینی بەپووش ئەمیش بەنانه

هەر بەخوێندن بوو کە بۆمبای بەرقی
بێ خاوەن ڕۆیی لە لەندەن تەقی
هەر بەخوێندن بوو قومبەلەی زەڕڕە
ژاپۆنی خستە هاوار و نەڕڕە
ئێمەش هەر لەسەر فیکری جارانین
بۆیە لە ڕیزی خزمەتکارانین

لەم شیعرەدا مفتی هەندێ نەریتی دواکەوتووی کۆن دەخاتە ڕوو لە بابەت خوێندنی کچەوە وەکو ئەوەی ئەگەر فێری نووسین بێ نامەی دڵداریی نهێنی بۆ دۆستی دەنووسێ و ناوی کەسوکاری پێ دەزڕێ. پیرێژنی جادووگەری فەرهادکوژە دەکەوێتە خۆی و داو و تەڵە دەنێتەوە نەک تەنیا بۆ ژن بەڵکو بۆ پیاویش. خوێندن هەموو جۆرە فێڵبازی و جادووگەری و خورافات لەناودەبا. لە پاشانا ئاوڕ لە وڵاتانی پێشکەوتوو دەداتەوە، بەزانست و زانیاری ئەوان توانیان بۆمبای ئاتۆم دروست بکەن. لێرەدا شاعیر وەک پێشکەوتنی زانست و تەکنیک باسی ئاتۆم دەکا، نەک بەکارهێنانی بۆ کوشتنی میلیۆنان کەس و لەناوبردنی سامانی نەتەوەیی مرۆڤایەتی.

## ٢

لە دیالۆجێکی شیعریدا لە نێوان مفتی و کچێکی لە ساڵی ١٩٤٤ نووسراوەتەوە کچەکە بەباوکی دەڵێ:

بابە نزیکە هەڵسێ ئارەزووم
خۆزگە ئەمزانی کێ ئەبێ بەشووم
من زۆر ئەترسم کە بمدەی بەشوو
بمدەی بەکەسێ بەدخولق و بەدخوو
یا لەبەرئەوەی کە پارەدارە
یا کوڕی ئاغا و بەگی زۆردارە
یا بڵێن کوڕی خزمی خۆمانە
هەرچەن گۆشت لەڕ بێ هەر لەسەر ڕانە
هەر بەزیندوویی بمخەیتە قەبرێ



خۆزگە بخوازم بەوەی کە ئەمرێ
سەدی نەوەدی کیژی ئەم کوردە
هەر نامرادە و هەناسە سەردە

باوک وەرامی کیژی دەداتەوە:

کچم تێ ئەگەم ئاواتت چییە
ئەو فیکرە کۆنە لە لای من نییە
شەرتە بەشەرع فەرموودەی قورئان
من بتدەم بەشوو نەتخەمە زیندان
هەرکەسێ کە خۆت حەزی لێ ئەکەی
هیچ ناوەستی لێی زوو شووی پێ ئەکەی
ئەو کەسەش کەوا عاشق بەتۆ بێ
بۆ تۆ وەکو تۆ دڵ پڕ لە سۆ بێ
ڕووشمان تێ نەکا عەیبەی ئەم و ئەو
وەک دەهۆڵ لێدەن بەڕۆژ و بەشەو
بێ ترس و بێ غەم بۆ خۆت دانیشە
من ئیشی خەڵکی ناکەم بەپیشە
ناشت فرۆشم هەروەکو حەیوان
شیربایی لە خۆم ئەکەم بەسندان
فەرقی لام نییە خزم و بێگانە
هەر تۆ لات باش بێ لای من ئاسانە
ترسی مەولوودیش لە دڵ لابەرە
کەسێک وا ئەکا بەناو بەشەرە

لەم دیالۆجەدا مفتی دەستی داوەتە کێشەیێکی کۆمەڵایەتی ناسک. لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا لە کۆمەڵی کوردەواری کەم کەس زاتی ئەوەی دەکرد بەشیعر و نووسین بەزمانی کچێکەوە بەهەموو سەربەستییێک بڵێ من ئازادم شوو بەکێ بکەم و داوا لە باوکی بکا ڕۆژێ لە ڕۆژان بەئارەزووی خۆی کچەکەی بەشوو نەدا. باوکیش بەهەموو سەربەستییێک پشتی کچەکەی بگرێ و بڵێ شووکردن بەئارەزووی خۆتە، سەرەڕای ئەمە

شیربابییشم ناوێ، خزم و بێگانە و هەژار و دەوڵەمەند لای من هەر یەکێکە، مەرج ئەوەیە دووڵی کوڕ و کچ بەیەکتریەوە بنووسێن.

## لە ناو پەردەدا زاوا کاری بۆ هەڵناسووڕێ

مفتی لە ژیانی کۆمەڵایەتی دواکەوتووی نالەباری ناو خەڵکی ئێمە پەنجە بۆ دیاردەیێکی گرنگ درێژ دەکا، ئەویش بەزاوا نەبوونی پیاوە لە شەوی یەکەمی ناو پەردەدا. ئەم کارە «بەستن»ی پێ دەڵێن. لەم لایەنەوە شاعیر دەڵێ:

دەردێکمان هەیە دەرمانی کەمە
زۆر کەس بەو دەردە کەوتە و پڕ غەمە
لە ناو ئێمەدا بەستن مەشهوورە
بەیان کردنی نەختێ زەروورە
گەلێ جاهیلمان کە ژن ئەهێنێ
ناجوولێتەوە عەمری نەمێنێ
ئەوەن ووتراوە دەخیل هۆشت بێ
نەبەسرێی نەکو بیت بەپەندی دێ
ژنەکەی دەردی ئەزانێ چییە
پێی ناڵێ ئەویش لە بێ عەقڵییە
ئیتر لە پاشا لێی ئەبێ بەشێر
ئەم ئەبێ بەمێ و ئەو ئەبێ بەنێر
غەمناک و عاجز مات و پەشێوحاڵ
بێ نوتق و بێ دەنگ هەروەک کەڕولاڵ

وەکو مفتی لەم دێڕانەدا ڕوونی دەکاتەوە هەندێ کوڕ وەک زاوا کە دەچنە ناو پەردەوە لەبەرئەوەی تاقیکردنەوەی پێشوویان لەگەڵ ژنان نەبووە، تووشی گرێیێکی سایکۆلۆجی دەبن و ترس لە ناو دەماریاندا دەگەڕێ. هەروەها بووکیش وەکو زاوا لەم ڕووەوە تاقیکردنەوەی نییە، تا ئەگەر شتێکیشی لێ بزانی یارمەتیی زاوا نادا، زۆرجار ئەو ژنە بەدرێژایی ژیانی ژن و مێردایەتی لەم کارەدا بێ هەست و خوست دەمێنێتەوە. ئیتر کەسوکار دەکەونە خۆ، پەنا بۆ شێخ و مەلا دەبەن، بەڵکو مەسەلەکە بەعیلمی جەلجەلووتی جنۆکان جێبەجێ بکا. بەم جۆرە مفتی لەسەر شیعرەکە بەردەوام دەبێ:



ئەڕۆن بەتەعجیل بەشین و گریان
بۆ خزمەت ئوستاد شێخی عازەبان
نابێ بۆی بەرن دوو دینار کەمتر
بەسەد مەعزەرەت بەهەزار خاتر
شێخ دێتە لایان ئینجا زوو بەزوو
پیشانیان ئەدا نەختێ کوڵک و موو
ئەڵێ مژدە بێ جنۆکەکەم هات
نەیزانی ئێوە هاتوون بۆ شکات
گرتم خەریک بووم بیخەمە ئاگر
لێم پاڕایەوە مەلعوونی کافر
سوێندی بۆ خواردم ئەو بەئەدیانی
مەرەخەسم کرد چوو ئەمەی هانی
ئینجا واهیمەی لەسەر لائەچێ
ڕەگی ئەجوولێ کابرا جێ بەجێ
شێخ ئوسوولەکەی لێ حاڵی ئەکا
کابرا ژنەکەی خۆی ماڵی ئەکا

لێرەدا مفتی باس لە کردەوەی شێخی تەریقەتی دەروێشی دەکا بۆ کردنەوەی ئەو تەلیسمەی بەستراوە، چونکە ئەوان لە ڕووی نادیارییەوە (غەیبییەوە) تەماشای مەسەلەکە دەکەن نەک لە ڕووی سایکۆلۆجی و بیۆلۆجی و نەفامی بووک و زاوا لە مەسەلەکە. ئیتر بەدوعا و نوشتە و بەندکردنی ئەو جنۆکەیەی کاری بەستنی ئەم بووک و زاوایەی پێ سپێرراوە شێخی تەریقەت یا مەلای شەریعەت گرێی ئەم بەستنە دەکاتەوە. ڕاستییەکەش ئەوەیە ئەم شێخە مەسەلەکە بەئەنجام ناگەیەنێ، هەر خۆی جێبەجێ دەبێ لە دوای ئەوەی پیاوەکە فێری ئەوە دەبێ چۆن ببێ بەزاوا.

لە پاشانا مفتی بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

ئەم دەردە تووشی دانایان نابێ
هەرکەس دانا بێ وەها دا نابێ
بۆچی ئەجنەبی بەستنیان نییە
مەراقم زۆرە پێم بڵێن چییە

جوابی دامەوە شەخسێکی هوشیار
ووتی گوێ بگرە پێت بڵێم ئەی یار
لای ئەوان جن و دێو هیچ نەماوە
پاکیان دەوریان لە ئێمە داوە
ئەمان فەنباز و ئەوان فەنبازن
لەگەڵ یەکترا مەعلووم ناسازن
هەر ئێمە ماوین وەحشی و هیچ نەزان
جێگەیان خۆشە لە ئێمە ڕەزان

مفتی ڕاست دەکا کە دەڵێ لای دانایان و کۆمەڵانی پێشکەوتوو باوەڕکردن بەجنۆکە و مەملەکەتی نادیار و جادوو و ئەفسانەی پزیشکی و زانستی سیمیا دەمێکە باوی نەماوە. ئەم دیاردە ناهەموارانەی کۆمەڵ نابێ بەشێوەی نوشتە و جادوو چارەسەر بکرێن. لە لایێکی دیکەوە لەوانەیە قازانجیان هەبێ ئەگەر وەکو بەرهەمێکی ئەدەبی ئەفسانەیی میللیی سەرزار بێن بەسەرچاوە بۆ کارێکی داهێنراوی ئەدەبی و هونەریی هاوچەرخ.

لە کاتی خۆیدا مفتی ئەم شیعرەی بۆ پیرەمێرد ناردبوو لە ڕۆژنامەی «ژین» بڵاوی بکاتەوە. ئیتر پیرەمێرد ئیلهام لەو شیعرە وەردەگرێ و بەپارچە شیعرێک وەرامی دەداتەوە:

تا دادە عاسم لە دنیا مابێ
ڕووی قەبری سپی خوای لێ ڕەزا بێ
سلێمانیشمان لەگەڵ ئەترافی
عائیدی ئەوە خۆی و ئینسافی
چۆنی ئەبەستێ یا ئەیجڕێنێ
هەر کار دروست بێ زوو بیپەڕێنێ
خۆ ئەو شێخ نەبوو بەحوکمی دوعا
جن و دێوەکان موسەخخەر بکا
کەوا بوو مەعلووم حیکمەتی تیایە
خۆت لادە ئیتر تۆ لەم بەڵایە

پیرەمێرد لەم شیعرەدا مەسەلەی جادوو و نوشتە و جنۆکە دەخاتە لاوە. ناوی دادە عاسم



دێنێ. ئەمە ژنێک بووە بەعاسە بیجەڕێنە ناسراوە، لە سلێمانی و دەوروبەری بەناوبانگ بووە. لە پێوەندی ژن و پیاو لە ڕووی سێکسەوە شارەزا بووە. بەم ڕەنگە ئەم مەسەلانەی بەشێوەییێکی پراکتیکی زانستییانە جێبەجێ کردووە، بەئامۆژگاریکردنی بووک و زاوا. بەم جۆرە کارەکەی هەندێ ڕاستی زانستی تێدا بووە.

## دژی ماچ و مووچ
## لەگەڵ کار و کردەوە

١

مفتی لە شیعرێکیدا دژی دڵداری و ماچ و مووچە:

عەیبە شاعیر لەم زەمانە یاری زولف و شانە بێ
یا سوپاسی قامەتی گوڵزاری ڕووی جانانە بێ
هەرکەسی لافی ئەدیبی وا لەسەریا بۆ تەماع
حەیفە ئەشعاری خورافی یا قسەی ئەفسانە بێ
شاعیری بیکەی بەکوردی یانی خاوەن هۆش و بیر
چۆن ئەبێ هوشیار و زانا و هۆنەری لەرزانە بێ
هەر ئەدیبێ خووی لەسەر خاڵ و خەت و ئەگریجە بوو
من لە حەق داوا ئەکەم خوا بیبڕێ با هەر نەبێ
پیاو کەسێکە بۆ ژیان و جیفە تا ئاخر نەفەس
نۆکەری شێخ و غوڵامی بەگلەر و ئاغا نەبێ
خۆشەویستی خوایە هەرکەس قاچ و شان و دەستی خۆی
تووشی زەحمەت کات و لای کەس مل کەچ و ڕیسوا نەبێ
تێگەیشتوو هەر ئەناڵێنێ لە ژێر باری غەما
بێ مەراقی بۆ کەسێکە سەرسەری و دێوانە بێ
(مفتی) هەرچەند تۆ کە هۆنەر نیت و ناوت هۆنەرە
تا وەکو مردن ژیانت ژینی ئینسانانە بێ

نوبشکی بیروڕای مفتی لەم شیعرەدا ئەوەیە داوا لە شاعیران دەکا حەمە ژنانی نەبن. ئەم بۆچوونە لە مێژووی ئەدەبدا ڕاست نییە، چونکە شیعر بێ دڵداری نابێ. ئەڤین ماک و

سەرچاوەی بنچینەیی و لە بن نەهاتووی ئەدەب و هونەرە. کە شاعیر داوا لە شاعیران دەکا لە بابەت دڵدارییەوە نەنووسن نیازی ئەوەیە لەو پێویستتر و گرنگتر هەیە. بۆ خۆی چاکی کردووە بووە بەشاعیرێک کەموکووڕی کۆمەڵ و مەسەلەی نەتەوەیی و کێشەی چینایەتی بەشیعر باس کردووە و بووە بەشاعیری دیار، هەموو ئەوانەی وەسف و ستایشی کیژی جوانیان کردووە ئەوانیش شاعیری دیارن.

**۲**

لە شیعرێکی دیکەیدا مفتی وەسفی خۆی دەکا، دوور لە دڵداری و نزیک لە کار و کردەوەی چاک:

لە سایەی کەسب و سەنعەت من بەنێری هاتمە دنیاوە
لە بۆ نانی منەتبار ریابازیم فڕێ داوە
نە من زگ پڕ دەکەم بۆ کەس نە دێو و جن ئەسووتێنم
نە کۆتی ڕیشی بێ ئیشی و نە مەندیلم لەسەر ناوە
نە شێخی عازەبانم دێو و جننی بێنە ژێر حوکمم
بڵێم ئەمیانە قەرقەش ئەویتر سەرسەری ناوە
نە شێخم بەیعی جەننەت کەم نە کەس داخیل بەدۆزەخ کەم
وەلێ عەهدی خودا ناکەم بەناوی زوهد و تەقواوە
لە چڵکی پرچ و پەلکەم چی لە کەشکۆڵ و عەبا چبکەم
کەسێ ناوی بەشەر بێ حوڕ بژی مەردانە تا ماوە
کە دیم تەسبیحی دەستی سۆفی و بەرماڵی سەرشانی
موحەققەق بوو لە لام هەردوو بەدانە و داوی داناوە
بەڕووتی ناگەڕێم تەرکی دنیا ئەنبیا نەیکرد
هەوا و نەفسی بەشەر قەتعەن لە بۆ هیچ کەس نەکوژراوە
دیانەت کەی لە جێگەی سەنعەت و کەسب و فەلاحەت بوو
سولووکی تۆ بەمن چی هیچ کەسێ بۆ کەس نەخوڵقاوە
فەلەک بۆ هەرکەسێ گەردش ئەکا ئیقبالی ڕووناکە
کەچی بۆ قەومی ئێمە چەپ ئەچەرخێ عەکسی هێناوە



یەکێ ژینی بەهاوارە یەکێ کەشکۆڵ و ڕەش مارە
بەسەر هیچ نەیە خالیق ئەوی لەم قەومە قەوماوە
گڕی سینەم بڵێسەی سەندووە واعیز مەکە مەنعم
وەکو قەقنەس بەجارێ جەرگ و دڵ یەک دەفعە سووتاوە
ئەگەر بێتو لە دنیا تێنەگەی وەحشەت گەلێ خۆشە
لە لای نوستوو خەفەت نابێ خەبەر غەمبار و داماوە
زمانم کۆڵە ڕێی تەحریر و تەقریرم نەما چبکەم
وە ئیللا فیکری من ئەرزی خەیاڵی بیکری کێڵاوە
چ لازم ئەی تەبیب نەبزی دەستم ئەگری بەبێ هوودە
لە گێژاوی مەراقا غەرقە (مفتی) تازە خنکاوە

شاعیر بەهەناسەیێکی دانایانە بیروباوەڕی دەردەبڕی، خۆی لە جادوو و ئەفسانە، شێخ و تەریقەت دوور دەخاتەوە، باوەڕی بەزانستی و زانیاری هەیە. هەندێ وێنەی هونەری داهێنراوی لەم شیعرەدا خستۆتە ڕوو. دەڵێ ئەوەی نازانی هیچ غەمی نییە، ئەوەی دەزانێ ئەویان غەمبارە.

### بوومەلەرزەی پێنجوین

لە بابەت بوومەلەرزەکەی ساڵی ۱۹٤۷ی پێنجوینەوە مفتی دەڵێ:

پارەی ئیعانەی زەلزەلەی پێنجوین
نازانم ڕەنگی سپی بوو یا شین
کام دەردی ئێمەی پێ هاتە دەرمان
یا بۆ کام فەقیر بوو بەبەرگ و نان
هەروەکو دەهۆڵ هەر بیستم لە دوور
هەروەکو هۆ هۆی دەشتی شارەزوور
ئەم ئیعانەیە تەنها دەنگی بوو
ئیتر کەی شێوە و شکڵ و ڕەنگی بوو
هەروەکو جەژنی مانگی ڕەمەزان
لەو مانگی تردا ئەکرێ بەسەیران

ئەمیش بەناوی پێنجوین کۆکرا
نازانم ئیتر بۆ لای کێ برا
چاوەڕوانی نان بۆ پیاوی برسی
مردنی خۆشە ئەگەر بپرسی
مارانگاز ئەگەر تریاکی بۆ بێ
زوو فریای نەخەن لەتوپەت ئەبێ
گیای کەما ئەکرێ بۆ وەختی زستان
لە سەرما و بەفرا بدرێ بەحەیوان
بەڵام کە حەیوان لە برسا بمرێ
هەزار بار کەما کەڵکی کێ ئەگرێ
من دەستم بڕوا هەتاکو بەهار
بەهار بێ میننەت ئەڕۆمە سەر کار
لەجیاتی خانوو کەپرێ ئەبەستم
بەتەور و تەورداس بەشان و دەستم
یا لە شارەزوور ئەبم بەوەرزێر
جووتی خۆم ئەکەم پۆشتە و تۆخ و تێر
هەر بنکە گیایێ نانێکی تیایە
پەلامار ئەدەم ئەیکەم بەمایە
نەترسی بەفر و نە ئاوی باران
هەتاکو پاییز منیش وەک یاران
ئەبووژێمەوە و خۆم ئەکەم بەپیاو
هەروەکو جاران دێمەوە ناو ناو

لە دوای بوومەلەرزەکەی پێنجوین لیجنەی تایبەتی دانراوە، پارەیێکی زۆر کۆکراوەتەوە وەک باربو بۆ چاکە و بەرژەوەندیی لێقەوماوان، کەچی ئەو پارەیە تەنیا دەنگی هەبووە و ڕەنگی نەبووە. مفتی بەشێوەیێکی هونەرییانە ڕووداوی ئەم دزییە دەگێڕێتەوە. بەناوی کارەساتێکەوە پارە کۆکرابووەوە بۆ ئەو هەژارانەی زیانیان لێ کەوتبوو، کەچی پارەکە کەوتە گیرفانی ئەو دزانەی دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو. شاعیر دەڵێ لێقەوماوانی



بوومەلەرزە ئەوەندە برسی بوون ئەگەر گیای کەمایان دەست بکەوتایە دەیانخوارد. ئەم گیایە لە کوێستاناندا شین دەبێ و وەک ئالیک بۆ ئاژەڵ بەکار دێ، بۆ زستانانیش هەر بۆ ئەو مەبەسە وشک دەکرێتەوە.

## ژنی باش و ژنی خراپ

مفتی لە ڕەوشتی باش و خراپی ژن گەڕاوە و لێی کۆڵیوەتەوە، بۆ هەر یەکێکیان شیعرێکی داناوە.

١

لە «ژنی باش»دا دەڵێ:

گەر خودا بیدا بەچاکی دەوڵەتی شاهانە ژن
نیعمەتێکە وەک بەهەشت و هاودەمی پیاوانە ژن
بۆ دڵێکی بێ غەم و شەخسێکی بێ دەرد و ئەلەم
گەوهەرێکی شەوچراغی ژوور و بەرهەیوانە ژن
گەر کەموکووڕیت لە ماڵیشا هەبێ باکت نەبێ
بۆ کەموکووڕی ترازووی کۆمەڵی خێزانە ژن
ژن لە لای پیاوی نەزان و سەرسەری نرخی نییە
بۆ ژیانی کۆمەڵی باشتر لە میر و خانە ژن
بۆ سوپاسی باسی چاکی چی بەیان کەم هەر کەمە
جووت و ئاش و نان و بەرگ و باغچە و و بێستانە ژن
باعیسی ئارامی قەلب و مەرهەمی دەرد و برین
بۆ هەموو دەردێ دەوا بەخشێکە وەک لوقمانە ژن
دەوڵەتێکی پڕ لە شەوق و زەوقە دایم بۆ بەشەر
نیعمەتێکی خۆشەویستی و بێ سەر و سامانە ژن
کەی گوڵ و گوڵزاری باغاتی ئیرەم وەک ئەو ئەبێ
باغی ساحێب زینەت و پڕ لوئلوئی مەرجانە ژن
بۆ کەسێ نووری سلێمانی لە قەلبا بێ یەقین
پایە مەحکەم کردنی هەق دین و هەم ئیمانە ژن

زۆرتری عـەیشی بەهەشـتی حـووریـیـولعـینان کـچن
لەززەت و خـــۆشی بەیـاناتی لـە نـاو قـــورئـانە ژن
بێتو گەر موڵکی کەمال و گەنجی حوسنی یەک کەوێ
گـەر دووسـەد گـەنجی لەسـەر دانێی ئەڵێم هەرزانە ژن

لەم وەسفەدا مفتی بەشوێن ڕەوشتی باش گەڕاوە. سنوور کێشانی ئەم باشییە موتڵەق نییـە، چونکە هەندێ لەم باشانە ڕەنگە لە لای یەکێکی دیکە باش نەبێ، ئەمە مێـردی ژنەکەش دەگرێتەوە. بۆ بەرجەستەکردنی ڕەوشتی باش لە ژندا شاعیر وێنەی داهێنانی شیعری جوانی دروست کردووە.

٢

بەپێچەوانەی شیعرەکەی پێشوو لە «ژنی خراپ»دا دەڵێ:

گـــەر خـــودا نەیدا بەچاکی دوژمنی ئینسـانە ژن
مـــار و دووپشک و پڵنگی شـاخی هەورامـانە ژن
گـەر گڵـۆپی دووسـەدیش هەڵکەی لە مـاڵ و مەتبەقـا
دووکـەڵی حـەوش و حـەسـار و ژوور و بەرهەیوانە ژن
تۆ دە پـەیداکـــەی لە ڕۆژا ئەو بـە سێ داناکـــەوێ
هەر خـــەریکی قـــاووچ و قـــووچ بردن و تاڵانە ژن
گـەر نەخـۆشـیت نەبی سـیلداریی و دڵ پڕ لە غـەم
چۆتـە نـاو جـــەرگت بەدایم ئـێش و دەرد و ژانـە ژن
گـەر لەگـەڵ ئەودا بەهەشـتت پێ بدەن لێی ڕا ئەکـەی
تاوەکـــو مـــردن عـــەزیزم دەردی بێ دەرمـــانە ژن
گەرچی شێوەی شۆخ و شەنگ و دوورکوژ و پڕ عیشوە بێ
تۆ لە بەرچاو و دڵت شـێـوەی وەکـو شـەیتـانە ژن
بۆ خـراپی ئەو قـەڵەم ئەشکێ و زمـانیش کـول ئەبێ
قـابیـزیش ڕازی نەبێ هەر ئـیـشی گـیـان کـێشـانە ژن
هەر بژی (مـفـتی) کـەوا دایم لە ڕێی ڕاسـتی ئەڕۆی
هەر بـڵـێ تـا مـــردنت دەرد و بەڵای ئـینسـانە ژن



لەم شیعرەدا مفتی بەپێچەوانەی شیعری پێشوو باس لە خراپەی ژن دەکا. کۆمەڵێک مار و مێروو و ئاژەڵی دڕندە کۆ دەکاتەوە و کردەوەیان دەداتە پاڵ ژن، لەبەرئەوە پیاو بەڕق و کـینەوە تەمـاشـای دەکـا و هەرچەندە جـوانیش بێ نـایەتە بەرچاوی. لەم بابەتەوە دەڵێ ماڵت بەگڵۆپی نمرە دووسەد ڕووناک بێ ژن بۆی هەیە بیکا بەدووکەڵ و تاریکستان. ئەو ژنە هەرچەندە شۆخ و شەنگ بێ، لە ڕاستیدا دوورکوژە و لە بەرچاوی پیاو وێنەی شەیتان دەنوێنێ.

مفـتی ئەم شـیعـرەی بۆ ڕابواردن و دەربڕینی هونەری خۆی داناوە، هەناسەیێکی گـیـانی دەداتە خوێنەر و بەچاوێکی ڕیالیـزمـیـانەی زانسـتی تەمـاشـای لیـریکەکـە ناکـا، بەڵکو بەچاوی خەیاڵی شیعریانە و چێژی جوانکارییانە کاری لێ دەکا.

## گەورەی بێ بەخت و خۆپەرست

لە قەسیدەیێکی شەشینیدا مفتی دەڵێ:

گـەورەیێک بۆ کـەس نەبێ سـێبـەری
خـــۆم بۆ بگـێـــڕم لە دەوری ســـەری
بەووشکـی بۆچی بم بەمـــەیتـــەری
وەخـــتی دەرکـــەوێ هەســـتم لەبەری
هـەر بۆ خـــۆی دایم هەوڵـی ژیان بـێ
یاخـــوا ئەو گـــەورە بەشی نەمـــان بێ

گـەورەیێک چاوی لە فـەقـیـر نەبێ
دەربەست ژیانی جـوان و پیـر نەبێ
کـەس لە پوولێکی دەسی گـیـر نەبێ
جـەرگی بۆ مـیللەت وێنەی قـیـر نەبێ
مـێـمل بەمـاڵ و دوژمن بەجـان بێ
یاخـــوا ئەو گـــەورە بەشی نەمـــان بێ

گـەورەیێک وەک خـۆی نەڕوانێـتـە من
خـــۆی پلاوخـــۆر بێ من نـانی هەرزن
ســـەرباقی ئەوەش تاڵان و کـــوشتن
ڕیشـەی سـەربەسـتـیم دەربێنێ لە بن

هەر خۆی قەڵەو کا و شان و مل پان بێ
یاخوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ
گەورەییێک نیوەی لە ڕەنجی ساڵت
بسێنێ لە دەس خۆت و مناڵت
هێشتا بەزەیی نەیە بەحاڵت
بەدار و بەشەق بشکێنی باڵت
چاویشی لە دەس شوان و سەپان بێ
یاخوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ
گەورەیێک لەلەی مناڵەکەی بم
خۆڵڕێژی حەوش و ناو ماڵەکەی بم
پێشمەرگەی خۆی و هی خاڵەکەی بم
بێبەش لە نان و چا تاڵەکەی بم
ئەگەر ڕۆستەمی مازەندەران بێ
یاخوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ

لەم شیعرەدا مفتی وەسفی کەسانی دەسەڵات بەدەست دەکا لە کۆمەڵی ئێمەدا. ئەو ڕەوشتە خراپانەی باسیان لێوە دەکا لە هەر کەسێکدا هەبێ شایانی ئەوە نییە سەرۆک و سەردار و کاربەدەست بێ. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە گەورەییێک سێبەری بۆ کەس نەبێ، یارمەتیی هەژاران نەدا، نەبێتە باب و داکی خەڵکی، بەپێچەوانەوە نیوەی ڕەنجی خەڵکی بەزۆر بۆ خۆی دەبا، دەیانچەوسێنێتەوە و ئازاریان دەدا، پێویستە ئەم گەورەیە بەشی نەمان بێ. ئەمە لە نیوە دێڕی دوایی هەموو بەندەکان دووبارە و سێ بارە دەبێتەوە.

### باری ژیان

لە شیعرێکیدا مفتی لە ساڵی ١٩٤٣ داینـاوە بەناوی «باری ژیان»ەوە دەڵێ:

ئەو ژینە چ ژینێکە کە مەحکوومی بەشەر بێ
ئەو نانە چ نانێکە بەتەسبیح و بەگەڕ بێ
هەرکەس کە نەبێ چاولەبەری مەردوم و حوڕ بێ
شیرینە ئەگەر شاڵ و فەرەنجیشی لەبەر بێ



کوڕ ئەو کەسەیە تاوەکو ئاخر نەفەسی دێ
نانێک و ژیانێکی بەشان و بەهونەر بێ
فەرقی ئەم و ئەو چەندەیە لای ئەهلی بەویجدان
شێخی چلەکێش و کوڕی کاسب لە سەفەر بێ
کەڵکی چییە بۆ دینم و دنیام و ژیانم
ڕیشێکی زل و مێزەری سەوزیشی لەسەر بێ
هەر مردنە با بمکوژن و بەس لە مەراقا
پڕ داخ و خەفەت ئاخری بێ سوود و سەمەر بێ
مەهتووکە لە لای من ئەوی ژینی بەگەڕانە
ئەولادی عەلی یا لە نەوەی زاتی عومەر بێ
ئەم قەومە گەلێکی وەکو سەربارە لەسەرمان
بنچینە ئەگەر وابوو خودا ژێر و زەبەر بێ
واعیز مەکە مەنعم دڵەکەم پڕ لە جەخارە
ناحەق نییە گەر قامەتەکەم چەشنی فەنەر بێ
ئەم ژینە کەوا باسی ئەکەم غایە وو فیکرم
ساخێکە وەکو حەیتە لە دەس مەیتەری بەد بێ
ئەو لاشە کە بیمار و کز و زەرد و زەعیفە
دەرمانی نییە لازمە میکرۆبی بەدەر بێ
(مفتی) دەمی خۆت بگرە قسەی وا مەکە بەسیە
باوەڕ مەکە ئەو نەوعە بەشیعر و قسە تەڕ بێ

کارکردن و بێ کاری وەرەوورد و بیرکردنەوەی شەو و ڕۆژی مفتی بووە، بیروڕای خۆی تەنیا لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینانی بەکار نەهێناوە کە نویشکی لەو پەندە دەردەکەوێ دەڵێ «پیاو بەئیش جوانە»، بەڵکو سوودی لە پەندی دانایانەی فەلسەفەش وەرگرتووە. دوو هەڵوێست لەگەڵ یەکتریدا بەراوورد دەکا، کارێک بەرهەمی هەبێ، کارێکی دیکە بێ بەرهەم بێ. بەلای ئەوەوە کاری پیشەسازی و کردەوەی دەست ڕەنگینی بەرهەمیان دەبێ، بەڵام کردەوەی دەروێشی ئەنجامی چییە! بەتایبەتی ئەگەر هەموو کاتێکی تەنیا بۆ تەسبیحات و تەهلیلە بێ! بەلای مفتییەوە کارەسات لەوە دایە خەڵکی

هەست بەم دیاردانە دەکەن کەچی باسی لێوە ناکەن. بیر لەوە ناکەنەوە چۆن لەناوی ببەن چونکە دەترسن. شاعیریش وەکو ئەو خەڵکە ناچار دەبێ بەخۆی بڵێ: دەمی خۆت بگرە! گیروگرفت ئەوەندە زۆر و گەورەیە، بەقسە و شیعری تۆ چار ناکرێ!.

***

عەبدوڵڵا کوڕی مەلا کەریم ناسراو بەمفتی پێنجوینی یەکێکە لە شاعیرە دەگمەنەکانی کورد شیعری دڵداری نەوتووە. ژنی زۆر خۆشویستووە، دڵی سمیوە و شاعیر گرفتاری بووە بەڵام بەجوانی و شەنگی هەڵنەوتووە، باسی خەت و خاڵ و سنگ و مەمکی نەکردووە. لەبەر جوانییەکەی ویستوویەتی لە چەوسانەوە و بەکەم زانین ڕزگاری بکا، ئەو کاتە جوانییەکەی ڕاستتر و کاریگەرتر دەبێ.

مفتی یاری چینە هەژارەکانی کۆمەڵ بووە لە جووتیار و ڕەنجبەری گوند و پاڵە و هەژارانی ناو شار، بەچاوێکی بەرز تەماشایانی کردووە، بۆیە لەسەریانی کردۆتەوە. شاعیر لە دژی کردەوەی هەندێ لە مەلا و شێخ و مریدی شەریعەت و تەریقەتە دەروێشییە جیاکانی کۆمەڵی کوردەواری بووە. قسەی چاکی بۆ سەرۆکی ناشایستە و کاربەدەست و دەرەبەگ و ئاغای زۆردار نەکردووە، لەگەڵ هەژارانا بووە لە دژی چەوسێنەرانیان.

شاعیر لە مەیدانی هونەری شیعردا کەسێکی بەتوانا بووە. بایەخی بەشیعری کۆمەڵایەتی داوە، لە شیعری ڕۆمانتیکی و سیمبۆلی و کەسێتی دوورکەوتۆتەوە. لە شیعرە ڕیالیزمییە کۆمەڵایەتییەکانیدا سەرکەوتوو بووە بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر بەحری عەرووز و یەکێتیی قافیە هۆنراونەتەوە.

مفتی وەک شاعیرێکی بەدیمەن چۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە و وەک موسلیحێکی کۆمەڵایەتیش تەماشا دەکرێ لە مێژووی خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردیدا.

# بەشی نۆیەم

## شاهۆ

**۱۸۸۲ – ۱۹۷۱**

### ژیانی

حەسەن کوڕی مەلا عەبدولقادر کوڕی مەلا عەبدولڕەحمان لە ساڵی ۱۸۸۲ لە بیارە لە دایک بووە. بەمەلا حەسەنی قازی ناسراوە، لە پێشانا نازناوی «شایق» بووە و لە شیعریدا بەکاری هێناوە. لە جەنگی دووەمی گیتی نازناوی گۆڕیوە و کردوویەتی بە«شاهۆ». خوێندنی سەرەتایی لە حوجرەی مزگەوت بووە، لەگەڵ شێخ جەمیلی شێخ عومەر پێش جەنگی یەکەم ڕووی کردۆتە بەغدا و لەوێوە چووە بۆ ئەستەمووڵ، ئاشنایەتی لەگەڵ شێخ عەبدولقادری شەمزینی پەیدا کردووە، لە ماوەی مانەوەی لە ئەستەمووڵ پێوەندی بەرێکخراوی تەعالی شێخ عەبدولقادرەوە بووە. لە پاشانا گەڕاوەتەوە سلێمانی ئینجا چۆتەوە هەورامان. لە ساڵی ۱۹۲۳ چاوی بەمەلیک فەیسەڵی یەکەم کەوتووە لەو کاتەدا کردوویەتی بەقازیی هەڵەبجە. لە ساڵی ۱۹۳۱ گوێزراوەتەوە چوارتا تا ساڵی ۱۹۳۳ لەوێ ماوەتەوە. لەو دەمەدا هەموو قازییانی وڵاتی عیراق لابراون، ئەویش بۆ ماوەی چوار ساڵ بێ کار ماوەتەوە، هەڵسوکەوتی دارایی و گوزەرانی کەوتۆتە لێژییەوە و لە هەژارییەوە نزیک بووە. لە ساڵی ۱۹۳۷ جارێکی دیکە لەسەر کاری میری دامەزراوەتەوە و کراوە بەمووچەخۆری دادگای تەمیزی شەرعی، لە پاش ئەمە گوێزراوەتەوە دادگای کەرکوک، چوار ساڵ لەوێ ماوەتەوە ئینجا گوێزراوەتەوە هەولێر، لە دوای ساڵێک دووبارە گەڕاوەتەوە کەرکوک و تا ساڵی ۱۹۵۱ لەوێ ماوەتەوە ئینجا گوێزراوەتەوە چەمچەماڵ و لە دوای ماوەیێک لە ١٤ی حوزەیرانی ۱۹۵۳ خانەنشین کراوە. بۆ دواجار گەڕاوەتەوە هەڵەبجە و لەوێ نیشتەجێ بووە.

شاهۆ دەنگی خۆش بووە، قسە خۆشیش بووە. لە چاوتێریدا ناوی بووە، حەزی لە میوان کردووە ئەوەی دەستی کەوتووە خەرجی کردووە. شاهۆ لە ڕۆژی ۲۳ی حوزەیرانی ۱۹۷۱ کۆچی دوایی کردووە و لە بیارە بەخاک سپێرراوە.



### شیعری شاهۆ

شاهۆ شاعیرێکی ڕەسەن و بەرچاو بوو. یەکەمین شیعری بڵاوکراوەی قەسیدە بەناوبانگەکەیەتی «ئەی کوردی ستەم دیدە» لە ساڵی ۱۹۲٤ هۆنراوەتەوە. ئەم شیعرە بەڵگەیێکی دیکەیە لەو تیۆرییەی دەڵێ بەرهەمی شیعر و هەموو هونەرەکان بەکامڵی لە دایک دەبێ. هاوڕێیەتی لەگەڵ هەندێ شاعیرانی سەردەمی خۆیدا بووە، بەتایبەتی ئەحمەد موختار جاف.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

شاهۆ شیعری لە بابەت کێشەوە لەسەر بەحری عەرووز هۆنیوەتەوە. یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی زۆرترین بەحرەکانی عەرووزیان بەکارهێناوە. لە بەرهەمیدا ئەم بەحرانە دەکەونە بەرچاو: ڕەمەل، هەزەج، موزاریع، ڕەجەز، موجتەس، خەفیف، موتەقاریب، کامیل. لە ناو ئەمانەشدا تاکوتووک شاعیرانی کورد بەحری موتەقارییبیان بەکارهێناوە. هەرچی بەحری کامیلیشە بەدەگمەن لە شیعری کوردیدا دەبینرێ. لە قافیەدا ئەو دەنگانەی لە ئەلفوبێی کوردی عەرەبی وەریگرتوون ئەمانەن: ا ت د ر ز ق ل م ن (ە – ـە) وو ۆ ی ێ. بەگشتی یەکێتیی قافیەی لە شیعرە عەرووزییەکانیدا بەکارهێناوە. لە پاش قافیە ئەم وشانە لە شیعریدا بەرچاو دەکەون: ئەکا، تۆ، نابێ، نەبێ، بۆچییە، کورد، گرتووە، تۆ، مەکە، وەرە، بێ، خۆتی، کرد، مەکەن، چی، ڕەحمەتێ، حەبیبم، هەیە، هەموو، بۆ نییە، کەم (بکەم)، بکا. لە ناو ئەمانەدا وشەکانی: هەموو، تۆ، کورد یەکجار زۆر بەکارهاتوون.

شیعری کێشی سیلابی خۆماڵی لە لای شاهۆ بەدیالێکتی گۆرانی هۆنراونەتەوە لەسەر بنچینەی دە بڕگەیی و قافیەی مەسنەوی. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ بایەخی بەم جۆرە شیعرە نەداوە.

بەزۆری شیعری شاهۆ بریتییە لە پارچە شیعری لیریکی کورت. ئاوڕی لە لیریکی درێژ «قەسیدە» نەداوەتەوە لە قەسیدەی پێنجین و شەشین نەبێ. لەمەدا هەناسەی درێژە. جگە لەو بایەخی بەپێنج خشتەکیش نەداوە. تەنیا شیعری ئەحمەد موختار جاف و ناری کردووە بەپێنج خشتەکی.

زمانی شیعری شاهۆ پاراوە، ئاسانە، لە ڕەوانبێژیدا داهێنانی هەیە. کەڵکی زۆری لە ڕەوانبێژی کلاسیکی وەرگرتووە. وێنە ڕەوانبێژییەکانی لە شیعری کلاسیکی کۆن و ئەدەبی میللی وەرگیراون، بەشێکیشیان لە داهێنانی خۆیەتی.

### شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شیعری شاهۆ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە دەوری سێکوچکەی ئایینی و دڵداری و کوردایەتی دەسووڕێتەوە.

١- شیعری ئایینی بەهەردوو بابەتەکەیەوە موناجات و نەعت لە دیوانی شاهۆدا زۆرە. بەشێک لەو شیعرانە بەدیالێکتی گۆرانی هۆنراونەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە شیعری دیکەی ناوەڕۆکی ئایینی بەرچاو دەکەوێ.

٢- لە دڵداری و وەسفدا یەکێکە لە شاعیرە زیرەکەکانی سەر بەقوتابخانەی نالی لە ناوچەی سلێمانی و نموونەی بەرزی لەو ڕێبازە شیعرییەدا هەیە و داهێنانی تازەی خستۆتە ناو گێتیی ئەو ڕێبازەوە.

٣- شیعری نیشتمانپەروەری و سیاسی شاهۆ لە ناو بازنەی بیری کوردایەتی دەسووڕێتەوە بەشێوەییێک شەیدای خاک و هۆگری نەتەوەیە، ئیلهام و خەیاڵ و ئەندێشەی شیعری لە جووڵانەوەیە بۆ ئەو بیروباوەڕە. ئەگەر موناجاتی کردگار بکا یا کڕنووش ببا بۆ پەیکەری جوانێک خاک و نەتەوەی لە بیرە.

### نموونەی شیعری

### وەسف و دڵداری

لای شاهۆ و شاعیرانی دیکەی غەزەلی کلاسیکی بەزۆری وەسفی ئەندامی دلبەر لەگەڵ دڵداری تێکەڵ کراوە. لە بەرهەمی ئەم شاعیرە لایەنی وەسفی ئەندامی لەشی دلبەر لە شیعرە دڵدارییەکانیدا زاڵترە بەسەر سۆزی ئەڤینییەوە.

١

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

شەرمەزاری شێوەتە مانگ و پەناهی گرتووە
داغداری خاڵتە و ڕەنگی سیاهی گرتووە
پەرچەمی شێواو و ئەگریجەت لەگەڵ موژگانی چاو
دەستە دەستە و سەف بەسەف شکڵی سوپاهی گرتووە



دانەکەی خاڵت لە گۆشەی لەعلی لێوی ئاڵتا
ڕەنگی شکلی دووکەڵی تاریکی ئاهی گرتووە
نێشی شمشێری برۆت بۆ کوشتنی بەندەی هەژار
عادەتی شێری جەلادی پادشاهی گرتووە
چینی ئەگریجەت کە پەخشانە لەسەر ڕوخساری تۆ
هەر دەڵێی موشکی تەتارە دەوری ماهی گرتووە
بۆ ئەوەی ڕوخساری شیرینت نەبینێ (شایق)ت
ماهی ڕووت شارایەوە پێچەی سیاهی گرتووە

لەم لیریکەدا شاهۆ وەسفی خاڵی گەردن و ئەگریجە و موژە و لێو و برۆ دەکا. شیعرەکە ئاسایی دەکەوێتە بەرگوێ، لەوانەیە بۆ هەموو کچێکی جوان بشێ. کەچی شاهۆ وەسفی کچێکی دیاریکراو دەکا ناوی «شێوە»یە، کیژێکی جوولەکە بووە، ماڵیان بەرامبەر ماڵی شاهۆ بووە، لە ساڵی **١٩٣٣** ئەم شیعرەی بۆ نووسیوەتەوە. نیوە دێڕی یەکەمی شیعرەکە وێنەیێکی ڕەوانبێژی تێدایە، لە ڕستەی «شەرمەزاری شێوەتە» وشەی «شێوە» مانای ئەدگار و سیما دەگەیەنی، بەڵام ئەگەر بە«شەرمەزاری شێوەیە» بخوێنرێتەوە ئەو کاتە «شێوە» ناوی ئەو کچە جوولەکە جوانە دەگەیەنێ.

٢

لە شیعرێکی وەسفدا شاهۆ دەڵێ:

بەدرە کوڵمی لامیعت یا ڕۆژی بورجی چوارەمە
شیرە ئەبرۆت یا هیلالی قەوسی تیری ڕۆستەمە!
موشتەری و زوهرەن بەرامبەر یا دوو کوڵمی ئاڵتن
کانی مەرجانە ئەمە یاقووتی جانە یا دەمە!
دانەیی خاڵە ئەمە یا موشکە یا هیندووی حەبەش!
سونبولی زولفەینە یا داوی دڵانی پڕ غەمە!
ڕاحەتی ڕووح و تەنە یا لێوی شەککەربارتە
گۆی زەقەن یا سێوە وا سوور و تازە و خوڕڕەمە!
یاسەمینە وا بەقەدتا پەخشە یا گێسووی سیاه
یا سەوادی ڕەشکی موشکی ئاهووە یا پەرچەمە!

مەمکە یا ڕوممانە یا فنجانی شیر و شەککەرە
پورتەقالی کاڵە یا چەشمەی حەیاتی عالەمە!
ئەلفە یاخۆ عەرعەرە لاولاوە یا نەخلی ئیرەم
قامەتە یاخۆ قیامی حەشری ئالی ئادەمە!
چینی ئەگریجەن بەر ڕووتا وا پەرێشانن مودام
(یا سەوادی ڕەشکی موشکی ئاهووە یا پەرچەمە)
یاخوا (شایق) بەفیدات بێ هەڵسە زووکە بێرە لام
شەککەر ئەفشانە لەبم جانا بەماچی ئەو دەمە
(بەماچی شەوتەوە)

لەم شیعرەدا شاهۆ دیسانەوە لەسەر وەسفی ئەندامانی ئەو پەیکەرە بەردەوامە، هەندێکیان لەگەڵ میوەی جوان و بەتام و بۆن خۆش بەراوورد دەکا. لەو کاتەی شاعیر بەڕستەی «بەماچی ئەو دەمە یا بەماچی شەوتەوە» کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ وەستایەتییێکی دیکەی لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە دروست کردووە.

ئەگەر تیپی یەکەمی هەر نۆ دێڕ شیعرەکە کۆ بکرێتەوە ڕستەی «بمدری ماچی» دەکەوێتەوە، بەڕێنووسی تازەی کوردی «بمدەرێ ماچێ».

٣

شاهۆ لە وەسفی ئەندامانی دلبەر نابێتەوە:

تاتایی سەری زولفی ڕەشی پەرچەمی یارم
وەک تەوقی غەزەب چۆتە ملی قەلبی هەژارم
تابووری موژە دەس بەسینان بۆ منی بێ کەس
ئامادەیە وەک عەسکەری خوێنڕێژی تەتارم
شمشێری برۆی حازرە بۆ گەردنی عاشق
وەک شیری عەلی چۆن بووە بۆ جەیشی کوفارم
ئەو خاڵە بەسەر ڕوویەوە وا دیارییە (شایق)
بۆ مورغی دڵان دانەیە داینـاوە نیگارم

لەم شیعرەدا شاهۆ وەک شاعیرانی دیکە چەند ئەندامێکی ورد و ناسکی دلبەری



وەرگرتووە، سەری زولف و موژە و برۆی کردووە بەچەک و سیلاحی وەکو ڕم و تیر و شمشێر و زولفەقاری ئیمامی عەلی و جەنگێکی کوشندەی ناوەتەوە. ئەمە هەمووی لەبەر جوانی ئەو ئەندامانەیە ئەگەر بێن بەچەک و خوێنی دڵدارانیش بڕێژن هێشتا زیاتر لە لایان خۆشەویست دەبن. شاهۆ شیعرەکەی جوان هێناوەتەوە کە دەڵێ خاڵی سەر ڕووی دلبەر وەک دانەی داوە بۆ ڕاوکردنی مورغی دڵان (باڵندەی دڵان) دانراوەتەوە.

٤

لە شیعرێکیدا شاعیر وەسفی ژنێکی کراس ڕەش دەکا:

فستانی ڕەشی ناسکی چین چینی لەبەردا
وەک هەوری تەنک بێ بەسەری قورسی قەمەردا
حەیرانە خەیاڵم لە موتافاتی ووجوودم
تەشبیهی بەچی کەم نییە وێنەی لە بەشەردا

ئێوارەییێکی مانگی مایسی ١٩٣٨ شاهۆ لەگەڵ کاردۆخی لە بەغدا لە ساڵۆنی ئوتێلی ماجستیک خەریکی نانخواردن دەبن. ژنێکی جوان پەیدا دەبێ لە دەوری مێزێکی نزیک ئەوانەوە دادەنیشێ. ژنەکە کراسێکی ڕەشی لەبەرا بووە، وردە کونی تێدا بووە. ئەم دیمەنە بەوێنەی شەوێکی تاریکی ئەستێرەکانی بدرەوشێنەوە کەوتۆتە بەرچاوی شاهۆ و بووە بەسەرچاوەی ئیلهام بۆ نووسینەوەی ئەم چوارینە.

٥

لە لیریکێکیدا شاهۆ دەڵێ:

ئەم دەفە ناڵەی بەعەینی هەر دەڵێی ناڵەی منە
بۆ نیگار دایم دەناڵێ بۆیە جەرگی کون کونە
سینەکەم سەمتوورە دایم بەستەیی لەیلا ئەڵێ
لێدە سا تۆش پەنجەییێک خۆ عاقبەت هەر مردنە
هەر لە سەرتاپای ووجوودم کەوتە بەر تیری موژە
بێنە سەیری جیسمی خەستەم پاک چلۆن تیر ئاژنە

ئامێری مۆسیقا شتێکی بێ گیانە، ئەگەر بەدەست و پەنجە یا بەدەم بیجووڵێنی دەبێتە گیان لەبەر، بەسەرهات و ئەوەی لە ناو دڵە دەیگێڕێتەوە. ئەمەیە وەسفی شاهۆ بۆ دەف.

ئەو دەفە بەسەرهاتی هەیە. شاعیر لە کاتێکدا لە ماڵی خزمێکی میوان بووە، دەفێکیان هەبووە، ئەو دێڕە شیعرانەی لەم ماوەیەدا لێرە تۆمار کران شاهۆ لەسەر ڕووی دەفەکە نووسیبوونیەوە.

### نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

لە شیعرێکیدا ئەوە دەردەبڕێ کورد خاوەنی خۆیەتی و مافی ژیانی ئاسایی هەیە:

نەگبەتی نەیگرتبێ شوکری خودا هوشیارە کورد
ساحێبی عەقڵی سەلیم و ساحێبی ئەفکارە کورد
گەر لەمەوپێش نووستبوون بەینێ لە خاوی غەفڵەتا
ئێستە گەر ئینساف بدەن هەستاوە وا بێدارە کورد
خۆ بەئینساف گەر تەماشا کەن بەچاوی دیقەتێ
هەر ئەوەی عەیبە کە ئەمڕۆ بێ کەس و غەمخوارە کورد
خۆ بەنیسبەت جەوهەر و جێگە و مەقام و موڵکەوە
شاهیی و شاهەنشەهی شایستە وو هەموارە کورد
گەر قسەی ساغتان ئەوێ یاران بەقورئانی کەریم
مردنی پێ چاترە لەم خزمەتی ئەغیارە کورد
بێشە کەی خاڵی بووە هەرگیز لە شێر و کەرکەدەن
شێری شێرخۆری تیایە مەردی جەوهەردارە کورد
پرس ئەکەم بەو مەجلیسی ئەقوامی میللەتپەروەرە
داخیلی ئینسافە ئایا مەحوەکەن یەکبارە کورد
شێت نییە ئەم قەومە ئەفکاری هەمووتان تێ ئەگەن
هەرچی سیرڕێکتان هەبێ پاکی لە لا ئیزهارە کورد
نەگبەتی داوێنی گرتووین سەیر ئەکەین تا وەختی خۆی
عاقیبەت مەعلووم ئەبێ چۆن ئاغە وو سەردارە کورد
دڵ پڕ و ماتەم مەبە (شایق) یەقین ڕۆژێ ئەبێ
بەم زووانە ببنە جێگەی پەنجەیی ئیشارە کورد



لەم شیعرەدا شاهۆ سوورە لەسەر ئەوەی هەموو مەرجەکانی بوون بەنەتەوە لە کورددا هەیە. باس لە لایەنی ئازایی و توانایی و بیر و هۆشی کردووە، ڕەوشت و کردەوەی چاکی دەخاتە ڕوو وەکو شاعیرێک. لەبەرئەوە ئەم پێداهەڵدانەی ناچێتە ناو تەعریفی زانستیی کۆمەڵایەتی و مێژوو، چونکە ناوەرۆکی شیعر پێویستی بەم لایەنە نییە لە شیعری پەروەردەیی نەبێ.

٢

لە شیعرێکیدا کورد هان دەدا خۆی کۆ بکاتەوە، لە ساڵی **١٩٦٥** هۆنیویەتییەوە:

وەختی کرد و بردە کاکە تەرکی تێکۆشان مەکەن
دەرفەتە باوەڕ بەفیشاڵی درۆی گوێ پان مەکەن
خۆ بەخۆی خۆ یەک کەون جیا مەبنەوە مەردانە بن
فەرقی خەلقی وان و مووش و ئەزبەنی و سۆران مەکەن
پشتی یەک بگرن بەکۆمەڵ دەست لە یەکتر بەرمەدەن
ڕۆژی سەرکەوتن نزیکە تێکەڵی شەیتان مەکەن
یەکێتی ناوخۆ بزانن شەرتی ڕزگاری گەلە
بۆ ئەوەی یەک بن لە بۆ یەک فیتنەیی و بوختان مەکەن
ناحەزی ئێمە خەریکی گێرەشێوێنی گەلن
کاکە ئێوە بنۆخوا بڕوا بەناحەزتان مەکەن
قەومی کورد شێوە قسەشیان یەک نەبێ گشتیان یەکن
عەیبە جیاوازی لە بەینی کۆمەڵی کوردان مەکەن
مردن و مانمان یەکێکە پێکەوە وەک یەک ئەژین
فەرقی کوردی ناو عیراق و تورکیا و ئێران مەکەن
حوببی جاه و فیز و بوخل و نۆکەری غەیرە و نیفاق
کوردی لێک پچڕان بەسی بێ ماڵی کورد وێران مەکەن

ئەم شیعرە ئامۆژگاری شاهۆیە بۆ ئەوەی کورد یەک بگرێ. ئەگەر سەردەمی دانانی ئەم شیعرە بێتەوە بیر کە ساڵی **١٩٦٥** بووە، ئەو ڕۆژگارە گرنگترین قۆناغێکە لە خەباتی کورد لە کوردستانی عیراق. میللەت شۆڕشی هەڵگیرساندبوو، داوای مافی دەکرد. شاهۆ ئاماژەی هەیە بۆ عەرەب مەبەسی دەسەڵاتی عیراقە ئەو کاتە دژی کورد بوو. سەرەڕای ئەم

هەموو مەینەتییە دووبەرەکی لە ناو شۆڕش هۆی گرنگی سەرنەکەوتن بوو. شاعیر گەورەترین کێشەی کۆمەڵایەتی لە نەریت و گیانی عەشیرەتی دەبینێ، ئەمەیان بەسەر گیانی کوردایەتیدا زاڵە، بۆ لەناوبردنی ئەم بیروڕا دواکەوتووە پێویستە کوردی وان و مووش و بادینان و سۆران، کوردی عیراق و تورکیا و ئێران یەک بگرن و بۆ یەک ئامانج خەبات بکەن.

٣

لە شیعرێکیدا شاهۆ موناجات لەگەڵ خودا دەکا و لێی دەپاڕێتەوە ئاگای لە کورد بێ:

خودایە تۆ خۆت ساحێبی کوردی
خەبەرداری لە ئازار و لە دەردی
لە ژێر باری گرانی جەور و زوڵما
ئەناڵێنێ هەموو خێزانی ووردی
لە ناو ئەشکەوت و شاخ و شیو و دەشتا
بڵاو و پەخشە شێرانی نەبەردی
لە ژێر ڕەحمی فڕۆکەی وورچی سوورا
هەمووی وێرانە خانوو و دار و بەردی
لەبەر جەور و خراپەی نالەباران
هەمووی ڕەشپۆشە کێو و شیو و هەردی
وەکو عەنقایە ئینساف و مورووەت
لە دنیادا بەرامبەر قەومی کوردی
نەبیسرا کەس بەزەیی بێ بەکوردا
بپرسێت حاڵی ناڵە و ئاهی سەردی
وەکو (شاهۆ) ئەوەی کوردە هەمیشە
لە لوتفی تۆی ئەوێ دەرمانی دەردی

سۆزی شاعیر بەرامبەر بەنەتەوەی دەگاتە پلەیێک لە کردگار بپاڕێتەوە بۆ چارەنووسی کورد. شاهۆ لە هەموو دەرگاییێکی دا لە پێناوی چاککردنی باری ژیانی سیاسی کورد، پشتگیری هەموو هەڵسان و ڕاپەڕینەکانی کرد. چاری نەما ئەوە نەبێ پەنا بەرێتە بەر



خودا. کوردانە وەکو دایکێک یا باوکێک بۆ چاکەی کۆرپەکانی داوا لە خودا دەکا بیانپارێزێ. شاعیر ئەم دوعایە بۆ کورد دەکا.

لە پاڕانەوەکەیدا باس لەو کارەساتانە دەکا کە بەسەر کورد هاتوون. لە شیعرەکەدا پەنجە بۆ ورچی سوور ڕادەکێشێ، ئەمە مەبەسی ڕووسە. لە هەڵسانەکانی کوردی عیراق لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا دەسەڵاتی بەغدا فڕۆکەی میگی ڕووسی دەنارده سەر کوردستان بۆ وێرانکردنی.

٤

لە شیعرێکیدا لە ساڵی ١٩٤٨ نووسیویەتییەوە شاهۆ دەڵێ کوردستان هی کوردە:

بمدەرێ ئیقرارە نابێ کورد وەها داوا بکا
با بڵێ دەرچن لە خاکم ئیددیعای خۆی وا بکا
خاکی کوردستان ئەساسەن موڵکی باوکی کەس نییە
ماڵی کوردە ماڵی خۆی نابێ لە کەس داوا بکا
کەی ئەمانە خاوەنی مافن لە ماڵی ئێمەدا
کوردی مەرد عەیبە تەمەللوق بۆ شتی ئاوا بکا
کورد بەمانە وا بڵێن باشە بەدەنگێکی بڵند
بۆچ بەرۆکتان گرتووین! دەرچن تەڵەب ئاوا بکا
کاکی خۆم بێگانە نەبووە قەت بەخاوەن ماڵی کورد
کورد ئەبێ ڕۆڵەی گەلی خۆی ماڵی خۆی ئاوا بکا
کوردە (شاهۆ) شارەزای ئەحواڵی کوردستانە گشت
ڕێگەتان پیشان ئەدا کوردیش ئەبێ هەر وا بکا

شاهۆ بەڕاستی بۆ مەسەلەی نیشتمانی کورد چووە، ئەو لەسەر ئەو باوەڕەیە کورد خۆی خاوەنی کوردستانەکەیەتی، بێگانە هاتۆتە ناویەوە و داگیری کردووە، لەبەرئەوە دروشمی سەرەکیی خەباتی ئەوەیە بەبێگانە بڵێ بچێتە دەرەوە، نەک بڵێ من جیا دەبمەوە، چونکە کورد بەئارەزووی خۆی لەگەڵ ئەم هاوسێیەی نەژیاوە، ئەو داگیری کردووە، لەبەرئەوە پێویستە هاوسێ دەست لەم کارەی هەڵگرێ و بچێتە دەرەوە.

٥

شاهۆ هەندێ کورد بەگێرەشێوێن ناودەبا:

گرۆهێ هەن کەوا پیشان ئەدەن کوردێکی زۆر ساغن
ئەمانە گێرەشێوێنن لە لاتان وا بێ ناساغن
گەلێ دەرفەت هەبوو بۆ کورد کە مافی دەست کەوێ ئەمما
لە دەستیاندا بەفیشاڵێک و ئێستا حەبسی قۆناغن
نەقالای پاشەڕۆژیان نەبووە هەر دەربەستی خۆیانن
بەڵێ ئەم نەوعە ئینسانانە بەدجینس و بەدئۆجاغن
ئەمانە تاقمێکی زۆر کەمن ئەمما ئەوەی کوردە
بەدەسیانۆ وەکو (شاهۆ) هەموو کاتێ جگەرداغن

لەم شیعرەدا شاهۆ باس لەو کەسانە دەکا وا پیشان دەدەن کوردایەتی دەکەن، کەچی ڕاست ناکەن و گێرەشێوێنن. پێویستە لەو ماوەیەدا ئەوە بزانرێ مەرج نییە هەموو کەسێک کوردایەتی بکا، ئەوەی بەبیری کوردایەتی پەروەردە نەبووە بۆ چاکە و بەرژەوەندی خۆی خەریکی کوردایەتی دەبێ، هەر کاتێک مەسەلە لە چاکەی خۆی بچێتە دەرەوە ئامادەیە تاوانیش بکا. ئەم جۆرە کوردانە بەزۆڵە کورد ناودەبرێن، لە کۆنەوە لە ئەدەبی کوردیدا و تا ئێستاش ئەم دیاردەیە ڕەنگی داوەتەوە.

٦

لە لیریکێکیدا شاهۆ گازاندە لە کورد دەکا:

پێم بڵێن یاران بزانم بۆچی وا داماوە کورد
بۆچی واکیژو پەرۆشە ڕەوتی لێ شێواوە کورد
ماڵ و میراتی بەناحەق بۆچی وا دابەش کرا
بۆچ لە ناو جەمعی بەشەردا بێ بەش و بێ ناوە کورد
کردەوەی خۆیە وەهایە ڕۆژی ڕووناکی شەوە
کەوتە ناو چاڵاوی غەم بنواڕە چۆن خنکاوە کورد
یەک لەگەڵ یەک بەد دڵ و تینوو بەخوێنی یەکترین
گشتی بوختانچین لە حەق یەک بۆیە وا بەدناوە کورد



نۆکەر و یاساوڵن بۆ خوێنەخۆرانی وەتەن
هەر ئەڵێی بۆ نۆکەری بێگانەکان خولقاوە کورد
تیرە تیرە و بڕ بڕن ئەمیان ئەوی لا هیچ نییە
بۆیە بەم حاڵە هەموو دەم قەبری بۆ کەنراوە کورد
ڕێی بە بەختی خۆی نەبرد ڕۆژێ بچێتە ڕێزی خەڵق
داخی داخانم لە هاوڕێی دائیما جێماوە کورد
گاه ماشەی دەستە پیشکۆی پێ هەڵئەگرن بۆ فەساد
گاه فتبۆڵە ئەوەی هات تێر شەقی پیا داوە کورد
خۆی بەزل پیشان ئەدا وەختی کوڕە و فیشاڵ کەچی
چاوەڕێی پاشخوانی خەڵق و کەوچکی چلکاوە کورد

لەم دێڕانەدا شاهۆ هۆی سەرەکی مەینەتی و دواکەوتوویی کوردی دەستنیشان کردووە، هەمووی لە ئەنجامی کردەوەی خۆی دەزانێ. بێگانە و ئەمپریالیستی ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئینگلیز دەوری بووە، بەڵام دەوری خۆی زیاتر بووە لە هەموو ئەو پاشکەوتنە و بەجێمانەی لە ڕێڕەوی کاروانی میللەتان.

شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

وا تەمایان کردە ماڵ و موڵکی کوردستان هەموو
هەرکەسێ بۆ خۆی ئەپچڕێ سەیری چۆن پچڕاوە کورد
سووریییەش لەولاوە وا قۆڵی جزیرەی لێ بڕی
خۆیشی لێڵ ناکا بزانێ چی بەسەر هێنراوە کورد
دایکی داماوی وەتەن بۆ یارمەتی هاوار ئەکا
واجیبە فریای کەون تا دەرفەتی بۆ ماوە کورد
یەک کەون کوردینە بەسیە پشتی یەکتر بەرمەدەن
کورد هەمیشە کورد بووە کوردیش ئەبێ تا ماوە کورد
مەبنە تۆوی ناو دڕک هەریەک بەلایێکا مەچن
وا بکەن عالەم بزانێ پیاو بووە و هەر پیاوە کورد
بەنج کرابوو نوستبوو ئاگای لە مەرگی خۆی نەبوو
ئێستە وا پیشان ئەدا (شاهۆ) لە خەو هەستاوە کورد

دواکەوتوویی کورد بووە هۆی ئەوەی هاوسێی بێگانە و ئەمپریالیستی ڕۆژئاوا زەفەری پێ ببەن و وڵاتی داگیر بکەن. ئەوەی ئاشکرایە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم کوردستانی سووریا دەنگێکی وای نەبوو و کورد سوور نەبوون لەسەر بەسەرکردنەوەی، بەڵام شاهۆ یادی دەکاتەوە بەناوی «جزیرە»وە. پێویستە ئەوە بزانرێ ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٥٩ بڵاوکراوەتەوە لە کاتێکدا کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بەغدا بەرپا بووبوو و کورد لە ڕۆژگارێکی زۆر ناسک دەژیا. بیری لە خۆ خواردنەوەی ئەم کوودیتایەی نەدەکردەوە، دوارۆژ ئەو ڕاستییەی خستە ڕوو و کۆماری عیراقی تازە بوو بەدژی کورد و شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ لە کوردستانی عیراقدا هەڵگیرسا.

٧

لەم شیعرەدا شاهۆ لە ساڵی ١٩٤٨ وتوویەتی بنج و بناوانی بیروڕای خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر هەڵوێستی هاوسێیانی کورد:

بیر و بڕوام وایە من دەرحەق بەهاوسێ و دەوروبەر
ئەو سەگی هارە ئەمانیش گورگەمێش و جانەوەر
نابێ کورد لێیان ئەمین بێ با هەزار بڕیار بدەن
کردەوە و جەوری لەمەوبەریان بهێننە بەر نەزەر
جەنگی ئەووەل هێزی یۆنانی کە هاتنە تورکیا
کورد بەناوی دینەوە وەک شێر لە لانە هاتنە دەر
دەستبەجێ خۆیان گەیاندە کۆڕی مەیدانی نەبەرد
ڕۆستەمانە دەست بەچەک مەردانە تاویان دانە سەر
وا هوجوومیان بردە سەر دوژمن وەکو شێری ژیان
کون نەبوو خۆیان تیا گرن ڕۆژێکی وایان کەوتە بەر
سەلک و لاشە و قاچ و قۆڵ سینە و دەس و پێ و قوڕگ و مل
کەوتبوون لەو ناوەدا بووبوونە چەشتەی جانەوەر
(یەشەسن کورد ئەرسەلانلەر) تورکیای کەڕ کردبوو
چونکە کورد تورکیان نەجات دابوو لە ئەندێشە و خەتەر
پاش ئەوەی تۆزێ پشوویان دا لەجیاتی پیاوەتی
بوون بەگورگی هاری سپڵە و نانەخۆری سفرە دڕ



دڵنیابوون کوردەکان لەو خزمەت و قوربانییەی
کردبوویان بۆ خەلاسی تورک لە مەرگی مونتەزەر
گەر ئەمین نەبووایە کورد چۆن ئەو سەرۆکانەی هەموو
وا بەئاسانی ئەگیران بۆ قەنارە و لالەوەر
گەر بەمەکر و فێڵ و حیلە و هێمنی نەبووایە چۆن
جورئەتی ئەویانە بوو بگرن بەلانی نام دەر
کارەساتی دەرسیم و دیاربەکر و وان و ئەرزەڕۆم
شاهیدن بۆ بەدنیهادی جینسی سپڵە و سەگ پدەر
عیسمەت و گورسیل کە کوردن چاکەیان بۆ کورد چییە
خۆ بەسەهویش ناوی کوردێکیان لە دەم نایێتە دەر

لەم دێڕانەدا شاهۆ باسی دەستدرێژیی تورک دەکا بۆ سەر کورد، لەو کاتەی کورد گەلێ یارمەتی تورکی داوە. لە پاش جەنگی یەکەمی گێتی و ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و هێرشی یۆنان بۆ سەر تورک، کورد یارمەتی تورکی دا، تا گەیشتە ڕادەیێک تورکەکان بەزمانی خۆیان دەیانوت «یشەسن کرد ارسلانلر» (بژی شێرانی کورد)، بەڵام هەندێ لەوانەی بەبنەچە کورد بوون وەکو ئینۆنۆ و گورسێل ئەمانە لە دواییدا حەرامزادە دەرچوون و بوون بەدوژمنی کورد.

ئەوجا شاهۆ ڕوو دەکاتە حاڵی کوردی عیراق و ئێران:

هەروەها یاسین و تاهای کوردی عێلی کاکەیی
یا وەکو نووری سەعیدی کوردی خەڵقی ئاغجەلەر
پەهلەوی گەر کوردە ڕاستە بۆچی ئەم کوردەی هەموو
بێ قەباحەت گرتن و ناردنیە ناو قەسری قەجەر!
بۆچی خوێنی کوردەکانی ڕشت بەجەللادانی فورس
بۆچ لە داری دا سەرۆک کۆماری کورد قازی نەمر!

شاعیر باس لە کردەوەی یاسین هاشمی و تەها هاشمی و نووری سەعید و ڕەزای پەهلەوی و کوڕەکەی دەکا و بەنەژاد بەکوردیان دادەنێ، ئەمە هیچ نرخێکی مێژوویی نییە، گرنگ ئەوەیە ئەمانە دوژمنایەتی کوردیان کردووە، خراپەیان هەیە بەرامبەر بەکورد، لە سەرووی هەموویانەوە لە سێدارەدانی قازی محەمەدی پێشەوا.

ئەوجا شاهۆ بەئامۆژگاری کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

کاکە گیان ئەم جۆرە کوردانە کەوا باسیان کرا
بۆ مەرامی کاری خۆیان ئێمەیان وا نایە قوڕ
کورد ئەبێ هیوای بەخۆی و یەکێتی خۆی بێ هەموو
تێبکۆشن پێکەوە تاکو لە ژێر بار دێنە دەر
هەوڵ بدەن تا خاکی پاکی موڵکی کوردستان هەموو
پاک و خاوێن کەن لە پیسی دوژمنانی ماڵ و سەر
ئێش و ئازار و خراپەی ئەم گروهە خوێنمژە
قەت لە بیر ناچێتەوە (شاهۆ) هەتا ئاخر سەفەر

لەم دێڕانەدا شاهۆ ئامۆژگاری کورد دەکا، پێش هەموو شتێک باوەڕی بەخۆی و هێزی خۆی هەبێ، ئاگاداری هەموو تاکێکی خەڵکی کورد بێ، نەک تەنیا ئەوانەی کوردایەتی ناکەن بەڵکو ئەوانەی دژی کورد دەوەستن و خیانەتی لێ دەکەن. بێ گومان ئەم جۆرە نەفرەت لێکراوانە کەسانێکن تووشی نەخۆشیی گرێی سایکۆلۆجی بوون.

## ئەی کوردی ستەمدیدە

ئەم قەسیدە پێنجینە درێژەی شاهۆ بەناوی «ئەی کوردی ستەمدیدە»وە سەرتۆپی دیوانی شاهۆ و گوڵدەستەی دیوانی شیعری زمانی کوردییە. لە ٢٤ پێنجین پێکهاتووە، لە کاتی خۆیدا لە ساڵی ١٩٢٧ بەشێکی بلاوکراوەتەوە.

ئەم شیعرە ڕەند و ڕەنگینە یەکێ بوو لەو سروود و شیعرە نیشتمانییانەی لە ساڵانی سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەمدا سەرچاوەییێک بوو ڕێکخراوی «بەچکەشێران»ی پارتی هیوا ئەندامە منداڵەکانی پێ پەروەردە دەکرد بەمەبەسی پاراوبوونی زمانی قسەکردن و نووسین و چاندنی بیری کوردایەتی لە ناو مێشک و دڵیاندا.

شاهۆ بەم جۆرە دەست بەقەسیدەکەی دەکا:

ئەی کوردی ستەمدیدەیی مەزلوومی سیاچار
وەی میللەتی مەعسوومەیی بەدبەختی گرفتار
تاکەی لە خەوان ئێوە و دوژمن هەموو بێدار
تا چەندە ئەبێ مەست بن و خەڵقی هەموو هوشیار
خۆتان ئەکەنە مەزحەکەیی مەحرەم و ئەغیار



ئەو میللەت و قەومانە لەوەوپێش کەزەبوون بوون
ئەو تایەفە وو تاقمە ئەوساکە کە دوون بوون
ئەو خەڵقە لەبەر جەهل و نیفاق غەرقەیی خوون بوون
هەستان لە خەوی غەفڵەت و دارایی فونوون بوون
ئێستاکە هەموو بەگلگن و شاه و حوکمدار
ئەم جەهل و نیفاق و سەفەه و زیللەتە تاکەی
ئەم بێ شەرەفی و خۆخۆرییە و غەفڵەتە تاکەی
ئەم بوغز و شیقاق و حەسەد و عوزلەتە تاکەی
بێ فیکریی و سەرخۆشیی ئەم میللەتە تاکەی
تاکەی ئەبنە مەسخەرەیی عالەمی هوشیار

لەم دێڕانەدا شاعیر لەگەڵ کورد قسە دەکا، لە دواکەوتوویی و بەدبەختیان دەدوێ، لە ئەنجامی ناهوشیارییان ئامانجیان بەدی ناهێنن. هەموو میللەتانی دواکەوتووی وەکو کورد لە خەو هەڵسان و خەریکی فێربوونی زانستی و پیشەسازی بوون، بەمە سەرکەوتن و بوون بەخاوەنی خۆیان. پێیان دەڵێ تاکەی ئێوە لە گێتیی نەزانین و دووبەرەکی و نزمی دەژین! بەم هۆیەوە دەبن بەقەشمەرجاری خەڵکانی هوشیار و پێشکەوتوو.

ئینجا درێژە بەقسەکانی دەدا و لەو ڕەوشتە خراپانە دەدوێ کە کورد تووشی بووە و بەزۆر سەپێنراوەتە سەری:

بەس تالیبی تالانی یەک و کوشتنی یەک بن
بەس ساعیی بێ دەستیی و دەست بەستنی یەک بن
بەس مایلی فەوتانی یەک و مردنی یەک بن
مەشغوولی برایی یەک و یەکخستنی یەک بن
تا کۆمەڵ و یەک دەستە وو یەک بن وەکو ئەغیار
ئەم دەنگ و هەرا و ناڵە وو شینە لە چ لایە
ئەم ئاهی جگەرسۆز و گرینە لە چ لایە
ئەم گشت جەزەع و کوشت و برینە لە چ لایە
سەرچاوەیی ئەم چەشمەیی خوێنە لە چ لایە
چی بێ ئەبێ ئەم شۆڕش و غەوغایە لە ئەقتار

ئەم دەنگە هەمووی نالەیی كوردانە لە دەس غەیر
ئەم شۆرە سەرای شیوەنی كوردانە لە دەس غەیر
ئەم نركە هەمووی سۆزشی كوردانە لە دەس غەیر
ئەم خوێنە گەشە خوێنی شەهیدانە لە دەس غەیر
ئەم نەعرە هەمووی نەعرەیی كوردانە لە سەردار

شاهۆ ئامۆژگاری كورد دەكا بەس یەكتری بكوژن و بڕووتێننەوە. بەس لە خراپەی یەكتر بگەڕێن. گوێ بگرن ئەم نالە و شین و واوەیلایە لە كوێوە دێ! سەرچاوەی ئەم جۆگەلە خوێناوە لە كوێیە! شاعیر هەر خۆی وەرام دەداتەوە و دەڵێ، دەنگەكە نالەی كوردانە لە دەست دوژمن و بۆ هوشیاركردنەوەی سەرۆكە نوستووەكان.

شاهۆ لەسەر وەسفی كردەوەی دوژمنان دەڕوا لە دژی كورد:

دوژمن لە هەموو لا چ بەچەپدا چ بەڕاسا
بۆ میللەتی كورد شەو و ڕۆژ وان لە مەڵاسا
دایم ئەوەیان وا لە سەروو فیكر و حەواسا
ڕیشە و ڕەگی كورد بێننە دەر هەر لە ئەساسا
شایەد كە نەمێنێ نەفەرێ كورد بێ لە ئەقتار
كوردیش لە هەموو لاوە ئەوەند مەست و غورروورن
سەرخۆشی مەی و غەفڵەت و بێ حیسس و شوعوورن
بێ هۆش و سڕ و بێ خەبەر و مەستی خوموورن
گەهـ ئەهلی تەرەب گاهـ خەریكی شەڕوشۆڕن
گەهـ جەردەیی ڕێگرن و گەهی ماشەیی ئەغیار
شەهدی ئەم و ئەو پڕیە لە دەرمانی كوشندە
بەس تەفرە بخۆن هەر بەقسەی خۆش و بەخەندە
ئەی بێ خەبەران بەس ببنە چاكر و بەندە
مەشهوورە كە كەمتر نەبووە شەندە لە مەندە
ڕۆژێك ئەبێ بەم شەهدە بێن ئێوە گرفتار

دوژمنی كورد بێ بەزەییـیانە دەیكوژێ، لەناوی دەبا. بێ وچان هەموودەم لە بیریەتی، لە هەموو شوێنێك و كاتێكدا هوشیارە بۆ ئەوەی ڕیشەی لە بندا هەڵكەنێ. دوژمن بەهێزە،



كورد بێ دەسەڵاتە چونكە بیر لە دوارۆژی خۆی ناكاتەوە. بێ هۆشە لەو كاتەدا دەژی كە تێیدایە، ئەقڵی بەوە ناشكێ دوژمن خراپەی لەگەڵدا دەكا ئەو وادەزانێ چاكەیە.

شاعیر بەم پێنجینانە دوایی بەقەسیدەكەی دێنێ:

نەی دیوە كەسێك كەسبی مەعاریف بەبێ ئوستاد
مومكین نەبووە حەللی مەشاكیل بەبێ ئیمداد
نەبووە بەشتێك سەربەخۆ ئاسن بەبێ حەدداد
نەی گرتووە كەس بازی مرادی بەبێ سەییاد
گەورە نەبووە تیفل بەبێ دایەیی غەمخوار
بانە و سەقز و موكریی و سابڵاغ و مەریوان
یەك دەفعە لە سایەی قەدەمی نەكبەتی ئەركان
سووتان و بڵاوبوونەوەی ئەهلی لە وڵاتان
نیوەی بووە یەخسیری دەسی لەشكری ڕووسان
پۆلێكی بووە توعمەیی مۆر و مەلی كۆسار
هەر كەس كە بەقەد زەڕڕەییێك عەقلی لە سەرایە
تەسدیقی دەكات هەرچی كە نووسیومە وەهایە
مونكیر بەقەسەم داخیلی زومرەی جوهەلایە
(شایق) بەخودا هەرچی لە جەمعی عوقەلایە
بۆ نەزمی كەلامت بەدڵ و گیانە خریدار

لەم دێڕانەدا شاعیر بەكورد دەڵێ هیچ ئارەزوویێك بەبێ كۆشش سەرناگرێ و بێ ئەنجام دەبێ. یەكێتی دەرمانی دەردی مەسەلەی نیشتمانی و نەتەوایەتی كوردە. ئەگەر ئەمە لە ناو كوردا هەبێ بەهێز دەبێ، دوژمن بەسەریدا زاڵ نابێ، وەكو خەڵكی ناوچەكانی بانە و سەقز و موكری و سابڵاغ (مەهاباد) و مەریوان لە دەست زۆرداری نیرووی ڕووس پەراگەندە و ئاوارەی وڵاتان نابێ. ئەمە ئاماژەیە بۆ داگیركردنی ئەو ناوچانەی كوردستانی ئێران لە لایەن لەشكری ڕووسەوە لە ڕۆژگارانی جەنگی یەكەمی گێتیی سەدەی بیستەم. لە دواییدا شاعیر ڕاست دەكا كە دەڵێ ئەوەی لەم مەلحەمە شیعرییە قەومییەدا وتراوە ڕاستە، هەموو كەسێكی دڵسۆز پێویستە وەری بگرێ و باوەڕی پێ بكا.

## جەنگی دووەمی گێتی

لە بابەت جەنگی دووەمی گێتیی سەدەی بیستەمەوە شاهۆ لە شیعرێکیدا لایەنی سوێندخۆران دەگرێ لە دژی ئەڵمانیا:

سوقووتی دەوڵەتی ڕۆما کە (ڕۆ)یە ئەووەڵی ناوی
نیشانەی وایە بنیادی گەلی میحوەر لە ڕووخانە
بەد و بەدکردەوە و بەدوێژ و خوێنڕێژ و شەڕ ئەنگێزن
ژیانی ئەم گرۆهە بۆ بەشەر ئیسباتە نەژیانە
کە بوڵغار سەر دڵی کوترا بەیولغار دەرپەڕی ڕۆیی
ئیتر ئەم جارە نۆرەی کەوتنی ڕۆمان و یۆنانە
قەڵای هیتلەر لەمەولا زەحمەتە خۆی ڕاگرێ هەرگیز
لەبەر نیرووییی سوێندخۆران کە حامی حەقی ئینسانە
کەلی تێکەوت شەق و پەق یەک بەشوێن یەکدا هەمووی ڕووخا
بینای زوڵم و زەلالەت ئاخری بێ شوبهە ڕووخانە
بەڵێ میحوەر ئەگەر کلکی بڕا مەحوە بەیەکجاری
کەوا ئەمڕۆ بەشی هەر شیوەن و ڕۆ ڕۆ وو گریانە
ئەوەی هاوسوێندی هیتلەر بوو لە بەلتیک و ئەوروپادا
بەڕاستی گشتی سەرسامە و لە کردەی خۆی پەشیمانە

ئەم شیعرەی شاهۆ لە بابەت جەنگی دووەمی گێتیی سەدەی بیستەمەوەیە لە نێوان سوێندخۆران (بەریتانیا و فەرەنسا و ڕووسیا و ئەمەریکا) و میحوەر (ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و یابان). شاعیر لایەنی سەرکەوتنی سوێندخۆرەکانە. لە لیریکەکەدا هەندێ وێنەی ڕەوانبێژی داهێناوە و گەمەی هونەری کردووە. لەوانە شاعیر دەڵێ سەرەتای ناوی «ڕۆما» وشەی «ڕۆ»یە، بەم پێیە ئەنجامی جەنگ شین و ڕۆ ڕۆ دەبێ بۆ میحوەر، هەروەها دەڵێ ئەگەر «میحوەر» کلکی ببڕی واتە «ر»ی لێ جیا بێتەوە «مەحو» دەمێنێتەوە، ئەم وشەیە نەمان و لەناوچوون دەگەیەنێ.



## شیعری دیالێکتی گۆرانی

بەهەمموو حسێبێک شاهۆ دەبوو شاعیری دیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردی بێ، چونکە خەڵکی ناوجەرگەی هەورامانە و زۆربەی ژیانی لەوێ بردۆتە سەر. لە دوای نالی دیالێکتی کرمانجیی باشوور (سلێمانی) بوو بەزمانی شیعر. زۆربەی هەرە زۆری شاعیران دەبوو بەم دیالێکتە شیعر بنووسن، لەگەڵ ئەوەشدا کەم و زۆر شیعریان بەدیالێکتی گۆرانی (هەورامی) هۆنیوەتەوە.

شاهۆ لە شیعرێکیدا دەڵێ:

قوربان قوربانەن
وادەی ئازادی جەژنی قوربانەن
دەروونم کەیلەن دلەم بوریانەن
غەمم جەم بیەن یانەم وێرانەن
سەدای کنالەیل وادەی سەیرانەن
وەختی لەنجەولار بالاّ بەرزانەن
نۆبەی غەمزەی ناز خێڵی نازدارەن
وەناحەق کوشیای وەبێ تاوانەن
چێش بیەن چێشەن تاوانما چێشەن
پەی چێش جە ئێمە دەروونش ڕێشەن؟
وێنەی زاڵمان کینەی دڵ پێشەن
خاترش لێمان دایم وەئێشەن
یا فەیلەقووسەن یا گورگە مێشەن
گشت خەلق چون (شاهۆ) وەنەش دڵ ڕێشەن

لەم لیریکە جوانەیدا شاهۆ ئەوە دەردەبڕی دڵ و دەروونی سووتاوە، غەم و پەژارەی زۆرە، ماڵی وێران بووە بۆ دەنگ و ئاوازی خۆشی پڕ لە جۆشی کۆمەڵە پەرییانی کەناچەکانی هەورامان و شارەزوور لە کاتی سەیرانی بەهاردا. بەغەمزەی پڕ لە نازی نازداران سەرخۆش و شەیدا و وێڵ و سەرگەردان بووە.

***

حەسەن کوڕی مەلا عەبدولقادر لە پێشانا ناسراو بەنازناوی «شایق» و لە دواییدا بەنازناوی «شاهۆ» دەبێ لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بە«شاعیری کوردایەتی» بناسرێ. ئەم شاعیرە فرچکی بەشیعری نیشتمانی گرتووە، شاعیرێکی کلاسیکیی ڕەسەن بووە لە شیعری عەرووزیدا، پێڕەوی هەموو مەرجەکانی کردووە. زۆربەی بەحرە عەرووزییەکانی لە شیعریدا بەکارهێناوە. یەکێکە لە شاعیرە دەگمەنەکانی کورد کە بەحری «کامیل»ی لە کێشی شیعری کوردیدا بەکارهێناوە.

شاهۆ لەو شاعیرە ڕەندانەیە هێزێکی هونەریی بەرزی خستۆتە ناو ئەو شیعرانەی دەچنە ناو خانەی شیعری پەروەردەیی و فێرکردنەوە (دیداکتیکی) چونکە زۆربەی ئەم جۆرە شیعرە لە ئەدەبی هەموو نەتەوەکانی گێتی جەوهەری داهێنانی هونەری شیعرییان تێدا کەم دەبێ لەبەرئەوە زۆر جار «شیعر»ی پێ ناووترێ، بەڵکو هۆنراوە (نظم)ی پێ دەڵێن، کەچی شاهۆ ئەم جۆرە شیعرانەی لە «لیریک» نزیک کردۆتەوە و لە «هۆنراوە» دووری خستۆتەوە.

زۆربەی شیعری شاهۆ بۆ بیری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی نووسراوەتەوە. هەندێ ڕووداوی گرنگی نەتەوەیی دەستنیشان کردووە. بەزمانێکی ئاسان و لێکسیکۆنێکی زۆربەی خەڵکی کورد تێی بگەن. قەسیدە درێژەکەی «ئەی کوردی ستەمدیدە» لە لاپەڕە زێڕینەکانی شیعری کوردی دەژمێررێ. بۆ هەموو کەسێک وتراوە، هەموو کەسێک تێی دەگا و سۆزی هەموو کوردێک دەبزوێنێ و لە تەلی خەیاڵی هەموو کوردێک دەدا.

# بەشی دەیەم

## شێخ مەحموود

## ١٨٨٤ - ١٩٥٦

### ژیانی

مەحموود کوڕی شێخ سەعید کوڕی شێخ محەمەد بچکۆڵ کوڕی کاک ئەحمەد کوڕی شێخ مارفی نۆدێ لە ساڵی ١٨٨٤ لە سلێمانی لە دایک بووە. کە پێگەیشتووە و بەتەمەن گەورە بووە لە ناوچەی سلێمانی و کوردەواری و هەموو گێتی بەم ناوانە ناسراوە: شێخ مەحموود، شێخ مەحموودی بەرزنجی، شێخ مەحموودی حەفید، شێخ مەحموودی کوردی، شێخ مەحموودی سلێمانی، شێخ مەحموودی شێخ سەعید، شێخ مەحموودی حوکمدار، شێخ مەحموودی مەلیک، خولەی شێخ سەعید، فەرهادی کورد، نوور بەخشی.

خوێندنی سەرەتایی لە حوجرەی مزگەوت لەگەڵ هەندێ لە هاوتەمەنەکانی بووە، ئەمانە هەندێکیان لە دوارۆژدا بوون بەخوێندەوار و ڕۆشنبیر و شاعیری هەڵکەوتوو، لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستای تایبەتی فێری زمان و زانستییەکانی ئەو سەردەمەیان کردووە لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی.

شێخ مەحموود لە ماڵێکی خوێندەوار و شۆڕشگێڕ گەورە بووە. شێخ سەعیدی باوکی شاعیر بووە، باپیرانی کاک ئەحمەد و شێخ مارفی نۆدێ لە مەلا گەورەکانی گێتیی ئیسلامی بوون. لە منداڵییەوە مەشقی ڕاووشکار و سیلاح شۆڕی کردووە، سەرباز و جەنگاوەرێکی باشی لێ هەڵکەوتۆتەوە. هێشتا منداڵ بووە چاوی بەکۆشک و سەرای سوڵتانی عوسمانی کەوتووە لەو کاتەی شێخ سەعیدی باوکی میوانی سوڵتان بووە. لە ساڵی ١٩٠٧ لەگەڵ باوکی بووە لەو کاتەی بەپیلانی دوژمنان خەڵکی مووسڵ دەستدرێژییان کردە سەر شێخ سەعید و شەهیدیان کرد. لە جەنگی یەکەمی گێتی وەک سەربازێک لە ڕیزی سوپای عوسمانی لە دژی ڕووس لە جەنگدا بووە. لە ساڵی ١٩١٩ لە شەڕی دەربەندی بازیان لە دژی داگیرکەری ئینگلیز بریندار بووە و بەدیل گیراوە و فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچووە لە لایەن دادگاییێکی ئینگلیزییەوە، لە پاشانا فەرمانی خنکاندنی کراوە بەبەندکردنی هەتا هەتایە و بەدەستبەسەری ئاوارەی جزیرەی تانەی هیندستان کراوە. بەشداری لە شەڕی شعێبەی باشووری عیراق کردووە لە دژی



ئینگلیز (١٩٢٠). لە ساڵانی ١٩٢٢ - ١٩٢٤ بووە بەحوکمدار و لە پاشانا بەمەلیک. ئینجا ڕووی کردۆتە شاخ و خەباتی چەکداری کردووە تا ساڵی ١٩٢٧.

لە دوای ڕاپەڕینی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ بەردەرکی سەرای سلێمانی گەڕاوەتەوە شار. ئینجا لە ساڵی ١٩٣١ بەشداری لە شەڕی ئاوباریک کردووە و لە ساڵی ١٩٣٣ گیراوە و بەدەستبەسەری ئاوارەی باشووری عیراق کراوە تا ساڵی ١٩٤١. هەراکەی ڕەشید عالی گەیلانی بەهەل زانیوە و لەو ساڵەدا گەڕاوەتەوە سلێمانی و لە گوندی سیتەک لە ناوچەی شارباژێڕ دانیشتووە، لە دواییدا گواستوویەتییەوە گوندی داریکەلی. لەم ماوەیەدا شێخ مەحموود لە جموجۆڵی سیاسیی ڕۆژانە و خەباتی چەکداری دوورکەوتۆتەوە. لە دوا ساڵانی ژیانیدا لە دەست نەخۆشی ئازاری چەشتووە، بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی ڕووی کردۆتە بەغدا و ماوەییێک لە نەخۆشخانە بووە تا لە ڕۆژی ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦ کۆچی دوایی کردووە. تەرمەکەی هێنراوەتەوە سلێمانی و لە مزگەوتی گەورە بەخاک سپێرراوە. ئەوەی جێی خۆیەتی لێرەدا بووترێ ئەوەیە، لەو کاتەی تەرمی شێخ گەیشتۆتەوە سلێمانی ڕۆژێک بووە شار کەم ڕۆژی وای بەخۆیەوە دیوە. لەو سەردەمەدا عومەر عەلی موتەسەریفی سلێمانی بوو، فەوزی جەمیل سائیب جێگری بوو. موتەسەریف مۆڵەتی حەسانەوەی بووە، جێگر کاری بەڕێوە بردووە. لە خۆپیشاندان و ناشتنی تەرمی شێخدا تەقە لە جەماوەر کراوە ئەختەر خانی خێزانی ڕەشۆڵی گۆرانیبێژ شەهید بووە، کار بەمە کۆتایی پێ نەهاتووە، گوللە بەر تەرمی شێخیش کەوتووە، دیارە نەک تەنیا بەزیندوویی، بەڵکو بەمردوویی‌یش گوللە حەزی لە گۆشت و ئێسقانی شێخ بووە.

### شیعری

شێخ مەحموود لە بنەماڵەیێکی خوێندەوار پەروەردە بووە، باب و باپیرانی سامانێکی زانستی و ئەدەبیی بەنرخیان بەجێ هێشتووە. وەک سەردارێکی تەریقەتی قادری پێوەندی بەشیعر و ئەدەبەوە بەهێز بووە. چونکە ئەدەبی کوردی هەناسەی بەهێز و گەرمی لە بزووتنەوەی سۆفیزم وەرگرتووە. لە حوجرەی خوێندنی مزگەوتەوە چێژی ئەدەبی لای شێخ مەحموود دروست بووە، نەک تەنیا لای ئەو بەڵکو لە لای هەندێ لە شاگردانی حوجرەکە لەگەڵ ئەویان خوێندووە. لە دواییدا کە بەتەمەن گەورە بووە تەنیا پێوەندی لەگەڵ سیاسی و سوپاییییان نەبووە، بەڵکو لەگەڵ ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەران زیاتر بووە. لە زۆربەی شاعیر و ڕۆشنبیرانی دەوروبەری خۆیەوە نزیک بووە، لەوانە: حەمدی و ناری و زێوەر و

نووری شێخ ساڵح و شوکری فەزڵی و حوسێن نازم و ڕەفیق حیلمی و تۆفیق وەهبی و ئیسماعیل حەقی شاوێس و بێخود و شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی (فەوزی) و کەمالی و هی دیکە.

شێخ مەحموود خۆی بەشاعیر زانیوە لەبەرئەوە نازناوی «نوور بەخشی» بۆ خۆی داناوە و لە شیعردا بەکاری هێناوە. بنج و بناوانی ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ شێخ محەمەدی نوور بەخشی بەرزنجی، ئەمە برای شێخ عیسا و شێخ مووسایە، بنەماڵەی شێخ مەحموود خۆیان بەنەوەی ئەو برایانە دەزانن.

## شیعری لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە

شێخ مەحموود شیعری زۆر نییە، ئەوەی هەیەتی دەیکا بەشاعیرێک مێژووی ئەدەب ناوی بپارێزێ و خوێندەوار چێژ لە شیعری وەربگرێ. بەگشتی شیعری لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە ئەم خاسیەتانەیان تێدایە:

١- لە ڕووی ڕوخسارەوە: شیعری لەسەر سیستێمی عەرووزی داناوە. کێشە سووکەکانی بەحری عەرووزی هەزەج و ڕەمەلی بەکارهێناوە، لە قافیەدا هەمیشە لەسەر یەکێتیی قافیە ڕۆیشتووە. بەزۆری شیعری بەژمارەی دێڕ کورتە، لە بابەتی لیریکە. لە شیعریدا قەسیدەی پێنجینی هەیە (ا ا ا ا ب).

بایەخ بەچوارین و تاک دراوە. زمانی شیعری شێخ مەحموود ئاسانە، مانا لە ڕووە، لە سیمبۆلیزم و مانای ژێر وشە دوورە. بەرهەمێکە بۆ زۆرترین خەڵکی ناو کۆمەڵ نووسراوەتەوە.

٢- لە ڕووی ناوەڕۆکەوە: شیعری شێخ مەحموود لەم ڕووەوە لە دەوری بیروبۆچوون و ئیدیۆلۆجییەتێکی دیاریکراو دەسووڕێتەوە. شێخ بایەخی بەدانایی داوە، بەلایەوە گەورە ئەو سوارچاکەیە سەرشۆڕ نەکا بۆ هیچ کەسێک. بەشێوازی دڵداری کۆن لە بیروباوەڕی دانایی و ئامۆژگاری دەدوێ. شیعری بۆنی دڵداری ژنی لێ نایە زیاتر خەریکی ڕەوشتی چاک و ژیانی ئازادی و ئامۆژگاری و سەربەرزی پیاوانەیە.

شێخ لە کردەوەی گەردوون نارازییە هۆی سەرنەکەوتنی لە هەموو کەسێک دەبینێ، لە خۆیەوە دەست پێ دەکا، ئینجا خەڵکی دیکە و تا دەگاتە هاوسێیان و هێزی بێگانەی ئەمپریالیستی ئینگلیز و هێزی تورکە کەمالییەکانی دوای دروستبوونی دەوڵەتی تورکیا لە پاش جەنگی یەکەمی گێتی.



## شێخ مەحموود و ڕۆژنامەنووسی

بەئاشکرا و بەنهێنی لە ماوەی جموجۆڵی سیاسی، شێخ مەحموود ئاوڕی لە ڕۆژنامەنووسی داوەتەوە. یارمەتی ڕۆشنبیرانی داوە بۆ دەرکردنی ئەو چاپەمەنییانە. لە سایەی کۆششی ئەوەوە کۆمەڵێک ڕۆژنامە بڵاوکراونەتەوە، لەوانە: بانگی کوردستان (١٩٢٢)؛ ڕۆژی کوردستان(١٩٢٢)؛ بانگی حەق (١٩٢٣)؛ ئومێدی ئیستیقلال (١٩٢٣). بایەخدانی شێخ بەڕۆژنامەنووسی گەیشتبووە پلەیێک لە کاتێکدا لە ٣ی مارتی ١٩٢٣ کە سلێمانی بەجێ هێشت و بەرەو سووریداش کەوتە ڕێ، پێش هەموو شتێک بیری لە چاپخانەکەی کردەوە و بردی بۆ ئەشکەوتی جاسەنە و ڕۆژنامەی «بانگی حەق»یان پێ دەرکرد.

## نموونەی شیعری

١

شێخ مەحموود لە قەسیدەیێکی پێنجیندا دەڵێ:

دڵ لە بەندی سینەدا دووبارە واوەیلا ئەکا
(نوور بەخشی) ناسرەوێ مەیلی شەڕ و غەوغا ئەکا
ئینتیقامی قەومی لێقەوماو بەحەق داوا ئەکا
ڕۆژ و شەو فیکرم لە دنیادا عیلم بەرپا ئەکا
تیغی شیرم ئارەزووی سەیدی شکاری شا ئەکا

سەیری دوژمن کەن بەفیکری خامەوە بۆتە تەرەف
بۆ شکاری شێری شەرزە پیرە ڕێوی هاتە سەف
نیشتمانی پاکی بێکەس دیوە بۆیە کەوتە کەف
وام لە مەیدانی شەجاعەتدا موبارێز کوا ئەسەف
سەفدەری ڕۆژی وەغای (تابین)ە داوا ئەکا

دەست بەدەست یەکتر بدەن ئەی لاوەکانی مەرد و قۆز
تاکو کەی دوژمن لەناومانا ئەبێتە گورگی هۆز
بێن ببینە پشتیوانی یەکتر و بیکەینە تۆز
دەست بەداوێنی خوداوە بگرین و بگرین بەسۆز

تاکو دوژمنمان لە جەنناتولئیرەم بەرپا ئەکا
نامەوێ ژینی ئەسارەت بەسمە عومری گومڕەهی
نایخەمە سەر خۆم بەدەستی موددەعی تاجی شەهی
قەت بەئەمری دوژمنانم نامەوێ فەرمانڕەهی
نامەوێ تەختی کەی و بەختی جەم و شاهەنشەهی
تیشنەیی خوێنی عەدووم و بۆ حوقووقی وا ئەکا
تا بەئازادی ئەگەم کوێری ئەکەم چاوی ڕەقیب
شاسواری قەومی مادم میللەتێکی زۆر نەجیب
(أَطْلُبُ النَجَّاحَ والتَّوفيقَ من رَبٍّ مُجِيبْ)
ئایەتی (نَصْرٌ منَ اللّه)یە (فَتحٌ قَرِيْب)
دەنگی تەکبیری سبەینانم بەئیلەللّا ئەکا

ئەم شیعرە بەناوی «شەڕی سوورداش» وتراوە. شەڕەکە پێش شەڕی دەربەندی بازیانی سالّی ١٩١٩ لە ناوچەی سوورداشی سلێمانی ڕووی داوە. لە شیعرێکیدا حەمدی ئاماژەی بۆ ئەم شەڕە هەیە، لە دێڕە شیعرێکیدا ڕوو دەکاتە شێخ مەحموود و پێی دەڵێ:

بۆچی باسی حەربی سوورداش و کەنارۆت بۆ بکەم
بەم قسانە بۆت تەواو کەم قافیەی نەزم و غەزەل

لەم لیریکەدا شێخ مەحموود نازناوی شیعری خۆی نوور بەخشی بەکارهێناوە، شانازی بەمیللەتی میدیایی (مادەکان)ەوە دەکا و خۆی بەشاسوارێکی پاشماوەی ئەوان دەزانێ. ئینجا شەڕەکەی سوورداشی بەناوی «تابین»یشەوە تۆمار کردووە، ئەمەیان گوندێکە لەسەر ڕێگەی سلێمانی – دوکان لە نزیکی سوورداشەوەیە. شێخ مەحموود لەم لیریکەدا دەیەوێ ئەوە ڕوون بکاتەوە خەبات بۆ نیشتمانێکی سەربەست و ئازاد دەکا. نایەوێ دەسەڵات دروست بکا و لە ژێر سێبەری بێگانە بژی.

## ٢

لە قەسیدەییەکی پێنجینی دیکەیدا دەڵێ:

مووددەتێ عومرم بەتاڵان چوو لە سووچ و قوژبنا
پێمەلەم زۆر کرد لەبەر ئیمان لە بەحری بێ بنا



شاهبازێ بووم لە مەیدانی شکاری دوژمنا
جەهلی میللەت بوو بەزیللەت هات بەسەرشانی منا
سەیری جێگە زەخمی پەنجەم کەن بەدایم شاهیدە
دوودڵی لێم بۆتە زنجیر حەوسەڵەی داوم نییە
بۆ نەمانی ئەجنەبی ژینم لە بەرچاوم نییە
بۆیە ئیتر ئارەزووی دیداری تالّاوم نییە
گورگی پیر کەڵبە شکاوم تاقەتی ڕاوم نییە
دڵ بەم ئەحواڵەش لە ڕێگەی میللەتما قاسیدە
ئێوە ناودارانی کورد حەیفە دواکەوتن لە گەل
دەست بەدەست یەکتر بدەن بۆ گرتنی لووتکەی ئەمەل
عەزم و ووریایی و سەباتە بۆ بەدەستهێنانی هەل
دوژمن و بێگانە حەقی میللەتی پێ نابێ حەل
خوێنی ئەوتانە لە لای خوا عەینی زوهدی زاهیدە

لەم شیعرەدا شێخ مەحموود لە هەڵسووڕانی خەبات و کاری سیاسیدا ڕەشبینە، یەکێتی لە ناو ڕیزی میللەتدا نییە. کە ڕوو دەکاتە ناودارانی کورد و پێیان دەڵێ لە میللەت دواکەوتوون و ئاگایان لێی نییە، مەبەسی هەندێ سەرۆک عەشرەتی کوردە وەکو خوسرەو خانی دەرەویانە و جافەرسانی هەورامان و سەرکردەکانی عێلی جاف. ئەم گیانی عەشیرەتگەری و خۆ بەزل زانین یەکێ بوو لەو هۆیە هەرە گرنگانەی خەباتی چەکداری کورد بەدرێژایی مێژوو سەری نەدەگرت.

## ٣

لە پارچە شیعرێکیدا بەناوی «تاقی کیسرا»وە شێخ مەحموود دەڵێ:

چی بەسەرهات تاقی کیسرا هەیبەتی سوڵتان ڕەشاد!
حوکمی هاروونی ڕەشید و تەخت و بەختی کەیقوباد
چەند هەزار ئینسانی ناسک جوملە بوونە خاک و خۆڵ
کوررەیی ئەرزە سەراسەر پڕ لە ئێسقانی عیباد
نەسرەت و ماڵی جیهانیش بێ بەقایە ئەی ڕەفیق
عاقیبەت دنیا نەمانە قەت نەکەی فیتنە و فەساد

فرسەتە عومری عەزیزت بێ سەعی زایع مەکە
تەرکی ئەربابی سەفاکە و ڕێی فەلاکەت مەگرە یاد

لەم پارچە لیریکەدا شێخ مەحموود بەبیروباوەڕی دانایانەی ئایینی ئیسلامی ڕۆژهەڵات ئامۆژگاری دەکا. بەئادەمزاد دەڵێ هیچ گەورەیی و مەقام سامانێک هەتا هەتایە نییە، لەبەرئەوە پیاو تەنیا بەکاری چاکە قازانج دەکا، بۆیە دوورکەوتنەوە لە کاری خراپ جەوهەری ڕاستییە.

٤

لە لیریکێکیدا خۆ بەکورد زانینی شێخ مەحموود دەچێتە ناو گەردوونێکی بێ سنوورەوە:

فەرهادی قەومی کوردم و فەریادی کورد ئەکەم
دوژمن بەکوتەکی کاوە وەکو شووشە وورد ئەکەم
بۆ بێستوونی مانیعی ئامالی کوردەکان
وەکو کۆهکەن بەعەزمی مەتین دەستوبرد ئەکەم
یا کەشتیی کورد دەبەمە ساحیلی نەجات
یا ڕووحی خۆم و ئالی پەیەمبەر بەپرد ئەکەم
مەحموودی فیکرەتم ئەخەمە دووی ئەیازی کورد
یا کەسبی وەسڵی میللییەت و نەیلی کورد ئەکەم
من کوردم و بەکوردی ئەڵێم و بڕایەوە
زیللەت نەما سەعادەتی کوردان بڕایەوە

لەم لیریکەدا شێخ مەحموود دان بەوە دادەنێ جگە لە کورد هیچ شتێکی دیکە نییە. خۆی لەگەڵ فەرهاد و کاوە بەراوورد دەکا، ئەوەی فەرهاد بۆ شیرینی کرد ئەو بۆ کوردی دەکا، بەچەکوشی کاوە دوژمن وردوخاش دەکا، دەڵێ ئەگەر ببم بەمەلیکیش وەکو سوڵتان مەحموودی غەزنەوی بەئامۆژگاری و ڕاوێژی هەیاسی کورد (ئەیاز) دەکەم، واتە تەنیا ئەوەی چاکەی کوردی تێدا بێ ئەویان دەکەم. شێخ مەحموود لەم شیعرەیدا وا هەست دەکا بۆی نەکراوە بەخەڵکی بسەلمێنێ پلەی گیانی کوردایەتی لە چی پایەیێک دایە، لەبەرئەوە دەڵێ با خەڵکی لێی نەگرن، بەڕاستی کوردە و با مەسەلەکە ببڕێتەوە.



٥

لە شیعرێکیدا بەناوی «گریان و خۆشی»یەوە دەڵێ:

زەمزەمەیە گریانە لە نێو مەجلیسی عەشقا
ساقی خەبەری داوە کە یار نایەتە یاری
قەت نایە ئەو دلبەرە بەفەریادی من و تۆ
سەدبارە کەبابی دڵەکەم بیکەمە دیاری
دوو جێگەیی خوێنینە بەسەر سەفحەیی ڕووما
گوڵ گوڵ بووە دامێن و کەنارم وەرە دیاری
ئەو خاڵە زوخاڵێکە لە نێو بۆتەیی دڵما
ڕووحم ئەکولێنێ بەنەفەس کوورەیی ناری
ئەی مورغی ستەمدیدە ئەسیری لە قەفەسدا
بۆ خۆت و وەتەن بگری کە سەفحوردەیی ماری
دەست ناکەوی تریاکی من و تۆ لە عیراقا
با شەکوە بەرین بەلیقای حەزرەتی باری
قوڕ بپێوە دادڕە بەخت بۆ خۆت بەکەساسی
ئەی کوردی هەژار ئێستەکە بێ یار و دیاری

لەم شیعرە جوانەدا شێخ مەحموود وەکو شاعیرێکی جیگەر سووتاو بۆ کورد دەگری. ڕوو دەکاتە مەیگێڕ سەرخۆشی بکا، بۆ ئەوەی کارەساتی کوردی لە بیر بباتەوە. لەو شیعرەدا یادی دلبەر دەکاتەوە، ئەو دلبەرە لە لای شاعیران ئەگەر کچێکی جوان بێ لای شێخ مەحموود ئازادیی کوردە. شیعرەکەی بەوێنەی ڕەوانبێژی کلاسیکیانەی ڕۆژهەڵاتی ڕازاندۆتەوە، هەندێ تەعبیری دووبارە داڕشتۆتەوە، غەزەلێکی نایابی نیشتمانپەروەری و سیاسی دروست کردووە. لە دوای ڕووخانی هەموو ئامانجەکانی کوردی عیراق، لەم شیعرەدا شێخ مەحموود ڕاستییێک بەکورد دەگەیەنی ئەو دەردەی تووشی بووە دەرمانی لە عیراق چنگ ناکەوێ، چار تەنیا ئەوەیە کورد پەنا بەرێتە بەر خودا چونکە بێ کەس و بێ نیشتمان ماوەتەوە.

٦

لە چوارینێکیدا شێخ مەحموود دەڵێ:

لوتف و کەرەم و قەهری دەمودەس نەفەسێکە
هەر ساتە بەڕەنگێک و لەسەر تەبعی کەسێکە
تەخریبی گوڵی یاسەمەن و باغی مەحەببەت
کرداری لەسەر کەیف و هەوایی تەرەسێکە

ئەم چوارینە لە بیرێکی دانایانە هەڵقوڵیوە، لە کەلێنی هەندێ لە وشە و ماناکانی هەست بەگیانی نالی دەکرێ. ئەمە کارێکی سروشتییە بۆ شێخ مەحموود چونکە قوتابییێکی سەرکەوتووی شیعری کلاسیکی کوردستانی باشوورە.

لە چوارینێکی دیکەیدا دەڵێ:

دیسان بەهارە ئۆردووی جەننەت گەڕایەوە
دەستی جەفای فەلاکەتی زستان کشایەوە
شەونم لەسەر ڕوویی شەهلا و ڕوویی گوڵ
بولبول بەگریە غونچە بەخەندە گەشایەوە

بەشێوازێکی ڕۆمانتیکییانە لەم چوارینەدا شاعیر وەسفی دیمەنێکی بەهار دەکا. لە ناو ئەم دیمەنە جوانەشدا خۆشی و ناخۆشی هەیە، بلبل دەگری و غونچە پێدەکەنی، بەڵام ئەم خۆشی و ناخۆشییە وەکو دیاردەییێکی کۆمەڵایەتی ناکەوێتە ڕوو، بەڵکو دیاردەییێکی هونەرییە، چونکە گریانی بلبلیش جوانی تێدا هەیە.

٧

شێخ مەحموود کۆمەڵێک تاکی هەیە، شاعیرییەتی تیایاندا نواندووە. لەوانە لە یەکێکیاندا دەڵێ:

بەیادگار ئەینێرم بۆ شاوەیسی ڕەفیقم
لە دیدارما ببینێ بۆ میللییەت شەفیقم

لە دوای شەڕی ئاوباریکی ساڵی ١٩٣١ و دوورخستنەوەی بۆ باشووری عیراق و جێگیربوونی لە بەغدا لە ١٢ی تشرینی دووەمی ١٩٣٣ وێنەیێکی خۆی بۆ ئیسماعیل حەقی شاوەیس (١٨٩٤ - ١٩٧٦) دەنێری، ئەم دێڕە شیعرە لە پشتی وێنەکە دەنووسێ



و بەئیمزای «فەرهادی کوردی»یەوە بۆی ڕەوانە دەکا.

لە تاکێکیدا بۆ خوسرەو خانی دەرەوییانە شاعیر دەڵێ:

لوتفی شیرینی نەکرد خوسرەو لەگەڵ فەرهادی کورد
بۆیە کەوتە دامی شێر و تامی شیرینی نەکرد

ئەم دێڕە شیعرە ڕەنگینەی پڕ لە وێنەی هونەری وەرامێکە شێخ مەحموود بۆ خوسرەو خانی دەرەوییانەی ناردووە گلەیی لێ دەکا کە هاوکاری شێخ مەحموودی نەکردووە و دوایی کەوتۆتە دەست ئێران. لە شیعرەکەدا وێنەی ڕەوانبێژی زۆرە، خوسرەو خان و خوسرەوی دڵداری شیرین، فەرهادی دڵداری شیرین و فەرهادی کورد کە مەبەس شێخ مەحموودە. ئەگەر خوسرەو خان یارمەتی شێخی بدایە بەشیرین شاد دەبوو، واتە ئازادی و سەربەستیی کورد، بەڵام کە یارمەتی نەدا بەو شیرینە، ئازادییە شاد نەبوو.

لە تاکێکیدا بۆ ڕەشید مەستی شێخ مەحموود دەڵێ:

ڕەشید ئەمجارەش هەروەکو جاران مەستی نەکەی
وەک زیافەتەکەی گازێ بەشۆربا خەستی نەکەی

ڕەشید مەستی خاڵی تۆفیق وەهبییە. لە کاتی خۆیدا نامەییێکی بۆ شێخ مەحموود ناردووە داوای کردووە بیگەڕێنێتەوە بۆ سلێمانی. شێخ بەم تاکە شیعرە وەرامی داوەتەوە، وێنەی ڕەوانبێژی جوانی تێدایە. مەبەسی لە «گازێ» ناوی نەنکی حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغا بووە کە یەکێک بووە لە دەوڵەمەندانی سلێمانی. هەروەها «گازێ» ناوی گەرماوێکی بەناوبانگ بووە لە نزیک سەرای سلێمانییەوە. لە بارەی ڕەشید مەستییەوە، محەمەد ڕەسووڵ هاوار دەڵێ عەرەقخۆر بووە. ئەگەر وابێ شێخ بەتەورییە وتوویەتی مەستی نەکەی.

لە تاکێکی دیکەیدا شێخ بۆ وسوو ئاغا وتوویەتی:

یووسفم تۆیت لەتیفە زۆر سەلامت لێ ئەکەم
بۆ ئیسعادی نووری چاوم هەردوو چاوت ماچ ئەکەم

وسوو ئاغا ناوی یوسف بووە، یەکێکە لە نزیکەکانی شێخ مەحموود لە سەردەمی مەلیکیدا سەرۆکی پرۆتۆکۆڵ (تەشریفاتی) تەختی مەلیکی بووە، وەکو حەمدی لە شیعرێکیدا باسی لێوە دەکا. شێخ مەحموود نامەییێک بۆ وسوو ئاغا دەنووسێ بەم دێڕە شیعرە کۆتایی بەنامەکەی دێنێ.

***

شێخ مەحموود زۆر شت بوو، لەوانە دەروێشی تەریقەتی قادری و سەرباز و جەنگاوەر و حوکمدار و بوو بەمەلیک، بەڵام شاعیر بوو. شێخ شیعری کەمە لەسەر هەوای بەحری عەرووزی و یەکێتیی قافیە شیعری داناوە، بابەتی لیریک و قەسیدەی پێنجین و چوارین و تاکی هەیە، شیعری سفت و ڕەوانە، مانا لە ڕوو و ئاشکرایە، ناوەڕۆکی شیعری هەمووی دانایی و کوردایەتییە، لە وەسفدا سەرکەوتووە. ئازادیی نەتەوەی کوردی لە پەیکەری دلبەری کچی جواندا داتاشیوە. هەرچی کردبێ بۆ چاکەی کوردی کردووە، ئەگەر بەخراپەش گەڕابێتەوە دانی پێ داناوە.

# بەشی یازدەم

## کەمالی

**١٨٨٦ – ١٩٧٤**

### ژیانی

عەلی کوڕی باپیر ئاغا کوڕی چراغ لە ساڵی ١٨٨٦ لە سلێمانی لە دایک بووە. باپیری سەرۆکی تیرەی میرئالآیی یەکێتیی عەشیرەتی ئیسماعیل عوزێری بووە. باوکی لە ڕیزی سوپای عوسمانی بەپلەی ئەفسەری خزمەتی کردووە. عەلی باپیر ئاغا نازناوی «کەمالی» بۆ تۆماری شیعری بەکارهێناوە، لە پاشانا لە ناو خەڵکی بەعەلی کەمالی باپیر ئاغا ناوبانگی دەرکردووە. کە باوکی کۆچی دوایی کردووە عەلی هێشتا منداڵ بووە.

سەرەتای خوێندنی لە سلێمانی لە حوجرەی مزگەوتی شێخ عەبدوڵڵا (مزگەوتی دوو دەرگا) بووە. خوێندنی زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی تەواو نەکردووە. لەباتی ئەوەی ببێ بەمەلا، بووە بەمیرزا، واتە خوێندەوار و ڕۆشنبیر و ئەفەندی ئەو سەردەمە. بەم جۆرە بۆ کاربەدەستان سکرتێری و بۆ میری مووچەخۆری کردووە. لە پێشانا لە سلێمانی دامەزراوە لە پاشانا گوێزراوەتەوە بەغدا و لەوێ زۆر نەماوەتەوە. لە ماوەی جەنگی یەکەمی گێتیدا لە سلێمانی بووە بەسەرباز و لە شار ماوەتەوە و ڕەوانەی هێلی جەنگ نەکراوە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئینگلیزی داگیرکەر لە ساڵی ١٩١٩ بووە بەقایمەقامی چەمچەماڵ، ماوەیێکی کەم لەسەر ئەم کارە ماوەتەوە. لە ڕۆژگارانی خەباتی چەکداری و فەرمانبەرایەتییەکانی شێخ مەحموود لێی نزیک بووە و بەشداری لە جموجۆڵییەکانی کردووە، وەک سکرتێر و نووسەرێک لە بن دەستی شێخدا بووە. لە ساڵی ١٩٢٢ کە «جەمعیەتی کوردستان» بەسەرۆکایەتی مستەفا پاشا یا مولکی لە سلێمانی دامەزراوە کەمالی یەکێک بووە لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەر و دوایی بەئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی «بانگی کوردستان» هەڵبژێرراوە. بڵاوکردنەوەی ئەم ڕۆژنامەیە زۆری نەخایاندووە. لە ماوەی فەرمانڕەوایی ئینگلیز لە سلێمانی کەمالی سکرتێری و نووسەری بۆ حاکمە سیاسییەکانی ئینگلیزی وەک ئی. سۆن و گرین هاوس و ئەدمۆندس کردووە.



نزیکەی دوو ساڵێک لە هەڵەبجە مووچەخۆر بووە تا ساڵی ١٩٢٦ لەوێ ماوەتەوە. کە شێخ مەحموود چووە بۆ پیران کەمالی وازی لە کارەکەی هێناوە و چۆتە لای و ماوەی ساڵێک لێیەوە نزیک بووە. لەو کاتەدا شێخ مەحموود دووجار ناردوویەتی بۆ تاران و کرماشان بۆ گەیاندنی نامەی شێخ بۆ هەندێ لە کاربەدەستانی ئێران.

بەهۆی خوێندەواری و زانینی زمانانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی عوسمانی کەمالی ڕووی ئەوەی بووە نووسەر و میرزا و سکرتێر و مووچەخۆری باش بێ لای کاربەدەستان و فەرمانڕەوایانی میری.

ماوەیێکی زۆر لە هەڵەبجە مووچەخۆری میری بووە، لە ساڵی ١٩٢٨ەوە تا ساڵی ١٩٥٠. لەم ساڵەدا ماڵی گواستۆتەوە کەرکووک تا ساڵی ١٩٦٣ لەوێ خەریکی پیشەی ئەرزوحاڵ نووسین بووە. لە ساڵی ١٩٥٨ بوو بەئەندامی دەستەی نووسەرانی کۆواری «شەفەق=الشفق» بەزمانانی کوردی و عەرەبی. کەمالی لایەنی دارایی کۆوارەکەی بەڕێوە دەبرد، هەندێ جاریش نووسینی تێدا بڵاو دەکردەوە. کەمالی لە کەرکووک لای کوڕی گەورەی بوو، لە ساڵی ١٩٦٣ کە ئەو کوڕەی وەک مووچەخۆری میری گوێزرایەوە سلێمانی ئەویش گەڕایەوە مەڵبەندی ژیانی هەمیشەیی و تا کۆتایی تەمەنی لە سلێمانی بوو.

کەمالی بەشداری لە ڕۆژنامەگەری کوردیدا کردووە. لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی «بانگی کوردستان» و «ڕۆژی نوێ» و «شەفەق» و هی دیکەدا کاری کردووە. لە ساڵی ١٩٢٢ دیوانی مەحوی بەسەرپەرشتی کەمالی لە سلێمانی چاپی یەکەمی بڵاوکراوەتەوە. هەندێ وردە کتێبی لە بابەت ئەدەبی کوردییەوە داناوە. وەکو «گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم» (١٩٣٩)؛ «شاعیرە ناو وون بووەکان» (١٩٧٣).

کەمالی لە ڕۆژی ٢٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٤ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی شێخ محیەدین نێژراوە.

### شیعری

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

کەمالی لە هەردوو بابەتە شیعری کلاسیکی کوردی هەیە. شیعری بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی. بایەخی زۆری بەشیعری کێشی سیلابی داوە، بەشێکی زۆر لە بەرهەمی شیعری لەم بابەتەیە، ئەگەرچی بەژمارە لە شیعری کێشە عەرووزییەکانی کەمترە.

١- شیعری بەحری عەرووزی: لەم شیعرانەیدا لە جەوهەر و مەرجەکانی شیعری کۆنی کلاسیکی لای نەداوە. لە کێشدا بەحرەکانی هەزەج و ڕەمەل و موزاریع و موتەقاریب و موجتەسی بەکارهێناوە. یەکێتیی قافیەی پاراستووە. هەندێ لە دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی کردووە بەقافیە وەکو: ا ت د ث ز ل م ن و ۆ (ە – ــە) ی ێ. تا پلەیێک بایەخی بەپاش قافیە داوە. ئەم وشانەی کردووە بەپاش قافیە: ئەکا، ناکا، هات، گرت، کرد، کورد، کوردستان، ڕابورد، خوداحافیز، ئەکەم، ئەدەم، ئەیزانم، ئەبم، ناکەم، پەرچەم، دلی من، ئەکەن، من، ئەکەین، تۆ، بوو، بکە، هەیە، کردووە، نییە، نەکەی، ئەوێ، نەبێ، بێ.

لە بابەت ژمارەی دێڕی شیعرەوە بەشی هەرە زۆری بەرهەمی کەمالی لە چەشنی «غەزەل»ە، واتە لە دوازدە دێڕ شیعر کەمتر. لە هەموو دیوانیدا تەنیا دووسێ قەسیدەی هەیە، واتە ئەو شیعرەی لە دوازدە دێڕ زیاترە. لە ئەوانی دیکەشیدا دیاردەیێک لە شیعری کەمالیدا هەیە تایبەتییە بەخۆی، ئەویش ئەوەیە زۆربەی هەرە زۆری شیعری لە ٤ و ٥ و ٦ و ٧ دێڕ پێکهاتوون. ئەمە لە شاعیرانی پێش خۆی و هاوچەرخی خۆی بەدەگمەن دەکەوێتە بەرچاو، بەم جۆرە بەشێکی زۆر لە بەرهەمی شیعری لە بابەتی پارچەیە، واتە لە حەوت دێڕ کەمتر.

لە هونەرەکانی دیکەدا لە ڕووی ڕوخسارەوە تاک و چوارینی هەیە. لە تاکدا قافیەی (ا ا) و (ا ب)ی هەیە. لە چوارینا (ا ا ب ب) و (ا ب جـ ا) و (ا ا ب ا) و (ا ا ا ا) و (ا ب ا ب)ی هەیە. کەمالی شیعری شاعیرانی دیکەی نەکردووە بەپێنج خشتەکی، لە دیوانی شیعریدا شیعرێکی سالم دەکەوێتە بەرچاو کردوویەتی بەپێنج خشتەکی.

٢- شیعری سیلابی خۆمالی: شاعیر بایەخێکی زۆری بەم جۆرە شیعرە داوە. هەمووی لەسەر کێشی دە برگەیی هۆنیوەتەوە. بەدەگمەن حەوت برگەیی و هەشت برگەییش بەرچاو دەکەون. لە ڕووی قافیەشەوە هەمووی جووت قافیە (مەسنەوی)یە، یەک دووانێک نەبێ لەسەر سیستێمی یەکێتیی قافیە دایناون. لە بارەی ژمارەی دێڕی ئەم چەشنە شیعرە لە شەش دێڕەوە هەیەتی تا هەژدە دێڕ. لەم زانیارییانەوە ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ کەمالی هەناسەی شیعری درێژ نییە، لەبەرئەوە هەموو بەرهەمە ڕەسەنەکانی دەکرێ بەلیریک بژمێررێن. کەمالی لە هونەری موستەزاددا سەرکەوتووە. ئەم بابەتە شیعرە ئەگەرچی لە گێتیی شیعری کلاسیکی عەرووزیدا باوە کەچی ئەو بەکێشی دە برگەیی



سیلابی خۆمالی هەندێ موستەزادی هۆنیوەتەوە، لەمەدا هونەری نواندووە. دێڕە درێژەکانی موستەزاد لای ئەو کێشی سیلابی خۆمالی دە برگەیییە و کێشە کورتەکانی پێنج برگەیین.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شاعیرییەتی کەمالی زیاتر لە شیعرە عەرووزییەکانیدا دەردەکەوێ. لەگەڵ ئەوەی لە ناو شاعیرانی پێش خۆیدا تواوەتەوە کەچی هەست بەوە دەکرێ لە هەندێ لە شیعرەکانیدا خەیالی تازە و داهێنانی هونەرییان تێدا هەیە. لەم لایەنەوە کەمالی بەم جۆرە جێی خۆی لە ناو شاعیرانی کورددا دەکاتەوە:

لە ڕێزی شاعیرانا بۆیە من ئەمرۆ سەرئەفرازم
لە شاگردانی بەزمی حەزرەتی مەحوی شەکەرڕازم
لە پاش مەحوی هەمیشە پەیرەوی سالم ئەکەم لاکین
بەدڵ زۆر عاشقی هەڵبەستی ناری نیکتە پەروازم

لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

پەیرەوی حەمدی ئەکەم دائیم کەمالی بۆیە وا
ویردی خاس و عامە ئەشعاری تەرەب ئەفزایی من

هەرچی شیعری کێشی خۆمالییەکەیەتی زیاتر دەشکێتەوە سەر وەرگرتن و وەرگێڕان بەدەسکارییەوە.

١- شیعری بەحری عەرووزی کەمالی لە ناوەڕۆکە گشتییەکانی شیعری کلاسیکی ناچێتە دەرەوە، زۆربەی وەسف و دڵدارییە، بەشێکی کوردایەتی و ستایش و پێدا هەڵدانە.

٢- شیعری کێشە خۆمالییەکانی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ڕەنگاوڕەنگن، بەشێکیان ڕەسەن و داهێنراوی خاوەنیانن. بەشێکی دیکەیان لە سەرچاوەی جیاواز وەرگیراون، وەکو پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و حیکایەتی میللی (فۆلکلۆر)ی عەرەب و عەجەم و تورکی عوسمانی. هەروەها کەمالی مەلەوانی باش بووە لە زەریای بێ پایانی دیالێکتی گۆرانی زمانی کوردی. لە ئەدەبی میللی سەرزار و ئەدەبی کلاسیکی شاعیرانیان زۆری وەرگرتووە، بەتایبەتی لەناویاندا بەرهەمی سەیدی هەورامی.

بەرهەمێکی زۆری شیعری فارسی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، هەروەها شیعری دیالێکتی گۆرانی کردووە بەدیالێکتی کرمانجیی باشوور، لەوانە شیرین و خوسرەو ئەمیر

ئەرسەلان و خورشیدی خاوەر و شەڕی خەیبەر و حیکایەتەکانی سەعدی شیرازی و هی دیکە. ئەمانە هەموویان وەکو بەرهەمێکی ئەدەبی میللی چاپ کراون و لە ناو زۆربەی خەڵکی کورد بڵاوکراونەتەوە.

کەمالی ناوی «نیگار»ی وەک ڕەمزی کردگار لە شیعریدا بەکارهێناوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەزۆر مانا ورد دەکرێتەوە، وەکو ئەوەی ناوی کەسێک یا شتێکی جوان یا وێنەیێکی نایاب بێ. هەندێ جاریش کوڕ یا کچ، پیاو یا ژنێکی دیاریکراوە. کەمالی هەوڵ دەدا نیگار بکا بەڕەمزی دڵداریی مەجازی و حەقیقی. بەڵگەی حۆری و غیلمانی بەهەشتە، هەروەها بووکی شیعری کەمالییە، کە لە ژیاندا بوو لێی بیستراوە لە سەردەمی لاویەتیدا کچێکی خۆش ویستووە ناوی نیگار بووە. لەگەڵ ئەوەش وێنەی شیعری وای هەیە بەزۆر نیگار دەکا بەڕەمزی دڵداری حەقیقی.

## نموونەی شیعری

### دڵداری و وەسف

بەرهەمی لەم بابەتەی زۆرە، بەشێوەییێکی فراوان لە شیعرە عەرووزییەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە.

١

لە لیریکێکیدا کەمالی دەڵێ:

وەک نیگاهت کرد و نرخی بادەیی سەهبات شکاند
ڕووت کە دەرخست گیانە بازاڕی گوڵی حەمرات شکاند
زولفەکانت شانە کرد نرخی شکا میسکی خەتا
پێکەنیت بازاڕی شەکری میسر و بەلچیکات شکاند
کەعبە کە چ نابێ عەزیزم بۆچ لە لای زومرەی ڕەقیب
تۆ لەسەر ماچێ بەجارێ عاشقی شەیدات شکاند
موحتەسیب ناترسێ بشکێ شووشەیی نامووسەکەت
هەروەکو شووشەی شەراب و گەردنی مینات شکاند
ئەی فەلەک یا ڕەببی بشکێ دەستی چەرخی کەچ ڕەوت
بێ سەبەب بۆچی هەزار شووشەی دڵی دانات شکاند



خاکی دەرگاکەت چ ئیکسیرێکە سەرسامم کە بەو
وا کە قەدری تەختی شاهی خوسرەو و دارات شکاند
سیحرە ئەشعاری بەلیغت ئەی (کەمالی) ئافەرین!
قیمەتی شیعری هەزاران شاعیری غەڕڕات شکاند

لە پێشانا شاعیر ڕوو دەکاتە خۆشەویست و بەجوانییدا هەڵدەڵێ. ئینجا ئاوڕ لە موحتەسیب دەداتەوە و بەشێوەییێکی جوان بەراوورد لە نێوان زڕانی نامووسی ئەو و شکانی شووشەی شەراب دەکا. ئەوجا ڕوو دەکاتە ڕۆژگار (گەردوون، فەلەک) و کردەوە نابەجێکانی دەگێڕێتەوە، لە پاشانا جارێکی دیکە لەگەڵ خۆشەویست دێتە قسە، لە دواییدا کەمالی دەگەڕێتەوە لای خۆی و شانازی بەشاعیرییەتی خۆیەوە دەکا.

ئەوەی جێی تێبینییە لەم شیعرەدا ئەوەیە ئەگەر شاعیر لەم لیریکەدا ناوی شەکری میسری و بەلچیکی نەهێنایە بیری خوێنەر بۆ ئەوە دەچوو شیعرەکە لە سەدەی نۆزدەمدا نووسرابێتەوە، چونکە لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی شەکری میسری و هۆڵەندی و بەلچیکی پەیدابوون و بەچاکترین شەکر دەژمێرران بۆ چایی. ئەم مانا تازەیە کە جۆری شەکرەکە پیشان دەدا کەمالی لە قاڵبی کلاسیکیدا نوێگەری کردووە.

٢

لە شیعرێکیدا بەشێوەییێکی دیکە قسە لەگەڵ خۆشەویست دەکا:

نیگاری بێ وەفا بۆچی منت ڕیسوایی عالەم کرد
بەناهەق بۆچ منت دووچاری دەرد و مەینەت و غەم کرد
لە مزگەوتا هەمیشە هەر خەریکی نوێژ و تاعەت بووم
کەچی دوو چاوی مەستت بۆچی مەیخانەی بەجێگەم کرد
لە لای لێوی کە دیم خاڵی ڕەشی سەرسام و حەیران بووم
ووتم بۆچی لەسەر ئاوی بەقا گەوری بەهاودەم کرد
هونەر ڕزقێکی زۆر و نیعمەتێکی گەورەیە بۆ پیاو
هونەرمەند ناشکورە گەر بێت بڵێت خوا ڕزقمی کەم کرد
بزانە بەختیاریت چونکە باش تێفکرە وا گەردوون
کڕاندی نوختەکەی زۆر (موجریم)ی خێرا بە(مەحرەم) کرد

ئەم پارچە لیریکە ڕاز و گلەییە، کەمالی یاری بەوە تاوانبار دەکا لە ئایین دەریکردووە.

نیگار ئەو خۆشەویستەیە مەگەر تەنیا شاعیر خۆی بزانێ نێرینەیە یا مێیینەیە، با خاڵی ڕەشیش لە لالێویدا بێ، ئەم خاڵە لە لالێوی حۆری و غیلمانیش بەرچاو دەکەوێ.

٣

لە وەسفێکی ئاسایی دڵداری ئامێزدا دەڵێ:

بەتاتای پەرچەمی شۆخێکی بێ پەروا گرفتارم
عیلاجم ناکرێ نابیستێ کەس فەریاد و هاوارم
بەنەشئەی نێرگسی مەخمووری چاوی دلبەرێ مەستم
هەمیشە بۆیێ مەدحی نێرگسی شەهلایە گوفتارم
بەیادی تەبعی شەککەرباری تووتیی تەبعەم
غەزەلخوانە (کەمالی) بۆیێ وا شیرینە ئەشعارم
لە گۆشەی تەکیەدا گاهێ ئەکەم تەسبیح و تەهلیلە
کەنیسە جێگەمە گاهێ خەریکی بەندی زوننارم
لە دیوانی ئەدەبدا تا ئەمێنم دائەڕێژم من
بناغەی شیعری ڕەنگین چونکە ئوستادێکی هوشیارم
جیهان هیچە بەقا هیچە ژیان هیچە فەنا هیچە
ئیتر بۆ غەم بخۆم بۆ دەوری پێشووی پار و پێرارم

لەم وەسفەدا شاعیر ئەوە دەردەبڕێ سەرچاوەی ئیلهامی ئەندامە جوانەکانی یارە، ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی شیعر لە لای ئەو بەجوانی و بەرزی لە دایک ببێ. ئەگەر ئەم ئەندامانە جوان نەبوونایە، شیعریشی جوان نەدەبوو. لەوەوە دەکەوێتە وەسفی گێتیی سۆفیزم، بەلای ئەوەوە تەکیە و تەسبیح جیاوازییان لەگەڵ کەنیسە و زوننار نییە، واتا ئامادەیە وەکو موسوڵمانێک ببێ بەگاور. لە پاشانا دەکەوێتە پێدا هەڵدانی خۆی وەکو شاعیرێکی بەرز.

٤

کەمالی لە قسە جوانەکانی ناکەوێ بۆ خۆشەویست:

ئەچمە گوڵزار و لەگەڵ بولبول کە گفتوگۆ ئەکەم
ئەو ئەکا مەدحی گوڵ و من وەسفی گۆنای تۆ ئەکەم



با ئەگەر بۆم بێنێ بۆنی میسکی چینی پەرچەمت
چۆن ئیتر من بۆنی عەتر و سونبول و شەوبۆ ئەکەم

دیالۆجی شاعیر لەگەڵ بلبلە، بێ گومان لەو کاتەی بلبل وەسفی جوانی گوڵ دەکا، شاعیر وەسفی جوانی گۆنای دلبەر دەکا. لەگەڵ با ناتوانێ قسە بکا، ئەگەر ئەو بایە بۆنی پەرچەمی یاری بۆ بێنێ، ئیتر ئەو بۆنی سونبول و شەوبۆی بۆچییە!.

٥

شاعیر شین و شەپۆڕیەتی چونکە دلبەر دوورە لێی:

گیانەکەم بەخوا لە دووری تۆ هەمیشە شین ئەکەم
بولبول ئاسا بۆ گوڵی ڕووت گریە وو ناڵین ئەکەم
هەر بەیادی پەرچەم و ڕووی تۆیە بەخوا جار بەجار
ئەچمە ناو باغ و تەماشای لالە وو نەسرین ئەکەم
گەر بکەم تەشبیهی ڕووت گیانە لەگەڵ خورشید و مانگ
توهمەتێکی ڕووتە تەشبیهی بەبێ تەخمین ئەکەم
سابیتە قوربان وەکو ڕەنگی خەنە ناچێتەوە
جەژنە سبحەینێ بەخوێنم دەست و پێ ڕەنگین ئەکەم
گەر سلێمانی ببێتە جەننەت و پڕ بێ لە حوور
پەشمە لام هەر مەیلی وەسڵی یارەکەی پێنجوین ئەکەم
چاوەڕوانم زولفی لادات تا ببینم ڕوومەتی
هێندە بێ عەقڵم لە کافر من ئومێدی دین ئەکەم
هەر لە شەوقی لێوی شەککەرباری ئەو دڵدارەیە
من کە وەک تووتی (کەمالی) وا قسەی شیرین ئەکەم

مێشکی شاعیر بەسەدان غەزەلی وەسف و دڵداری قانگ دراوە. کە پەڕیزادەی شیعر سەری لێ دەدا، هەموو وشە و تەعبیر و وێنە کلاسیکییەکانی ناو مێشکی وەک هەورێک دەشێلێتەوە لە ئانێکی بێ ئاگایی شیعرێکی لەم بابەتە تۆمار دەکا. بێ گومان ئەوەی تازە بێ لەم لیریکەدا ئەوەیە شاعیر دەیەوێ بڵێ لە شاری پێنجوین حەزی لە یەکێک کردووە ئەگەر سلێمانی ببێ بەبەهەشت و پڕ بێ لە حۆری، ئەو تەنیا دڵی لای ئەوەی پێنجوینە. لە

ناوەرۆکی شیعرەکەدا خوێنەر ئەوەی بۆ دەردەکەوێ ئەو خۆشەویستەی شیعرەکەی بۆ وتراوە مێیینەیە.

٦

شاعیر دڵی هەر لە لای یارە دوورەکەی پێنجوینە:

لە دووری تۆ نیگاری بێ وەفا و و دین
سەفایێکی نییە چواریاغی پێنجوین
بەبێ ڕووی تایدار و ووردە خاڵت
نییە شەوقی لە لای من مانگ و پەروین
مەهێڵە ڕۆژی من ڕەش بێ نیگارا
لەسەر ڕوو لابدە تۆ زولفی پرچین
قسەی عەشقی من و تۆ هاتە مەیدان
ئیتر باسی نەما فەرهاد و شیرین
فیدای ئەو چاوە مەستەی کە (کەمالی)
ژیان و عەقڵ و هۆش و سەبر و تەمکین

نیگاری بووکی شیعر یا غیلمانی بەهەشت هەمیشە لەگەڵ شاعیرە، ئەگەرچی لێی دوورە. لێرەدا نیگار خۆشەویستەکەی پێنجوینە، کەچی لەو کاتە ئیلهامییەدا لە پێنجوین نییە. شاعیر هەموو جوانیی سروشت لە نیگار کۆدەکاتەوە، خۆ مەسەلە ئەگەر دڵداریش بێ، خۆشەویستیی ئەو لە ئەوەی شیرین و فەرهاد قووڵترە.

٧

دووری یار بەڕاستی بێ یا بەقەستی سەرچاوەیێکە کەمالی ئیلهامی لێ وەرگرتووە.

لە دووری سەروی باڵات دیدە هەر وەک جۆییبارێکە
بەخوێنی ئاڵی دیدەم دەشت و سەحرا لالەزارێکە
بەشەو کاتێ ئەنووم پێچ و خەمی چین چینی ئەو زولفەت
لە چاوی ئەشکبارمدا هەموو تاوێکی ماریکە
وەرە سەیری سەفاگای دیمەنی دوو چاوی گریانم
لە لایێک بەکرەجۆیێکە لە لایێک سەرچنارێکە



بەشەو گوێ بگرە دەنگی ناڵە ناڵی دڵ بەمەحزوونی
لە تاوی دەردی عەشقی تۆ عەجەب شوور و قەتارێکە
مەحاڵە من بکەم دەرمانی زامی تیری برژانگت
لە سینەی پارە پارەمدا نیشانی ئیفتیخارێکە
لە ڕێگەی عەشقدا ئەووەل قەدەم دانانی سەرشەرتە
نەکەی هیوایی سوود هەرگیز ئەمە نەوعە قومارێکە
(کەمالی) دێت بەشەو بۆ پاسەوانی دەرگەکەت قوربان
مەکە مەنعی مەرامی کەسبی ناو و ئیعتیبارێکە

گریان بۆ دووری یار دیاردەیێکی بڵاوە لە شیعری کلاسیکیدا. بەشێوازی جیاواز دڵۆپی فرمێسک بەزەریا و ڕووبار و زێ دەچوێنن. کەمالی ئاسۆیێکی ناوچەیی یا نەتەوەیی داوەتە سۆزی دڵدارییەکەی بەوەی فرمێسکی بەئاوی بەکرەجۆ و سەرچناری سلێمانی دەچوێنێ.

٨

کەمالی لە ناو دەردی دووری دەتلێتەوە:

شەوی دووریت ئەوەندە گریە وو هاوار و شینم کرد
بەخوێنی ئاڵی چاوم ڕەنگی سەفحەی سەرزەمینم کرد
کە دیم ئادەم نەوەی وەک تۆ لە پشتی دێتە دنیاوە
سوجوودی ئادەمم برد ڕەجمی شەیتانی لەعینم کرد
مورادم مەدحی زولف و ڕووی نیگاری شۆخەکەی خۆمە
کە هاتم وەسفی ماچین و نیگارستانی چینم کرد
ژیانی تازەیی بەخشی بەمن یارم کە ڕێگەی دا
شەوی وەسڵی تەوافی لێوی موعجیز ئافەرینم کرد
کە دیم زوونناری زولف و پەرچەمی وەک شێخەکەی سەنعان
قوبوولی مەزهەبی تەرسا وو تەرکی عەقل و دینم کرد
لە ناو باغا چنار و سەرو و عەرعەر شەرمەزار مابوون
(کەمالی) من کە مەدحی بەژنی یاری مەه جەبینم کرد

لێرەدا شاعیر دووری لە بیر دەچێتەوە، تەنیا دوورییەکەی بۆ ئەوە ویستووە، چونکە بۆتە هۆی ئەوەی وەسفی جوانی خۆشەویست بکا. لەبەر جوانی دلبەرەکە باوەڕی بەپێغەمبەرایەتی ئادەم هێناوە و ڕەجمی شەیتانی لەعینی کردووە. ئادەم باوکی هەموو پێغەمبەران و جوانانی سەر ڕووی زەوییە. دڵداری لە هەموو جوانێکدا خۆی دەنوێنێ. کەسێکی وەکو شێخی سەنعان ئامادەیە بچێتە سەر ئایینی ئەو شۆخە گاورەی حەزی لێ کردووە.

**٩**

نیگار ژیانە لە لای کەمالی:

گوڵ و لالەی بەهارم ناوێ بێ تۆ ئەی نیگاری من
گوڵی ڕووتە عەزیزم خۆ گوڵ و لالەی بەهاری من
بەماچێکی دەمت گەر بێتو تۆ چارە نەکەی دەردم
لە ڕۆژی مەحشەرا ئەگرێ بەرۆکت گیانی زاری من
بەیەک لە گەردوون تێپەڕی بۆ عەرشی ئەعلا چوو
فیداتم شاهبازی عەرش و شیرین شاسواری من
سەگی دەرگانەکەی کاک ئەحمەدی شێخم تەمادارم
تکای عەفوم بکە ڕۆژی جەزا شێخم لای کردگاری من
ڕەئیسی ئەولیایە قوتبە یەعنی واریسی غەوسە
پەناه و پشتیوانی کوردە مایەی ئیفتیخاری من
ئەکەم ڕووحم فیدای ئەولادی لاکێن پیرم و کوێرم
نییە لایق بەقوربانی ببێ گیانی هەژاری من

شاعیر ئەم لیریکەی لە سەردەمی پیریەتی و کوێریەتیدا لە ساڵی **١٩٦٩** نووسیوە. هەندێ دیاردە و وێنەی تێک ترنجاندووە لەم پارچە شیعرە بچووکەدا. نیگار لە بەهار و گوڵ و گوڵاڵە جوانترە، ماچی لێ داوا دەکا. لە کاک ئەحمەدی شێخ دەپاڕێتەوە لە ڕۆژی حەشردا لێی ببوورێ، کاک ئەحمەد زۆر گەورەیە جێگری غەوسی گەیلانییە. ئەوجا کوردایەتی دەکا بەناوی ئەوەی کاک ئەحمەد کوردە.



**١٠**

لە وەسفی هەندێ ئەندامی یاردا دەڵێ:

لە دڵما نووکی برژانگی بەوێنەی تیری ڕووهامە
لە حەسرەت زوڵفەکەی ڕۆژم بەڕاستی هەروەکو شامە
نیگار لەیلایە من مەجنوون و دەشتی شارەزوور ئەمڕۆ
دوجەیلە تاری زولفی پڕ خەمی زنجیری سەودایە
خۆشە ئەحواڵی ئەو مەستەی لە بەزمی بادەنۆشانا
نەزانێ لێوی دلبەر کامەیە و مینایی مەی کامە
نەوەک لەیلا وو مەجنوونە نەوەک شیرین و فەرهادە
قسەی عەشقی من و تۆ داستانی بێ سەرەنجامە

لەم شیعرەدا کەمالی نووکی برژانگی خاتوو نیگار بەتیری ڕووهام دەچوێنێ. ئەمە ناوی کوڕی گوودەرزی پاڵەوانی حیکایەتی ئەفسانەی کۆنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، لە شەڕێکی نێوان ئێران و توورانی داستانی ئەفسانەیی ڕووهامی ئێرانی بارمانی توورانی دەکوژێ. لە لایێکی دیکەوە کەمالی شانۆی دڵداری لەیلا و مەجنوون لە دوجەیلەوە دەگوێزێتەوە شارەزوور. خۆی مەجنوونە و نیگار لەیلایە. لە دواییدا لەم قسانەی پەشیمان دەبێتەوە، عەشقی خۆی و نیگار لە لەیلا و مەجنوون و شیرین و فەرهاد قووڵتر حسێب دەکا.

**١١**

دڵی کەمالی بەنووکی برژانگی خاتوو نیگار زامدار بووە:

لە شارانی عیراقدا میری خاوەن حوسن و جوان زۆرە
لە ناویاندا لە سایەی خواوە یارم ئیمپراتۆرە
کە ماچی ئەو دەمەم کرد زۆر سەرم سوڕما ووتم یا ڕەب
دەمی ئاوی حەیاتە بۆچی هەم شیرینە هەم شۆرە
بەلوقمان و ئەرستۆ ناکرێ چارەی دڵی زارم
کە چونکە زامی برژانگی نیگارە کۆنە ناسۆرە

وێنەکانی ئەم پارچە شیعرە ڕستەی لە قاڵب دراوی مانای داهێنراوی شیعری کلاسیکی کوردییە. کەمالی وشە و تەعبیری پاش و پێش خستووە لەو مانا ئامادەکراوانەی لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە لە ناو ئەدەبی کوردی دروستبوون.

١٢

کەمالی کچە جوولەکەییێکی کوردی خۆش ویستووە:

که من تەوراتی ڕووی تۆم دی نیگاری پەلکە خورمایی
بەکۆڵێ عیلمەوە چارەم نییە وا ئەبمە مووسایی
موحەققەقمە لە باغا سەرو و عەرعەر گیانی شیرینم
لە بالای تۆ ئەکەن تەعلیمی ئازادی دلاریی
ئەگەر شەککەر دەمێکی چەشنی تۆی ببووایە ئەو عەسرە
چلۆن فەرهاد ئەبوو عاشق بەشیرین شۆخی بەغدایی
ووتم ماچێک کەرەم کە ئەتدەمێ گیانم ووتی شێتیت
چلۆن ئاوی حەیاتی خۆم ئەدەم من پێت بەخۆڕایی
دوو چاوم بۆیە قوربان خۆش ئەوێ تا من ببینم ڕووت
کە ڕووی تۆ پێ نەبینم ئیکە من بۆ چیمە بینایی

شاعیر ناوی نیگاری خۆشەویستی کردووە بەسیفەت بۆ کچە جوولەکەییێک بەمانای جوان. لە پێناوی دڵداریی ئەو کچە کەمالی ئامادەیە بچێتە سەر ئایینی مووسا پێغەمبەر. وێنە شیعرییە هونەرییەکانی هەرچەندە تازە نین لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر هەناسەییێکی ڕەوان و مۆسیقاییێکی نەرمی دروست کردووە و ئاشنایەتییەکی لە نێوان وشە و ڕستەکاندا پەیدا کردووە، سیفەتی داهێنانی داوەتە شیعرەکە.

١٣

لە بارەی جوانی ڕووی یار و مانگی چواردەشەوی کەمالی لە چوارینێکیدا دەڵێ:

مانگی نوێ بۆیە هەموو شەو زیاد ئەکا و ئەشنێتەوە
تا جەمالی هەروەکو ڕووی تۆ بڕازێنێتەوە
کاتێ بوو بەچواردەهەم شەو تێ ئەگا نابێ بەڕووت
جا لە داخا ووردە ووردە کەم ئەکا و ئەتوێتەوە

داهێنانی شاعیر لەو لەیەکچوونە جوانەیە کە لە نێوان مانگ و ڕووی یار دیاری دەکا. مانگی یەک شەوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاد دەکا بۆ ئەوەی لە شەوی چواردە وەکو ڕووی یار جوان بێ. کە دەگاتە ئەو شەوە ڕووی یار لەو جوانتر دەکەوێتە بەرچاو، لەبەرئەوە لە داخانا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لاواز دەبێ، تا لە دواییدا بەجارێ لەناودەچێ.



١٤

لە لای شاعیر یار هەمیشە بەختیارە و خۆی بەدبەختە:

لە ناو شۆخانی شارا دلبەرم هات خودنومایی کرد
بەخوێنی جەرگەکەم سەر پەنجەیی دەستی خەنایی کرد
بەشەو بۆ پاسەوانی دەرکەکەی چووم من بیحەمدیللا
سەگی دەرگانەکەی هات و لەگەڵما ئاشنایی کرد
هەموو تاعاتی فلسێکی نەهێنا لای خوا زاهید
کە چونکە هەرچی کرد بۆ چارەیە هەر بۆ ڕیایی کرد
دڵ و هێز و هەناو و سەبر و هۆشی بردم و ڕۆیشت
نیگاری نازەنینم کاتێ مەیلی ماڵئاوایی کرد
لەبەرچی زویری لێم بێ ڕەحم و مروەت بۆچی نازانی
لە ڕێگەی عەشقی تۆدا چەند (کەمالی) گیان فیدایی کرد

لەم پارچە شیعرە کورتەدا هەست بەگێڕانەوەی ڕووداو دەکرێ، وەک ئەو شیعرانە نییە یەکێتیی دێڕە شیعری تێدا بێ. واتە دێڕەکان سەربەخۆ بن و پێوەندییان بەدێڕی پێش و پاشەوەی خۆیان نەبێ. نیگار لە ناو شۆخانی شار لە هەموویان جوانتر بوو، بەخوێنی جیگەری شاعیر پەنجەی خەنایی کردووە. بەشەو شاعیر هەواڵی دەپرسێ، ئەگەر سەگی بەردەرگای ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا بکا ئەویش جێگەی خۆشی و شادمانییە.

## ستایش

کەمالی ستایشی کەمە، ئەوەی هەیەتی بەشی زۆری بۆ بنەماڵەی کاک ئەحمەدی شێخ و شێخ مەحموود و شاعیرانی کوردی سەردەمی ژیانی خۆی وتووە.

١

لە ستایشێکیدا بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی دەڵێ:

سەرداری ئەولیای جیهان پێشەوایە غەوس
بۆ گومبووانی ڕاهی هودا ڕەهنومایە غەوس
شابازی عەرشی حەزرەتی زاتی ئیلاهییە
یەعنی بەجوملە سرری خودا ئاشنایە غەوس

پشت و پەناهی بێکەس و داماوی عالەمە
پەیوەستە دەستگیری هەژار و گەدایە غەوس
مردووی زیندوو کردەوە وەک حەزرەتی مەسیح
واقیف بەسرری بارەگەهی کیبرییایە غەوس
کەنناسی بەردەری ئەوە شاهانی ڕووی جیهان
بۆ ژانی دیدە خاکی دەری تووتیایە غەوس

ئەم شیعرەی کەمالی دەکرێ بخرێتە خانەی شیعری ئایینیشەوە. لێرەدا ئەوە ڕوون و ئاشکرایە شاعیر دەروێشیزمی تێکەڵ بەشەریعەت کردووە، نەک تەنیا تێکەڵ کردن بەڵکو تەریقەتی لە ناو شەریعەت تواندۆتەوە، شێخ عەبدولقادری گەیلانی وەکو دەروێشێک گەیاندۆتە پلەی پێغەمبەری و لەگەڵ عیسای مەسیح بەراووردی کردووە. لەوە دڵنیایە خودا ئەو بەهرە و توانا میتافیزیکییەی داویەتییە پێغەمبەران بەشی شێخ عەبدولقادریشی تێدا بووە. گومان لەوەدا نییە ڕێزگرتنی شێخ عەبدولقادر هەندێکی لەبەرئەوەیە بنەماڵەی شێخ مەحموود لەسەر تەریقەتی قادری شێخی گەیلانین.

٢

لە شیعرێکیدا کەمالی ستایشی بێخودی کردووە:

بەدوورم تێمەگە قەلبەن موقیمی خاکی دەرگاتم
بەوێنەی قۆچی قوربانی بەلاّ گەردانی بالاّتم
بەیادی تاقی ئەبرۆی تۆیە گەر وا ڕوو لە میحرابم
لە شەوقی چاوی مەستی تۆیە دەربانی خەراباتم
لە مەحشەردا بەمەستی دەرئەهێنم سەر لە خاکی گۆڕ
وەها مەستی نیگاهی نێرگسی مەخمووری شەهلاتم
لە من هەرگیز مەکە قوربان تەڵەب ئادابی هۆش و فام
چەل و مل بەندەیێکی زەڕ خەریدەی بێ سەر و پاتم
چ نەزدیکی و چ دووری بەندەیی نابێ لە دڵ زائیل
بەدوورم تێمەگە قەلبەن موقیمی خاکی دەرگاتم

شاعیر ئەم پارچە لیریکەی لە ساڵی ١٩٢٠دا نووسیوە. نامەیێکە بۆ بێخودی ناردووە.



لە پێداهەڵدان و ستایشکردنیدا دەیگەیەنێتە یار و یاوەرێکی گیانیان لە ناو دڵداریی حەقیقی توابێتەوە، وەکو مریدێکی تەریقەت تەماشای بێخود دەکا و بەشێخ و ڕێبەری خۆی دەیژمێرێ.

بێخود بەشیعرێکی دە دێڕی وەرامی کەمالی دەداتەوە، لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

لە کونجی خەڵوەتی غەمدا کە مەشغوولی ڕیازاتم
شەو و ڕۆژ حەسری فیکری پەرچەم و ڕووی تۆیە ئەوقاتم

لە کۆتاییدا دەڵێ:

بەشێخ نووری بفەرموو چاوەکانت ماچ ئەکا (بێخود)
بەیادی خانەیی خەمماری ئەو مەستانە وا هاتم

مەبەسی بێخود لە شێخ نووری، شێخ نووری شێخ ساڵحی شاعیرە.

**شیوەن**

لە دیوانی کەمالی شیعری ماتەمنامە کەمە. یەکێ لە شیعرە جوانەکانی ئەو موستەزادەیە کە بۆ کۆچی دوایی شێخ مەحموود هۆنیویەتییەوە:

ئەمساڵ لەپڕ هات ڕەشەبای خەزان        لە بەدبەختی من
هەڵیکەند ڕیشەی گوڵی کوردستان        لە بێخ و لە بن
کام گوڵ ئەو گوڵەی ئەحمەدی کاکی        قوتبی ڕەببانی
ناشتی و ئاوی دا بەدەستی پاکی        بۆ کامەرانی
سەربەست بوو دلێر ڕەشید و لاوچاک        واریع و بەدین
لە ڕۆژی جەنگا مانەندی ڕۆستەم        لە جەرگەی مەیدان
داخت بەجەرگی هەموو کوردا نا        کاتێ کۆچت کرد
شین و واوەیلا بەجاری هەڵسا        لە ناو گەلی کورد

ئەم شیوەنە سۆزی قووڵ و فرمێسکی گەرمی تێدا نییە، بەزۆری مانا و وێنە ڕێزکردنە، لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر توانیویەتی هەناسەیێکی هونەروەرانە بداتە شیعرەکە، بەهۆی ئەوەی شاعیر دوو بابەتە کێشی سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە، بەمە لە ڕووی مۆسیقییەوە توانیویەتی سەرنجی خوێنەر ڕابکێشێ. ماتەمنامەکە لە سەردوولکەیێک و لاواندنەوەیێکی شیعری میللی سەرزاری کوردی (فۆلکلۆری) دەکا.

کەمالی لەم بابەتە شیعرەی هەیە لە ڕووی ناوەرۆکەوە ئەدگاری بەرزی داهێنانی جوانکاری پێوە دیار نییە، کەچی لە ڕووی ڕوخسارەوە هەندێ لە مانا و وێنە کۆنەکانی شیعری کلاسیکی خستۆتە قالبێکەوە وەک شیعرێکی بەرز دەکەوێتە بەرگوێ.

١

ژیان بەلای کەمالییەوە هیچ و پووچە:

ژیان هیچە هەمووی دەردی سەری و ئەندووهی سەودایە
ئەگەر ئیسراحەت و خۆشیت ئەوێ ئەی کاکە لەولایە
نەخۆی تەفرە بەوەعدەی هیچ و پووچی تۆ دەخیلت بم
نیهایەت ئەتکوژێ ئەم پیرەزاڵەی ناوی دنیایە
کەمێک ترسی خودات بێ چاوەکەم با پێت نەڵێن خەڵکی
کە ئەو مەحبووبە بێ دینە لەسەر ئایینی تەرسایە
دڵم مەشکێنە نەک بازاڕی جوانیت یەک کەڕەت بشکێ
بەچاوی سووکی مەنوارێ کە جێی نووری تەجەللایە
ئەبینم هەرکەسێ ڕووی وا لە قاپی گەورەیێک ئەمڕۆ
(کەمالی)ش ڕووی دڵی دائیم لە قاپی غەوسی بەغدایە

بەکەم زانینی ژیانی سەر ڕووی زەوی بابەتێک نییە کەمالی یەکەم کەس بێ باسی لێوە کردبێ، بەڵکو ئەمە ناوەرۆکێکی گرنگە لە شیعری نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، لە ژیانێکی پڕ لە ئەشکەنجە و نائومێدی هەڵقوڵاوە و بووە بەهۆی دروستبوونی گرێی سایکۆلۆجی و ڕەشبینی لە ناو دڵ و دەروونی خەڵکیدا. شاعیر هەر لەو شیعرەدا ڕەشبینی وەردەگێڕێتە سەر گەشبینی، بۆ ئەمە گەورەیێک دەستنیشان دەکا هەموو کارێکی پێ دەکرێ، ئەو گەورەیە شێخ عەبدولقادری گەیلانییە شاعیر غولامی بەردەرگای تەکیەی ئەوە لە بەغدا.



٢

کەمالی بەراوورد لە نێوان لاوێک و پیرێکدا دەکا و دەڵێ:

لاوێک پیرێکی پشت کۆماوەی دی
وورد وورد ئەگەڕا لاوەکە پرسی
چیت لێ وون بووە تۆ خوا مامەگیان!
جوابی دایەوە پیری قسەزان
ووتی چاوەکەم بۆچی نازانی
وونم کردووە تەمەنی جوانی!

لەم بڕە شیعرەدا کەمالی تابلۆیێکی ڕەنگینی داهێنراوی لە وشە دروست کردووە. هونەر لێرەدا کێش و قافیە و ڕیتم نییە، بەڵکو مانایە. هەتا ئەگەر بەزمانێکی ساکاری کاروباری ڕۆژانەش بووترێ: لاوێک پیرەمێردێکی پەشووکاو دەبینێ، لێی دەپرسی، چیت لێ قەوماوە؟ چیت لێ ون بووە؟ دەڵێ تەمەنی لاویەتی.

٣

شاعیر لە خوو و ڕەوشتی جیای خەڵکی ئەم زەوییە دەدوێ:

بەزمی دنیا سەیرە هێندێ کونجی مەیخانەی ئەوێ
ساقیی و جامی شەرابی ناب و پەیمانەی ئەوێ
ووشکەسۆفیش بۆ حیسابی بەینی خوا و خۆی دائیمە
وا لە مزگەوتایە هەر تەزبیحی سەد دانەی ئەوێ
هێندێ دەروێشە بەهایوو هووی لە تەکیە و خانەقا
لوولک و تەپڵ و دەف و پرچ و خەنە و شانەی ئەوێ
هێندێ وەک مەجنوون لە پای هەردەی دوجەیلا شێت و وێڵ
هاودەمی وەحشی و ڕەفیقی شێت و دێوانەی ئەوێ
هێندێ خاوەندی دووسەد دێ و قەیسەری و باغە کەچی
هەر دڵی پڕ داخە تەخت و تاجی شاهانەی ئەوێ
هێندێ نانێک و قومێ دۆی بێ ئەکا شوکری خودا
قانیعە و ڕازی ژیانێکی هەژارانەی ئەوێ

عەینی هەروەک سینەمایە بەزمی دنیا چاوەکەم
سەرسەری سەیری نەکەی بیری حەکیمانەی ئەوێ
کەم کەسێ پەیدا ئەبێ مەقسوودی خوایی و هیچی تر
سەیری هەرکەس من ئەکەم هەر دەرهەم و عانەی ئەوێ

شاعیر جیاوازی خوو و ڕەوشتی خەڵکی بەگیروگرفت دەژمێرێ، وەسفی ئەو جیاوازییە دەکا. یەکێ سەرخۆشە، یەکێکی دیکە نوێژکەرە، هەندێ دەروێش و هایووهوو. کەسانێکی دیکەی شێت و دڵدارن. هەندێ دەوڵەمەند و هی دیکە شاهەنشا و سوڵتانن. کەسانێک بەنان و دۆ و هەژاری دەژین. شاعیر ئەم دیاردە جیاواز و پێچەوانەی یەکترییانە بەپەردەی سینەما دەچوێنێ کە دیمەنەکانی جۆراجۆر و پێچەوانەی یەکترین. شاعیر دیاردەیێکی کۆمەڵایەتی لە قاڵبی شیعرێکی جوان تۆمار دەکا.

٤

لە شیعرێکیدا بەشێوازێکی ئامۆژگاری کەمالی دەڵێ:

نانی ڕەنجی شان ئەخۆم وەک تۆ هەوای جاهم نییە
ترسی عەزل و خۆف و بیمی حەزرەتی شاهم نییە
بۆ فەلەک ناکەم تەنەززول چونکە زۆر دوون پەروەرە
ئیحتیاجی شەوقی ڕۆژ و پرتەوی ماهم نییە
دەست درێژم گەه لە بەغدا گەه لە تارانا ئەژیم
حوڕڕ و ئازادم دەسی بەسرا وو کۆتاهم نییە
بەسمە من ئۆباڵی مەزڵوومان نەچێتە گەردنم
تاقەتی باری حوقووق و ئاگری ئاهم نییە
خۆ یەزید نیم تاکو ببمە دوژمنی ئالی عەلی
شێت نەبووم تابی عەزابی زاتی ئەڵڵاهم نییە
من سەگی قاپی ڕەسوولولڵاه و ئەولادی عەلیم
بەندەیی زارم خەیاڵی ڕوتبە وو جاهم نییە
نەکەم گەر مەدحی ئەو زاتەی کە فەخری جین و ئینسانە
مەڵێن خەڵکە (کەمالی) کافر و بێ دین و ئیمانە



گونەهکارم دەمم پیسە ئەگەر ناوی نەبەم حەقمە
چ مەدحێکی بکەم! خۆ مەدحی ئەو ئایاتی قورئانە

لەم شیعرەدا کەمالی لە لووت بەرزی خۆی دەدوێ، نایەوێ گەورە بێ، چونکە وا زان دەکا ئەگەر گەورە بێ لە کار دەکەوێ. دەیەوێ سەربەست بژی. کوێی پێ خۆشە لەوێ زیندەگانی بکا. نایەوێ ئۆباڵی خەڵکی چەوساوە بکەوێتە ئەستۆی. حەز ناکا بەیەزید بێ بۆ ئەوەی ببێتە دوژمنی نەوەی عەلی. ئەم بیروباوەڕانە لە دەستووری ئایینەکان و ژیانی کۆمەڵانی خەڵکی سەر ڕووی ئەم زەوییە بەدرێژایی ڕۆژگار دروستبوون. ڕەنگە هەموو کەسێک بەبێ سڵەمینەوە ئەم ئامۆژگارییانە قوبووڵ بکا، بەڵام هەموو کەسێک نایخاتە پراکتیکەوە.

## کوردایەتی و سیاسەت

دیوانی کەمالی شیعرێکی زۆر لەبارەی بیروباوەڕی کوردایەتی و سیاسەت دەور دەکاتەوە.

١

کەمالی شیعرێکی بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی میللی شێخ عەبدولقادری کوردستانی باکوور وتووە:

فیدات بم ئەی فیدایی میللەت ئەی سەرداری کوردستان
وەلی عەهدی هومایوون تالعی خونکاری کوردستان
بەئەنفاسی مەسیح ئاسا عیلاجی عاجلیت بەخشی
بەدایەی بێکەسی بێچارەیی بیماری کوردستان
وەکو بارانی ڕەحمەت لوتفی عامت فەیز بەخشایە
بژی ئەی واسیتەی نەشئونەمای گوڵزاری کوردستان
بە زەرکفتی تەلا ناوت لەمەولا دەرج ئەبێ تا حەشر
لە تەئریخا بەعینوانی سوپاسالاری کوردستان
ئەگەر بیشمکوژن زومرەی موخالیف پێت ئەڵێم ئەمجا
هیزەبری غالیب ئیبنی حەیدەری کەرڕاری کوردستان
ئەوەی بەدخواهتە با قوڕ بەسەردا کا بەنەومیدی
ووجوودی تۆبە فەخری فیرقەیی ئەحراری کوردستان

دەخیلم فرسەتە هەنگامی سەعی و جوهدە تێکۆشە
بەدڵ بۆ ئینتیزامی موڵک و بۆ ئیعماری کوردستان

شێخ عەبدولقادری شەمزینی نیشانێکی مانگ و ئەستێرەی لە زێڕ دروست کردبوو و لەسەر مانگەکە ڕستەی «فیدای میللەت» نووسرا بوو و وەک بازیبەند لە قۆڵی بەستبوو. بەم هۆیەوە کەمالی ئەم شیعرەی بۆ هۆنیوەتەوە. شیعرەکە مژدەی ڕۆژی خۆشی و گوشادی پێوەیە، بەوەی قارەمانێکی وەکو شێخ عەبدولقادر بەناوی مافی کوردەوە لە خەباتدا بووە لە پێناوی سەربەستیی کوردستان. بەلای شاعیرەوە ئەم شۆڕشگێڕە شایانی ئەوە بوو سەرداری میللەت بێ.

٢

کەمالی شانازی بەوەوە دەکا کە کوردە:

من فەخر ئەکەم کە کوردم و کوردی زمانمە
ئەم شاخ و کێوە دڵکەشە وا نیشتمانمە
ئەم خاکە پاکە جێگەمە کە هەر زەڕڕەیێکی ئەو
خاڵ و برۆ و سەری شەهی زەند و بەبانمە
ئەم خاکە تووتیا سیفەتە پاکەیە کەوا
دەرمانی چاوی پڕ گڵ و پڕ دەرد و ژانمە
من فەخر ئەکەم کە شاعیر و ڕەند و قەڵەندەرم
شیعرەکە تاج و نەجمە وو ڕوتبە وو نیشانمە
ئوستادی شیعرم و نییە ترسم لە ڕەخنەگر
با بێتە ڕوو ئەوەی بەتەمای ئیمتیحانمە
شیعرم ڕەوان و ڕاستە وەکو بەژنی دلبەرم
ئەو دلبەرەی کە ڕووح و دڵ و جەرگ و گیانمە
ئەو دلبەرەی کە نیوە نیگای چاوی ساحیری
مایەی حەیات و خۆشی و شادیی ژیانمە
ئەو دلبەرەی کە لێوی بەمن ئەبەخشێ حەیات
کافر نەبم ئەڵێم ئەوە عیسایی زەمانمە



ئەو دلبەرەی کەوا دەمی گەوهەرفشانەکەی
نوقڵ و نەبات و شەکر و گوڵ خەندەرانمە
لادە (کەمالی) بێرەوە سەر باسی نیشتمان
ئەم نیشتمانەی دلبەری پڕ حوسن و ئانمە
ئەم نیشتمانە جوانەیە وا ووردە بەردی ئەو
یاقووت و دوڕ و گەوهەر و ئەڵماسی کانمە

شاعیر بەوە شادە کە کوردە و زمانی کوردییە، لە پاشانا بەوە باغە کە شاعیرێکی گەورەیە. ئینجا دەکەوێتە سەر وەسفی دلبەر چونکە ئەو سەرچاوەی ئیلهامی شیعریەتی. دەکەوێتە وەسفی جوانیی ئەو شۆخە. لە کۆتایی شیعرەکەدا هوشیار دەبێتەوە و بەخۆی دەڵێ پێویستە لە وەسفی خۆشەویست لابدا و بێتەوە سەر نیشتمان، چونکە جوانیی هەموو شتێک لەودا بەرجەستە بووە.

٣

لە دژی کردەوەکانی دەروێشیزم دەڵێ:

خەڵکی ئەمرۆ وا لەسەر ئەوجی فەلەک جەولان ئەکەن
هەر وەکو ماسی لە دەریادا سەفا و سەیران ئەکەن
نەگبەتی و بێ عەقڵی داوێن گیری ئەم کوردانەیە
بۆیە تازە حەز لە زەرگ و تەپڵ و دەف لێدان ئەکەن

ئەم پارچە شیعرە بەراووردێکە لە نێوان ژیانی خەڵکی پێشکەوتووی سەر ڕووی زەوی و ژیانی دواکەوتووی خەڵکی کورد ئەوەی خەریکی هایووهووی دەروێشی و زەرگ وەشاندنن. ئەگەر کردەوەی ئەم دەروێشییە وەکو دیاردەیێکی دواکەوتوو نەمێنێ کورد پێش دەکەوێ.

٤

بۆ شەهیدبوونی دوکتۆر فوئاد و شێخ سەعیدی پیران کەمالی دەڵێ:

ئێمە کورد و سەرچڵێن دائیم شەڕ و دەعوا ئەکەین
تا وەکو ئاخر نەفەس بەرزی وەتەن داوا ئەکەین
حوججەتی نامووس و ئیستیقلالی خۆمان سەیر کەن
وا بەخوێنی گەورە گەورەی کوردەکان ئیمزا ئەکەین

کەمالی لە ساڵی **١٩٢٥** ئەم چوارینەی بەهۆی لە سێدارەدانی دوکتۆر فوئاد و شێخ سەعیدی پیران وتووە. بێ گومان شەهیدەکان تەنیا ئەم دوو کەسە نەبوون، بەڵکو کۆمەڵێک لە نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕانی کوردی کوردستانی باکوور بوون.

**٥**

لە شیعرێکیدا کەمالی لەوە دڵنیایە کورد دەگاتە ئامانجی:

عاقیبەت تەئسیر ئەکا هاوار و ئۆف و ئاخی کورد
مەرهەم ئەکرێ زامی جەرگی پڕ برین و داخی کورد
بێشەیی شێری ژیانە و یانەیی بەبر و پڵنگ
چۆن ئەژی دوژمن لەسەر ئاسۆی بڵندی شاخی کورد
خوێنی گوڵڕەنگی شەهیدانە لە خاک هاتۆتە دەر
زەحمەتە بێگانە بۆنی کات گوڵاڵەی باغی کورد
دەستی قودرەت لووتی بەرزی وا گەیاندۆتە فەلەک
پێکی پۆڵا نانەوێنێ تا ئەبەد برناخی کورد
زۆر ئەترسم بەعزە بێ ئەقڵێ بڵێن پێم کافرە
گەر بڵێم من عەینی باغی جەننەتە ئێلاخی کورد
ڕۆستەمی مازەندەران شێری ژیان بەبری بەیان
ناگرن بەرگەی هوجوومی عەسکەری قازاخی کورد
کێ ئەڵێ کورد مردووە کورد نامرێ هەر زیندووە
مەرهەم ئەکرێ زامی جەرگی پڕ برین و داخی کورد

ئەگەر لە سەردەمی دانانی ئەم شیعرە وردببینەوە (تشرینی یەکەمی **١٩٦٩**) ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ لەو سەردەمەدا فەرماندەی شۆڕشی ئەیلوولی **١٩٦١** لە وتووێژدا بوو لەگەڵ دەسەڵاتی نێوەندی لە بەغدا بۆ بڕیاردان لەسەر دامەزراندنی کۆماری ئەفتۆنۆمی هەرێمی کوردستان. وابوو لە دوای ماوەیێک لە **١١**ی مارتی **١٩٧٠** بەیانێک بەم هۆیەوە دەرچوو. دیارە شاعیر هەواڵی ئەو وتووێژەی بەرگوێ کەوتووە و لەوە دڵنیا بووە کورد هەندێ لە مافی ڕەوای خۆی دەست دەکەوێ، بۆیە لەسەر ئەو باوەڕەیە کورد نەمردووە و هەر زیندووە.



**٦**

لە شیعرێکیدا کەمالی ئەوە دەردەبڕی ئومێدی زۆری بەکورد هەیە:

پیاوی زانا چۆن لە ڕەویەی قەومی خۆی حاشا دەکا
چۆن لە ئاداب و ئوسوولی ئەو گەلە ئیبا ئەکا
هەروەکو مەنسووڕ «انا الحق» گۆ بوو گەر بیشمکوژن
خوێنەکەم ئەتکێ بەکوردی دەردی خۆی ئینشا دەکا
کورد ئەوەند کوردن بە سەد شەیتان لە کوردی ناکەون
ئیکە خەڵکی بۆچی بۆ خۆی دەردی سەر پەیدا دەکا
باوکی ناناسێ خودا ئەیزانێ کێیە و کەی بووە
هەرکەسێ تەرکی زمانی خاسی مادەرزا ئەکا
هەرکەسێ هات و ووتی کورد مردووە باوەڕ مەکەن
شێتە بێ عەقڵە کەر و گایە قسەی بێ جا ئەکا

بەلای شاعیرەوە کوردبوون شایانی سەربەرزییە و هۆی سەرشۆڕی نییە. لە کاتی خۆیدا مەنسووڕی هەلاج لە قسەی خۆی نەهاتە خوارەوە، شاعیریش وەکو ئەو لە کوردییەتی پەشیمان نابێتەوە هەتا ئەگەر خوێنیشی بڕژێنرێ ئەو خوێنە دەبێ بەمەرەکەب و بەسەرهاتی کورد دەنووسێتەوە. ئەوەی کورد بەزیندوو دانەنێ شێت و بێ هۆشە.

**٧**

بەچوارینێکدا کەمالی جەژنە پیرۆزەی لە شێخ مەحموود کردووە:

جەژنی کەسێک موبارەکە سەربەست و حوڕ بژی
پابەندی دەستی غەیرە نەبێ چەشنی کوڕ بژی
کوردی هەژار ئەسیری دەستی غەیریت جەژنی چی
کەی جەژنی تۆیە بگری بڕۆ سەر بەقوڕ بژی

لە ساڵی **١٩٣٥** کە شێخ مەحموود دەستبەسەر دەبێ لە بەغدا کەمالی بەم چوارینە جەژنی لێ پیرۆز دەکا. بەڕاستی ناوەرۆکی ئەم پیرۆزباییە لەگەڵ هەڵسوکەوتی شێخ مەحموود ڕێک ناکەوێ. بۆیە شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە کەسی دیلی وەک شێخ مەحموود جەژنی نییە، لە ژیانی ئازادیدا جەژنە پیرۆزە لە پیاو دەکرێ نەک لە ژیانی دیلییەتیدا.

## ٨

دیسانەوە بۆ مەبەسی جەژنە پیرۆزە لە چوارینێکی دیکەیدا کەمالی دەڵێ:

سبەینێ جەژنی قوربانە بەئادابی موسوڵمانی
مەڕومالاّت ئەکەن ئیسلامەکان ئێستا بەقوربانی
بزانن خەڵکە بۆ پاراستنی خاکی بەنرخی کورد
بەقوربانی ئەکا وا ڕۆڵەکانی خۆی سلێمانی

کەمالی نەریتێکی ئیسلامەتی دەگێڕێتەوە بەوەی لە جەژنی قورباندا مەڕومالاّت دەکەن بەقوربانی، ئەمە بەناوی ئایینەوەیە، کەچی خەڵکی سلێمانی ڕۆڵەکانیان دەکەن بەقوربانی لە ڕێی پاراستنی خاکی نیشتمان. ئاوڕدانەوەییێکی هونەریی جوانە لە لایەن شاعیرەوە.

***

عەلی کوڕی باپیر ئاغای نازناو «کەمالی» شاعیرێکی بەدیمەنی قۆناغی گواستنەوەی ئەدەبی کوردییە، نزیکەی سەدەییێک ژیاوە. ئاگادارییێکی تەواوی لە ئەدەبی کلاسیکیدا بووە، هاوڕێی هەندێ لە شاعیرە نوێخوازەکان بووە. بەشداری لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا کردووە. لە شیعرە عەرووزییەکانیدا نوێنەری ڕاستی ئەدەبی کلاسیکی بوو، لە شیعرە کێشی خۆماڵییەکانیدا لە شیعری میللییەوە نزیک بوو. کەمالی نموونەی شیعری کلاسیکییە لە مێژووی ئەدەبی کوردی لە سەدەی بیستەمدا.

## بەشی دوازدەم

### ئەمین

### ١٨٨٩ - ١٩٥٤

### ژیانی

محەمەدئەمین کوڕی ئیبراهیم لە ساڵی ١٨٨٩ لە شاری شنۆ لە دایک بووە. لە پاشانا لە ناو خەڵکی بەمیرزا محەمەدئەمینی بەلەدی ناسراوە، نازناوی شیعری «ئەمین»ە، هەندێ جار «ئەمین شنۆیی»یشی بەکارهێناوە. باوکی دەستڕۆیشتوو و دەوڵەمەند بووە. بەمنداڵی مامۆستای تایبەتی بۆ ئەمین گرتووە، قۆناغە گرنگەکانی بەرنامەی خوێندنی حوجرەی مزگەوتی بڕیوە و بووە بەخوێندەوارێکی باش. لەگەڵ ئەوەی لە تەمەنی یازدە ساڵیدا بەناوەخت باوکی کوژراوە، بەڵام مامی گرتوویەتییە خۆی و لە خوێندن بەردەوام بووە. میراتی باوکی زۆر بووە، لەبەرئەوە لە سەرەتای ژیانیدا هەژاریی بەخۆیەوە نەدیوە. لە پاشانا کارەساتی دیکە ڕووی تێدەکا لە ماوەی جەنگی یەکەمی گێتیی سەدەی بیستەم لە شەڕی ڕووسەکان لە ڕواندز مامیشی دەکوژرێ، بێ کەسی بەخۆیەوە دەبینێ.

ئەمین چۆتەوە سەر ڕەوشتی باوکی، چاوتێر بووە، دەستی خەڵکی گرتووە، پیاوەتی لەگەڵ هاوڕێ و نزیکەکانی کردووە، بۆیە لە ساڵانی بەر لە کۆچی دوایی دەست کورتی بەخۆیەوە دیوە. لە ژیاندا ناخۆشی چەشتووە، لە دوای کوژرانی باوک و مامی سێ جار ژنی هێناوە، ژنی دووەمی گەلێ سەرێشەی بۆ ناوەتەوە، لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە زۆر کاری لێ کردووە، هەروەها یەکێ لە کچەکانی بەگەنجی سەری ناوەتەوە ئەمەشیان لە ژیانیدا دەردێکی دیکەی دەروونیی بووە تووشی هاتووە.

شاعیر شارەزای گیا و ڕووەک بووە ئەوەی بۆ داوودەرمان بەکارهێنراوە، لەگەڵ ئەجزاچییەتیدا دەستی پزیشکیشی بووە. وەک خوێندەوار و کەسێکی دیار لە ناو کۆمەڵدا ماوەیێک بەهەڵبژاردن بووە بەسەرۆکی شارەوانی شنۆیە، لەبەرئەوەیە محەمەد ئەمین بەلەدی لە ناو خەڵکیدا ناوی دەرکردووە. ماوەییێکی دیکەش کراوە بەمامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی لەو سەردەمانەی قوتابخانەی میری لە شارەکانی کوردستانی ئێران پەیدابوون. ساڵانی پێش مردنی لەگەڵ سێیەمین ژنی ژیانی بردۆتە سەر، ئەمەیان ئامۆزای



خۆی بووە. ئەمین لە ساڵی ١٩٥٤ لە شنۆ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی خەلیفە مەلا خدر لە شاری خۆی نێژراوە.

### شیعری

ئەمین شاعیرێکی خۆڕسک بووە، لە منداڵییەوە مەیلی بۆ شیعر هەبووە، زۆری خوێندۆتەوە. لە سەرەتادا شیعری بۆ خۆی وتووە، مەیلی بۆ گاڵتەوگەپ و داشۆرین و شیعری کراوە بووە، لە پاشانا کە لە گێتیی ئایینی ئیسلامی و تەریقەتی دەروێشی نزیک بۆتەوە لە شیعری پێشووی دوورکەوتۆتەوە، بەم جۆرە بووە بەیەکێ لە شاعیرە پسپۆڕەکانی شیعری ئایینی.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

ئەمین لە چوارچێوەی شیعری کلاسیکی عەرووزی نەچۆتە دەرەوە. بەزۆری بەحرەکانی هەزەج و ڕەمەلی بەکارهێناوە، هەندێ جار لە کەرتکردنی نیوە دێڕە شیعری عەرووزی کێشەکە بووە بەکێشی سیلابی خۆماڵی. لە قافیەدا هەردوو جۆرە قافیەی بەکارهێناوە. یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی).

هەندێ لە دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی کردووە بەقافیە: ا ب ت د ر ع غ ل م ن (ە - ـە) وو ۆ ی ێ. شاعیر بایەخی تەواوی بەپاش قافیە داوە، ئەم وشە و ڕستانە لە پاش قافیەیدا بەرچاو دەکەون: بکە، من، یا ڕەسووڵڵا، محەمەد، ڕۆیی، ئەلوەداع، بێ (ببێ)، ڕۆ، سووتا، بم (ببم)، با، ئەی فەلەک، هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ، دڵم، تۆم، نەکەم، چبکەم، لە من، تۆ، نەبوو، مەکە، بووە، چییە، نییە، بێ (ببێ).

بەرهەمی شیعری ئەمین بەزۆری لە لیریکی کورت پێکهاتووە، لە نێوان پێنج دێڕ تا دوازدە دێڕ. قەسیدەی کەمە، بەڵام پێنجینی زۆرە (ا ا ا ا ب) بەتایبەتی شیعرە ئایینییەکانی لەسەر قەسیدەی پێنجین هۆنیوەتەوە. زمانی شیعری ئەمین خۆش و ڕەنگینە، نموونەییێکی تازە و جوانە لە دیالێکتە بچووکەکەی زمانی کوردی شاری شنۆ و دەوروبەری پێکهاتووە. لەگەڵ ئەوەی دیالێکتی موکری بەسەر زمانیدا زاڵە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زمانەکەی تێکەڵاوە و ئەدگاری دیالێکتە بچووکەکانی دیکەش بەشیعرییەوە دیارە.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

لە بنجدا ئەمین شاعیری غەزەلی دڵدارییە، بەو دەستی پێ کردووە، لەبەرئەوە هەر لەو بابەتەشدا بەرز و باڵایە. شیعری ئایینی زۆرە. لە موناجاتی خودا و نەعتی پێغەمبەر و ستایش و پێداهەڵدانی شێخانی تەریقەتی دەروێشی. نزیکەی سی شیعری هۆنیوەتەوە لە ستایش و پێداهەڵدانی شێخانی تەریقەتی قادری، لەبەرئەوە شیعرێکی زۆری تەرخان کردووە بۆ سەرداری تەریقەتەکەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، ئینجا بەرەو خوار دەبێتەوە بۆ لای شێخ عەبدولقادری شەمزینی و سەید عەبدوڵڵای شەمزینی و سەید تەهای شەمزینی و هی دیکە. لە هەموو ڕوویێکەوە ئەمین بێ ئاگا نەبووە لە هەواڵی بنەماڵەی شێخانی شەمزینی (نەهری)، لە خۆشی و ناخۆشیدا لەگەڵیان بووە. کە شاعیر شینی بۆ شێخ عەبدولقادر گێڕاوە لە ساڵی (١٩٢٥) بەهۆی لە سێدارەدانی لە لایەن کەمالییەکانەوە، لە ڕووی ئایینی و دەروێشییەوە بۆ مەسەلەکە چووە، شاعیر وەک شێخێکی گەورەی تەریقەتی قادری تەماشای دەکا نەک وەکو شۆڕشگێڕ و خەباتگێڕێکی بزووتنەوەی کوردایەتی لە دوای جەنگی یەکەمی گێتیدا.

ئەمین لە شیعرە ئایینییەکانیدا وشە و ڕستەی بێگانە بەکار دێنێ، بەتایبەتی لە زمانی عەرەبی بەزۆری لە ئایەتی قورئان و حەدیثی پێغەمبەر وەریان دەگرێ. جگە لەوە لە شیعری دیکەیدا شاعیر زیاتر بایەخ بەوشەی کوردی دەدا، بەگشتی شیعری پاراو و ناسک و ڕەوانن.

شاعیر پێوەندی لەگەڵ هەندێ لە شاعیرانی دەوروبەری خۆی بووە، لەوانە شیعری ستایشی بۆ میرزا مرادی شاعیری هاوشاری خۆی و سافی هیرانی وتووە.

وەک لە سەرچاوەکاندا دەردەکەوێ ئەمین قەسیدەیێکی درێژی (پۆیێم) هەیە بەناوی «بەیتی عەبدولڕەحمان» تا ئێستا بەدەسنووسی ماوەتەوە و بڵاونەکراوەتەوە.

## مەولوودنامە

ئەم مەولوودنامەیەی ئەمین یەکێکە لە مەولوودنامە زۆرەکان بەزمانی کوردی، لە ڕووی هونەرییەوە سەرکەوتووە. لە بابەت ناوەڕۆکەوە جیاوازییێکی ئەوتۆی لەگەڵ مەولوودنامەکانی دیکەوە نییە، بەڵام لە بابەت ڕوخسارەوە بەڕاستی ئەمین هونەری نواندووە. بەرهەمەکەی بەپەخشان و شیعر نووسیوە، لە کاتی مەولوود خوێندندا وا دیارە



گۆینده بەپەخشان ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە، لە دوای هەر فەسڵێک گۆرانیبێژەکان شیعرەکە بەئاوازی دەف و تەپڵەوە دەچڕن. بەشی پەخشانەکەی مەولوودنامەکە شیعرئامێزە، یا پەخشانە شیعرە، یا وەکو بەعەرەبی پێی دەڵێن «سەجع»ە. ئەم مەولوودنامەیە لە ناوچەکانی شنۆ و ورمێ بەناوبانگە، تا ئێستاش لە ماڵی کورداندا سەرچاوەی خوێندنی ئاهەنگی هەموو مەولوودێکی پێغەمبەرە.

## نموونەی شیعری

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «غارەتگەری هۆش» ئەمین بەم جۆرە وەسفی دلبەری دەکا:

نەمدیوە وەکو تۆ کەسێ وا دلبەر و ڕەعنا
ڕوومەت گوڵ و موو سونبول و چاو نێرگسی شەهلا
خۆش ڕەنگ و قەشەنگ و بەنەزەر شەنگ و دەهەن تەنگ
سووڕەت قەمەر و لەب شەکەر و ئاوێنە سیما
نازک بەدەن و سیم تەن و سینە سپی و ساف
شیرین دەهەن و خۆش سوخەن و شۆخی دلارا
عەییار و دڵ ئازار و ستەمکار و جەفاکار
غارەتگەری هۆش و خیرەد و تاقەتی دلها
من سەیدی چ دامێکی نەبووم کەوتمە دامت
پابەندی بەزنجیری سەری زولفی سەمەن سا
بولبول وەرە تا مەردنێ هەر تێکڕا بناڵێن
تۆ بۆ گوڵ و من بۆ دەهەنی غونچەیی یەکتا
پەروانە وەرە تاکو دەگەڵ یەگدی بسووتێین
تۆ عاشقی شەمعیی و ئەمن عاشقی لەیلا
کەس قیمەتی ئەشعاری (ئەمین)ی لە شنۆیە
نازانی مەگەر شەخسێکی زۆر عارف و دانا

ئەمین وێنە ڕەوانبێژییە ئامادەکراوەکانی شاعیرانی پێش خۆی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام دیمەنێکی تازەیان پێ دەبەخشێ، کارەکەی وەکو ئەو پارچە مۆزاییکەیە لە کۆمەڵێک وردە

بەردی بەنرخی ڕەنگاوڕەنگ پێکهاتووە و بووە بەتابلۆیێکی داهێنراو، هونەروەرێکی دیکە لەو کۆمەڵە وردە بەردە تابلۆیێکی دیکە دروست دەکا و هەرچەندە لە هەندێ لایەنەوە لە ئەوەی پێشوو دەکا، بەڵام بە داهێنانێکی تازە دەژمێررێ.

## ٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «تەرسا» ئەمین بەم جۆرە موناجات لەگەڵ دلبەردا دەکا:

من فیدایی چاوەکانت هێندە گریانم مەکە
تۆ بەعیشقی زولفەکانت دڵ پەرێشانم مەکە
تیری موژگانت کەوا داناوە نێو ئەبرۆی کەمان
بەم خەدەنگ و بەم کەمانە تیرەبارانم مەکە
گەر وەکو تەرسا دەکەی تالانی عەقڵ و هۆشی من
تالیبی زینناره هەروەک شێخی سەنعانم مەکە
دڵ لە دەوری ڕوویی شەمعت شەو وەکو پەروانەیە
ئەی چراغی عاشقان وا قەسدی سووتانم مەکە
زەحمەتە دەردی جودایی جارێکی ڕەحمەت هەبێ
وا دووچاری داخی دووری دەردی هیجرانم مەکە
خۆ لە عیشقی زولفی یار و چاهی غەبغەب ئەی (ئەمین)
بێ قوسوورم موستەحەققی بەند و زیندانم مەکە

لەم شیعرەدا ئەمین هەوڵ دەدا وەکو سۆفییێک خۆی بێنێتە ڕیزی شێخ سەنعان، بەم پێیە شیعرەکەشی بێنێتە ڕیزی ئەو شیعرەی دەچنە ناو خانەی داهێنانی سۆفیزمی کوزمۆسییەوە. تەرسا کچە مەسیحییەکەیە کە بۆ شێخی سەنعان کردگار بوو چووبووە ناو لەشی ئەو کچەوە. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو جوانییەی شاعیر لەم پارچە شیعرەدا دەری دەبڕێ، سۆزی گەرمی دڵداریی ئاسمانی لە شیعرەکەدا بەدی ناکرێ، هەر لەبەرئەوەشە ئەمین لەو دلبەرە دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی وەکو شێخی سەنعانی لێ نەکا، چونکە ئەوەی ئەو شێخە بۆی دەکرا ئەم شاعیرە بۆی ناکرێ.



## ٣

لە موناجاتێکی دیکەدا لەگەڵ دلبەر ئەمین دەڵێ:

من خەرابی دەردی عیشقی فیرقەتی دیداری تۆم
دڵ کەبابی داغ و هیجری ئاهی ئاتەشباری تۆم
هەرکە مردم با بزانن جوملە عالەم خاس و عام
کوشتەیی تیری نیگاهی دیدەیی خوێنباری تۆم
با لە کێلی من بنووسن نەخشی دوو ئەبرۆت بەخوێن
تا بزانن من شەهیدی تیغی سەیقەلکاری تۆم
عاشقی ڕوویی گوڵم دایم دەناڵم هەر سەحەر
عەندەلیبی باغی حوسنی گوڵشەنی ڕوخساری تۆم
گەر حەکیم نەیگوت عیلاجی عیللەتی جەرگی (ئەمین)
من دەڵێم ڕەنجووری عیشقی نێرگسی بیماری تۆم

ئەمەش موناجاتێکی دیکەیە لەگەڵ دلبەر، ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ لەم شیعرە و لە شیعرەکانی دیکەی شاعیر لە بارەی وەسف و دڵدارییەوە هەموویان لە غەزەلی دڵداری دەکەن، لەگەڵ کچێک قسە دەکرێ، وەسفی ئەندامی جوانی ژنێک دەکرێ، کەچی شاعیر مەبەسی ئەوە نییە، بەڵکو پێچەوانەی ئەوە، خۆی بەعاشقی حەقیقی دەزانێ، ئەو سیفەتانەی بۆ جوانیی ژن دەردەبڕێ مەبەسی جوانیی شێخی تەریقەتی دەروێشییە، لەبەرئەوەیە دلبەری شاعیر ژنێکی دیاریکراو نییە.

## ٤

لە قەسیدەیێکی پێنجینی بەناوی «شەیدایی گوڵ» دەڵێ:

ئیمرۆکە لە هیجرانی تۆ بیمارە دڵی من
شێواو و پەرێشان و بریندارە دڵی من
دائیم وەکو نەی خەسڵەتی هاوارە دڵی من
موشتاقی مولاقاتی ڕوخی یارە دڵی من
وەڵڵاهی بەعیشقی تۆ گرفتارە دڵی من
وا تێمەگە گەر هەیکەلی من زاهیری ساغە
وەک لالە دەروونم هەموو لەو هیجری تۆ داغە

پەروانە سیفەت مەقسەدی من ڕوویی چراغە
وەک بولبولێ هەر حەسرەتی من دیتنی باغە
شەیدایی گوڵ و تالیبی دیدارە دڵی من
گیانە وەرە ڕوحمێ بکە بەو ئەمنی حەزینە
جەرگم لە فیراقی تۆ هەمووی کۆنە برینە
لێوت بەمەسەل شەکرە وەیا قەندی شیرینە
ئەو مەڵحەمە بۆ دەرد و دەوای گیانی (ئەمین)ە
موشتاقی ڕوخی دلبەرە دووبارە دڵی من

ئەم لیریکەی ئەمین شیعرێکی دیکەیە لە یەکەم خوێندنەوەیدا شیعرە بەناوبانگەکەی بێخود دێنێتەوە یاد «لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دڵی من...» هەندێ لە شاعیرانی کورد لەسەر کێش و قافیەی بێخود لاساییان کردۆتەوە، لە ڕوخساردا هەموو ئەو شیعرانە لە یەکتری دەکەن، کەچی لە ناوەرۆکدا جیاوازن، ئەوەی بێخود شیوەن و ماتەمنامەیە، شیعری ئەوانی دیکە زۆربەیان لە بابەت وەسف و دڵداری و دووری دلبەر و ئاوارەیی شاعیرەکان خۆیانەوەیە.

### ٥

لە شیعرێکیدا ئەمین خەریکی گەمەییێکی ڕەوانبێژییە:

لە ئەم دنیایی فانیدا هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ
لە ناو مەستی جوانیدا هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ
تەماشا باب و باپیران ئەگەر بوڕناو ئەگەر پیرن
دەخاکێ دا چ یەخسیرن هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ
تەماشا موونیس و یاران دە قەبرێ دا گرفتارن
هەموو خەستە و بریندارن هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ
ئەگەر شێخی ئەگەر عالیم ئەگەر مەعلوولی گەر سالیم
دە ئاخری دەمری ئەی زاڵم هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ
بەسەد تەدبیر و سەد ڕایێ عیلاجی مردنێ نابێ
دەبێ کۆچ کەی لە دنیایێ هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ



تەنی وا نازکت دەرزی دەژێر خاکی سەری ئەرزی
لە ترسان بۆچی نالەرزی هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ
(ئەمین) جارێ بکە تۆبە لە خورد و نووستن و خەو بە
لە بۆ تۆش دێتن ئەو نۆبە هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ

ئەمین ئەم شیعرەی لەسەر بەحری عەرووز داناوە، هەر دێڕێکی کردووە بەچوار نیوە دێڕ، واتە هەر نیوە دێڕی لەت کردووە و بووە بەدوو پارچە. بەم پێیە هەر دێڕێک دەبێ بەچوارینێکی هەشت بڕگەیی بەکێشی سیلابی خۆماڵی. هەموو دێڕە شیعرەکان بەم جۆرە خۆیان دەنوێنن:

لە ئەم دنیایی فانی دا
هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ
لە ناو مەستی جوانی دا
هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ

***

تەماشا باب و باپیران
ئەگەر بوڕناو ئەگەر پیرن
دەخاکێ دا چ یەخسیرن
هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ

***

تەماشای موونیس و یاران
دەقەبرێ دا گرفتارن
هەموو خەستە و بریندارن
هەتاکەی ئەی دڵی غافڵ...

لێرەدا وەک دیارە ڕستەی «هەتا کەی ئەی دڵی غافڵ» کە لە هەشت بڕگە پێکهاتووە دەبێتە نیوە دێڕی دوایی هەموو چوارینەکان، ئەوەی لە بنجدا پاش قافیەی لیریکەکەیە. بەم خوێندنەوە تازەیە ئاوازێکی ڕەوان دەکەوێتە بەرگوێی خوێنەر.

لە شیعرێکیدا بەم ڕەنگە ئەمین فرمێسکی دەڕێژێ بەهۆی جوانەمەرگبوونی «نازدار»ی کچی:

لە پاشی ڕوویی مەحبووبان لە دنیا گوڵ نەمێنێ با
لە پاشی ڕووی گوڵان بولبول لە باغاندا نەخوێنێ با
گوڵی ڕووی نەوجەوانان وەک لە ژێر خاکی زەمین وون بوو
دەنا ڕوویی گوڵ و سونبول بەهاران کەس نەبینێ با
وەکو بادی ئەجەل غونچەی منی ئەوڕۆکە فانی کرد
بڵێین با باغەوان چیدی لە باغان گوڵ نەچێنێ با
چەمەن وا مانەوە بێ گوڵ هەزار ئەفسووس و سەد حەسرەت
بڵێ با غونچە گوڵ چیدی لە پەردە خۆی نەژینێ با
جەوان و نازەنینی من لە دنیایێ وەداعی کرد
لە پاشی وی (ئەمین) یارەب لە دنیایێ نەمێنێ با

نازەنینی کچی ئەمین بەگەنجیەتی جوانەمەرگ بووە. لە گوڵ جوانتری نەدۆزیوەتەوە بیکا بەڕەمز بۆ کچە خۆشەویستەکەی. نازەنینی کردووە بەشاگوڵ. مەملەکەتی گوڵستان ئەگەر شای نەمێنێ بەهاری وێران دەبێ. لەم ماتەمنامەیەدا شاعیر وێنەی نوێی داهێنراوی هونەری دۆزیوەتەوە. لە ڕووی قافیەوە وەستایی نواندووە. قافیە و پاش قافیەی قورسی هەڵبژاردووە، هونەرەکەی لەوەدایە ڕەوانییێکی داوەتە ئەو قافیە قورسە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە.

***

محەمەدئەمین شنۆیی شاعیرێکە شیعری کەمە، بەرهەمی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە دەوروبەری چەند بابەتێکی دیاریکراو دەسوورێتەوە وەکو شیعری ئایینی ستایش و پێداهەڵدانی ڕەمزەکانی ئایینی ئیسلام و شێخانی تەریقەتی دەروێشی. ستایشی دۆست و برادەرانی کردووە. لە کێشدا بەحری عەرووز و یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی) بەکارهێناوە. لە شیعری وەسف و دڵدارییدا باڵایە. داهێنانی هونەریی جوانی هەیە.

# بەشی سێزدەم

## ڕەحمی هەکاری

## ١٨٩٠ - ١٩٥٨

### ژیانی

عەبدولڕەحیم کوڕی سەید محەمەد پرتە لە ساڵی ١٨٩٠ لە ئاوایی ئەلباک لە دایک بووە. لە پێشانا ناوی باشقەڵا بووە، قەزاییێکە لە ناوچەی وان. عەبدولڕەحیم کە بەتەمەن گەورە بووە بەناوی عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری ناوبانگی دەرکردووە، لە نێوەندی ئەدەبی و ڕۆشنبیریدا بەناوی ڕەحمی هەکاری ناسراوە.

خوێندنی سەرەتایی لە ئەلباک بووە، لە دواییدا لە شاری وان خوێندنی ناوەندی تەواو کردووە. لەو شارەدا لە خانەی مامۆستایان کۆتایی بەخوێندن هێناوە، ئینجا ڕووی کردۆتە ئەنقەرە و ئامۆژگای دارایی تەواو کردووە، لە پاشانا چووە بۆ ئەستەموڵ لە کۆلێجی ئیلاهییات کۆتایی بەخوێندنی هێناوە.

لە ١٩٠٨ەوە تا ساڵی ١٩٢٣ لە بزووتنەوەی کوردایەتی بەشداری کردووە، لە کۆمەڵەی هیڤی ئەندامێکی بەکار بووە. لە ساڵی ١٩١٥ یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی قوتابیانی کورد لە ئەستەموڵ. لە ساڵی ١٩١٨ بەهاریکاری نیشتمانپەروەری دیکە «کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان»یان دامەزراندووە. دۆستایەتی لەگەڵ ڕۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمە بووە، وەک پیرەمێرد، خەلیل خەیالی، هەمزە مۆکسی، مەمدووح سەلیم، کەمال فەوزی، محەمەد شەفیق ئەرواسی. لە کۆواری «ژین»ی ئەستەموڵ نووسینی هەیە (شیعر و پەخشان).

کە لایەنگرانی مستەفا کەمال ئەتاتورک دەسەڵاتیان گرتە دەستی خۆیان و سیاسەتی قەڵاچۆیان (تیرۆریان) بەرامبەر بەکورد بەکارهێنا ڕەحمی وازی لە کوردایەتی هێنا و ڕووی کردە ئایین و هۆگری بوو. تا دوایی ژیانی ڕۆژگاری بۆ ئەم مەبەسە بردە سەر. لە جەنگی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لە شەڕەکانی نێوان عوسمانی و ڕووس ڕەحمی لایەنی عوسمانییان بووە لە دژی ڕووس. لەو شەڕانەدا زانای ئایینی سەعید نەورەسی کوردی لەگەڵدا بووە. لە شەڕێکدا هەردووکیان بریندارکراون و بەدیل گیراون و ماوەیێکی زۆریان



لە بەندیخانەکانی ناوچەی ڤۆلگا لە ڕووسیا بردۆتە سەر، لە پاشانا گەڕاونەتەوە مەڵبەندی خۆیان.

ڕەحمی لە ساڵی ١٩٥٧ بەناوی زانایێکی ئایینی کورد بەشداری لە کۆنگرەی ئیسلامی کردووە لە پاکستان. لە پاش ماوەیێکی کەم لە ساڵی ١٩٥٨ لە ئەستەموڵ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی نەجاتی بەگ بەخاک سپێرراوە.

### بەرهەمی ئەدەبی

ڕەحمی یەکێک بوو لە ڕۆشنبیرە نیشتمانپەروەرەکانی کوردی عوسمانی. خوێندەوارییێکی بەرزی هەبوو لە ئایینی ئیسلامیدا. نیوەی یەکەمی ژیانی بریتی بوو لە جموجۆڵی ڕۆشنبیری و سیاسی لە پێناوی مەسەلەی ڕزگاری نەتەوەیی کورد. لەم ماوەیەدا کۆمەڵێک بەرهەمی ئەدەبی لە شیعر و پەخشان هێنایە ناو خوێندەواری کوردییەوە. لە نیوەی دووەمی تەمەنیدا لە پاش دروستبوونی کۆماری تورکیای تازە وازی لە سیاسەت هێنا و دەستی کرد بەنووسین و دانانی کتێب بەزمانی تورکی لە بابەت ئایینی ئیسلامەوە. لەم ماوەیەدا باس لە ڕەحمی دەکرێ وەکو شاعیر و نووسەرێکی کورد لە دەرگاییێکی فراوانەوە چۆتە ناو مێژووی ئەدەبی کوردییەوە.

### شیعری ڕەحمی

شیعری ڕەحمی بەگشتی میللی ئامێزە، کێشی سیلابی خۆماڵی و جووت قافیەی (مەسنەوی) بەکارهێناوە. لە بابەتی لیریکە، زمانی ئاسانە، بۆ ئەو سەردەمەی شیعری هۆنیوەتەوە لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی جۆرە نوێکردنەوەییێک بووە لە شیعری کوردیدا، چونکە تا ئەو سەردەمە بەحری عەرووزی لە شیعردا بەکار دەهێنرا، شیعری جووت قافیە کەم بەرچاو دەکەوت. لە ناوچەکانی کوردستانی باکوور لە دوای ڕەحمی بۆ ماوەیێکی زۆر تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم شاعیرانی کورد لاسایی ڕێبازی ڕەحمییان نەکردووە لە نوێکردنەوەی شیعردا.

ڕەحمی ئەگەرچی ئاسۆی شیعری لە ڕووی ناوەرۆکەوە فراوان نەبوو، بەڵام جۆرە شۆڕشێک بوو بەوەی هێز و توانای شاعیرییەتی بۆ مەبەسی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی بەکارهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا شیعری ئایینیشی زۆرە، لە هەندێ لەم جۆرە شیعرانەدا کوردایەتی دەکا و هێرش دەباتە سەر سیاسەتی شۆڤێنی مستەفا کەمال ئەتاتورک بەرامبەر بەکورد.

لە هەڵبژاردەی شیعریدا هەندێ نموونەی ڕەند دەکەونە بەرچاو.

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «سەر سال» لە وەسفی سروشتی بەهاردا دەڵێ:

مە کوردان عیدەکێ قالە
دلۆ شاد بە کو سەر سالە
د مێرگان سووسن و لالە
گولان وێ گریتنە ژالە
تەبیعەت سامیت و لالە
ژ خەملان رووح و جان والە
تەنێ دەنگەک ژ کو دنالە
عەجاییب بلبلە دکالە
نەکو بلبل دکەت ئەفغان
نەخێر ئەو نارەیە لاوان
سوارن جوملە سەر هەسپان
ژ بۆ ڕمبازیی و مەیدان
جریدە بکن وەکی شێران
کو ڕۆژا شادی یا کوردان
بزانن ساحبێت ئیزان
نە عیدە بەلکی سەر سالە

لەم شیعرەدا مەبەسی ڕەحمی لە «سەر سال» جەژنی نەورۆزە. هەموو سروشتی بەهاری بەگوڵ و گوڵاڵەوە هێناوەتە سەما، سوارێن و جریدبازی لاوانی وەک شێری بێشە هەموو سروشتی هێناوەتە لەرزین، کاتی جەژنی نەورۆزە، سەری ساڵی کوردانە.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «دەنگەک» باس لە کەساسی و شپرزەیی کوردان دەکا:

دەنگەک ژ خرابا وەتەنێ مە دکە گازی
دەنگێ چییە! ئەو کوندە وە یا تەیرەکی بازی



یا دەنگێ یەتیمان ل بەر باگەر و بەفران
ژ سەرمان لەرزن بێ جل و سول ماییـنە تازی
بێ خوارن و زادن هەمی برسینە و سەفیلن
ژینا خوە پەشیمان هەمی مرنەکێ رازی
پەز چوونە دەوار مرنە ل کوو مادە وو رێچال
گامێش مرنە گاسن چووتە نێر برازی
ناڤ ئاگرێ زولمێ هەمی سۆتن نوها بێ شوون
گەردوون ئەرەبە مالێ شەنە خوە لیەکی تازی
بەلکو خوەلی ژی باگەرە کێ ئانی بەلاڤ کر
داوا چییە! مەزنوون کییە! ما قەی هەیە قازی

لەم شیعرەدا دەنگێک لە جێیێکی نادیارەوە بۆ حاڵی کوردان دەلاوێنێتەوە. هەتیو لە سەرمانا دەلەرزن، برسی لە بێ هێزییانا دەگەوزن، مەڕوماڵات و وڵاغ لەناوچوون، لە ناو ئاگری زۆرداربیدا سووتان و شوێنەواریان نەماوە. بێ گومان قازیی دادپەروەر لەسەر ڕووی زەوی نەماوە لە یەکسانی بپێچێتەوە.

٣

لە بارەی نەخوێندەوارییەوە لە شیعری «نەزانین»دا دەڵێ:

ئەی جەهل و نەزانین! تویی دوژمن تویی خاین
زولما تەیە هێلان هەمی بێ سنعەت و بێ دین
قەهرا تەیە وێران کری ئاه وەتەنێ من
کینا تەیە بێلانە کری جیسم و تەنێ من
سەروەت تە ژ مە ستاندییە بێ ماڵ و دراڤن
ئەمماینە بەلەنگاز و فەقیر خانە بەلاڤن
دەردێ تەیە مەعلوول کری ئەم خوە نەزانن
ئەم کێنە! کوڕێ کێنە! ما ئێخسیر و گاڤانن
یان ئەم ژی خوەدان شان و نەسەب قەومێ نەجیبن
بەهرا مە هەیە ئەم ژ خودان بەهر و نەسیبن

دنیا وەکی چێکر خوەدێ بەهرا مە ژ دا بوو
لاکین ژ نەزانین و جەهل کانێ فیدا بوو

لەم شیعرەدا دیالۆجی ڕەحمی لەگەڵ نەزانینە. هەموو دواکەوتوویی کورد لە چاوی ئەوەوە دەزانێ. بەشێوازێکی هونەروەرییانە ئەو هەموو دواکەوتنەی بەرەو ڕووی نەزانین دەکاتەوە. ئەو ڕاستییە دەردەبڕێ کە کوردیش خاوەن بیر و هۆشە، خاوەنی مێژووی تایبەتی خۆیەتی، کە لە ژیانی ئاسایی بێ بەش بووە تاوانەکە دەخاتە ئەستۆی ئەو هەڵسوکەوتەی بووە بەهۆی ئەوەی خوێندەواری لە ناو کورداندا باو نەبێ.

٤

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «نالینا سێویکی» باس لە دزینی نیشتمانەکەی دەکا:

ئەز مامە سێوی بێ دا و بابم
خانی یێ من سۆتن ئەز ماڵ خرابم
بابێ من کوشتن بێ دین کوفاران
موحتاجم ئیرۆ دەستێ نەیاران
گورگێت دو پێ هاتن کەتن کەرییان
موهاجیرم ئەز وێ کەتمە دەرییان
نانەک دخوازم ژ بۆ قەژینێ
ڕەحمێ ب من ناکن ژ غەیری کینێ
ئینساف بکن ئەی ئەولادێ ئادەم
ئەز ژی مرۆڤم قەت خوە ب وە نادەم
وەختێ زەمان دا ئەز خانەدان بووم
جهێ خوەدا ئەز ساحیبقران بووم
ڕۆژێ دو سەد مێر من بوونە مێهڤان
دایم تژی بوون من دەرگەه دیوان
ژ گۆشت و برنجان سفرە دەرتێخست
مەمنوون و مورەففەه من ڕێ دێخست
ئیرۆ من عارە ئەز بەحس ژ وێ بکم
دنیا وە بووراند ئیرۆ پا چ بکم



بەناوی کوردەوە شاعیر ئەوە دەردەبڕێ دایک و باوکی کوژراون و هەتیو ماوەتەوە، خاکی دزراوە. ئەم هەموو کارەساتە لە ئەنجامی کار و کردەوەی گورگی دوو پێ بووە. مەبەسی کەمالییەکانن خەریکی لەناوبردنی هەموو شتێکن بۆنی کوردیان لێ بێ. شاعیر هانا دەبا بۆ هەموو ئادەمزادێک و تێیان دەگەیەنی کە ئەویش لەوانە، بەڵکو خۆی لەوانیش بەگەورەتر دەزانێ، مێژوو شایەتی ئەوەیە خانەدان بووە و جێگە و ڕێگەی خۆی هەبووە.

## پەخشانی ڕەحمی

جگە لە شیعر ڕەحمی کۆمەڵێک کورتە وتاری ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و سیاسی لە «ژین»دا بڵاوکردۆتەوە (ئەستەموول ١٩١٨ - ١٩١٩). ئەمانە نموونەییێکی جوانی ماوەی سەرهەڵدانی پەخشانی کوردی بوون لە دوا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم. هەندێ لەو وتارانە بەم ناوانەوە دەکەونە بەرچاو: «شەری تۆپان خلاس بوو ئیرۆ شەری قەلەمانە»، «حالێ مە یێ حازر»، «ئیتتیفاق»، «وەلات» و هی دیکە.

## پیەسی «مەمی ئالان»

دانانی ئەم پیەسە لە لایەن ڕەحمییەوە لە ساڵی ١٩١٩ داهێنانێکی گرنگ بوو لە ئەدەبی کوردیدا، تا ئێستا لە ڕووی پراکتیکەوە کەڵکی لێ وەرنەگیراوە، بەڵام وەکو بەرهەمێکی ئەدەبی مێژووی ئەدەبیی ڕەنگین کردووە.

لە ڕووی ڕوخسارەوە پیەسەکە لە دوو پەردە پێکهاتووە، قارەمانەکانی چوار کەسن: مەمی ئالان، لەوەندی هاوڕێی مەم و غولامی میری هەکاری، دایکی مەم ناوی چاڤرەشە، ژنی مەم ناوی غەزالەیە. لە پەردەی یەکەمدا تەنیا مەم و دایکی بەشداری دەکەن. لە پەردەی دووەمدا هەموو ئەکتەرەکان بەشدارن. نویشکی چیرۆکی پیەسەکە بەم جۆرەیە.

لە پەردەی یەکەمدا دوژمنی کورد دەگەنە سەر سنووری میرنشینی کورد کە عەمەر سەرداریەتی و دەیانەوێ داگیری بکەن. مەم لەگەڵ دایکی قسە دەکا و دەڵێ من لە جەنگاوەری دیکە کەمتر نیم، منیش کوردم، میری هەکاری فەرمانی شەڕی دەرکردووە، وەکو سوڵتان سەلاحەدین شیری لە کالانی دەرهێناوە و قودس دەپارێزێ، هەموو هەکاری خۆی ئامادە کردووە. لە دایکی دەپرسێ لەم شەڕەدا بەشداری بکا یا نا؛ دایک دەڵێ ئەگەر بەشداری بکا شیری حەڵاڵە.

مەم دەچێتە لای لەوەندی هاوڕێی و تێی دەگەیەنی کە دایکی ڕێگەی داوە بچێ بۆ مەیدانی جەنگ. لەوەندیش بڕیاری خۆی دەدا و بۆ ڕۆژی دوایی پێکەوە بچنە گۆڕەپانی شەڕ.

دایک لە خودا دەپاڕێتەوە کوڕی بپارێزێ. مەم خەریکی مۆنۆلۆجی ناوەوەی دەبێ، چۆن غەزالەی تازە بووک بەجێ بێڵێ! بەڵام بەلایەوە خۆشەویستیی نیشتمان لە هەموو شتێک بەهێزترە، بەتایبەتی غەزالەش حەز بەوە دەکا مەم لەو شەڕەدا بەشداری بکا. مەم و غەزالە دەست دەکەن بەگفتوگۆ. غەزالە فرمێسکی دەسڕێتەوە و بە مەم دەڵێ: بەبێ تۆ چی بکەم؟ مەم پێی دەڵێ: ژن لەگەڵ پیاودا بچێ بۆ جەنگ شەرمە، لەگەڵ دایکم بمێنەوە.

لە پەردەی دووەمدا چاڤرەش و غەزالە دەکەونە گفتوگۆ، ساڵێک تێپەڕ دەبێ هیچ هەواڵێک لە بابەت مەمەوە ناگاتە ماڵیان. خەڵکی لە ئۆردووگا هاتوونەتەوە دەڵێن مەم سەلامەتە. ئەو ڕۆژە چاڤرەش لە ماڵ دەچێتە دەرەوە. لەو کاتەدا میوانێک لە دەرگا دەدا، غەزالە نایناسێ، پێشوازیی گەرمی لێ دەکا. هەوڵ دەدا خواردەمەنی بۆ ئامادە بکا. تێی دەگەیەنی برسی نییە. میوان لە غەزالە دەپرسێ کچی ئەو ماڵەیە یا بووکیانە! غەزالە تووڕە دەبێ، سەرزەنشتی دەکا و پێی دەڵێ ئەمە قسەی پیاو نییە. لە دوای ئەوە خۆی لێ ئاشکرا دەکا کە مەمە. هەردووکیان سەرسام دەبن، دەست لە ملی یەکتری دەکەن و لە هۆش خۆیان دەچن و دەکەونە سەر دۆشەکەکە. لەو کاتەدا چاڤرەش دەگەڕێتەوە و لە دەرگا دەدا. بێ سوودە کەس دەرگا ناکاتەوە. ناچار دەبێ دەرگا بشکێنێ. چی دەبینێ! کابرایێک لەگەڵ غەزالە لەتەک یەکتری ڕاکشاون! بەلای چاڤرەشەوە ئەمە تاوانێکی گەورەیە ئەم کابرایە کردوویەتی بۆ ئەوەی ئابڕووی مەمی پێ ببا. ئیتر دەست دەداتە ڕمێک لە سنگی کوڕەکەی گیر دەکا. کە غەزالە خەبەری دەبێتەوە بەخەسووی دەڵێ چیت کرد! چاوی خۆت کوێر کرد! بەم جۆرە غەزالە و چاڤرەش لە سنگی خۆیان دەدەن و بەئاوازەوە دەلاوێننەوە:

هەرێ مەمۆ مەمێ ئەباسی ئەباسی!
بریندارۆ مەمۆ دایێ کۆر بت نەناسی!

***

عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری یەکێک بوو لە ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەرە کوردەکانی عوسمانی. هەموو قۆناغەکانی خوێندنی لە کوردستانی تورکیای خۆی و ئەنقەرە و ئەستەمووڵ بڕیوە. سیاسەتی لە ڕیزی ڕێکخراوە کوردییەکانی سەردەمی دەسەڵاتی



عوسمانی کردووە. یارمەتیی ڕۆژنامەی «ژین»ی ئەستەمووڵی داوە. شیعری نووسیوە، لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی دەستی باڵای بووە. وتاری ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و سیاسی نووسیوە، پیەسی بەپەخشان داناوە. لە دوای دروستبوونی کۆماری تورکیا لە سیاسەت دوورکەوتۆتەوە و خەریکی زانستییەکانی ئیسلامی بووە. جێ پەنجەی ڕەحمی لە ڕۆشنبیریی کوردیدا دیارە و بەرهەمە ئەدەبییەکانی لە شیعر و پەخشان خوێندەواری کوردیان دەوڵەمەند کردووە.

# بەشی چواردەم

## چروستانی

**۱۸۹۰ - ۱۹٦۳**

### ژیانی

محەمەد کوڕی مەلا عەبدولڕەحیم کوڕی عومەر لە نەوەی پیر خدری شاهۆیە. لە پاشانا وشەی «چروستانی» کردووە بەنازناوی شیعری و لە ناو خەڵکیشدا هەر بەو ناوە ناسراوە. لە ساڵی ۱۸۹۰ لە گوندی ئابلاغ لە دایک بووە. ئەم ئاواییە ئێستا بووە بەگەڕەکێک لە گەڕەکەکانی شاری سلێمانی. لە تەمەنی شەش ساڵیدا دەستی کردووە بەخوێندن، ئەو کاتە باوکی مەلای مزگەوت بووە لە هەڵەبجە. ماوەیێک شاگرد بووە لەگەڵ فەقێکانی باوکی خوێندوویەتی. لە پاشانا ماڵیان هاتۆتەوە سلێمانی، لەوێوە بۆ مەبەسی خوێندن ڕووی کردۆتە هەولێر و کۆیە، ماوەیێک لە گوندەکانی هیران و نازەنین لە خۆشناوەتی خوێندوویەتی، لە دوای سێ ساڵ گەڕاوەتەوە سلێمانی، ئینجا لەگەڵ باوکی چۆتە بەرزنجە. بەهۆی مردنی باوکییەوە ناچار بووە واز لە خوێندن بێنێ. ئیتر ڕووی کردۆتە گوندی سەرا و لە ناوچەی شارباژێڕ و ئالان و سیوەیل بۆ بەخێوکردنی دایک و خوشکی مەلایەتی کردووە. لەو گوندە عاسمە ناوێک دەخوازێ. لەو ناوە زۆر نامێنێتەوە، هەر بەکاری مەلایەتی دەچێتە گوندی بادین و هەندێ لە گوندەکانی دیکەی پشدەر. لە گوندی بادین خێزانی کۆچی دوایی دەکا. لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی و سەردەمی داگیرکردنی ئینگلیز ماڵی چروستانی لە ڕانیە بووە. لە بۆمبابارانی شارەکە ماڵی بەر تۆپ کەوتووە و هەندێ لە کتێبەکانی لەناوچوون.

لە پاش ماوەیێکی دوورودرێژ لە بێ ئۆقرەیی و ماڵ گواستنەوە لە جێیێک بۆ جێیێکی دیکە چروستانی لە ساڵی ۱۹۳٦ بەیەکجاری نیشتەجێی سلێمانی دەبێ و لە مزگەوتی نەقیب مەلایەتی دەست دەکەوێ. لە ساڵی ۱۹۵۵ تووشی نەخۆشی بووە، ماوەیێک لە نەخۆشخانەی توێسەی بەغدا کەوتووە، ئیتر ڕۆژگاری داهاتووی بەنەخۆشی بردۆتە سەر تا لە ساڵی ۱۹٦۳ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ جافەر نێژراوە، ئێستا گۆڕستانی گردی جۆگەی پێ دەڵێن.



## شیعری چروستانی

لە کاتێکدا چروستانی هەوەسی شیعر دانانی هەڵساوە لەوە بەدواوە لە سلێمانی نیشتەجێ بووە، تەمەنی لە دەوروبەری چل ساڵی بووە. هۆی نزیکبوونەوەی لە شیعر تا پلەیێک دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەنگی خۆش بووە، لە تەجویدی قورئان و بانگ و سەلا شارەزا بووە، ئەمە یارمەتی داوە گوێیێکی مۆسیقی لە لا دروست ببێ و لە ئەنجامدا بتوانێ شیعر بڵێ. ئەو برە شیعرە کردوویەتی بەشاعیر و ناوی دەچێتە ناو مێژووی ئەدەبی کوردییەوە.

لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەم تێبینییانە هەندێ لایەنی شیعری ڕوون دەکەنەوە:

۱- ئەم شاعیرە کێشی شیعری سیلابی خۆماڵی بەکار نەهێناوە، شیعری هەمووی لەسەر بەحرەکانی عەرووز هۆنراونەتەوە: هەزەج، ڕەمەل، موتەقاریب، موجتەس. تەنیا ئەوە نەبێ دوو شیعری لەسەر کێشی خۆماڵی دە بڕگەیی و جووت قافیە (مەسنەوی) داناوە. وەکو خۆی وتەنی بەشیعری ڕاستەقینەیانی دانەناوە، بەڵکو بۆ گۆرانی چڕین هۆنیویانیەتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی چێژیان لێ وەربگرن.

۲- زنجیرەیێک شیعری داناوە بەناوی سکاڵای دایکی وەتەن، یا گفتوگۆی دایکی وەتەن، لە بیست پارچە شیعر پێکهاتووە لەسەر کێشی «هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان) لەسەر بنچینەی جووت قافیە (ا ا ب ب جـ جـ...).

۳- زنجیرەیێکی دیکەی هەیە بەهۆی یەککەوتنی جەژنی قوربانی ساڵی ۱۳۵۳ھ و جەژنی بەهاری ساڵی ۱۹۳٤م وتوویەتی. لە حەوت پارچە شیعر پێکهاتووە لەسەر بەحری «هەزەجی هەشتی تەواو» (مفاعیلن هەشت جار)، قافیەی «انە»یە، لە ۱۳۱ دێڕە شیعر پێکهاتووە. ئەم زنجیرە شیعرەی چروستانی لە ڕووی ڕوخسارەوە کاریگەریی نەعتە بەناوبانگەکەی نالی پێوە دیارە:

ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتاکەی حیرسی وێرانە
لەگەڵ ئەم عیشقبازانە بڕۆ ئازانە بازانە

ئەم کاریگەرییە زیاتر لە ناوەرۆکە ئایینییەکانی شیعرەکە دەکەوێتە بەرچاو ئەگەر نا زۆربەی ماناکانی ئەم زنجیرە شیعرە لە دەوروبەری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و کەموکووڕی کۆمەڵایەتی دەسووڕێتەوە.

٤- زمانی شیعری چروستانی هەر ئەو زمانەیە کە لە شیعری کلاسیکی قوتابخانەی نالی بەکار دەهێنرێ، بەڵام ئەوە هەیە لە تەمومژی سیمبۆلی و ڕەمز تا پلەیێک ڕزگاری بووە، واتە ئەگەر وشەی قورس و کەم بەکارهێنراوەکانیش بەکار هاتبن مانا ڕوون و ئاشکرایە.

لە ڕووی ناوەرۆکەوە ئەم تێبینییانە هەندێ لایەنی دیکەی شیعری چروستانی ڕوون دەکەنەوە:

١- شیعری ئایینی (موناجات و نەعت) لەگەڵ شیعری کوردایەتی و نیشتمانپەروەری و سیاسەت و کۆمەڵایەتی و دژی دەرەبەگی و دواکەوتوویی مەبەسی بنچینەیی شیعری چروستانییە.

٢- شیعری وەسف و دڵداری کەمە، ئەمەش لەسەر ئارەزووی هاوڕێ و دۆستانی بووە. بەئاسایی لە ناو دڵ و مێشکی خۆیدا هەڵنەقووڵاون.

٣- شاعیر لە گێتیی نالی نزیک بووە و خۆشی ویستووە، بەئاسانی هەست بەوە دەکرێ کاریگەریی نالی بەسەر شیعری چروستانییەوە زۆرە. لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا ئەوە باوە کە شاعیر نالی ناس بووە و لە هەندێ لە شیعرە داخراوەکانی گەیشتووە. ئەمە زیاتر لەبەرئەوە بووە دیوانی نالی بەخەتی خۆی نووسیوەتەوە. ئیتر ئەم دەسنووسە بووە بەسەرچاوە لە ناو دەسنووسە فرە زۆرەکانی نالی و نرخی زانستی لەو دەسنووسانەی لە ئەورووپا هەن و ئەوانەی لە نیشتمان دەست دەکەون ئەگەر کەمتر نەبێ زیاتر نییە، هیچ نەبێ هەندێ لەوانەی دیکە زۆر لە ئەوەی چروستانی کۆنترن و پێش ئەو تۆمار کراون.

٤- وەک لە ژیانی ڕۆشنبیریی چروستانی دەردەکەوێ لە تەریقەتی نەقشبەندییەوە نزیک بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ستایشی شێخ عەبدولقادری گەیلانی کردووە. ئەوەی ئاشکرایە لە بنەڕەتدا دژایەتییێک و چوونە مەیدانێک لە ڕووی ئیدیۆلۆجی و سیاسییەوە لە نێوان تەریقەتی قادری و نەقشبەندی لە ناوەوەیە. کاری کردۆتە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسی کورد، بەڵام بەو مانایە ڕەنگی لە ئەدەبدا نەداوەتەوە شاعیرانی هەردوو لا لە دژی یەکتری بنووسن. بێ گومان شاعیری سەر بەقادری یا نەقشبەندی لایەنگری تەریقەتەکەی خۆی بووە، کەچی لە دژی یەکترییان نەنووسیوە. ئەگەر تاکە تاکە شتی وا هەبووبێ بەنهێنی لای خۆیان ماوەتەوە.



## نموونەی شیعری چروستانی

### وەسف و دڵداری

بەقسەی شاعیر دوو پارچە شیعری دڵداری داناوە لەسەر داوای خۆشەویستێکی خۆی.

١

ئەی بوون و نەبوونی نەفەست مان و نەمانم
بێ نەقدی هەوا مردن و سەوداتە ژیانم
ئاوایی دڵم چۆڵە بەبێ خێڵی خەیاڵت
ئاوایی بەدڵداری بفەرموو دڵ و گیانم
بێ دەرکە ڕەقیب ئەو تەمەڵە لاتی هەلاتە
خۆم مەشقی غەمی عەشقی تۆ ئازانە ئەزانم
ئەو دڵ ڕەشە نەعل و یەمەنی ماڵە بەدەمیا
من مۆرە دڵم ماڵی لەبی لەعلی یەمانم
ئاوارە دەکا پەرچەمی ئێوارە تەماشام
وا هەر بەتەما چوونی شەو و بوونی بەیانم
لابە تەمی زولفت لەسەر ئاوێنەیی کوڵمت
با چارەیی بێچارە بدا جارێ نیشانم
دیققەت لە قەدی ئەلف و کەچی لامی دوو زولفە
لەم ماتەمە داماوە دڵ و لاڵە زمانم
چاوم کەڕوا خێڵ بوو لە بۆ چاوەڕوانیت
بێ چاو و ڕوو بۆ تیلەیی چاوێ ئەڕوانم
زولفت کە قەرینی ڕووە شێوەی شەو و ڕۆژە
ئەو سێبەری خۆرم ئەم ئەلەتریکی شەوانم
دەم عەتری شەکەر قەترە مەگەر لێوی تو چاکا
دوو لێوی بەبار زەردی ڕوان رووحی ڕەوانم
عەهدێکە دوو پێم ناوەتە ڕێی عەشقت و ماتم
بۆ شوێنە وونی هەر بەتەما هاتی ژوانم

کەشکۆڵی دڵ و زاری (چروستانی) لە نەزما
ئاواڵەیە ئاوارەیی بەزمێکی ڕەوانم

ئەم شیعرەی چروستانی بەڵگەی ئەوەیە ئەو ڕەخنەگرەی دەڵێ «شیعر بەڕادان نادرێ» قسەکەی ڕەت بکاتەوە. لەمەدا دەردەکەوێ شاعیر توانای ئەوەی هەبووە شیعری دڵداری بڵێ، بەڵام خۆی بەئانقەست نەیووتووە و ناوەرۆکەکانی دیکە بەلای ئەوەوە گرنگ بوون.

ئەم شیعرە غەزەلێکی ئاساییە، گەمەی ڕەوانبێژی تێدا هەیە. قەدی دلبەر بەتیپی «ا» دەچوێنێ، دوو زلفی کەچی لەگەڵ تیپی «ل» بەراوورد دەکا، لە کۆکردنەوەی ئەم تیپانە وشەی «لال» دروست دەبێ. شاعیر ئەگەر وشەی «ئەلەتریک»ی بەکار نەهێنایە، خوێنەر وای زان دەکرد ئەم شیعرە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم لە ناوچەی سلێمانی وتراوە.

۲

لە شیعری دووەمیدا لەسەر داوای دۆستە خۆشەویستەکەی دایناوە دەڵێ:

من کە دڵ ماتەم نشین و بولبولیش هاوار و شین
هەریەکە سەوداسەری غونچەی گوڵێکی بێ غەشین
من بەنەقدی دڵ لە سەوزەی غونچە لێوی سوخمەشین
ئەو بەئاهی لێوی غونچەی دوگمە سەوزی ئاتەشین
هەریەکە خار و جەخاری باری دەردی دڵ کەشین
تاڵی شاری کوڵم و ژاری ماری زولفی خەم چەشین
هەریەکە زامی بەتیر و نەشتەرێ کون کون لەشین
دڵ بەئاواتی نەباتی گوڵ دەمی ماتەم بەشین
هەریەکە سەرخۆشی جۆشی قەترە عەترێکی خۆشین
کوا نەسیمێ بێ بەیانی دەم گوڵی کا مەهوەشین
لەو دوو لێوە ئاڵە دوو کوڵمی سپی خاڵی هەشین
دڵ دەهێنێت و دەبا هاوار ئەکا خەڵوەت نشین
چارەیێک شینی ئوفوق سووری شەفەق خۆری بەتین
گشتی شێوان عەسر و شێوان و عیشا چۆن دابەشین
من سەرم سوڕماوە چۆن یەک کەوتوون وا سوور و شین
خاڵی شین ماتەم دەکا بەو لێوە سوورە دڵگەشین



ئووچی پاراو و تەڕی زاری (چروستانی) یەقین
بولبول ئاسا نەغمەیی سەد نەزمە بێ تالع ڕەشین

لەم لیریکەدا چروستانی لە پێناوی ڕیتم و مۆسیقا خەریکی گەمەی ڕەوانبێژییە. یەکێتیی قافیەی لە هەموو نیوە دێڕە شیعرەکاندا بەکارهێناوە، ئەم دیاردەیە زۆر کەمە لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا. لە پاشانا شاعیر یاری بەڕەنگی «سوور» و «شین» دەکا. لە ئەدەبدا یەکەمیان ڕەمزی بەختیاری و دووەمیان ڕەمزی بەدبەختییە. ئەم ئاوڕدانەوە ڕەوانبێژییانە لە هەندێ شتومەکی سروشت بەرجەستە دەکا بۆ ئەوەی بەراووردیان بکا لەگەڵ وێنەی ڕووکەشی ئەندام و بزووتنەوەی دلبەر ئەوانەی ئەم دوو ڕەنگە دەنوێنن. ئەم نموونانە ئەوە دەگەیەنن توانای شیعر وتن لای چروستانی بەهێز بووە، بۆی کراوە هەندێ وێنەی داهێنراوی تازە دروست بکا، ئەگەرچی بەشێوەیێکی دیکە پێش ئەویش وترا بن.

## کوردایەتی

لە شیعرێکیدا چروستانی بەناوی «وێنەی دایکی وەتەن» بەم جۆرە وەسفی ئەو دایکە دەکا و دەیەوێ هەواڵی بزانێ:

مات و کز و کوێر و کەل و کۆم و شڕ و شێواو
ناسیم و ووتم چۆنی! بەخێر هاتی بەسەرچاو
هەرچی کەسەری دڵ هەبوو لێم پرسییەوە گشت
فرمێسکی سکاڵای نەتەوەی سپڵەیی هەڵڕشت

بەم جۆرە شاعیر چاوی بەدایکی وەتەن کەوتووە و وەسفی کردووە. ئەمە ڕەنگدانەوەی شپرزەیی حاڵی منداڵ و نەوەکانی بووە، لە کاتێکدا دەبوو ژنێکی خانومان و خەرمان و قەشەنگ بووایە وەک حەووای دایکە گەورە.

بەچاوێکی پڕ لە فرمێسکەوە دایکی نیشتمان وەرامی شاعیری داوەتەوە:

چەن خۆش ووتی ئەی ڕۆڵە لە داخی کوڕەکانم
وا پەرت و بڵاون نییە هیوایی ژیانم
وەک بزنی بەڕەڵڵا یەکی ڕووی ها لە شوێنێ
گەر دوو بگەنە یەک شەڕە قۆچ خۆی دەنوێنێ
بێ شوان و مەڕن کەس لە کەسە گەورە وو چووکی
گەر زۆر و گران دێمەنە بۆ وا کەم و سووکی

بێ خـــاوەنیـــــیـــــە دوژمنی ئازا وو زرینـگە
بۆ گــرتنیــان ڕاوچی وەکــو شـێــر و پڵــینگە
یەک توخنی یەکێ ناکـــەوێ نابینی یەســـاغی
لە وولاّت و بەر و ســێــبـــەری لالووتن و یاغی
برسی بەســـەری یەکــتــرن و تینوو بەخـــوێناو
چۆن جـەرگ و دڵی داکی وەتەن نابێـتـە زووخـاو
لا لووت وەکــو جـۆڵاّ لە کـڕ و سـەردڕی خـۆیان
ســـا بۆیە کـــە مـــۆرانە جنی ڕایەڵ و پۆیان
خـۆ خـۆرەکـە دەبڕێتـەوە خـۆی دەسکی لە خـۆیە
وەک مـاسـتی مـەییـو وایە هەوێنی کـە لە دۆیە
ناکـۆکـیـــە خـاک و نەتەوەم بێ دەس و مـایەن
ناڕێکیـــیـــە وا بێ بەش و بێ نۆرە لە کـــایەن
دووری دڵ و ڕوو لـێکـتــــــرە وا پـەرت و بـلاون
بێگانە پەرســـتی پەکی خـــستێ شـــڵـــەژاون
«فَـــرِّقْ تَسُـــد»ی دوژمنە ناکـــۆکن و ناڕێک
بێ هۆش و پەژارە نە مـــشـــوورێ نە پەرۆشـــێک

لە وەرامدا دایکی نیشتمان لەو هۆیانەوە دەدوێ کە کوردیان دواخست و نەیتوانی تا ئەمڕۆش ئازادی و سەربەستی بەدەست بێنێ. ئەم هۆیانە لەم وێنانەدا دەستنیشان دەکا: پەرت و بلاّوی، بێ سەرداری، نەبوونی گەورە و بچووک، لە هەموو شتێک یاغی، برسی گۆشت و تینووی خوێنی یەکتری، بێگانە پەرست و خۆخۆر و گەلێ سیفەتی دیکە. سیاسەتی «جیا بکەرەوە گەورە دەبی» بەعەرەبی (فَرِّقْ تَسُدْ) لە ناو ڕۆڵەکانمدا سەرکەوتوو بوو، ئەم دروشمە بەواتا عەرەبییەکەی سیاسەتی ئەمپریالیستی ئینگلیز بوو لە ولاّتە داگیرکراوەکاندا بەکاری دەهێنا بۆ بەرژەوەندی خۆی.



## کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا

ئەم ڕووداوە جێی گوشادی هەموو عیراقییێکی دڵسۆز بوو، شاعیرێکی وەکو چروستانی و هی دیکەی کورد کە بەشیعر پیرۆزبایی ئەم ڕووداوە گرنگەیان کردووە بەرهەمەکانیان بوون بەبەشێک لە مێژووی ئەدەبی میللەتەکەیان. لەم لایەنەوە چروستانی هەندێکی کردووە، لەوانە:

١

لە شیعرێکیدا چروستانی دەڵێ:

لە تاریکی نەهاتی و نەگـــبــەتی دامـــەبڕە هیـــوای دڵ
کـــە ڕۆژی هات و ڕزگـــاری لە پارێزایە پەنـهـــانە
کـە کـاسـەی زەبروزەنگی خـوێنمـژی پڕ بوو دەبێ بڕژێ
لەپڕ تووشی شـەوی نەحـســە و سـزایە و پەتپـەتی دانە
هەرای چواردەی تەمووزی نۆ سەد و پەنجا و هەشتی جەیش
لە دنیـــا نەبووە وێنەی قـــەت ئەشێ بۆ جـەژنی تاقـانە
هـەوێنـی زۆر و زاڵـی دوژمـن و پـەرت و بـلاّوی گـــــەل
هەمـــوو پەندی بپـــســـاتن ڕەنجـــەڕۆ ڕیســـوا ســـزادانە
تەبایی و ڕێکوپێکی و کــۆمــەڵی و ئازادییـــە ئیـــتـــر
درا جـاڕی قـــڕانی مـــاکی ئیـســـتــیـعـــماری مـۆرانە
بەخـــوا دەکـــرێ شــەوی زۆر و ســتـــەم لابا لەپڕ بیکا
بەڕۆژی پاکی جـــومـــهـــووری لە چاوا لابـــا تانە
نەمـــا بەندی عــــیــــراق و بەندەیی ڕزگـــار و ئازاد بوو
لە یەک ئانا بەپرکـێـشی سـوپا و کـۆمـەڵ بەشـێـرانە
لە کـۆمـەڵ مـژدە جـومـهـووری بەپیـرۆزی خـودا کـردی
گــرێ و کـۆسپ و پلەش تەفـروتوونـاکـا وا ڕجـامـانە
ژن و پیـاوی کـەژ و دەشـتی عـیـراقی هەر لە دێ تا شـار
بەخـۆشی و کـەیف و شـادی ڕووح و ژینی تازە پەخشـانە
نەمـامێ کـەس نەبوو بێـژێ کـە بەر دەگـرێ بەپەنجـا سـاڵ
لەپڕ وا خـــوا ڕووانی ســـێـــبــــەر و بەردانی یەک ئانە

لە لوتفی خوا دەسی زۆری نییە بەندی (چروستانی)
بەبێ پەروا ئەژی ترسی نییە هاورێی هەژارانە

لەم شیعرەیدا چروستانی تەعبیر لە ناو دڵی خەڵکی عیراق دەکا، ئەم ڕووداوە کۆتایی بەدەسەڵاتی مەلیکی هێنا و جاری کۆماری دا. لە لایێکی دیکەوە وڵاتی ڕزگار کرد لە دەستبەسەر داگرتنی ئەمپریالیستی بەریتانی و تالانکردنی سامانی سروشتیی وڵات بەتایبەتی نەوت.

٢

لە دواتر شاعیر لیریکێکی دیکەشی داناوە لەم بابەتەوە:

سەرم سوڕما گەلێ دەمرێ لە بۆ گەل شین و گریانە
گەلێکیش مردنی هۆی جەژن و شایی و چەپڵە ڕێزانە
وەسی و نووری سەعید و میسر و عەبدولناسڕ و بەغدا
لە هێز و قودرەتی حەق عیبرەت و دەرسێکە بیزانە
ئەوی دوێنێ نیشان بوو بۆ پلاری تاغییە ئیمڕۆ
بەناوی ڕۆڵەکانی گەل لە سەرزارە و لە نێو گیانە
نەما ئەو دوو پەڵە هەورە ڕەشەی ماکی پەتا و پیسی
بەهۆی تاوی سوپاوە و هەڵمەتی کۆمەڵ بەمەردانە
تەبایی و ڕێکی میسر و شام و بەغدا کارەساتێکە
کە پاراوی هەزاران تینووە ڕووناکی چاوانە
لە شایی و بەزم و سەیرانی بەنەغمەی نەزم و گۆرانی
هەموو شاری سلێمانی وەکو ڕۆژانی جەژنانە
نەشیدی ڕاپەڕین و سەورەیی «صَوْتُ العَرَبْ» باوە
لە ناو ماڵان و خێزانا لە هەر دوکان و چاخانە
خودا هێزی بدەی ئەم ڕاپەڕین و ئیتتیفاقە تا
بەری ئازاد و بەرزی وەرگرن چی عورب و کوردانە
خودا کورد و عەرەب ئازاکە پاکی کە لە ئیستیعمار
لە ئەمریکا و ئینگلیز و فەڕەنسا تێک بدە لانە



بەتاوی تیپی قەهرت دامرێنە ئاگری دوژمن
بەئاوی فەتح و نەسرەت ئاو بدە ئەم لێو بەبارانە
شوکور وا هاتە دی ئاواتی دڵ بۆ عارەب و کوردان
بەلاچوونی تەمی تاریکی ئیستیعمار و بێگانە
برا نۆرەی تەبایی و ڕێکییە سا هۆگری یەک بن
ئیتر پەرت و بڵاوی دوودڵی ناکۆکی تاوانە
ئەگەر ئەم دوو برایە پشت بەیەک بەستن بەیاری خوا
بەجان و دڵ بکۆشین هەردوو کۆمەڵ گورج و ئازانە
مسۆگەر هێزی یاریدەی خودا سەرکردەیی گشتە
هەوێنی ڕێکوپێکی هۆی تەبایی دین و ئیمانە
بەجاهی ئەحمەد و قورئان ببەخشە هێزی ئازادی
بەئیسلامەت کە قوڕگم بۆ کەساسی پڕ لە گریانە
دڵم تینووی تەبایی عارەب و کوردە خودا بیکا
بەعەونی خۆی ئەگەرچی کوردم و ئەسڵم (چروستانە)

لەم بڕە شیعرەدا چروستانی هەڵوێستێکی ئاسایی بووە کە بەخراپە باسی عەبدولئیلاهی وەسی و نووری سەعیدی کردووە، بەڵام کە ناوی جەمال عەبدولناسر بەچاکە دەبا، لەبەرئەوەیە لە سەرەتادا پشتی کوودیتاکەی گرت بەئومێدی ئەوەی عیراق لەگەڵ میسر و شام «کۆماری عەرەبی یەکگرتوو» دروست دەکەن. شاعیر باس لە ڕادیۆی «دەنگی عەرەب» (صوت العرب) دەکا، چونکە لە سەرەتادا پشتگیریی کوودیتای عیراقی دەکرد و دەوری گرنگی هەبوو بۆ هاندانی خەڵکی بێ بەلایەنی کوودیتاکە، کەچی لە دواییدا ئەو ئێستگەیە بوو بەدژی عیراق. چروستانی دڵخۆش بوو بەوەی سێبەری ئەمپریالیستی بەریتانی و سایەی ئەوانی دیکەی ئەمەریکا و فرەنسا لە وڵات دوورکەوتنەوە. شاعیر هێشتا لە ژیاندا بوو کە ئەو کوودیتایە لە دواییدا هەڵگەڕایەوە و ئاژاوە کەوتە ناوەوە لە هەموو عیراقدا. بەشی کورد لەم ئاژاوەیە لە هەموو لایەنێکی دیکەی عیراق دژوارتر بوو. وا بوو جارێکی دیکەش ڕاپەڕی و لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ شۆڕش دەستی پێ کرد تا بەهاری ١٩٧٥ی خایاند. بەپیلانێکی نێودەوڵەتی زیندەبەگۆڕ کرا.

***

مەلا محەمەدی چوڕستانی درەنگ دەستی داوەتە شیعر، لەبەرئەوە شیعری کەمە. ئەو بەرهەمەی لە بەردەستدایە هەموو مەرجەکانی شیعری سەردەمی خۆی تێدایە. مەیدانی شیعری لە ڕووی ناوەرۆکەوە فراوان نییە، چێژی کەسێتی خۆی پاڵی پێوە ناوە شیعر بڵێ، ئەو شیعرەی وتوویەتی لە دەرەوەی دەروونییەوە هەڵقوڵاوە، لەبەرئەوەی ڕەنگدانەوەی هەندێ دیاردەی سۆسیۆپۆلیتیکی ناو کۆمەڵی کوردەوارییە جێی تایبەتی خۆی دۆزیوەتەوە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. لە شاعیرە دەگمەنەکانە کە داڵغەی بەشیعری دڵداری و دەسبازی و لێستنەوەی ژن نەداوە. شیعری ئەو شاعیرە ئامۆژگاری و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و وتەی دانایی پەروەردەییە لە ناو قاڵبی شیعری کلاسیکیی بەرزدا.

# بەشی پازدەم

## ئەحمەدی ناڵبەند

**١٨٩١ - ١٩٦٣**

### ژیانی

ئەحمەد کوڕی ئەمین لە ساڵی ١٨٩١ لە گوندی بامەڕنێ لە دایک بووە. ناوی بنەماڵەیی لە باوکی وەرگرتووە، بەپیشە ناڵبەند بووە، لە ناو خەڵکی بەگەلێ نازناو ناسراوە، لە شیعردا «ئەحمەد»ی بەکارهێناوە، هەندێ جار ناڵبەندیشی تۆمار کردووە. لەم بابەتەوە خۆی دەڵێ:

ئەز ب تەبعێ خوە فەقیرم نەعلبەندی نیسبەتە
لێ ب شیعرا خۆ غەنیمە فەخرا کوردستانم ئەز

لە تەمەنی پێنج شەش ساڵی دەستی بەخوێندن کردووە لە حوجرەی مزگەوت. وەکو نەریتی ئەو سەردەمە لە گەلێ شوێن خوێندوویەتی، ئەوەی ئاشکرایە ناوچەی بادینان حوجرەی خوێندنی مزگەوتی زۆر بووە. لە شارانی ئامێدی و زاخۆ و دهۆک خوێندوویەتی. لە ساڵی ١٩١٤ لە گوندی بێدوهـ لە ناوچەی بەرواری دوو ساڵ خەریکی خوێندن دەبێ و ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ و لە ساڵی ١٩١٦ هەر لەو گوندەدا دەبێتە مەلا تا ساڵی ١٩١٩. لەم ماوەیەدا چەکدارانی فەلەڕەشکەی تەیاری ئاسووری هێرش دەبەنە سەر گوندەکانی، مایی، بێدوهـ، دیرشکێ و هی دیکە. ئاواییەکان دەسووتێنن، ماڵ و سامانی خەڵکی تالان دەکەن. دانیشتوانی ئەو گوندانە دەربەدەر دەبن، ناچار ئەحمەد ڕوو دەکاتە گوندی چەلێ. لە دوای ساڵێک دەچێتە گوندی ڕویسێ و ماوەی دوازدە ساڵ لەوێ مەلایەتی دەکا. لە پاش ئەمە بۆ ماوەی دوو ساڵ بووە بەمەلا لە گوندی بێگۆڤا لە ناوچەی گولی، ئەوجا شەش ساڵیش لە گوندی خشخاش مەلایەتی کردووە. لە ساڵی ١٩٤٢ گەڕاوەتەوە ئامێدی تا ساڵی ١٩٤٧ لەوێ زیندەگانی کردووە ئینجا لە ناوچەی سلێڤانە نیشتەجێ بووە. لە ساڵی ١٩٥٧ ڕووی کردۆتەوە ئامێدی، لە دوای ساڵێک چۆتەوە بامەڕنێ و لەوێ بووە تا ساڵی ١٩٦١ بۆ دواجار گەڕاوەتەوە گوندی خشخاش لە ناوچەی بەرواری بالا. ئەمە دوا ئێسگەی ژیانی بووە.



لەو سەردەمەدا ئەحمەد گرفتاری نەخۆشیی سایکۆلۆجی بووە، نزیکەکان و شارەزایانی ژیانی لەسەر ئەو باوەڕەن شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ تووشی ڕەشبینی کردووە، بەلایەوە ژیان هیچ نرخێکی نەماوە بۆ تاکی کورد لەبەرئەوە لە ڕۆژی ٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٣ تراجیدییانە لە گوندی خشخاش بەچەقۆ ناو زگی خۆی هەڵدڕیوە و کۆچی دوایی کردووە.

### شیعری

لە منداڵییەوە ئیلهامی شیعری لای ئەحمەدی ناڵبەند تەقیوەتەوە. لەو کاتەوە تا کۆچی دوایی لەگەڵ شیعردا ژیاوە، وا دەردەکەوێ هیچی لە ناو نەچووە و هەمووی ماوە، بۆیە بەقەوارە شیعری لە هەموو شاعیرێکی دیکەی کورد زیاترە. کۆمەڵێک نووسەری کورد لە ساڵی ١٩٩٨ کارێکی باشیان کرد لە پێنج بەرگدا سەرجەمی شیعری ئەحمەدیان بەناوی «باغێ کوردا» بەچاپ گەیاند. شیعرەکان لە لایەن تەها ماییەوە کۆکرابوونەوە و ئامادە کرابوون بۆ چاپ، لە پاشانا پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوە و سەرپەرشتیی چاپکردنی بەنووسەران ڕەشید فندی و ئیسماعیل بادی و محەمەد عەبدوڵلا سپێررا بوو. لەوانەیە ئەم دیوانە فرە گەورەیە یەکێک بێ لەو دیوانە دەگمەنانەی لە سانسۆر ڕزگارییان بووە، ئەوەی شاعیر وتوویەتی هەمووی بلاوکراوەتەوە، بەبێ ئەوەی گوێ بدرێتە پلەی بەرزی و نزمیی شیعرەکان لە ڕووی هونەری و جوانکارییەوە، هەروەها لە لایەن ڕەوشت و نەریتی کۆمەلایەتیشەوە سانسۆر لەسەر ئەو شیعرانە نەبووە، بەئاشکرا وەسفی میکانیکی پێوەندیی ژن و پیاو دەکا لەو کاتەی شەهوەت تەنیا هەیەجان بە پیاو ناکا بەڵکو بەژنیش دەکا. ئەم ئازادییە لە بەرهەمی ئەدەبی و هونەریدا کارێکی بەجێیە بۆ ناسینی سامانی نەتەوەیی وەکو هەیە و بەشێکە لە واقیعی ژیان.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

دیوانی ئەحمەد نزیکەی شەش سەد لیریک و قەسیدەی بەحری عەرووزی دەور دەکاتەوە، هێندەی ئەو یا لەویش زیاتر شیعری لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی هۆنیوەتەوە. لە بەکارهێنانی بەحری عەرووزی یەکێکە زۆرترینی ئەو کێشانەی بەکارهێناوە کە لە شیعری کوردیدا بەرچاو دەکەون. بەم جۆرە کێشەکانی هەزەج و ڕەمەل و موتەقاریب و ڕەجەز و بەسیت و موزاریع و مەدید لە شیعریدا دەبینرێن. لەم شیعرانەدا یەکێتیی قافیەی بەکارهێناوە. لەبەر زۆری شیعری بۆی کراوە هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بکا بەقافیە تەنیا چوار پێنج دەنگ نەبێ.

ئەم شاعیرە هەرچەندە وەکو نوێنەرێکی شیعری کلاسیکی دەکەوێتە بەرچاو لە سەدەی بیستەمدا، بەڵام بەشداریکردنی لە بەرەوپێش چوونی شیعری میللیی سیلابی خۆماڵی ئەگەر لەویان زیاتر نەبێ کەمتر نییە. بۆیە هەموو کێشە خۆماڵییەکانی کە لە شیعری نووسراوی خۆماڵی و شیعری میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) بەکار هێنراون، ئەحمەد لە هەموویان نموونەی زۆری هەیە. بەم جۆرە کێشە میللییەکانی (٥، ٦، ٧، ٨، ١٠) برگەیی بەکارهێناوە. هەندێ جار کێشە درێژەکانی کەرت کردووە و کەرتەکانی نەکردووە بەدێڕە شیعر، ئەگەر ئەمەی بکردایە هەندێ لە شیعری، لە رووی روخسارەوە وەک «شیعری نوێ» دەکەوتنە بەرچاو، ئەو شیعرەی لەسەر بنچینەی زیاتر لە کێشێک و قافیەیێک رێک دەخرێ.

ئەحمەد لە بەکارهێنانی قافیە دەوڵەمەندە، هەموو جۆرە قافیەکانی یەکێتی و مەسنەوی و رەنگاورەنگی بەکارهێناوە.

دیمەنی روخساری شیعری ئەحمەد لە رووی ئەندازیارییەوە بەم شێوەیە:

١- شیعری لیریکی لە پێنج دێڕییەوە تا دوازدە دێڕی هەیە.

٢- قەسیدەی زۆر زیاترە، واتە لە دوازدە دێڕ بەولاوە.

٣- قەسیدەی چوارینی هەیە، قافیەی (ا ا ا ا)، (ا ب ا ب)، (ا ا ا ب)ی بەکارهێناوە.

٤- لە پارچەی سێ دێڕە شیعری، واتە شەش نیوە دێڕ شیعر، قافیەی (ا ب ا ب ا ب) بەرچاو دەکەوێ.

٥- کۆمەڵێک قەسیدەی پێنجینی ئاسایی هەیە (ا ا ا ا ب).

٦- لە دیوانیدا کۆمەڵێک تەرجیع بەند هەیە، بەڵام لیریکەکانی بەژمارەی دێڕ کەمن، هەروەها هەندێ جار نیوە دێڕی تەرجیعەکە دووبارە نابێتەوە، ئەمەیان دەتوانرێ تەرکیب بەندی پێ بووترێ.

٧- بەگشتی ئەدگاری شیعری میللیی خۆماڵی خاسییەتی بنچینەیی بەرهەمی ئەحمەدی ناڵبەندە.

زمانی شیعری ئاسانە، لە قسەی خەڵک وەری دەگرێ، بۆ ئەوەی بەشێکی زۆر لە کوردزمان تێی بگەن. بەلای ئەوەوە مەبەس لە روخسار تێگەیشتنی ناوەڕۆکە، بۆیە بایەخی ئەوتۆ بەیەکەمیان نادا. خۆی لە رەوانبێژی تا پلەیێک لادەدا ئەگەرچی هەندێ جاریش وێنەی هونەری جوان دەکەونە روو.



## شیعری لە رووی ناوەڕۆکەوە

ئەگەر هەوێنی جوانکاری لە هەندێ شیعری ناڵبەندا کەم بێ و لە شیعری فێرکردن و پەروەردەیی (دیداکتیکی) نزیکی بکاتەوە لەبەرئەوەیە لە هەموو بابەت و رووداو و ناوەڕۆک و بەسەرهاتی ژیانی نووسیوە. بێ گومان هەندێ لەم بابەتانە تاقیکردنەوەیان کەمە نەک تەنیا لە ئەدەبی کوردیدا بەڵکو لە ئەدەبی هەموو نەتەوەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. بۆیە نەیتوانیوە ئەو جۆرە ناوەڕۆکانە بخاتە ناو قاڵبی داهێنانێکی تازەوە.

لە خوێندنەوەی شیعری ئەحمەد تەنیا خۆی وەکو شاعیرێک ناخاتە روو، بەڵکو وەک مامۆستاییێکی قوتابخانەی ئاسۆ فراوان و مێشک پڕ لە ئامۆژگاری و پەندی رۆژهەڵاتییانە خۆی دەنوێنێ.

بەگشتی شیعری ئەحمەد لە رووی ناوەڕۆکەوە خەریکی ئەم بابەتانەیە:

١- شیعری ئایینی (موناجات و نەعت و هەندێ لایەنی سۆفیزم) جێگەی دیاری لە بەرهەمی شیعریدا هەیە.

٢- دڵداری و وەسف بەگەلێ شێواز دەری دەبڕێ. لەوانە وەسفی دلبەر و نیشتمان تێکەڵ بەدڵداری دەکا. لاسایی دڵداری کلاسیکی زۆرە.

٣- شیعری کۆمەڵایەتی ئەوەندە زۆرە، ئەگەر بەمەبەسی ئەکادیمی تەماشا بکرێ، نەک بەمەبەسی چێژ و خەیاڵی هونەری، ئەنسیکلۆپیدیاییێکی کۆمەڵایەتی لێ دروست دەبێ. شاعیر باس لە هەژاری و دەوڵەمەندی و دزی و قومار و بەرتیل و چاکە و خراپە و گەلێ دیاردەی دیکەی ناو کۆمەڵ دەکا. زۆربەی ئەم جۆرە شیعرانەی دەچنە ناو خانەی شیعری فێرکردن و پەروەردەییەوە.

٤- لە شیعری نیشتمانپەروەرییدا راستگۆیە، کەسێکە لە ناو کوردایەتیدا تواوەتەوە. ئەم جۆرە شیعرەی دەکرێ بەدوو بەشەوە. یەکێکیان لە وەسفی جوانی و رەنگینیی خاکی کوردستانە، ئەوی دیکەیان سۆزێکی قووڵی دەروونییە لەو رێگەیە دەگەرێ کە کورد رزگار دەکا و دەبێتە خاوەنی خۆی و وەکو هەموو میللەت و نەتەوە سەربەستەکانی سەر رووی زەوی دەژی.

٥- شیوەن و ماتەمنامە وەک مەبەسێکی کۆنی ئەدەب و بەشێوەییێکی نوێ وەک مەبەسێکی تازە جێگەی تایبەتی هەیە لە دیوانیدا.

٦- له ستایش و شانازی کردن و پێداهەڵداندا جێ پەنجەی شاعیر دیارە. هەندێ جار تێکەڵ بەگاڵتەجاڕی و پێکەنینی دەکا، لەم حاڵەتەدا لە چوارچێوەی مەبەسەکەی پێشوو دەردەچێ و دەکەوێتە خانەی بۆ پێکەنین. جاری واش هەیە وەردەگەڕێ و دەبێ بەدراما و وەک کۆمیدیا دەکەوێتە بەرچاو.

٧- کۆمەڵێک شیعری کراوەی سێکسی هەیە (ئیرۆتیک) دیوانی شیعری کوردییان ڕەنگین کردووە.

## نموونەی شیعر

### دڵداری

لە شیعرێکی دڵداریدا ئەحمەد دەڵێ:

ئەز نزانم بۆ جەمالا تە چ بێژم دلبەرێ
سۆر گولا وەختێ سەحەر مینا ژ قەسرێ تێی دەرێ
وەک ژ قەسرێ تێیە بانی سۆر گولی یان ڕەش رحانی
فەخرا ئەهلێ ڤی زەمانی کەسک و سۆر و ئەسمەرێ
کەسک و سۆر و شین و ئالێ نازک و شۆخ و شەپالێ
دوڕ و یاقووت و لوئالێ مسک و عوود و عەنبەرێ

***

وەی عەجەب چەندا خەفیفی رۆژ و ڕەنگێ گەرمەسیڤی
قیبلەئو کەعبا شەریفی وەسفە ناهێن دەفتەرێ
وەسفە ناهێن بەر حسابێ شیشەیا کەسک و شەرابێ
شەربەت و گۆشت و کەبابێ جوملە نوور و جەهوەرێ
شەربەتا مەجرووحە بالا وەی بهارا ل ناڤ هەڤالا
دێم پڕە ژ نیشان و خالا رووی شرین و شەککەرێ

***

نەقشێ فەرراشێ بهارا سووسنا مێرگا نزارا
خەملا باغ، داروبارا وەی عەزیزێ سەر زەرێ
وەی عەزیزێ ئەز غولامێ شەکرا میسرێ وو شامێ



بلبلێ شیرین کەلامێ عەندەلیبا سەحەرێ
بلبلێ ئاوازە خۆشی ساقیی و شەربەت فرۆشی
کەفتمە جەزبە و خورۆشی ژ بەر تە ئەی ئال و زەرێ

***

خانمێ بەلقیس و زینێ مەلحەم و میلاک کەوینێ
برسی و مێڤان حەوینێ سفرەیا ل سەر بێدەرێ
سفرە ئا خاس و عەواما قیبلە ئا چەندی ئیماما
لائیقی قائیمەقاما والی یێ سەر عەسکەرێ
والی یو سولتان مەسیلی سافی یو زیبا جەمیلی
ڕێبەر و ڕێک و دەلیلی شوعلەدە وەک فەنەری

***

زالمێ کوشتم بە شیرا دامە بەر تەعن و نەزیرا
قەلبێ مە ڤان تۆڤ فەقیرا گرت و دا ل بەر نشتەرێ
نشتەرەک هاڤێت هناڤا سۆتنی دا قەلب و چاڤا
قەت قەبوول ناکەت چو گاڤا هیڤی داری و مەهدەرێ
(ئەحمەد)ا وەک حەفتێ سالا تو بکەڤی بەر ئێش و نالا
تالیبی وان زلف و خالا ئەو سەنەم ناکەت هەرێ

لەم شیعرەدا وەک نموونەیێکی دڵداری لە وەسفی نازەنینێک ئەحمەد هەندێ لە وێنە داهێنراوەکانی مەلای جزیری لە گوێی خوێنەر دەزرنگێنێتەوە. جوانی ژنە شۆخ و شەنگەکە لەگەڵ دیاردە ڕەنگینەکانی بەهار بەراوورد دەکا. شاعیرانی کرمانجیی سەروو هەمیشە جوانی ژنیان بەدەوڵەمەندی چواندووە، بەو مانایەی دەوڵەمەندی جوانی، ئیتر ژن کە جوان بوو دەبێ دەوڵەمەند بێ، کە دەوڵەمەند بوو دەبێ لە قەسر و باڵەخانەدا بژی، ئەمە لە لایێکی دیکەوە بەسەرهاتی زەمبیل فرۆشمان دێنێتەوە یاد ژنە جوانی میر حەزی لە زەمبیل فرۆشێکی ڕووتەڵە کردووە. هەروەها ئەحمەد لەم شیعرەدا یادی بووکە جوانەکانی شیعری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکاتەوە بەلقیسی سلێمان پێغەمبەر و زینی مەمی خۆمان. دەبێ ئەو دلبەرەی ئەحمەد چەند خۆشەویست بووبێ تا شاعیر لەگەڵ ئەم جوانانە بەراووردی بکا!.

## کوردایەتی

ئەحمەد ڕوو دەکاتە گەلی کورد و پێی دەڵێ:

ئەی گـــەلی کــــوردا بزانن
رابنە ســەرخــۆ بەســە خــەو
هوین فــەقــیــر و بێ خــودانن
رزقــێ وەمــــــــان نـان و دەو

***

ڤێ وەلات و ملک و مـــالی
بەس بدەن هندەک کـــەســـا
وان ژ برسێ هوین مـــراندن
ئەو هەمی پێ بوون قـــەلەو

***

ملک و عـار و زاخ و ناموس
ئەو هەمی ژ دەســتێ وە چوون
ڤـان برینا کی لوە سـاغ کـەت
بێ ســەر و دەرمـــان و کـــەو

***

یا هەوە ب دەسـتێ خـو گرتی
ئەز بەرێ خـــو ددم چیـــیـــە
زولـم و تەعــــــەددائـو دزینـە
کـــــــــوشـتن و نـژدە و درەو

***

غـەیری وە حـوکـمێ ددەسـتی
تۆپز و شــــیـــر و تفـــەنگ
راڤ و نێـچـیـرا لوە بەسـتی
هوین بو هەمـیـا بوونە کـەو

***



گــوە بدەن ڤێ نســحــەتا من
چونکە دل خـــۆشی خـــلاس
جــوملە تشــتێ خــۆ بو پێلن
خــۆ ڤــەشــێــرن رۆژ و شــەو

***

(ئەحمەد)ا وەختێ وەتەن چوو
دبن ب خـــۆ نادەت ســەقـــا
هەر تو بێـــژە فـــایدە نادەت
بۆ مـــــرۆڤێ هەر د خـــــەو

ئەحمەد ئەگەر خەیاڵ و وەرەووردی هەمیشە لەگەڵ چارەنووسی کورد نەبووایە، ئەوەندە باسی لێوە نەدەکرد. ئەم شیعرە یەکێکە لە گلەییە زۆرەکانی. شاعیر باش دەزانێ دەروجیران، ئەمپریالیستە و کۆڵۆنیالیستەکانی ئەورووپا و ئەمەریکا هۆی دواکەوتنی کوردن، بەڵام هۆی ناوەوەی لەو کەمتر نییە. واتە لەو کاتەی لە هەموو کەوتنێکدا دوژمن تاوانبار دەکەین، پێویستە پێش ئەوە حسێب لەگەڵ خۆمانا بکەین. ئامۆژگارییەکانی لە دڵسۆزییەوە هەڵقوڵاوە بۆ ئەوەی کورد هوشیار بێتەوە و مافی مرۆڤایەتی و نەتەوەیی خۆی بەدەست بێنێ.

## شیعر و شەهوەت

١

لە پارچە شیعرێکیدا ئەحمەد دەڵێ:

ئەڤ شـیـعـرا من دەرمـانە
زێـدە بـۆ گــــــونـەهـکـارا
هەر حـەقی وی گـــوهدانە
هەر و سـپـێـدە و ئێـڤـارا
شـاعــیـر یەقین شـول زانە
کـەس وەسـا نینە ل ڤـارا

لەم پارچە شیعرە جوانەدا ئەحمەد وەسفێکی دیکەی شیعر دەکا، دیارە ئەمەش یەکێکە

لە هەزاران وەسفی شیعر، نەک تەعریفی چونکە شیعر تەعریف ناکرێ. بەلای ئەوەوە شیعر دەرمانە بۆ تاوانباران، ئەوانەی گوناهیان کردووە ئاراستەی کاری چاکەیان دەکا، لەبەرئەوە پێویستە شیعر هەمیشە بخوێندرێ، چونکە شاعیر زانا و کارزانی بێ وێنەیە.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

چ ژنکا نەمەحرەم بیت
تو دگەل نەکە خەلوەتێ
ئەگەر مرۆڤ رۆستەم بیت
حیفز ناکەت شەهوەتێ
دێ مرنا تە لتە غەم بیت
شەرمێ بکە ژ غیرەتێ

ئەو ئامۆژگارییەی لەم پارچە شیعرەدا بەرەو ڕووی پیاوەی دەکاتەوە لە لێکدانەوەییێکی سروشتی سایکۆلۆجییەتی پیاوەوە هەڵقولاوە. شاعیر دەڵێ ئەگەر ژنێک نامەحرەم بوو، واتە بەپێی تەعبیری میللی ئەو ژنەی پیاو دەتوانێ مارەی بکا، پێویست ناکا لە جێییێک بەتەنیا کۆببنەوە، چونکە پیاو هەرچی بێ، ناتوانێ بەسەر شەهوەتیدا زاڵ بێ. بەم جۆرە ئەنجام کارەسات دەبێ، بەپێی نەریتی ئایینی یا کۆمەلایەتی. شاعیر بیرۆکەی ئەم پارچە شیعرەی لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینان وەرگرتووە.

## دڵداریی کراوە

دیوانی ئەحمەد کۆمەڵێک لیریکی کراوە (سێکس، ئیرۆتیک) دەور دەکاتەوە. لە بابەت ئەم شیعرانەوە خۆی دەڵێ:

ئەڤ چەند لەفزە بێ ئەدەب
من گوتن بۆ حیکمەتێ
مەقسەد من ئەو بوو سەبەب
بۆ کەیفا ڤێ سوحبەتێ
گوتنا من نابیت عەجەب
من چ گوتە هەر وە تێ



کەس چو تەعنا ل من نەدەن
کەلامێ من حیکمەتە
عینادی ژ بەر خۆ ڤەدەن
کو شیعر خۆش نیعمەتە
کەسێ وی بڤێت وەتەن
جەهوەرێ وی لوغەتە

شاعیر لە بەرگریکردنی لە وتنی ئەم جۆرە شیعرە ژیرانە ئەو ڕاستییە دەردەبڕی کە جوانکاری لە بەرهەمی ئەدەبی و هونەرییدا هەبێ و لە ڕووداوێک بدوێ لە ژیاندا بووە، ئەگەر دروستیشی بکا شایانی ڕوودان بێ، بەرهەمی لەم بابەتە لایەقی مانەوەیە. پێوەندی سێکسیی ژن و پیاو ڕووداوێکە هەمیشەیییە لە ژیانی ئادەمزاددا ئەگەر ئەمە بخرێتە قالبێکی هونەرییەوە وەکو ئەحمەد دەڵێ دەبێتە دانایی و شادی بۆ گیانی ئادەمزاد، ئەو شیعرە بەنرخە نیعمەتە، چونکە بەزمانی میللەت وتراوە و دەبێتە سامانی هونەری بۆی.

١

ئەحمەد لە شیعرێکی لەم بابەتەیدا دەڵێ:

دوهی سپێدێ وەکی مە دڤی قوزی نا
ئەوێ کچکێ گەلەک کەیفا خۆ ئینا
هەڕۆ من جارەکێ بگێ ئەی فەقێ باش
ل من دەرمان بکە ئێش و برینا
مە گوتێ بێخە دەرپێ خو ئو ڕازێ
هەما ڕازا ئو لنگێ خو هەلینا
وەسا کیرێ خو من داکر قوزێ وی
کو بو تەرم و لەش و ما ل ناڤ نڤینا
ئەز و ئەو وەک پەزی پێکڤە د مخەل چوین
کو هەر شەڤ ئەز دو جار ڕا بووم شەڤینا
وەکی من دایە بە حنگا ئەوی گوت
رەحەت هێدی تە هیلاکا مە ئینا

تە ئەز کوشتم بڤی کیرێ رەق و رەش
کو قوز ناهێتە دەرمان کە وینا

**٢**

لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

من کچەک جان دیت مەزانی موشرکە
ئەز قوزی چەند بگێم یا بێ شکە
گوت قوز ئێ بریندارە مەلا
کا وەرە هەر شەڤ دو جار دەرمان بکە
چەندی حەسکەی حازرم تو د من بنی
ئەڤ قوزە مالێ تە بێ کەرب ورکە
من لەوا ژ ڤێ عالەمی کیرێ تە خاست
چی دەما وی دیت قوزێ من ئێ لچکە
من رحا خۆ دیتنا زاتێ تەیە
مەقسەدا من یا موهم هەر بن زکە
ئەو قوزێ سپی لێڤ تەنک چمکی غەزال
هەر وەکی بەلگێ گولێ ئێ نازکە
ئێ مودەووەر شوبهی هنگوستیرەکێ
هەر بو سەر کیری شەکال و کالکە

ئەوەی نوێ بێ و داهێنانی هونەریی تێدا بێ لەم دوو بەڵگەیە و بەگشتی لە شیعرەکانی دیکەی لەم بابەتەی شاعیر ئەوەیە لە کاری ئەو سێکسەی وێنەی دەکێشی کچەکە یا ژنەکەش بەشداری دەکا. بەپێی نەریتی کۆنی کلاسیکی ژن دەوری نییە، وەکو بڵێی کارەکە تەنیا بۆ پیاو دانرا بێ، ئەمە ڕەوشتێکە بەزۆری لە ئایینەوە هەڵقوڵاوە لە کۆمەڵی میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەتی لە دەشت نشین و ناوچە کشتوکاڵییەکاندا.

***

ئەحمەد کوڕی ئەمینیناڵبەند شاعیرێکە بەرهەمی زۆر و فراوانە، کەسێک بووە خاوەن بیروباوەڕ، دڵسۆزی فیکری خۆی بووە و بەرگری لێ کردووە. لەگەڵ شیعر ژیاوە، ئەگەر



مەلایەتی کردبێ بۆ ژیان و گوزەران و پارووی نانی بووە. شاعیرێکە بەسەلیقە شیعری هۆنیوەتەوە، هەموو وێنە و دیاردە و ڕووداوێکی کردووە بەشیعر. ئەگەر ئەو قسەیە ڕاست بێ هەموو شتێک نابێتە سەرچاوەی شیعر، ئەو هەوڵی داوە زۆرترین شت بکاتە سەرچاوە. لاسایی گەورە شاعیرانی باشووری کوردستانی کردووە، بەهەوای ئەوان شیعری وتووە. شیعری میللیی کێشی خۆماڵی زۆرە. یەکێکە لەو بەهۆشانەی بەڕاستی لە شیعر گەیشتووە و بەرگری لە شیعرە کراوە سێکسییەکانی خۆی کردووە.

# بەشی شازدەم

## سەلام

## ١٨٩٢ - ١٩٥٩

### ژیانی

سەلام کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی عەبدولکەریم لە بنەماڵەی شێخانی عازەبانی ناوچەی وارماوەی هەڵەبجەیە. لە گوندی عازەبان لە ساڵی **١٨٩٢** لە دایک بووە. لە دواییدا ناوی ڕاستەقینەی خۆی کردووە بەنازناوی شیعری و لە ناو خەڵکی بە«شێخ سەلام» ناسراوە. هێشتا منداڵ بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە. خێزانی سەلام سەر بەماڵی مەحموود پاشای جاف بوون، باوکی لەگەڵ ئەودا گەرمیان و کوێستانی کردووە. سەرەتای خوێندنی لە بن دەستی مامۆستاییێکی هەورامی بووە، فێری خوێندن و نووسینی کردووە. لە پاشانا چووە بۆ ئاوایی قلیجە لای شێخ محەمەدی بەرزنجی لەگەڵ منداڵی بەگەکانی جافی ئەو ناوە خوێندوویەتی، لە دواییدا گەڕاوەتەوە عازەبان، ئەمجارەیان خوێندنی لە گوندی ئەحمەد بڕندە بووە، بۆ ماوەی دوو کیلۆمەتر کەوتۆتە لای باکووری عازەبان، بەیانییان دەچووە ئەوێ و ئێواران دەگەڕایەوە. لە دواییدا ڕووی کردۆتە سلێمانی و لە مزگەوتی شێخ عەبدولڕەحمانی عازەبانی دەستی کردۆتەوە بەخوێندن، تا ساڵی **١٩١٥** خوێندوویەتی، لەو ماوەیەدا کە هەڵسوکەوتی شار ناخۆش بووە گەڕاوەتەوە عازەبان. گوزەران و دارایی ماڵی سەلام باش بووە، مەحموود پاشای جاف چاودێری کردوون و یارمەتی داون. سەلام لەم سەرەک عەشرەتە نزیک بووە. لە ساڵی **١٩١٩** مەحموود پاشا بەهۆی سەلام نامەی بۆ شێخ مەحموود ناردووە، ئەو کاتە حوکمداری کوردستان بوو لە سلێمانی و سەرقاڵی شەڕی بازیان بوو. سەلام چاوی بەشێخ کەوتووە و نامەی داوەتێ، کە گەڕاوەتەوە لای مەحموود پاشا لە کاروباری شێخی پرسیوە، ئەویش پێی وتووە زیندووە و بریندارە و گیراوە. مەحموود پاشا لە وەرامی قسەکانی سەلام وتوویەتی: شێخ مەحموود بوو بەپیاوێکی زۆر گەورە و ڕەفیقی ئێمەمانان نییە!.

بەڕەزامەندی مەحموود پاشا سەلام گەڕاوەتەوە سلێمانی و نامەیێکی بۆ حاکمی سیاسی ئینگلیز هێناوە، ئەمە کردوویەتی بەپۆلیس تا ساڵی **١٩٢٢** لەم کارەدا ماوەتەوە. لەو ساڵەدا کە شێخ بوو بەمەلیکی کوردستان، سەلام کراوە بەکارگێڕی دەفتەری سوپا. لە



ڕۆژی نەورۆزی ئەو ساڵە ڕای کردووە بۆ سووورداش، لەبەرئەوەی سەرباز لەوێ بەدوایا دەگەڕان ناچار بوو ڕووی کردە هەورامان. لەو ماوەیەدا هەندێ ناحەز دەمیان لەو و لە خەڵکی دیکە دابوو، ئیتر شێخ مەحموود کۆمەڵێکی خستبووە بەندیخانەوە یەکێ لەوانە سەلام بوو، هی وەکو ساڵح زەکی ساحێبقڕان و فایەق کاکەمین و عەزیز قەزاز و ئەمین ڕواندزی تێدا بوو. هەشت مانگ لە بەندیخانەی سیاکوڵە لە نزیک دزلی مانەوە. لەو کاتەدا ئینگلیز سلێمانییان بەجێ هێشت شێخ گەڕایەوە سلێمانی و شێخ سەلامیش هاتەوە ئەوێ.

لە ساڵی **١٩٢٣** سەلام وەک مووچەخۆر کاری تەحسیلداری ئاوایی وارماوای پێ سپێررا. لە دوای ساڵێک گوێزرایەوە هەڵەبجە، لە پاش ساڵێکی دیکە بۆ سلێمانی. لە ساڵی **١٩٢٧** لە کاری میری دوورخرایەوە، دەستی دایە کشتوکاڵ. لە ساڵی **١٩٣٠** بەهۆی ڕاپەڕینی ٦ی ئەیلوولی بەردەرکی سەرای سلێمانی سەلام تووشی ناخۆشی و دەردی سەری بوو. لە ساڵی **١٩٣٢** بوو بەچاوەشی کرێکاران لە پرۆژەی دروستکردنی ڕێگەی پێنجوین. لە ساڵی **١٩٣٥** گەڕایەوە سلێمانی و ماوەیێک لە کردنەوەی ڕێگەی دەربەندیخان کاری کرد، ئینجا بوو بەمووچەخۆر لە کارگێڕیی کشتوکاڵ و دارستانی سلێمانی. لە دوای ماوەیێکی کەم گوێزرایەوە بۆ کارگێڕیی پاراستنی ڕووەک لە بەغدا و لە پاشانا بۆ شاری حیللە. لە ساڵی **١٩٤٠** هاتەوە سلێمانی و کارگێڕیی ڕێگەوبانی پێ سپێررا. لە ساڵی **١٩٤٣** جارێکی دیکە لە کاری میری دوورخرایەوە، لە دوای ئەمانە بوو بەکارگێڕی دەسکەوتی ناوچەیی لە شارباژێڕ.

لە ساڵی **١٩٤٤** تا ساڵی **١٩٥٥** لە کارگێڕیی سەرژمێر و کارگێڕیی دارستان لە پشدەر و هەڵەبجە و هەولێر و سلێمانی کاری کردووە. لەسەر داوای خۆی لە ساڵی **١٩٥٥** خانەنشین کراوە، ئیتر دەستی کردووە بەکشتوکاڵ و زیاتریش خەریکی نووسین و هۆنینەوەی شیعر و لێکۆڵینەوە بووە لە ئەدەب و مێژووی سەردەمی کورد.

سەلام مرۆڤێکی ئازا و قسە لە ڕوو بوو، ئامادە بوو بەبێ ترسی وەرامی هەموو پرسیارێک بداتەوە، زمان ڕەوان و نوکتەچی بوو، لە هیچ هەڵوێستێکدا دانەدەما. قسەکانی کۆمیدییێکی دڵگیرانە بوو، ئەمە لە نووسینیدا تا پلەیێک ڕەنگی داوەتەوە.

سەلام لە ڕۆژی **٣**ی مارتی **١٩٥٩** لە گوندی دۆڵان لە ناوچەی قەرەداغ کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی هێنراوەتەوە سلێمانی و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

## شیعری

### دیوانی سەلام

سەلام هێشتا لە ژیانا بوو کە چاپی یەکەمی دیوانی بڵاوکرایەوە (١٩٥٨). ئەو دیوانە بوو بەسەرچاوە بۆ چاپی دیکە. بەهۆی سانسۆری میری لە سەردەمی دەسەڵاتی مەلیکی و دەسەڵاتی کۆماری عەبدولکەریم قاسم هەندێ بۆچوونی سەلام لە شیعریدا بەهیچ جۆرێ شایانی بڵاوکردنەوە نەبوون، لەبەرئەوە ئەو جێیانە بەبەتاڵی مانەوە بەهیوای ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان پڕ بکرێنەوە. چاپی دووەمی دیوانەکە (١٩٩٠) کەڵکی لەوەدا بوو هەندێ شیعری تازەی تێدا بڵاوکرایەوە. بەڵام لە بارەی جێگەی بەتاڵی شیعرەکان لە چاپی دووەمدا زیاتر بوو لە چاپی یەکەم، چونکە سانسۆری دەسەڵاتی پارتی بەعس لە عیراق (١٩٦٨ – ٢٠٠٣) سەختتر و دژوارتر بوو لە سانسۆری دەسەڵاتی مەلیکی و کۆماری عیراق. هەر چۆنێک بێ چاپی یەکەم لە دیوانی سەلام سەرچاوەی بنچینەییە بۆ لێکۆڵینەوە لە سەلام و شیعری لەم بەشەی ئەم کتێبە کە لە بابەت سەلامەوەیە، هەموو ئەو بەڵگانەی وەرگیراون و بۆشاییان تێدایە لە هەردوو چاپی دیوانەکە پڕ کراونەتەوە و بۆ یەکەمین جار خوێنەری کورد ئاشنایان دەبێ.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

سەلام لەگەڵ ئەوەی لە شاعیرانی میللیی خۆماڵی و شیعری نوێ دەژمێررێ، مەشقی سەرکەوتووانەی لە شیعری عەرووزیدا هەیە. بەحرەکانی ڕەمەل و هەزەجی بەکارهێناوە، لەسەر یەکێتیی قافیە ڕۆیشتووە و هەندێ لە دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی کردووە بەقافیە و پاش قافیەی پشتگوێ نەخستووە. لەم بابەتە شیعرە قەسیدەی کەمە و لیریکی زیاترە.

شاعیر لە لیریکی کێشی سیلابی خۆماڵیدا باڵایە، بەشی هەرە زۆری شیعری لەسەر کێشی دە بڕگەییە، لە هەشت بڕگەییشی هەیە. لە ڕووی قافیەوە زۆربەی ئەم جۆرە شیعرەی جووت قافیەیە (مەسنەوی) (ا ا ب ب جـ جـ...). جگە لەوە ئەم قافیەش بەرچاو دەکەوێ (ا ب ا ب). کۆمەڵێک قەسیدەی درێژ (پۆیێم)ی هەیە لە بەرهەمە جوان و ڕەنگینەکانی دەژمێررێن.

سەلام لە هونەر و بابەتەکانی دیکەی شیعر موستەزادی زۆرە. تەرجیع بەندی هەیە،



قەسیدەی شەشین (ا ا ا ا ب ب) لای ئەو کەمترە. کۆمەڵێک چوارین و تاکیش لە دیوانیدا بەرچاو دەکەون. پێنج خشتەکی هەیە لەسەر شیعری مستەفا بەگی کوردی و حەمدی ساحێبقڕان.

### شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

سەلام خەریکی زۆرینەی بابەتەکانی شیعری کلاسیکی و شیعری سیلابی خۆماڵی بووە، وەکو وەسف و دڵداری و یادی دۆست و برادەران. شینی بۆ کەسانی نزیکی خۆی کردووە وەکو حەمدی ساحێبقڕان و ئەمین زەکی و کەریم بەگی جاف و مارف جیاووک و کاکە حوسێنی شێخ عەبدولکەریمی کرپچنە. بەڵام لەمانە لە هەموویان زیاتر وێڵ و سەرگەردانی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی بووە. دژی فەرمانڕەوایانی ناوەوە لە کاربەدەست و ئاغا و دەرەبەگ و شێخی تەریقەت وەستاوە، ڕەخنەی لە تورک و عەجەم و عەرەب گرتووە. لەسەر کرێکار و هەژار و بێ نەوایانی کردۆتەوە.

هەندێ کردەوەی دەسەڵاتی تورک و عەجەم و عەرەب لە ئەندازە بەدەر بەرامبەر بەکورد خراپ بووە، ئەمە کاری یەکجار گەورەی کردۆتە سەر سایکۆلۆجییەتی شاعیر، ئیتر هەستی نەتەوەیی بەکوڵ تەقیوەتەوە، بەناوی میللەتانی عەرەب و تورک و عەجەمەوە هێرش دەباتە سەر سەرۆکەکانیان بەپەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ئەدەبی میللی قسەیان پێ دەڵێ و قەشمەرییان پێ دەکا. ئەمە کارێکی ڕەوایە مێژووی ئەدەبی هەموو میللەتان دەوڵەمەند دەکا. لەم لایەنەوە سەلام دەلاقەیێکی لە ئەدەبی میللی پڕکردۆتەوە. بەهیچ جۆرێکیش نابێتە بەڵگەی شۆڤێنیزم، چونکە لە بەرهەمی شاعیری میللەتێکی ستەمدیدەی زوڵم لێکراو کەوتۆتە ناوەوە.

### زمانی

سەلام زمانزانێکی کوردی بێ هاوتا بوو، هەوڵ و کۆششی زۆرە بۆ بەپەتی کردنی نووسین بەزمانی کورد. ئەم ئامانجەی تەنیا لە نووسینی شیعر نەهێناوەتە دی، بەڵکو لە مەیدانی پەخشان و ڕەخنەدا ئەسپی خۆی تاو داوە. لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا کەم کەس بووە خۆی لە قەرەی تۆفیق وەهبی بدا لە زمانەوانیدا. هەروەها تۆفیق وەهبییش ئامادە نەبووە بکەوێتە چەندوچوون لەگەڵ هەموو کەسێکی تەنیا خۆی دان بەخۆی دابنێ و خۆی بەزمانەوان بزانێ، کەچی تۆفیق وەهبی ڕێزی لە سەلام ناوە و خۆشی ویستووە. سەلام

وتارێکی لەسەر هەندێ لە بیروڕاکانی تۆفیق وەهبی نووسیوە و بۆ خۆی ناردووە. ئەویش بەشانازییەوە بۆی بڵاوکردۆتەوە و ئینجا تێبینیی خۆشی تۆمار کردووە (وتاری سەلام سەردەقی شکاند، دەنگی گێتیی تازە، ژ ٦، ١٩٤٤). جگە لەوە خاوەنی ئەم کتێبە لە تۆفیق وەهبی بیستووە شایەدی بۆ سەلام داوە کە یەکێکە لە کوردی زانە زیرەکەکانی ڕۆشنبیرانی کورد.

## وەرگێڕانی چوارینەکانی خەیام

تا ئێستا ژمارەیێکی زۆر لە وەرگێڕانی چوارینەکانی خەیام بۆ زمانی کوردی کەوتوونەتە ناوەوە. زۆریان بڵاوکراونەتەوە و هەندێکیان بەچاپ نەگەیشتوون. ئەوەی سەلام یەکێکە لە وەرگێڕانە باشەکانی ئەم چوارینانەی بوون بەسامانی هەموو مرۆڤایەتی. سەرکەوتنی سەلام لەم کارەیدا زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی چوارینەکانی لەسەر کێشی دە بڕگەیی سیلابی خۆماڵی هۆنیوەتەوە، ئەمە لە کێشە سووکە مۆسیقییەکانی ئەدەبی سەرزاری میللیی کوردییە. جگە لەمە سەلام شارەزا بووە لە نهێنییەکانی هەردوو زمانی کوردی و فارسی.

## پەخشانی سەلام

پەخشانی سەلام نموونەی شێوازی تازەی نووسینی پەخشانی کوردییە. وشەی پەتی بەکار دێنێ. شارەزاییێکی تەواوی لە زاراوەی پیشەسازی شار و کشتوکاڵی گوندایەتیدا هەیە. نووسینی لە کۆوارە کوردییەکاندا بەرچاو دەکەون. یەکێ لە چیرۆکە جوانەکانی ئەوەیە بەناوی «یا مەنە یا هۆقە، نە مەنە نە هۆقە». تۆفیق وەهبی لە کۆواری دەنگی گێتیی تازە (بەغدا، ژ ٣، ١٩٤٤) بۆی بڵاوکردۆتەوە.

لەم چیرۆکەدا باس لە کابرایێکی سادە دەکا، تا بووە بەپیاو لە گوند ژیاوە و چاوی بەشار نەکەوتووە. لە ماڵی خۆیدا هانی دەدەن بچێ و شار ببینێ و هەندێ شتومەکیان بۆ بکڕێ. کابرا لە شار داوا لە دوکاندار دەکا مەنێک خەنەی بداتێ، یا هۆقەیێک قوماشی پێ بفرۆشێ! بەشێوازێکی ساتیرانەی پڕ لە گیانی کۆمیدی بەسەرهاتی دەشتەکییێک لە شاردا دەگێڕێتەوە کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ شارستانییان ڕێک ناکەوێ.



## نموونەی شیعری

زۆربەی شیعری سەلام لە بابەتی لیریکە، هەندێ قەسیدەی درێژیشی هەیە. جارێ لەگەڵ لیریکەکان.

### دڵداری

لە ساڵی **١٩٣٦** سەلام لە بەغدا بەناوی «عەشق و سەرەمەرگ» شیعرێک دەهۆنێتەوە:

دڵی بردم وەکو ئاسک بەلەنجە هات و تێپەڕ بوو
دەخیلە پێم بڵێن کێ بوو لە کوێوە هات و بۆ کوێ چوو!
نییە حاجەت بەبەنجم وا بەبۆنی زولفەکەی مارگرید
شوعوورم لا نەما عەقڵم فڕی هۆش و دڵم لێ چوو
لەگەڵ برژانگی چاوی هەڵبڕی باڵێکی چاوی دا
ئیتر هەر دڵ بوو هەڵقرچا جگەر کون بوو گڕم تێچوو
بەیادی خاڵی لالێوی بەدایم دڵ ئەناڵێنێ
بەڵێ سەرسەخت و بێعارم لە مردندا فرەم پێچوو
ئەوانە وا ئەڵێن شێخین ئەکەن مەنعت لە دەرد و دڵ
وەرە ئیمانی لێ بکڕین لە بەرچاوت بە سێ بێچوو

سەلام لە کاتێکدا لە نەخۆشخانەیێکی بەغدا نەشتەرگەری جیگەر کراوە، ئەو کچەی دەرزی بەنجی لێداوە جوان بووە، ناوی مارگریت بووە، ئیتر وەکو خۆی دەڵێ، دڵی لای چاوی کاڵی ئەو کیژە بووە زیاتر لەوەی بیر لە ئەنجامی نەشتەرگەرییەکە بکاتەوە. لە شیعرەکەدا ئاماژە هەیە بۆ نەریتی میللیی ناو کوردەواری نەخۆش دەبەنە لای شێخی تەریقەت بۆ ئەوەی دوعای لەسەر بخوێنێ و چاک ببێتەوە، بەڵام ئەوە ڕاست نییە شێخ ئیمانی بە سێ بێچوو دەفرۆشێ. ئەمە ناوی پارەیێکی کەم نرخە. لە پاشانا یەکێکی وەکو مارگریت پیاو بەنج بکا دوعای شێخ لە کوێ دەوەستێ!.

## کوردایەتی

١

بەهۆی نەشتەرگەرییەوە ئەگەر سەلام لە شیعرەکەی پێشوودا خەریکی کچە جوانەکە بووبێ، هەر لەو کاتەدا شیعرێکی بۆ بیری کوردایەتی بەناوی «کەی کورد ئەجوولێ!» وتووە:

وەکو قەومی تر کەی کورد ڕاپەڕێ!
لە حوقووق هەڵچێ لە تەماع گەڕێ
دەروونی بەکوڵ بۆ کورد بجۆشێ
خۆی فیدا بکا وەتەن نەفرۆشێ
بگری بڕێژێ فرمێسکی خوێنین
هەتاکو وەتەن دێتە پێکەنین

***

نەمێنێ بمرێ هەموو پیاوی پیر
نەک بۆ ئەم و ئەو ببن بەگزیر
لە جێی ئەمانە نیشتمانی کورد
بەبەرهەم بێنێ منداڵانی وورد
وەک فەرەنسا بۆ ئەلزاس و لۆرەن
کورد وەها یادی کوردستان بکەن

***

خەریتەی هەموو خاکی کوردستان
دایک بەدەرزی و دەزوو دروومان
بنووسێ لەسەر سەربێشکەی مناڵ
هەر بەکوردستان بێتە گرۆگاڵ
لە بێشکەی وادا چاو هەڵنەهێنێ
درۆیە هەڵسێ تۆڵە بسێنێ

شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە کورد بەبێ قوربانی ناگاتە ئامانجی. پێویستە چاو لە



میللەتانی دیکە بکا وەکو فرەنسا چۆن ناوچەکانی ئەلزاس و لۆرێنی لە ئەڵمانیا بەخەبات سەندەوە، کوردستانیش پێویستە بەم جۆرە ڕزگاری ببێ. بەلای شاعیرەوە پیر دەبێ نەمێنێ، چونکە لە کەڵک کەوتووە، منداڵ دەبێ پێ بگا چونکە هیوای دواڕۆژە. سەلام شاعیرانە بۆ مەسەلەی نیشتمانی کورد چووە کە دەڵێ پێویستە دایک نەخشەی کوردستان لەسەر لانک بنەخشێنێ لە ناو لانکی وادا گەورە نەبێ ناتوانێ تۆڵە بستێنێ.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «کورد»ەوە لە ساڵی ١٩٥٦دا دەڵێ:

کورد هەمووی دڵسۆزە ئەمما پیاوی هوشیاری کەمە
ئەو کەسەی پیاوە خەریکی میحنەت و دەرد و غەمە
من بەمەنتیق هەر قیاسی وەزعی کوردستان ئەکەم
حاسڵی ئاخر نەتیجە چاوڕاوە و هەمهەمە
دەستەپاچە بێ زمانن ڕووبەڕووی بێگانەکان
خۆ بەخۆی خۆیان دەمانچە و خەنجەر و شیر و قەمە
بوو بەدۆزەخ نیشتمانت پڕ لە دیل و بەندییە
خۆ بەهەشت بوو سەیری کە ئەم شاخ و دەشت و گوێی چەمە
بێشەیی شێرانی ماد و جەرگەیی کوردانی گورد
مامەڕێوی خۆی و کلکی تیا ئەکا گاڵتە و گەمە
کوردە هەڵسە ڕاپەڕە تاکەی وەها تۆ دیل ئەبی
قەومی سەربەرزت بەجارێ ژێر چەپۆکەی عالەمە
ئاسمانی عەدل و عیرفانی زەمانی عەسری نوور
هەر لە عاستی قەومی کورد تاریک و نووتەک هەر تەمە
بۆ برینی زام و ناسۆری سیاسەت بێ حەکیم
ئیتتیفاق و یەکێتی وەک پانسلین و مەڵحەمە

لەم شیعرەدا سەلام هەندێ ڕاستی لە بارەی کۆمەڵی کوردەوارییەوە خستۆتە ڕوو بەوەی میللەت دڵسۆزە، بەڵام پیاوی هوشیاری کەمە. ئاسایش لە ناوەوە نییە، دووبەرەکییە، کوشتن و برین زۆرە، ئاوڕ لە مێژووی کۆنی پڕ لە شانازی نادەنەوە. ڕێز لەوە ناگرن لە نەوەی مادەکانن. ئیتر هانیان دەدا هەوڵ و کۆشش بکەن بۆ یەکێتی.

بەم دێڕانە و بەشێوازێکی سیمبۆلییانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

هیچ گەلێ بێ پێشەوا پێشکەوتنی هۆزی نەدی
چۆن بەبێ شوان ڕائەگیرێ مێگەل و ڕان و ڕەمە
وا گوریسێکی سیاسەت بادراوە گورزەهۆن
ڕایئەکێشن جووڵە ناکا کورد لە جێی خۆی مەحکەمە
وورزەهۆنە ئەم گوریسە بەڵکی شیرازەی هەیە
هێزی کوردە لابەرێ شیرازە وو هەم شەرزەمە
بێ محامی بێ تەشەببوس حەققی خۆی داوا دەکا
ڕووت و قووتی و ناتەواوی شاهیدن بۆ مەحکەمە
خاک و ئاوی بەشکراوە سوخرەکێشە پیاو و ژن
مەحکەمەی عەدلی دووەل تەمسیل ئەکا مامەخەمە
تۆ بڵێی ڕۆژێ بەلای کوردا فەلەک چەرخێ نەدا
دەربخا نەجمی سەعادەت ڕاپەڕێ کورد ئەودەمە
هیچ گومانی تیا نییە تەئریخ و نۆرە و دەورەیە
ڕۆژی شین ئەلبەت ئەبێتە ڕۆژی شایی و زەمزەمە

لەم دێڕانەدا ڕستەی «گوریسی سیاسەت» هاتووە. شاعیر مەبەسی لە پەیمانی سەعد ئاباد (١٩٣٧) و پەیمانی بەغدایە (١٩٥٦). ئەو گوریسە بەچوار لیپ زۆر بتەو هۆنراوەتەوە، مەبەس لەو چوارە بەریتانیا و تورکیا و ئێران و عیراقە (ئینگلیز و تورک و عەجەم و عەرەب).

بەریتانیا دەستی بەسەر ئەو سێ وڵاتەدا داگرتووە و نەوتیان تاڵان دەکا و لە کاتی پێویست بەکوردیان بەر دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر گومانی لەوەدا نییە کورد هەر دەگاتە مرازی خۆی.

٣

لە شیعرێکیدا لە ساڵی ١٩٣٤ لە بەسرە بەناوی «نامەوێ» وتوویەتی:

نامەوێ خورما خودایە بۆچی بەسرەم تووش ئەکەی
کوێر ببم لام چاکترە تۆ ڕووم لە ڕووی حەنتووش ئەکەی



من لە شاخا گەورە بووم و هەر بەسەربەرزی ژیام
تازە من فێری دەسیسە و حیلە وو کرنووش ئەکەی
ئەسپی نەژدیم تاو ئەدا یاخو کەحێلەی زینکراو
ئێستە من سواری کەرێک یا ئێستری چەمووش ئەکەی

شاعیر گلەیی لەوە دەکا ناتوانێ لە سروشتی گەرمی شاری بەسرە بژی، خورما بخوا و لە نزیک دانیشتوانییەوە بێ. ناوی «حەنتووش»ی کردووە بەڕەمز بۆ عەرەب. سەلام لە ناو شاخدا پەروەردە بووە، سواری ئەسپی کەحێل بووە، ژیانی بەسرە بەلای ئەوەوە لە سواری کەر و ئێستری چەمووش دەکا، دیارە ناتوانی لەگەڵ ژیانی وادا ڕابێ!.

## قەسیدە درێژەکانی

١

### ساقینامە

ساقینامە هونەرێکی شیعرییە شاعیرانی کلاسیک پەنایان بۆ دەبرد، لە مەیگێڕ نزیک دەبوونەوە، لە پێناوی ئەوەی سەرخۆشیان بکا تا بتوانن ئەوەی لە ناو دڵیان دایە بیکەنە دەرەوە. سەلام ئەم ساقینامەیەی بۆ ئەوە نووسیوە هەرچی لە ناو دڵیەتی لە بابەت کوردەوە دەری ببڕێ. لە ڕێبازی کۆنەکان چۆتە دەرەوە، ئەوان ئەم بابەتە هونەرەیان بۆ مەبەسی دڵداری بەکار دەهێنا، ئەم بۆ مەبەسی کوردایەتی بەکاری دێنێ. ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٣٨ لە شاری حیللە نووسراوەتەوە. لە هەندێ لە دێڕەکانی ساقینامەی سەلام ئەمە هاتووە:

وەکو من گەر بزانی قوڕ ئەپێوی
بەبێ شک زوو ئەدەیتە شاخ و کێوی
قەرارێکە لە سێ لاوە دراوە
نەمێنێ قەومی کورد و سەر بزێوی

***

لەبەرچی سێ بەشە ئەم لالەزارە
لەبەرچی کورد بێ لانە و هەوارە

سەیری کە چ سرڕێکی عەجیبە
لە خاکی کوردستانا کورد غەریبە

***

هەموو گەورە و شەریفی کوردەواری
لە سێ لاوە کراون خانەشاری
لە پاداشا عەرەب کوردی ڕەش و ڕووت
وەکو جەربووعی سەحرا زووکە دەل قووت
ئەگەر عارەب دەڵێ من جینسی سامم
لەگەڵ ئاری نەژادا دوورە کامم
وەرە لای کاکی ئاریت قەومی ئێران
ببینن ناڵە وو فەریاد و ئەفغان
سەراسەر کوردی بێچارەن کە دیلن
لە پێوەندا لە ژێر کوتا ڕەزیلن

***

هەتا شێخی درۆ و حیلە بمێنێ
درۆیە کورد بجوولێ حەق بسێنێ
هەموو دەرویش و مارگر زەرگ وەشێن
ئەمانە ڕاپەڕن تۆڵە بسێنن
درۆیە کەی بەهەشتم بۆ ئەوانە
بەهەشتی من ڕەوشتی پاک و جوانە

شاعیر لە هەڵسوکەوتی خاکی کوردستان دەدوێ لە دوای جەنگی دووەمی گێتی و دابەشکردنی و بوونی بە سێ بەش، ناوی بەو دەوڵەتەوە بەسترایەوە کە پێیەوە لکێنرا بوو. تورک و عەرەب و عەجەم لە گەڵێ مەسەلەی سیاسی گیروگرفتیان هەبوو کەچی لە مەسەلەی کورد و تا ئێستاش ڕێکن و یەک دەنگن. سەلام هوشیارانە بۆ مەسەلەی کورد چووە، ژیرانە و ڕۆمانتیکییانە دەڵێ ئەگەر عەرەب کوردیان خۆش ناوێ لەبەرئەوە بێ ئەوان سامین و کورد ئارییە، ئەدی بۆ فارس بەربەرەکانی کورد دەکەن خۆ هەردووکیان لە یەک نەژادی ئارین! مەبەسی شاعیر لە ئاری هیندوئەورووپییە. لەو شیعرەدا سەلام هەندێ



هۆی نەگبەتیی کورد دەگەڕێنێتەوە بۆ کردەوەی تەریقەتی دەروێشی لە کوردستاندا وەکو تەگەرەییێکی کۆنەپەرست ڕێگە لە پێشکەوتن دەگرێ.

٢

## بۆ کۆمەڵی ئەقوام

سەلام بەناوی «بۆ کۆمەڵی ئەقوام»ەوە تەرجیع بەندێکی لە ساڵی **١٩٣١** لە سلێمانی هۆنیوەتەوە لە چوار پارچەیێک هاتووە، لە پارچەی یەکەمدا دەڵێ:

عوسبەتولئومەم کۆمەڵی گەورە
بەپێچ و پەنا بەفێڵ و دەورە
لە دوور بەدوو ڕوو بۆ حەقی کوردان
تەکانت ئەدا خۆت دائەشرنگان
بەجۆش و کوڵ بووی بۆ کوردی هەژار
ئەتگوت ئەم قەومە ئەکەم ڕستگار
لیجنەی ئینتیداب مەرەخەسی هات
گەڕا کەشفی کرد سەراسەر وڵات
ئەگەر ڕاست ئەکەی هەڵیسووڕێنە
بەس بۆ سیاسەت هەڵمانپەڕێنە
تەریق نابیت و تۆ چیت پێ ئەکەن
کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن

لەم دێڕانەدا سەلام ڕاستیییێکی مێژوو دەخاتە ڕوو. لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی و لەناوچوونی دەوڵەتی عوسمانی و دابەشبوونی خاکی کورد، لیجنەییێکی تایبەتی کۆمەڵی نەتەوەکان لە شاری جنێڤی سویسرەوە لە ساڵی **١٩٢٥** هات بۆ مووسڵ و شارەکانی هەموو کوردستانی باشوور گەڕا بۆ بیروڕا وەرگرتن لە بابەت ویلایەتی مووسڵی کۆنەوە (لە دواییدا کوردستانی عیراق) بۆ ئەوەی بزانن خەڵکەکە سەربەخۆیی دەوێ یا ئارەزووی ئەوە دەکا بەعیراقەوە بلکێنرێ. بەڵام لەبەرئەوەی کۆمەڵی نەتەوەکان وەکو سەلام دەڵێ کوتەکی دەستی میستەر هەندرسنی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بوو مافی کورد خرایە ژێر پێیەوە.

لە پارچەی دووەمدا سەلام دەڵێ:

بۆ ئەقەللیات کەوتیتە سەما
خزمی نەستووریت لە کوێ بنیات نا
هەر بەهیچ و پووچ بەم دەنگوباسە
تۆ خوێنی کوردت بۆ کردە کاسە
هەر چوار دەورمان لێ بوو بەدوژمن
ئێران و تورک و عارەبی کوڵکن
نوفووسی ئێمە کەم ئەکەیتەوە
وەها نەستووری ڕێک ئەخەیتەوە
لە عەدالەتا کەی ئەمە دەئبە
یاخۆ هەر شێوە و ئوسووڵی غەربە
کۆمەڵی درۆ جێگەی مەکر و فەن
کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن

لەم دێڕانەدا سەلام گفتوگۆ لەگەڵ کۆمەڵی نەتەوەکان دەکا، ئەوەی بۆ ڕوون دەکاتەوە کە لەسەر میللەتە بچووکەکانی دەکردەوە مەبەس خزمە نەستوورییەکانی بوو (ئاسوورییەکان)، هەروەها تورک و عەجەم و عەرەبی لە کورد کرد بەدوژمن. بۆ ئەم ئامانجە ژمارەی سەرژمێریی کورد کەم دەکاتەوە بۆ ئەوەی قازانجی نەستوورییانی تێدا بێ.

لە پارچەی سێیەمدا سەلام دەڵێ:

خۆ تۆ وەسی بووی ئەقوام بوون هەتیو
دەمی کوردت کرد بەتەڵەی تەقیو
غایە ئاسووری ناوی کورد بردن
لایق بەخۆتە پێچ ناوئاخن
تا تۆ نەگەڕای بەناومانا
دەستمان گرت بوو بەکلاومانا
بۆچ کوردت فەوتان بەم بەنوباوە
ئێستەش لە جنێوە خۆت مەلاس داوە



مەنشەئی فیتنە کۆمەڵی تەزویر
وا ئەدەی حەققی ئەقوامی سەغیر
کارخانەی فەسادی کۆمەڵی میحەن
کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن

لەم دێڕانەدا سەلام لەسەر گفتوگۆی دەڕوا لەگەڵ کۆمەڵی نەتەوەکان، پێی دەڵێ و لێی دەپرسێ، تۆ پارێزەری نەتەوەکان بووی بۆ چ یارمەتیی کوردت نەدا، بەناوی کوردەوە داوای مافی ئاسوورییانت دەکرد، لەبەرچی کوردت بەفەتارەت دا! لەبەرئەوە تۆ سەرچاوەی ئاژاوە و فەسادی.

لە پارچەی چوارەمدا سەلام دەڵێ:

لە عەدالەتتان واقم وڕ ماوە
لە سیاسەتتان سەرم سوڕ ماوە
خوێنی میلیۆنێ کورد ئەڕژێنی
بۆ ئەوەی تۆزێ تورک بترسێنی
خوێنی مەزڵوومی کوردی ڕووت و قووت
حەلاڵە لە لای عارەبی لنگ ڕووت
لە سلێمانی جاددەی بەر سەرا
بەخوێناوی کورد ئاوڕشێن کرا
تۆ نەبی نایکا دوژمن بەدوژمن
حەق بۆ نەستووری ئێمە بۆ کوشتن
چۆن عاجز نابی لەم خوێن ڕشتنە
لە لای تۆ ئەلبەت حوقووق کوشتنە
ناترسی تەئریخ لەعنەتت بکەن
کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن

لەم دێڕانەدا سەلام هەموو سەرنەکەوتنێکی تووشی کورد بووە دەگەڕێنێتەوە بۆ هەڵوێست و بڕیارەکانی کۆمەڵی نەتەوەکان بۆ چاکەی هاوسێکانی کورد و کەمە نەتەوایەتییەکانی دانیشتوانی کوردستان وەکو ئاسوورییەکان. لەو کاتەدا ئەمپریالیست

بەتایبەتی بەریتانیا لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆی بەناوی مافی تورک و عەرەب مافی کوردی پێشێل دەکرد، بەڵگە بۆ ئەمە بەدەستی دەسەڵاتی عەرەب بەردەرکی سەرای سلێمانی لە ڕۆژی ٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ بەخوێنی کورد ئاوڕشێن کرا. دانانی ئەم هەموو پیلانانەی کارەساتیان لێ کەوتەوە بۆ کورد هەندرسنی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بوو وەکو شاعیر بۆی چووە.

٣

**بەیادی ئێل بەگی جافەوە**

شاعیری میللیی کوردی ناودار ئێل بەگی جاف (١٤٩٢ - ١٥٥٣) قەسیدە میللییەکەی «دایکە دەرۆم بۆ داڵەهۆ» لە کوردەواریدا بەناوبانگە. هەندێ جار بەناوی «پێشبینییەکانی ئێل بەگی جاف»یش بڵاوکراوەتەوە لەسەر بنچینەی قەسیدەی پێنجینی هەشت بڕگەیی و قافیەی (اااا ب) دامەزراوە، لە هەموو پێنجینەکاندا نیوە دێڕی پێنجەم دووبارە و سێ بارە کراوەتەوە «هەر وا بووە و هەر وا دەبێ».

سەلام لە ڕووی ڕوخسارەوە ئیلهامی لە ئێل بەگی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٥٢ لە سلێمانی قەسیدەیێکی لەسەر بنچینەی شیعری خۆماڵی هەشت بڕگەیی داناوە. سیستێمی قەسیدەی شەشینی هەڵبژاردووە، قافیەی (اااا ب ب)یە. لە هەڵبژاردەی ئەم شیعرانەدا دەڵێ:

دنیا هەموو چاو و ڕاوە
فڕوفێڵ و بەن و باوە
ڕاستە ڕاستی هەڵگیراوە
درۆ و هۆشە بەلێشاوە
من لە درۆ گوێ ناگرم
ڕاستیم ئەوێ هەتا ئەمرم
ئەمڕۆ ڕۆژی هۆش و بیرە
دەعوا لەسەر نەوت و قیرە
ووریا بوونی لاوی ژیرە
یەکگرتنی جوان و پیرە



پارەی نەوت و پارەی ئیعمار
وەزیر ئەیخوا نەک کرێکار
بابە عورفی حوکم بدەن
هەردوو قاچم کۆت و پێوەن
هەردوو دەستم کەلەپچە کەن
بەشەو بەدار زۆرم لێدەن
ئازاد ئەبم ئازاد ئەبم
بەسەربەستی من شاد ئەبم
سجنت پڕ کرد لە ڕۆڵەی لاو
پێوەن لە پێ دوو دەس بەسراو
بەمەترەلوێز هەندێ کوژراو
بێباک لە شەعبی سک سووتاو
بۆ کوێ ئەچی خوێن ئەتگرێ
قاتیل ئەبێ بمرێ بمرێ
شەعبت سکی وا سووتاوە
ڕەحمی بەتۆ هیچ نەماوە
ڕۆڵەی لاوی لا کوژراوە
داغمەی بەسەر دڵیا ناوە
جێگەت وەها پێ لەق ئەکا
لەسەر پێستت تۆ شەق ئەکا
شەعبت هەمووی ڕەنجەڕۆیە
چاوەڕوانی نان و دۆیە
حەپس و کوشتن ئیشی تۆیە
لە هەر ماڵی ڕۆڵە ڕۆیە
کچ و کوڕیان بەدیل گیران
لە ناو سجنا پێوەند کران

له دوای جەنگی دووەمی گێتی له عێراق «ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوە» دانرا. له پاشانا بوو بەوەزارەت، ئەم دەسگایه خزمەتی ئاوەدانکردنەوەی هەبوو، بەتایبەتی له شاری بەغدا. بەڵام سەلام باس له لایەنه خراپەکانی دەکا. کۆمپانیاکانی بێگانه و وەزیر و دەوڵەمەندانی عێراق سوودیان لەو ئاوەدانکردنەوەیه وەردەگرت. تیرۆر له ناوەوە بوو، دادگای سوپایی (عورفی) ناوە ناوە دادەمەزرا. ڕەش و ڕووت دەگیران، ئازار دەدران. بەشێکی زۆر له پارەی نەوتی وڵات که بۆ ئاوەدانکردنەوە تەرخان کرابوو دەچووە گیرفانی خاوەن کۆمپانیاکانی ئەوروپا و وەزیر و دەوڵەمەند و دەرەبەگ و کاربەدەستانی عێراقەوە. بەشێکی زۆر له میللەتیش له برسانا دەینالاند.

٤

**قوتابخانەی کوردستان**

له بابەت تێکچوونی شیرازەی ژیان و دواکەوتوویی کۆمەڵی کوردەواری سەلام قەسیدەییێکی درێژی له ساڵی ١٩٤٤ له شاربازێڕ هۆنیوەتەوە. لەو شیعرەدا قوتابخانەییێکی بەناوی کوردستانەوە دامەزراندووە، له ئەوروپاوە مامۆستای بۆ هێناوە، تەنیا کارگێڕی قوتابخانەکە کورد بووە هەموو بەیانیان ناوی قوتابیان بەم جۆرە دەخوێندرایەوە:

نیفاق ئەفەندی حازر ئەفەندم
ئیتتیفاق کوانێ! چوو بۆ جەهەننەم
درۆودەلەسە قوربان حازرین
هەردووکمان لێرەین ئێمە داخڵین
ڕاستی و سەداقەت میرم دوو بران
یەکی بەدوو ساڵ پار مەحکووم کران
وەتەنی کوانێ بۆ دیار نییە!
وا ساڵ تەواو بوو بەهانەی چییە!
ئازادی کوانێ! بانگی بکەن زوو
قوربان ئەبەدی پێرار مەحکووم بوو
عەدالەت کوانێ! له کوێیە ئەدەب!
تەردن یاساغە چۆن دێنە مەکتەب



نەخۆشی! بەڵێ حازر لەسەر پێ
هەردوو لام فەوتان چ شار چ لادێ
کوانێ سەربەستی لەم ساختمانە
پۆلیس ڕاپێچا بۆ بەندیخانە
زانستی کوانێ ئەویش بۆی دەرچوو
مەحکوومی حوکمی عاشەیەری بوو
جەهل له کوێیە! لێرەم ڕۆژ و شەو
خەریکی ئیشم لێم حەرامە خەو

سەلام بە شێوازێکی کۆمیدیانە وێنەی شپرزەیی له ناو کۆمەڵی کورددا دەکێشێ. ئەو قوتابخانەیەی دایمەزراندووە بۆ دواکەوتووانە. قوتابیانی ڕەمزی پێشکەوتن لەوێ نین. شاعیر له قەسیدەکەیدا سوورە لەسەر ئەوەی له ژێر سایەی سەربەستی و ئازادی نەبێ کۆمەڵ پێش ناکەوێ، بەبێ خوێندەواریش ڕزگاری نابێ له دەست ئەمپریالیستی بێگانەی ئەوروپا.

٥

**بەیادی سالم**

سالم شیعرێکی بەناوبانگی هەیە لەسەر بەحری ڕەمەلی هەشتی مەقسوور هۆنیویەتییەوە، بۆ کارەساتەکەی شاری سلێمانی وتووە له ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمدا که سوپای عوسمانی میرنشینی بابانی ڕووخاند، سەرەتاکەی دەڵێ:

لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم دەستەئەژنۆ کەف زەنان
گێژەڵووکەی بای نەدامەت تاری کرد سەفحەی جیهان

ئەم شیعرە بەرزە بووە سەرچاوەی ئیلهامی سەلام و قەسیدەییێکی زیاد له حەفتا دێڕی لەسەر کێش و قافیەی شیعرەکەی سالم له ساڵی ١٩٥١ له هەولێر هۆنییەوە. له هەڵبژاردە قەسیدەکە ئەم دێڕانە دەکەونە بەرچاو:

هەر ئەبێ یادت بکەم ئەی شاعیری گەورەی بەبان
(سالم)ی سالم سیفەت ئەی نوتفەیی ساحیبقڕان

مەن ئەگەر یادت نەکەم کێ بێ ئەبێ یادت بکا
عالەمی مەشغوولی پارە و ڕوپیە وو فلس و قران
تۆ لە دەستی زوڵمی تورک و جەهلی زۆری قەومەکەت
شیعرەکانت ناڵە وو فەریادە تا دەوری جیهان
بوون بە سێ بەش قەومی کوردت وەک ئەسیری حەربی کون
ماڵ و سەریانە حەڵاڵی دوژمنانی نیشتمان
بۆچ حوکوومەت گاڵتەیە سا سەیری ئیجرائاتی کە
نەجمەدین ماکەرسەرە بۆ چ کۆریایە کوردسان
وا لەیەک بەربووین هەموو عەینەن وەکو جووجکەی هەتیو
نەجمەدین کڕ کەوت لەسەر هێلکەی دزی وەک ماکیان
قەومی کورد سا دەی بەجارێ ڕاپەڕن ئیتر بەسە
ساتی سەربەرزی نەوەک ساڵی بەسەر نزمی ژیان
عەشرەتی جافیش بەجارێ ناو و ئاساری نییە
پارچە پارچە تەفرەقە هەروەک موهاجیر بەشکران
چەند کەسێکی تورکمان خائینی مولک و وەتەن
ڕۆژێ عارەب ڕۆژێ کورد ئێستە زەعیمی کوردەکان
کێ ئەوێرێ دەرکەوێ کاتێ کە شەو تاریک ئەبێ
وەرفڵانی بێ بەتەنها ژن بەرێ بیدا بەگان
هەر دز و جەردە ئەبینێ شەو لەسەر جاددەی عومووم
هەندێ پۆلیسی حوکوومەت بەعزێ پیاوی شێخەکان
هەر زەمانی تورکە سالم ئێستە ڕیشوەت زیاترە
چاکەت و پانتۆڵ و نەجمە ڕوتبە وو مۆر و نیشان
تاقە یەک والی بوو ئەوسا بۆ عیراق و ئێستەکە
نۆ وەزیرە گوڵ بەدەم سی چل وەزیرە کۆنەکان
ڕەببی مووسایێک بنێرە خۆی و هاڕوون و عەسا
شارەزوورە میسری ئێمە بیکوژێ فیرعەونمان



ئەی خودا خۆ تۆ ئەزانی کوردی بێچارەی زەلیل
چەندی برسی و تینوون چەن هەوڵ ئەدەن بۆ ئاو و نان
داوەشێی بۆ کار و ئیشت دارزێی بۆ سەنعەتت
وا ئەبیتە حاکم و گەورە و ڕەئیسی کوردەکان
سەر لە خاکا بێنە دەر تاکەی ئەسیری خاک نەبی
ئەی عەزیز بەگ شۆڕەسواری گەورەیی قەومی بەبان
وەک هەڵۆ هەڵمەت بەرە بۆ دوژمنی ڕێوی سیفەت
چەشنی کەو بارە لە عاستی هەڵمەتت شێری ژیان
تۆ لە ئێمە عاجزی ئەی گیانی شێرینی عەزیز
ڕاپەڕە قوربانی تۆ بێ کوردی سۆران و بەبان

سەلام لەم شیعرەیدا باس لە سلێمانی دەکا لە سەردەمی داگیرکردنی شار لە لایەن لەشکری عوسمانییەوە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم. لە دوای سەد ساڵ لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا سەلام باسی سلێمانی بۆ سالم دەگێڕێتەوە. لە دوای تێپەڕبوونی ئەو ڕۆژگارە هەڵسوکەوت لەو شارەدا خراپتر بووە. ئەو کردەوە ناهەموارانەی عوسمانییان لە کاتی خۆیدا کردبوویان، دەسەڵاتی ئینگلیز و نۆکەرەکانی لە کاربەدەستانی عیراق لە کورد و عەرەب زیاتریان کردووە. ئەو نەجمەدینەی شاعیر ناوی بردووە نەجمەدین سائیبە. ئیتر شاعیر هاوار بۆ عەزیز بەگی بابان دەبا، ئەو شۆڕەسوارەی لە کاتی داگیرکردنی سلێمانی لە لایەن عوسمانییانەوە خۆی بەدەستەوە نەدا. ماوەیێک لە دەوروبەری شار بەرهەڵستی سوپای داگیرکەری کرد، لە پاشانا چووە میرەدێ و لە دواییدا ناچار بوو ئاودیو بێ بۆ ناوچەی زەهاو.

***

سەلام شێخ ئەحمەدی عازەبان شاعیرێکی ڕەسەنی دڵداری و وەسفی سروشتە. بەمە بووە شاعیری دڵسۆزی خۆشەویستی و ئەڤینی. بایی ئەوەندە شیعری بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی و هەموو جۆرە قافیەکانی هەیە پێی بووترێ گۆی هۆنەری بردۆتەوە لەم مەیدانەدا. لەوەوە شیعری گواستۆتەوە بۆ ئاسۆیێکی فراوانی کوردایەتی و کۆمەڵایەتی و سیاسەت. هێرشی بردۆتە سەر چینە چەوسێنەرەکانی سەرەوەی کۆمەڵ. لەسەر چینە چەوساوەکانی خوارەوەی کردۆتەوە لە کرێکار و هەژار و بێ نەوایان.

سەلام خانەییێکی گرنگی لە ئەدەبی کوردیدا پڕکردۆتەوە، ئەویش بەخراپە باسکردنی هاوسێیانی داگیرکەرانی کوردستان لە تورک و عەجەم و عەرەب. بێ گومان ئەمە دەوری باشی نابێ بەپێی لێکدانەوەی زانستی کۆمەڵایەتی، بەڵام لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە لایەنگری ئەم هەڵوێستە لە ناو کورددا هەیە، نەک تەنیا لە ناو ئێمە بەڵکو لە نێو هەموو نەتەوەکانی هاوسێ بەتایبەتی ئەگەر لە نەژاد یا ئاین یا نەتەوەیی جیاوازییان هەبێ. ئەمە ڕاستییەکە نابێ پشتگوێ بخرێ و هیچ زیانێکی نییە نە بۆ کورد و نە بۆ ئەوانەی گلەییان لێ کراوە و یا قسەیان پێ وتراوە. تا ئێستا لەبەرئەوەی سانسۆر لە ناوەوە بووە نەتوانراوە ئەم جۆرە شیعرانە، هەروەها شیعری کراوە (ئیرۆتیک) بەسەربەستی بلاوبکرێنەوە.

# بەشی حەڤدەم

## تۆفیق وەهبی

## ١٨٩٢ – ١٩٨٤

### ژیانی

تۆفیق کوڕی مەعرووف کوڕی محەمەد لە ساڵی ١٨٩٢ لە سلێمانی لە دایک بووە. باوکی مووچەخۆری کارگێڕی سەرژمێری دەسەڵاتی عوسمانی بووە لە سلێمانی. لەسەر دەستووری عوسمانی لەقەبی «وەهبی» بۆ خۆی هەڵبژاردووە و بەناوی «تۆفیق وەهبی» لە ناو خەڵکیدا ناسراوە. سەرەتای خوێندنی ماوەیێک لە حوجرەی مزگەوت بووە، ئینجا قوتابخانەی ڕوشدییەی سوپایی سەرەتایی لە سلێمانی تەواو کردووە، لە پاشانا قوتابخانەی ڕوشدییەی سوپایی ئامادەیی لە ساڵی ١٩٠٨ لە بەغدا تەواو کردووە. لە پۆلی خۆیدا یەکەم دەرچووە و پلەی ئەفسەری لیفتینانتی دراوەتێ. هەر لەو ساڵەدا ڕووی کردۆتە ئەستەمووڵ و بووە بەقوتابی قوتابخانەی ئەرکانی جەنگ. ئەو ساڵەی ئەو لەوێ بووە پۆلی یەکەمیان داخستووە و ئەفسەرەکانیان ناردۆتە ئۆردووگاکان بۆ مەشق کردن. تۆفیق وەهبی تا ساڵی ١٩١١ لە ئۆردووگاکاندا ماوەتەوە، ئینجا لەسەر داوای خۆی بەشداری لە شەڕەکانی ئەلبانیا کردووە، لە دوای ئەوە بۆتەوە بەقوتابیی قوتابخانەی ئەرکانی جەنگ، کەچی ئەم جارەش بەشەکە داخراوەتەوە و بەهۆی جەنگی بەڵقانەوە تۆفیق وەهبی لە ئۆردووی ڕۆژهەڵات بەشداری لەو جەنگەدا کردووە لە ئەنجامدا بریندار بووە.

لە دوای جەنگی بەڵقان لە ساڵی ١٩١٣ گەڕاوەتەوە قوتابخانەی ئەرکانی جەنگ. بەتەواوکردنی ئەم قوتابخانەیە جەنگی یەکەمی گێتی دەستی پێ کردووە. بەم جۆرە تۆفیق وەهبی لە هێڵە سوپاییەکانی ئەو جەنگە ئەفسەر بووە لە چەناق قەلعە و عیراق و فەلەستین. لە دوای جەنگ گەڕاوەتەوە ئەستەمووڵ و بەشداری لە دەورەی ئەرکانی جەنگ کردووە، بەپلەیێکی بەرز باوەڕنامەی ئەو دەورەیەی وەرگرتووە.

لە دوای جەنگ کە ئینگلیز سلێمانی داگیر کردووە لە ئاغستۆسی ١٩١٩ گەڕاوەتەوە سلێمانی. لە ئەیلوولی ئەو ساڵەدا کراوە بەقایمەقامی ڕانیە، هەر لەو ساڵەدا کە ئینگلیز سوپای کوردستانی دامەزراندووە پلەی ئەفسەری بینباشی دراوەتێ. لەو کاتەدا یەکێک بووە لە نزیکەکانی شێخ مەحموود.



لە ساڵی ١٩٢١ لە دروستکردنی سوپای عیراق بەشداری کردووە و لە ساڵی ١٩٢٣ کراوە بەئامیری قوتابخانەی سوپایی عیراق. لە ساڵی ١٩٢٩ پلەی کۆلۆنێلی (عەقیدی) وەرگرتووە. لە ژیانی خوێندەواریدا گەلێ شانازی بەم پلە سوپاییەوە کردووە، لەسەر هەندێ لە کتێبەکانیدا وەک دانەر دەینووسی «کۆلۆنێل تۆفیق وەهبی». لە ئەیلوولی ئەو ساڵەدا ١٩١٩ لە لایەن حوکوومەتی عیراقەوە نێررایە لەندەن بەشداری لە دەورەی قوتابخانەی ئومەرای ئۆردووی ئینگلیز کرد. چوار مانگ لەوێ مایەوە بەسەرکەوتوویی باوەڕنامەی ئەو دەورەیەی وەرگرت و گەڕایەوە عیراق. لە ساڵی ١٩٣٠ بۆ ماوەیێکی کەم بوو بەموتەسەریفی سلێمانی. لەو کاتەدا لە ١٤ی ئاداری ١٩٣٠ ناودارانی ئەو سەردەمەی سلێمانی (تۆفیق وەهبی) یان بە«نوێنەری دەستنیشانکراوی گەلی کورد لە عیراق» هەڵبژارد. لە دوای لابردنی لە موتەسەریفی سلێمانی و دوورخستنەوەی لە عیراق و نیشتەجێ بوونی لە بێرووت، کەوتە جموجۆڵی داواکردنی مافی کورد ئەوەی بڕیاری لەسەر درابوو و حوکوومەتی عیراق جێبەجێی نەکردبوو.

تۆفیق وەهبی لە بێرووت لە ١٩ی نیسانی ١٩٣١ یادداشتی بەناوی خۆیەوە «کۆلۆنێل تۆفیق وەهبی موتەسەریفی پێشووی سلێمانی و نوێنەری دەستنیشانکراوی گەلی کورد لە عیراق» بۆ ئەم لایەنانە نووسیوە:

١- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بەریتانیا – لەندەن.

٢- سکرتێری گشتی کۆمەڵی نەتەوەکان – جنێڤ.

٣- سەرۆکی کۆمیسیۆنی هەمیشەیی ئینتیداب، کۆمەڵی نەتەوەکان – جنێڤ.

٤- مەندووبی سامی بەریتانی – بەغدا.

لەو یادداشتانە داوای مافی کوردی کردووە. ڕاپۆرتی زانستی لە بابەت کوردەوە نووسیوە، باسی مێژوو و جوگرافیا و ڕۆشنبیری و خوێندەواریی کوردی کردووە. هەموو جۆرە بەڵگەیێکی پێشکێش کردووە بۆ ئەوەی ئاشکرای بکا میللەتی کورد عەرەب نییە، کوردستانی باشوور نیشتمانی نەتەوەیی و باوەڕپێکراوی کوردە.

وەک دیارە ئەم کۆششانە سەریان نەگرت و لە دوای پەیمانی عیراقی – بەریتانی (١٩٣٠) هەموو مافی کوردی عیراق لەسەر «قانوونی زمانانی ناوچەیی» نیشتەوە. تۆفیق وەهبی ماوەیێکی زۆری لە ژیانی ئاوارەیی لە لبنان بردە سەر و لە ساڵی ١٩٣٥ گەڕایەوە وڵات و بوو بەبەڕێوەبەری گشتیی کاروباری ڕێگەوبان، ئینجا بەڕێوەبەری

گشتیی تۆپۆگراف (مساحة). له دواییدا تۆفیق وەهبی چەند جارێک بوو بەوەزیر، وەکو له خۆی بیستراوە وەزارەتی زانیاری (مەعاریفی) له هەمووییان زیاتر پێ خۆش بووە. له پاشانا وازی له کاروباری میری هێناوە و بەئەندامی ئەنجوومەنی سیناتی (ئەعیانی) پەرلەمانی عیراق هەڵبژێرراوە. هەروەها بووە بەئەندامی کارای ئەکادیمیەی زانستی عیراق (مەجمەعی عیلمی). له ساڵی ١٩٥٧ له یەکەمین هەڵبژاردنی «کۆمەڵەی دانان و وەرگێڕان و بڵاوکردنەوە»ی عیراق له بەغدا تۆفیق وەهبی بەسەرۆکی کۆمەڵەکە هەڵبژێرراوە. هەندێ چاپەمەنیی ئەدەبی و زانستی لەو سەردەمەدا بڵاوکراوەتەوە. له ساڵانی ١٩٥٦ - ١٩٥٨ دەورەی فێرکردنی زمانی کوردی کردبووەوە له یانەی سەرکەوتنی کوردان له بەغدا.

له ١١ی تەمووزی ١٩٥٨ سێ ڕۆژ پێش کوودیتا سوپاییەکەی بەغدا تۆفیق وەهبی بەهۆی نەخۆشییەوە ڕووی کرده لەندەن. هێشتا له ئەستەموڵ بوو و نەگەیشتبووە لەندەن کە کوودیتای ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ له بەغدا هەڵگیرسا. ئیتر له وڵاتی ئاوارەیی مایەوە تا ٦ی کانوونی دووەمی ١٩٨٤ له لەندەن کۆچی دوایی کرد. لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمی هێنرایەوە نیشتمان و لەتەک ئارامگای پیرەمەگروونی سەرکەش بەخاک سپێررا.

## تۆفیق وەهبی زانا

تۆفیق وەهبی نموونەی هەرەبەرزی گێتیی کوردناسی بوو نەک تەنیا له ناو کۆمەڵی کوردەواریدا بەڵکو له هەموو عیراق و نێوەندی کوردناسیی ئەوروپا. بەزۆری لێکۆڵینەوەکانی له بابەت کوردەوە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەستی بۆ لایەنی دیکەش درێژ دەکرد، بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بەهاوسێیانی کوردەوە هەبوو. گۆڕەپانی لێکۆڵینەوەی فراوان بوو. زمان و ئەدەب و مێژوو و ئەرکیۆلۆجی و ئەتنۆگراف و فۆلکلۆر و گەلێ لایەنی دیکەی ڕۆشنبیریی کوردی گرتبووەوە.

له مەیدانی زانستیدا مەرجی هەڵکەوتنی زانایی بەدرێژایی ژیانی بۆ تۆفیق وەهبی ڕەخسابوو. له سەرەتادا بەزانستییەکانی عەسکەری دەستی پێ کرد، لەمەدا گەیشتە پلەی پسپۆڕی و دوا باوەڕنامەی له ئەرکانی جەنگی ئەستەموڵ وەرگرت، شارەزایی تەواوی له زانستییەکانی سوپاییدا هەبوو له ڕووی تیۆری و پراکتیک و تەکنیک و ستراتیجەوە. زانینی زمانەکانی کوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی بەهەموو دیالێکتەکانیانەوە، هەروەها زمانە کۆنە مردووەکانی میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەتایبەتی ئێرانی و



هیندۆئێرانییەکان، ئەمە هەمووی ئاسۆی بیری فراوان کردبوو. مەرجی سەرەکیش بۆ سەرکەوتنی تۆفیق وەهبی له ئیش و کارە زانستییەکانی زانینی هەندێ له زمانە گەورە و زیندووەکانی ئەوروپا بوو وەکو ئینگلیزی و ئەڵمانی و فەرەنسی.

تۆفیق وەهبی له کاری زانستیدا زۆر ورد بوو، لەبەرئەوە بابەتی کورت، یا مەسەلەی سنوورکێشراوی هەڵدەبژارد، بۆیە ئەو باسانەی له لایەن ئەوەوە کەوتوونەتە ناوەوە بەقەوارە کورت و بچووکن، بەڵام بەناوەڕۆک گەلێ بەنرخن و سەنگی تایبەتیی خۆیانیان له مێژووی ڕۆشنبیریی کوردیدا هەیە. لەبەرئەوەیە له ناو بەرهەمی تۆفیق وەهبی کاری ئەنتۆلۆجی (کۆکراوەی گەورە و زۆر) نابینرێ، بەڵکو کارەکانی دەچنە ناو بەرهەمی هەندێ مەسەلەی ئەکادیمیی وردی سنوور کێشراوەوە.

له سەرەتای ژیانی ڕۆشنبیری، خەریکی دەستووری زمانی کوردی بوو. له ساڵی ١٩٢٩ له بەغدا کتێبی لەم لایەنەوە بڵاوکردۆتەوە. له پاشانا بەناوی «خوێندەواری باو» له ساڵی ١٩٣٣ له بەغدا بۆ فێربوونی ئەلفوبێی لاتینی کتێبی بڵاوکردەوە. نویشکی نووسینەکانی له بارەی زمانی کوردییەوە له ساڵی ١٩٥٦ له بێرووت «دەستووری زمانی کوردی» بەدوو بەرگ بەزمانی عەرەبی بڵاوی کردەوە. هەروەها ئەو وشە کوردییانەی دەمێک بوو کۆی کردبوونەوە له ساڵی ١٩٦٦ له لەندەن لەگەڵ سی. جەی. ئەدمۆندس له قەوارەی فەرهەنگی کوردی - ئینگلیزی بەچاپی گەیاند. له دواییدا دووبارە و سێ بارە ئەم فەرهەنگە گرنگە بڵاوکرایەوە.

هەوەسی سەرەکیی تۆفیق وەهبی له زانستییەکانی ئەرکیۆلۆجی و مێژوو و زمانەوانی بوو. له ئەرکیۆلۆجیدا کاری داهێنراوی نوێی هەیە دەچێتە ناو کاری داهێنان و دۆزینەوە لەمانە:

١- قسنێک له کوردستان، له ساڵی ١٩٤٧ له بەغدا بڵاوکراوەتەوە، له بڵاوکراوەکانی کۆواری دەنگی گێتیی تازەیە.

٢- ئەشکەوتەکەی گوندۆک، بەزمانی ئینگلیزی له کۆواری «سۆمەر»ی بەغدا له ساڵی ١٩٥١ بڵاوکراوەتەوە. بەکر دڵێر وەریگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی.

٣- دوورخستنەوەی مانای کەر له ناوی بەهرامی گۆر، له بەغدا بەزمانی عەرەبی له ساڵی ١٩٥٧ بڵاوکراوەتەوە.

٤- قەڵاییێکی کەیانی له باکووری سلێمانی، بەعەرەبی له کۆواری «الکاتب»ی عەرەبی له بەغدا له ساڵی ١٩٥٨ بڵاوکراوەتەوە.

٥- میترابیزم بەئینگلیزی لە لەندەن لە ساڵی ١٩٦٢ بڵاوکراوەتەوە.
٦- گەشتێک لە دەربەندی بازیانەوە بۆ ملەی تاسلووجە، بەزمانی عەرەبی لە بەغدا لە ساڵی ١٩٦٥ بڵاوکراوەتەوە.

لە بابەت زمانەوانییەوە تۆفیق وەهبی کاری یەکجار گرنگی هەیە. هەموویان دەچنە ناو لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی زانستی. لەم لایەنەوە ئەم کارانەی بەرچاو دەکەون:
١- مانای وشەی «بەغدا»، لە کۆواری ئەکادیمیەی زانستی عیراق لە بەغدا لە ساڵی ١٩٥٠ بەزمانی عەرەبی بڵاوکراوەتەوە.
٢- ئاڵتوون کۆپری «پردێ»، لە کۆواری ئەکادیمیەی زانستی عیراق لە بەغدا لە ساڵی ١٩٥٦ بڵاوکراوەتەوە.
٣- ناوی «کەرکووک» لە کۆواری «الکاتب»ی عەرەبی لە بەغدا لە ساڵی ١٩٥٨ بڵاوکراوەتەوە.
٤- کۆمەڵێک باس و لێکۆڵینەوە لە ماوەی ١٩٥٨ - ١٩٨٤دا لە لەندەن بەزمانی ئینگلیزی بڵاوکراونەتەوە، لە لایەن عەزیز گەردییەوە وەرگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی و لە سلێمانی لە ساڵی ٢٠٠٢ بڵاوکراونەتەوە.

## تۆفیق وەهبی ڕۆژنامەنووس

تۆفیق وەهبی لە سەرەتای ژیانی خوێندەوارییەوە بەهۆی بڵاوکردنەوەی نووسینی خۆی لە چاپخانەوە نزیک بووە. لە ساڵانی جەنگی دووەمی گێتی سەدەی بیستەم (١٩٤٣ - ١٩٤٥) لە ڕۆژنامەگەریدا کاری کردووە، لەو کاتەی بەشی پێوەندی لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا کۆواری مانگانەی «دەنگی گێتیی تازە»ی بڵاو دەکردەوە. بەرپرسیاری یەکەمی کۆوارەکە تۆفیق وەهبی بوو. حوسێن حوزنی موکریانی و حەسەن شێخ حەمە مارفی وەک نووسەر و یاریدەدەری خۆی لە کۆوارەکەدا دامەزراندبوو. بەشی زۆری بڵاوکراوەی کۆوارەکە لە نووسین و ئامادەکردنی تۆفیق وەهبی بوو. هەندێ لەو بەرهەمانەی نووسەر دەکەن بەڕۆشنبیرێکی بەدیمەن لەسەر لاپەڕەی ئەم کۆوارە بڵاوکراونەتەوە.

لە دوای جەنگی دووەمی گێتی و هەندێ لەقبوونی هەڵسوکەوتی ئەمپریالیستی بەریتانی و لە برەوبوونی سیاسەتی ئەمپریالیستی ئەمەریکی لە سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەموو گێتی دەسگای کاروباری ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیری ئەمەریکا لە بەغدا لە



ساڵی ١٩٤٦ دەستی کرد بەچاپکردنی بڵاوکەرەوەیێک بەزمانی کوردی بەناوی «ئاگا و ڕووداوی هەفتەیی» لە پێشانا بەستێنسل چاپ دەکرا، لە پاشانا لە ساڵی ١٩٥٢ بوو بەکۆواری «پەیام» و تا کوودەتاکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا بەردەوام بوو. ئەم بڵاوکراوانە بەسەرپەرشتی تۆفیق وەهبی بەڕێوە دەچوون. بایەخی زۆری بەزمان و ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی دەدا، بڵاوکراوەیێک بوون ئەگەر لایەنە سیاسی و پڕوپاگەندەکەی لێ لابرایە خزمەتی بۆ کولتووری کورد زۆر بوو. لایەنی بیری و دەرهێنانی هونەریی بەدەست تۆفیق وەهبییەوە بوو، بەڕێوەبردن و هەڵەچنی و بڵاوکردنەوەی بەئەندازیار بەکر دلێر سپێررا بوو.

## تۆفیق وەهبی نووسەر

تۆفیق وەهبی کوردیزانێکی بێ هاوتا بوو. هەندێ جار لەبەرئەوەی بەتەنگەوە بوو شێوازی نووسینی کوردانە بێ و هیچ هەڵەی تێدا نەبێ ژمارەیێک لە ڕستەکانی هەندێ قورس دەکەوتنە بەرگوێ بەتایبەتی ئەو ڕستانەی وشەی دروستکراوی خۆی تیایاندا بەکاری دەهێنا. لەم لایەنەوە زمانی ستانداردی ئێستای کوردی قەرزاری ئەو وشە و لێکسیکۆنانەیە کە تۆفیق وەهبی لە وتار و باس و کتێبەکانیدا بەکاری هێناون.

بەرهەمە ئەدەبییەکانی تۆفیق وەهبی کە دەچنە ناو پەخشانەوە لەم بابەتانەی خوارەوە دەبینرێن:
١- چیرۆک: ئەو چیرۆکانەی لە لایەن تۆفیق وەهبییەوە نووسراونەتەوە، بەشێکیان مەشق و بەڵگەی ئەو باسە زانستییانەن کە لە بابەت زمانی کوردییەوە نووسیویەتییەوە. ئەم جۆرە بەرهەمەی ڕەنگاوڕەنگە، هەندێ جار چیرۆکەکەی وەک چیرۆکێکی هونەریی دەکەوێتە بەرچاو، هەندێ جاری دیکە وەک حیکایەتی میللیی سەرزار، هەندێ جاریش وەک حیکایەتێکی ئەفسانەیی بەشێوازێکی ئەدەبی و زمانێکی بەرز دادەڕێژرێتەوە. پێویستە بۆ نموونەی ئەم جۆرە بەرهەمانە ئاماژە بۆ ئەم کارانە بکرێ: «چیرۆکی بەختیار و بەدبەخت»، «یەک دوو وێنە لە شیعر و فەلسەفەی بەرزی ئەحمەدی خانی» گەشتێکی ئەدەبییە تۆفیق وەهبی لە ناو «مەم و زین»ی خانی دەیکا. «قەزای دیزە کەوت لە گۆزە» تابلۆیێکی کۆمیدی و ساتیرێکی سەرکەوتووە لە بەرهەمی ئەدەبیدا. «بیرەوەرییێک» گێڕانەوەیێکی ئەدەبییە. یەکێک لە وڵاتەوە دەچێ بۆ سووریا و لەوێوە بۆ ئەستەمووڵ لە سەردەمی جەنگدا. «چیرۆکی کەڕ ئەحمەد»،

چیرۆکێکی ئەدەبی جوانە، بەهەناسەییێکی مێژوویی سەردەمی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە نووسراوەتەوە. باس لە زۆرانبازی نێوان فەقێ ئەحمەد و کەیغانی (کەیهانی) کچە جوان و قارەمانی فرەنگی دەکا. ئەوەی فەقێ ئەحمەد داویەتی لە ئەرزا، لەو کاتەی دوو مەمکی سەر سنگی ئاشکرا بووە و ئەوە ڕوون بۆتەوە لە ئەمازۆنەکانە وازی لێ هێناوە.

٢- ڕەخنە: لە مەیدانی ڕەخنەی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و مێژوو تۆفیق وەهبی دەستی باڵای هەبوو. هەندێ ڕەخنەی زانستی لە بۆچوونەکانی ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیز ڕاولینسون گرتووە. جگە لەوە گەلێ بیروڕای ناڕاستی لە بابەت دەستووری زمان و زانستی زمانەوانییەوە ڕاست کردۆتەوە، لەوانە بەتایبەتی بەشێ لە نووسینی کوردناسی ئینگلیز د. مەکەنزی.

٣- وەرگێڕان: تۆفیق وەهبی لەسەر ئەو باوەڕە بوو میللەتی کورد لە هەموو کەسێکی دیکە زیاتر پێویستی بەوەرگێڕان هەیە، چونکە وەرگێڕان لە لاییێک زانیاری تازە دێنێتە ناو کۆمەڵی کوردەوارییەوە، لە لاییێکی دیکەوە زمانی کوردی بەهێز دەکا وەرگێڕ لە وشە و زاراوە و تەعبیری تازە دەگەڕێ و ئەمە زمان دەوڵەمەند دەکا. لەم لایەنەوە کۆمەڵێک نووسینی هەیە زۆربەیان لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی. بەشێک لە ئەمانەش بەناوەرۆک لە بابەت کوردەوەیە. نموونەیان لەم کارانەدا بەرچاو دەکەون:

وەرگێڕانی وتارێکی ئەدمۆندس لە بابەت سۆنەوە لە ئینگلیزییەوە پێوەندی بەکوردەوە هەیە. نووسینێکی گرنگی نووسەری فرەنسی ئەندرێ مۆڕوا لە بابەت بەریتانیاوە گۆڕیویەتییە سەر زمانی کوردی. وتاری ئەدمۆندس لە بابەت شێخ ڕەزاوە کراوە بەکوردی. وەرگێڕانی هەندێ وتاری هەیە لە بابەت بنەماڵەی مەلیکی بەریتانیا و ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەدەبی ئینگلیزی.

٤- ژیانی کۆمەڵایەتی کورد: بەگشتی تۆفیق وەهبی لە هەموو نووسینەکانیدا گرنگی بەژیانی کۆمەڵایەتی داوە. بۆ بەڵگە لە ساڵی ١٩٤١ لە بەغدا کتێبێکی بەناوی «بەیانی حەقیقەت» بڵاوکردۆتەوە. ئەم جۆرە نووسینانەی لە شێوازی ئەدەبی بەدوور نین. بەگشتی نووسەر لە دەروازەییێکەوە دەچێتە ناو گێتیی ڕۆشنبیریی کوردییەوە و لە دەرگاییێکەوە لە ناو گێتیی ئەدەبی کوردی دێتە دەرەوە.



## نموونەی نووسینی ئەدەبیی تۆفیق وەهبی

تۆفیق وەهبی بەرهەمی ئەدەبیی هونەریی بەپێز و هەناسە ڕۆمانتیکییانەی هەبوو. ئەگەر ژیانی خوێندەواریی خۆی بۆ بەرهەمی داهێنراو تەرخان بکردایە دەورێکی دیکەی دەبوو لە پێشخستنی ئەدەبی کوردی، کەچی ئەوەی هەیەتی کەم نییە، جگە لە خزمەتکردنی زمانی کوردی وەکو ڕوخسارێک یا کەرەستەییێک دەورێکی گرنگی بووە لە پەرەسەندنی ئەدەبی کوردی، بەشیعر و پەخشانەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا.

یەکێ لە وتارە ئەدەبییە بەرزەکانی تۆفیق وەهبی ئەوەیە وەک ماتەمنامەییێک بۆ هاوڕێی خۆشەویستی ئەمین زەکی نووسیوە:

«شەپازلەییێکی دێو، دەستی لەپڕێکا درا بەبنا گوێما، کاسی کردم، ئەمین زەکی بەگ مرد.

دەنگی «مرد!» دەنگێکی داچڵەکێنەرە، لەمە نەفرینتر دەنگ نییە بۆ گوێی پیاو.

بەڵام ئەو پەیامەی ئەم دەنگە دای بەبناگوێی منا پەیامی کارەساتێکی قورس بوو، پەیامی کارەساتێکی زۆر قورسی گشتی.

«ئەمین زەکی بەگ مرد!» ئەوەی ئەگەیاند کە تانجەڕۆی زانستی سەدەی بیستەممان ووشک بوو، تانجەڕۆییێکی زانست کە هەموو بستێکی خاکەکەمان بەراوی بوو.

چەند ساڵێ بوو، ئەژدەهایێ خۆی گیر کردبوو لەم چەمەدا، ئەژدەهای نەخۆشی.

ئاوی بەخوڕ خۆی گەلی جەنگی بەرامبەر بەئەژدەهاکە.

درێغا! چاری نەبوو، فرەیدوون نەگەیشت بەفریای ئاو و بەراوا، ئەوەتا، سەر زەویمان ووشک بوو.

ئەمین زەکی بەگ لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوەندە ساڵ بوو، لە زۆرانا بوو لەگەڵ نەخۆشییەکەی ڕۆژ بەڕۆژ بەدەسیەوە زەبوونتر دەبوو، بەڵام گیانی بەهادری، بۆ کاتێک بێ، سست و بێ هیوا نەبوو.

ئەو چەمە بەخوڕە هەتا ئەو کاتەی کوتوپڕ ووشک بوو، هەر بەگوڕ بوو، هەر بەفەڕ بوو.

ئەمین زەکی بەگ بەڕاستی سروشتی هەنگی هەبوو، بێ سرەوتن لە کارا بوو، کاری ڕێکوپێک و زانستی بوو.

یەک هەنگ نەبوو، کوورەیێ بوو، کوورەییێکی بەپیت و بەرەکەت بوو. نەء هەنگ

نەبوو، هەنگ ڕقی هەڵئەسێ، بەپیاوەوە ئەدا، ئەو هەرگیز ڕقی هەڵنەئەسا، کینی نەبوو.

هەنگوینی شیرینی هەنگ ئەخورێ و ئەبڕێتەوە، کەوسەری ئەو نابڕێتەوە، کردەوە زانستییەکانی ئەو ئێمە لێرە پشتاوپشت لێی بەرخۆ ئەبین. خۆشی لە پاداشی ئەمەدا ناوی لە گێتیدا نەمر، وە ڕەوانی لە بەهەشت کەوسەر نۆشە.

سەرچاوەی ئەم تانجەرۆی زانستییە سلێمانییە، سلێمانی پێیەوە ئەنازێ، کورد پێیەوە ئەنازێ، عیراق پێیەوە ئەنازێ، ئێستا ڕوو ئەکەمە ڕۆڵەکانی ئەمڕۆ.

ئەی لاوینە!

بیرەوەری پیاوی گەورە و ستایشی کردەوەی بەرز و بەکەڵکیان بەزمانێکی پەسەندکارییەوە، هەرچەندە ئەرکێکی سپاس بژێرییە، بەڵام پتری بۆ ئامۆژگاریی ئێوەیە.

ژیانی زانستیی پیاوی گەورەی نەتەوەییێک وێنەیە بۆ لاوەکانی کە لاسایی بکەنەوە.

وتم ئەمین زەکی بەگ پرشنگی سلێمانییە، ڕۆڵەی کوردە، پێگەیشتووی عیراقە، بەڵام ئەبێ بزانن ئەمین زەکی بەگ بەسروشتی مەزن، بەڕەوشتی پاک، بەکردەوەی چاک، بەتێکۆشینی بێ ووچان توانی پیاڵەیێکی زانستییان بۆ تێبکا.

تێکۆشینی زانستی ئەمین زەکی بەگ وێنەیە بۆ ئێوە، کردەوەی زانستی ئەمین زەکی بەگ دەستووری کردارتانە، لەسەری برۆن. چاک بزانن کە نەوەی لاوەکانی، لە تێکۆشیندا بۆ زانست، چاو لە زانا گەورەکانی نەکا، بەشی بەش بڕاوییە».

لەم پارچە پەخشانە شیعرئامێزە ڕۆمانتیکی و سیمبۆلییانەدا تۆفیق وەهبی ئاماژە بۆ رووباری تانجەرۆی سلێمانی دەکا، کە ڕەمزی ئاوە. لە ئەفسانەی کوردەواریدا ئەژدەها بەری ئاو دەگرێ، خەڵکی ئاوایی لە بێ ئاوی لەناودەچن. کوڕی ئازا کە فەرەیدوونە پەیدا دەبێ، وەکو کاوە چۆن زەحاکی کوشت و فەرەیدوونی لەسەر تەختی شاهی دانا، تۆفیق وەهبییش فەرەیدوونی کردووە بەکوڕی ئازا و ڕەمزی قارەمانی.

تۆفیق وەهبی لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەگەر میللەتێک پیاوی گەورەی وەکو ئەمین زەکی هەبێ، دەبێ لاوان لاسایی ئەو بکەنەوە. بەمە میللەتی کورد پێش دەکەوێ.

***

تۆفیق وەهبی زانا و دانا و سوپایی و زمانەوان و مێژوونووس و نووسەرێکی گەورەی کورد بوو لە سەدەی بیستەمدا. یەکێکە لەو کوردە دەگمەنانەی ناوبانگیان تەنیا کوردستانی پڕ نەکردبوو، لە عیراق و نێوەندی ڕۆژهەڵاتناسی ئەوروپا پلەوپایەی دیاری



هەبوو. لێکۆڵینەوەی لە زانستییە کۆمەڵایەتییەکاندا ورد و ئەکادیمییانە بوو، داهێنەری تیۆریی دانانی دەستووری زمانی کوردی و بەپەتی کردنی ئەو زمانە بوو. شێوازی نووسینی لە ناخی سروشتی زمانی کوردی و لێکسیکۆنی زمانی قسەکردن و نووسین هەڵقوڵا بوو. دەوری گرنگی هەبوو لە چاککردنی باری ڕاست نووسینی زمانی کوردی بەئەلفوبێی عەرەبی و لاتینی.

بایەخی بەمەسەلەکانی مێژوو و ئەرکیۆلۆجیا و زمانەوانی و ئەتیمۆلۆجیا دەدا. هەموو ئەم باسانەی بەزمانێکی پاراوی کوردی پەتی دەنووسییەوە. وتار و چیرۆکە ئەدەبی و هونەری و فۆلکلۆرییەکانی لە ئەدەبی کوردیدا نموونەی بەرهەمی داهێنراوی سەرکەوتووبوون.

## بەشی هەژدەم

## ئەسیری (أثیری)

## ١٨٩٥ – ١٩٦٢

### ژیانی

عەبدولخالیق کوڕی سەید حوسێن ئەفەندی مورشیدی تەریقەتی نەقشبەندی لە ساڵی ١٨٩٥ لە کەرکوک لە دایک بووە. سەرەتای خوێندنی لە مزگەوتی حاجی ئەحمەد ئاغای مستەفا ئاغا لای مەلا محەمەدی وەستا فەتاح بووە. بۆ تەواوکردنی پرۆگرامەکانی خوێندنی ئایینی لە ساڵی ١٩١٣ ڕووی کردۆتە هەڵەبجە و ناوچەی جوانڕۆ و بانە و سەقز و سنە و چوڕ. لە دواییدا گەڕاوەتەوە کەرکووک و لای مەلا عەلی حیکمەت و دوا قۆناغی خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی دوازدە زانستییەکەی ئایینی ئیسلامی وەرگرتووە. لە پاشانا چووە بۆ ئەستەمووڵ و لەم گەیشتنەیدا بیرووت و ئیزمیری دیوە. ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو شارانە کاری کردۆتە سەر بیری و کەوتۆتە بەراوردکردن لە نێوان پێشکەوتوویی ئەوان و دواکەوتوویی کورد. ئیتر بڕیاری داوە هەر شیعرێکی دڵداری تا ئەو کاتە نووسیبێتی هەمووی بسووتێنی و تەنیا شیعری نیشتمانپەروەری و بیری کوردایەتی بنووسێ (١٩٢١). لە گەشتی ئەستەمووڵی شێخ عەبدولقادری شێخ عوبێدوڵلای نەهری دیوە.

ئەسیری لە ساڵی ١٩٣٥ بەمووچەخۆر لە دادگای شەرعیی کەرکووک دامەزراوە، لە پاشانا لە ساڵی ١٩٤٣ بووە بەباشکاتبی کارگێڕی ماڵی قاسیرین لە کەرکووک تا ساڵی ١٩٥١، لەو ساڵەوە بۆ جاری دووەم گەڕاوەتەوە دادگای شەرعی. لەم کارەدا ماوەتەوە تا ساڵی ١٩٥٨ خانەنشین کراوە. ئەسیری ژنی نەهێناوە، ماڵی لە ناو خانەقا بچووکەکەی بووە لە گەڕەکی ئەخی حوسێن لە کەرکووک. ژیانێکی ساکاری قەلەندەرانەی بردۆتە سەر. لەو کاتەی مووچەخۆری میری بووە کاری کشتوکاڵیشیی کردووە. لە ساڵی ١٩٦٠ تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە بووە لە قوڕگی تا لە ڕۆژی ١٨ی حوزەیرانی ١٩٦٢ لە کەرکووک کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ محیەدین نێژراوە.



### شیعری

وا باوە لە نێوەندی ئەدەبیی کوردیدا ئەسیری لە سەرەتای ماوەی شیعر وتنی خەریکی دڵداری و بابەتەکانی دیکەی شیعری کلاسیکی بووە. کە لە ئەستەمووڵ گەڕاوەتەوە ئەم بەرهەمانەی هەموو سووتاندووە و لە ساڵی ١٩٢١ بەم لاوە بڕیاری داوە شیعری تەنیا بۆ نیشتمانپەروەری و کوردایەتی تەرخان بکا.

لە شیعریدا هەست بەهەندێ خەوشی تەکنیکی و کەموکووڕی مەرجەکانی شیعر دەکرێ، وەکو لەنگی لە کێش و هەڵە لە قافیە، ئەمە پێوەندی بەگوێی مۆسیقی شاعیرەوە هەیە. لەم لایەنەوە ڕەفیق حیلمی لەسەر ئەو باوەڕەیە عەشقی نیشتمان ئەسیری کردووە بەشاعیر. واتە خۆڕسک نییە، بەڵکو ئەوەی لە مێشکی دایە هانی داوە بەشیعر بیڵێ. ڕەخنەگرە کۆنەکان «کەسبی» پێ دەڵێن. واتە پێویست کردوویەتی بەشاعیر نەک ئیلهام و خەیاڵ ئەوەی ڕەخنەگرە کۆنەکان «وەهبی» پێ دەڵێن.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

ئەسیری لە هەردوو بابەتە شیعری عەرووزی و خۆماڵی هەیە لە ڕووی کێش و قافیەوە. زۆربەی شیعری لە یەکەمیانە و کەمتری لە دووەمیانە. لە شیعری عەرووزیدا ئەم بەحرانەی بەکارهێناوە: ڕەمەل، هەزەج، ڕەجەز، موزاریع، موتەقاریب، خەفیف، سەریع، بەسیت، موجتەس. ئەسیری یەکێکە لەو شاعیرانەی زۆرترین بەحری عەرووزیان لە شیعری کوردیدا بەکارهێناوە. بەگشتی ئەو شیعرانە لەسەر سیستێمی یەکێتیی قافیە ڕێکخراون، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ جار جووت قافیە (مەسنەوی)شی بەکارهێناوە. دەنگەکانی قافیە لە شیعریدا زۆر نین، ئەم دەنگانە دەکەونە بەرچاو: ا ت د ر ش ل م ن و وو ۆ (ە – ـە) ی ێ. ئەم پاش قافیانەش لە شیعریدا دەبینرێن: دەوێ، بوو، تۆ، بڵێ، کرد، بێ، من، نییە، ئەبێ، هەیە، کورد، گورد.

لە شیعری خۆماڵییدا بەزۆری کێشی دە بڕگەیی بەکارهێناوە لەگەڵ جووت قافیە، بڕێکیش لەو شیعرانە لەسەر یەکێتیی قافیە دانراون. بەگشتی شیعری لە ڕووی ژمارەی دێڕەوە کورتن، لە دوازدە دێڕ کەمترن، بۆیە دەچنە ناو بابەتی لیریکەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ قەسیدەی بابەتی پۆێمی هەیە. چەند قەسیدەیێکی بەندی چوارینیشی هەیە لەسەر قافیەکانی (ا ا ا ا)، (ا ا ب ا)، (ا ب جـ ب) هەروەها قەسیدەی بەندی شەشین

لەسەر قافیەی (ا ا ا ا ب ب). زمانی شیعری ئاسانە، زمانەکەی تا ڕادەیێک کوردی پەتییە، وێنەی داهێنراوی ڕەوانبێژی لە شیعریدا زۆر نییە.

### شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

زۆربەی شیعری ئەسیری لە نیشتمانپەروەری و بیری نەتەوەیی دەدوێ. بایەخی زۆری بەشیعری ئایینی داوە (موناجات و نەعت). شیعری ستایش و دانایی و شیوەن و ماتەمنامەی هەیە، لە وەسفدا شیعری پێداهەڵدانی سروشتی کوردستانی زۆرە، بەڵام شیعری دڵداری نییە، بووکی شیعری نەبووە تا وەسفی بکا. شاعیر ستایشی هەندێ کەسی دیاری ناو کۆمەڵی کردووە، لەوانە سەید تەهای نەهری، ئەمین زەکی، بێکەس، مەلا محەمەدی کۆیی، بابا عەلی بەرزنجی، عەبدولڕەحمان بەگی تاپۆ، ڕەشید عالی گەیلانی، جیگەرخوێن، هەروەها ماتەمنامەی بۆ باوکی خۆی و ساڵح زەکی ساحێبقڕان و پیرەمێرد و شێخ محەممەدی کەرەدان هەیە.

### نموونەی شیعری

نموونەی بەپێزی شیعری ئەسیری بەزۆری لە شیعرە نیشتمانپەروەری و کوردایەتییەکانیدا دەدۆزرێنەوە.

١

لە سروودێکی نیشتمانیدا ئەسیری دەڵێ:

بێرە کوردستان عەزیزم گەر تو سەیرانت دەوێ
بتبەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری کوێستانت دەوێ
سەیری ئەو خێلانە کە نیشتوونە داوێنی چیا
بابچین بۆ ماڵی کوردێ گەر تو خوێشانت دەوێ
بتبەمە پای تاقی لای سەپیل و سەرمیل و کرند
پێت پیشاندەم سەد هەزار ئاساری ساسانت دەوێ
ئاوی ساف و ڕۆشنی داوێنی چەشمانی چیا
لێی بنۆشە دەم بەدەم گەر ئاوی حەیوانت دەوێ
لاوی کوردی من لەبەر کە شاڵی زاخۆ و ئامێدی
گەر تو سەد چاتر لە ڕەنگی شاڵی کرمانت دەوێ



هەڵسە گەشتی چیمەن و گوڵزاری کوردستان بکە
گەر لە بۆ دەردی دەروونت داوودەرمانت دەوێ
ڕووح و ماڵت سەرفی ڕێگەی میللەتت کە ڕووحەکەم
گەر لە خوا لوتفی عەمیم و جوود و ئیحسانت دەوێ
ئەی (ئەسیری) هێندە عیشقی میللەتی کوردت هەیە
بشمری لام وایە قەبری گردی سەیوانت دەوێ

ئەم شیعرە نموونەیێکە لە شیعرە جوانەکانی ئەسیری لە بابەت وەسفی سروشتی کوردستانەوە. لەم شیعرە و لە بەشێکی زۆری بەرهەمیدا یادی ناوی جوگرافی و تیرە و هۆز و عەشرەتەکانی کورد دەکاتەوە.

لە سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەم لە ڕێکخراوی بەچکەشێرانی پارتی هیوا ئەم سروودەیان بەئەندامە منداڵەکان لەبەر دەکرد بۆ بەهێزکردنی گیانی نەتەوەیی و پاراوی زمانی زگماک. لە دوای دەرچوونی کتێبی «شیعر وئەدەبیاتی کوردی» ڕەفیق حیلمی (١٩٤١) لە قوتابخانە کوردییەکاندا هەندێ لە مامۆستایان بۆ وانەی زمانی کوردی ئەم سروودەیان کردبووە سەرچاوە.

٢

ئەسیری لە دژی شیعری دڵدارییە:

گەر ئەدیبی و ئارەزووی سەرکەوتنی کوردت هەیە
تەرکی ئەشعاری عیشقبازی کە گەر بیرت هەیە
شیعری تەئریخی بڵێ بۆ ئینتیباهی میللەتت
مورشیدی عیلم و مەعاریف بە گەر عەقڵت هەیە
ناوی هۆمیر چەند هەزار ساڵە لە یۆنان باقییە
شیعری تەئریخی ئەگوت وەک ئەو بە گەر زەوقت هەیە

ئەم پارچە شیعرەی ئەسیری بەڵگەی ئەوەیە ڕاستە بڕیاری داوە شیعری دڵداری نەنووسێ. بەلای ئەوەوە کورد لە قۆناغێکدا دژی پێویستی بەشیعری نیشتمانی و سیاسی هەیە، ئاماژە بەئەلیادەی هۆمیرۆسی گریک دەکا کە زیاتر لە دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا شیعری مێژوویی وتووە، لەبەرئەوە ناو و بەرهەمی ماونەتەوە. بەپێی ئەم

بیروڕایەی ئەسیری لەوانەیە ئەو هەواڵە ڕاست بێ، شیعری دڵداری بووبێ و سووتاندبێتی.

٣

ئەسیری قەسیدەییێکی هەیە لە حەوت بەندی شەشین پێکهاتووە بەناوی «مێژووی کەرکووک»ەوە. لە بەندی یەکەمدا دەڵێ:

قەڵاتی کەرکووک لە جێی جەرمەنە
نیشتەنی کۆنی خێڵی کرمەنە
لە پشت و نەوەی کوردی گەورەنە
زوانی ئێستەی فەیلی و لوڕەنە
کەرکووک ئەلزاسە کفری لۆرەنە
دڵسووتاویانە هەرچی کورد هەنە

لە بەندی دواییدا دەڵێ:

لەسەر زوانا هەڵبەستی سووکە
ڕۆژهەڵاتییە لاوی کەرکووکە
بۆ لە چاپدانی (ئەسیری) زووکە
ئەمە زەبووری گەورە و بچووکە
کەرکووک ئەلزاسە کفری لۆرەنە
دڵسووتاویانە هەرچی کورد هەنە

لەم شیعرەدا ئەسیری کەرکووک بەئەڵمانیا دەچوێنێ. لێرە میللەتی جەرمەن دەژی. جەرمەن لە نەژادی گەلێ هۆز دروست بووە، کەرکووکیش کوردە و گەلێ هۆزی کۆکردۆتەوە وەکو فەیلی و لوڕ. قسەی کوردی کەرکووک لەسەر زماندا سووکە. ئەو شیعرەی ئەسیری دەیهۆنێتەوە وەک کتێبی زەبوور پیرۆزە.

شاعیر دوو نیوە دێڕ شیعر لە هەموو بەندەکاندا دووبارە دەکاتەوە، تیایاندا کەرکووک و کفری لەگەڵ ئەلزاس و لۆرێن بەراوورد دەکا. ئەوەی پێویستە لێرەدا ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە ئەلزاس و لۆرێن دوو ناوچەی جوگرافی بوون کەوتبوونە سەر سنووری ئەڵمانیا و فرەنسا، بووبوونە مایەی شەڕوشۆڕ لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتەوە، هەریەکەیان بەهی خۆی دەزانی. لە



کاتی خۆیدا شاعیر ئەم مەسەلەیەی بەجوانی هێناوەتەوە، کێشەکە تا ئێستاش لە ناوەوەیە و کۆتایی نەهاتووە، بەڵام کەرکووک هەر کوردستانە و زۆربەی دانیشتوانیشی کوردن.

٤

ئەسیری لە شیعرێکیدا بەناوی «جلخواری و ملخواری»یەوە دەڵێ:

چەندە پێم گوت ئەی کوڕە واز بێنە لەم جلخوارییە
ئاخر و ئەنجامی جلخواری وەها ملخوارییە
ئەو نەخۆشەی دائیما دەتگوت زەریفە سیحەتی
ڕۆژی ئەووەڵ پێم گوتی باوەڕکە دەردی کارییە
دەست و پێی خۆت بەستەوە تا بووی پەرێشان و ڕەزیل
فائیدەت چی بوو بڵێ توخوا ئا لەم ئینکارییە
دۆتەکەت وا لێبڕاوە بۆیە هێندە موفریتە
کابراش دەیوێت و نایدەن بۆیە وا هاوارییە
دەردی لوقمەی چەورە عالەم گوبە و شێت و هار ئەکا
کەس نییە بۆ دینی بێ ئەم قال و قیلە و زارییە
ئەو کەسەی مەیلی دەکەی گوایا بەناوی دینەوە
وا لەسەر شەپقە لە بەیتی میللەتت کوشتارییە
خۆتش ئەیزانی حەقیقەت وایە ئەمما پێوە بووی
لات وەهایە تازە عەیبە تەرکی ئەم بیعارییە
سەیری کوردی میللەتت کە چەندە جاهیل مایەوە
سەنعەت و کەسبی کە هەیبێ شوانیە و جووتیارییە
ئەی (ئەسیری) لێیگەڕێ جلخوارە دەردی خۆی بەسە
ئەم غەم و دەردەی کە هەشیە ڕاستی سەربارییە

لە دوای جەنگی یەکەمی گێتیی سەدەی بیستەم و ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و دروستبوونی کۆماری تورکیا، لە ناو کۆمەڵی کوردەواریدا هەندێ کورد خۆیان بەتورک دەزانی، لە ناو خەڵک دوو زاراوەیان بۆ ئەو کەسانە بەکار دەهێنا، یەکەمیان «جلخوار» و دووەمیان «زۆڵەکورد». لێرەدا ئەسیری قسە لەگەڵ ئەم جلخوارانە دەکا، ئەوانەی نەک تەنیا خۆیان بەتورک حسێب دەکەن، بەڵکو تورکچیەتی دەکەن، بیروباوەڕی پان تورکیزم

(تۆرانیزم) بڵاودەکەنەوە. شاعیر لە گفتوگۆیدا ناڕاستەوخۆ شێوازی سیمبۆلی بەکار دێنێ. مەبەسی شاعیر لە نەخۆشەکە دەوڵەتی عوسمانییە، لە پاش جەنگ مرد، واتە دەوڵەتی عوسمانی ڕووخا. ئینجا ئەم جلخوارانە ڕوویان کردە کۆماری تورکیا ئەوەی ئایینی ئیسلامی بەشەبقەی گاوورانی ئەورووپا گۆڕییەوە. لە دوو لاوە شاعیر ئەمانە ڕیسوا دەکا لە لایێک لە ڕووی نەتەوەییەوە، لە لایێکی دیکە لە ڕووی ئایینییەوە. ئیتر کورد لەبەرچی تورکچیەتی دەکا، لەو کاتەی عوسمانی تورک بوو پێش ئەوەی ئیسلام بێ، تورکەکەی تازەش هەر تورکە و وازی لە موسوڵمانەتی هێناوە.

***

عەبدولخالیق کوڕی سەید حوسێن ناسراو بەئەسیری لە سەرەتای ژیانی خوێندەوارییدا شیعری دڵداری نووسیوە. کە بیری لە دواکەوتوویی میللەتی خۆی و پێشکەوتنی هاوسێیانی کردۆتەوە گرێی سایکۆلۆجی لا دروست بووە و شیعرە دڵدارییەکانی سووتاندووە، بڕیاری داوە تەنیا شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی بڵێ، بەم پێیە بیری کوردایەتی کردوویەتی بەشاعیر. لە ڕووی ڕوخسارەوە لە زۆربەی هونەرە کلاسیکییەکانی شیعری وتووە، عەرووزی و خۆماڵی. هەروەها لە ناوەرۆکیشدا جگە لە شیعری دڵداری لە بابەتەکانی دیکەی هەیە، بەڵام هەرە زۆری نیشتمانپەروەرییە. شیعری ئایینی زۆرە، بابەتەکانی دیکەی کەمە. نموونە نیشتمانپەروەرییەکانی دەیکا بە«شاعیری کوردایەتی».

## بەشی نۆزدەم

### خادیم

### ١٨٩٥ – ١٩٧١

### ژیانی

عەبدوڵلا کوڕی محەمەد مەولوود لە ساڵی ١٨٩٥ لە شاری کۆیە لە دایک بووە. لە دواییدا کە خۆی بەشاعیر ناسیوە «خادیم»ی وەک نازناو لە شیعریدا بەکار هێناوە. گوزەرانی ماڵی باوکی لە ڕووی داراییەوە باش بووە. سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت بردۆتە سەر. لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا قۆناغی یەکەمی خوێندنی حوجرەی تەواو کردووە. لە جەنگی یەکەمی گێتیی سەدەی بیستەمدا ماڵی تالان کراوە و ئازاری زۆری چەشتووە، ناچار بووە کۆیە بەجێ بێڵێ و ڕوو بکاتە قەڵادزە و لەوێ دوکانی بەرگدروونی داناوە. لەم کارەدا قازانجی بووە، بۆیە توانیویەتی لە ساڵی ١٩٣٥ بچێتە حەج و ئینجا لە ساڵی١٩٣٦ ماڵی گواستۆتەوە سلێمانی و کردوویەتی بەنیشتەجێی هەمیشەیی خۆی. دوکانی بەرگدروونی داناوە، هاوڕێیانی لە شاعیرانی ئەو ڕۆژگارەی سلێمانی سەریان داوە، لەوانە بێخود و ڕەمزی و مەلا مارف و عەلی کەمالی و ئەحمەد شوکری و هی دیکە.

خادیم ژیانی شاری سلێمانی پێ خۆش بووە، حەزی بەهاوڕێیەتی ڕۆشنبیر و خوێندەواران کردووە، دیارە لە سلێمانی بەئاسانی ئەمەی بۆ هەڵکەوتووە. لە ساڵانی نزیک کۆتایی ژیانی چاوی کز بووە، ئازاری بەم دەردەوە چەشتووە و بۆتە هۆی ئەوەی زیاتر هۆگری ئایین ببێ و شیعری لەم بابەتە لە دیوانیدا زۆر بێ. خادیم لە ٥ی کانوونی دووەمی ١٩٧١ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی جۆگە نێژراوە.

### شیعری

شیعر وەک بەهرەیێکی خۆڕسک لە ناو دڵ و دەروون و هۆشی خادیم پەیدا بووە. زوو دەستی بەشیعر وتن کردووە، دڵسۆزی بەرامبەری بووە، هەمیشە لەگەڵیدا ژیاوە، لەبەرئەوە بەرهەمی زۆرە لە چاو شاعیرانی دیکە، دیوانی شیعری یەکێکە لە دیوانە گەورەکانی شیعری کوردی. خادیم تەنیا خەریکی دانانی شیعر نەبووە بەڵکو شیعری



زۆری دیکەی خوێندۆتەوە، بەتایبەتی شارەزای تەواوی قوتابخانەی شیعری کلاسیکیی کوردستانی باشوور بووە.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

شاعیر بایەخی زۆری بەلایەنی ڕوخساری شیعر داوە وەک جەوهەرێکی هونەری بەبێ ئەو ناوەرۆک نابێ بەبەرهەم لە هەموو هونەرە جوانەکاندا نەوەکو تەنیا شیعر.

پێویستە ئەو جەوهەرانە دەستنیشان بکرێن بۆ ناسینی شیعری خادیم لە ڕووی تاشینی ئەو پەیکەرەی لە وشە و زاراوە دروستی کردووە، هەروەها ئەو قاڵبانەی بەکاری هێناون بۆ ئەو ناوەرۆکانەی ئارەزووی کردووە لە شیعردا دەریان ببڕێ:

١- خادیم یەکێکە لەو شاعیرانەی زۆرترین بەحری بەکارهێناوە لە شیعرە عەرووزییەکانیدا. ئەم بەحرانە لە شیعریدا بەرچاو دەکەون: هەزەج، ڕەمەل، موزاریع، خەفیف، موجتەس، موتەقاریب، ڕەجەز.

٢- لە قافیە دەوڵەمەندە، هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی بەکارهێناوە، هەرچی دەنگە کوردییەکانیشن هەندێکیانی وەرگرتووە.

٣- لە پاش قافیە زۆر دەوڵەمەندە، هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شیعری بەژمارە زۆرە و هەروەها خۆی حەزی لە پاش قافیە بووە بۆ ئەوەی ڕیتمی شیعرەکەی بەهێز بێ.

ئەم پاش قافیانە لە شیعریدا بەرچاو دەکەون: ئەکا، پەیدا، ئەدا، کوا، جودا، شکا، دەکا، نەما، هێنا، چبکا، بەهارا، سووتا، عەندەلیب، غائیب، ئەدەب، نیقاب، شەراب، نەهات، هات، ڕووت، مەحەببەت، عەبەس، کرد، ڕابردوو، بەهار، سەر، نەزەر، لە دوور، عومەر، زاهیر، ئاخیر، یار، ناز، ڕاز، نەفس، نێرگز، بەکەس، هەوەس، فرۆش، دەروێش، غەرەز، نەشات، واعیز، سەماع، بەکەف، عیشق، عاشق، لە خاک، دڵ، گوڵ، بلبل، تەغافول، بم (ببم)، کردم، چبکەم، چاوم، غەم، دایم، ئەبینم، چووم، ناکەم، هەموو دەم، دەگرم، یەکین، من، ئەکەن، بازن، چین، تۆ، برۆ، بوو، ئیمشەو، ئیمڕۆ، چوو، نەچوو، پێکەوە، منە (هی منە)، بیستووە، داوە، بێ دەنگی، چی، بێ تۆیی، نەبێ، پێئەکەنێ، بابێ، ئەگری، دەدوێ، نەبێ، خاڵی، بابێ، سێ.

٤- شیعری میللیی سیلابی خۆماڵی جێگەی دیاری هەیە لە دیوانی خادیمدا. بەزۆری کێشی دە بڕگەیی بەرچاو دەکەون. گەلێکیان وەستانیان لە ناوەڕاست دایە (٥ + ٥)

کەمیان ئەو وەستانەیان نییە. قافیەی ئەم جۆرە شیعرەی مەسنەوییە (اا ب ب جـ جـ...).

٥- زۆربەی بەرهەمی غەزەل (لیرک)ی کورتە، قەسیدەی درێژی کەمە، شیعرە عەروزییەکانی هەموویان لەسەر یەکێتیی قافیە ڕێکخراون.

٦- شاعیر بایەخی بەقەسیدەی پێنجین داوە (اااا ب).

٧- زنجیرەییێک شیعری هەیە، لە بەندی هەشت نیوە دێڕ شیعری پێکهاتوون لەسەر قافیەی (ااااا ب جـ ب).

٨- لە تەرجیع بەندا شاعیر بەرهەمی زۆرە. تەرجیع بەندی تەوحیدی بۆ خودا لە شەش قەسیدە پێکهاتووە، یەکێکی دیکەی بۆ پێغەمبەر لە حەوت قەسیدە دایە. شاعیر لە ژێر کاریگەری و لاساییکردنەوەی حەمدی «تەرجیع بەندی نیشتمانی» داناوە، لە نۆ قەسیدە پێکهاتووە، تەرجیعەکەی ئەم دێڕەیە لە هەموو قەسیدەکاندا دووبارەکراوەتەوە:

ڕەببی بەدکارت ببینم کوێر و ئیفلیج و زەلیل
بێتە بەردەرگەت بڵێ هاوارە کاکی کورد دەخیل

٩- شاعیر شەش قەسیدەی داناوە بەناوی «تەرکیب بەند لە عیشقدا» مایەی دەوڵەمەندیی دیوانیەتی.

١٠- بابەتی موستەزادی هەیە، دوور نییە لەبەرئەوە وتبێتی بۆ ئەوەی نەڵێن لەم بابەتە شیعرەی نییە.

١١- شاعیر هەندێ ڕستەی لە شیعری بێگانە وەرگرتووە تێکهەڵکێشی شیعری کوردی خۆی کردووە. لە دیوانی شیعریدا ئەم دیاردەیە بەمولەممەع ناسراوە. ڕاستییەکەی ئەوەیە شاعیر بەدوو زمان یا زیاتر شیعر بڵێ، بەمەرجێک زمانی نەتەوەیی خۆی لەگەڵدا بێ. ئەوەی خادیم کردوویەتی تێکهەڵکێشە.

١٢- کۆمەڵێک چوارینی نایاب لە دیوانی شاعیردا هەیە، ناوەرۆکیان لەگەڵ قەوارەی چوارین دەگونجێ، زۆربەیان لە بابەت ئامۆژگاری و دانایی و قسەی نەستەق و دڵداری و لایەنی دیکەی ژیانەوەن.

١٣- شاعیر قەسیدەی درێژی مەسنەوی هەیە، بەشی زۆری ناوەرۆکی ئەم جۆرە شیعرانەی لە ئەدەبی میللیی بەتایبەتی حیکایەتی بەرگوێی ئاگردان وەرگیراون، لەمانە: «گفتوگۆ لەگەڵ کەو»، «شێر و مام ڕێوی»، هەروەها قەسیدەییێکی درێژی هەیە (زیاتر لە



دووسەد دێڕە شیعر) لە مێژووی سەفەربەرلک دەدوێ، بەسەرهاتی جەنگی یەکەمی گێتیی سەدەی بیستەم.

١٤- لە قەسیدەییێکی درێژی دیکەیدا (زیاتر لە هەشتا دێڕە شیعر) یادی شاعیرانی کۆنی کورد و سەردەمی خۆی دەکاتەوە. ناوی هەندێ لە شاعیرانی قوتابخانەی کوردستانی باشووری بردووە ئەوانەی لە سلێمانی و موکریان و کۆیە و گەرمیانی ناوچەی کەرکووک ژیاون. ناوی شاعیرانی گۆرانی کەم بردووە. لە شاعیرانی کوردستانی باکوور تەنیا ناوی عەلی هەریریی بردووە دیارە ئەو زانیارییەی لە حاجی وەرگرتووە کە ناوی هەردوو عەلی دەبا، هەریری و بەرداشانی.

١٥- شاعیر بایەخی زۆری بەپێنج خشتەکی داوە، شیعری شاعیرانی سەدەی نۆزدەم و سەردەمی خۆی کردووە بەپێنج خشتەکی لەوانە: نالی، سالم، حاجی، مەحوی، تاهیر بەگ، سافی، میرزا مارف، نووری شێخ ساڵح، کەمالی، ڕەمزی.

١٦- خادیم کۆمەڵێک شیعری بەدیالێکتی گۆرانی هۆنیوەتەوە، لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی دە بڕگەیی و جووت قافیە (مەسنەوی)، لەمانەدا زمانی تێکەڵاوە لە نێو دوو دیالێکتە بچووکەکەی سلێمانی (کرمانجی باشوور) و هەورامی (گۆرانی).

١٧- زمانی خادیم قورس نییە، جیاوازییێک لە نێوان بەکارهێنانی وشە و زاراوە هەیە لە شیعریدا. لە بەرهەمە عەروزییەکانیدا وشەی بێگانە دەبینرێ، هەندێ جار وشەی قورسی نەبیستراویش بەکار دێنێ، کەچی لە شیعرە میللییە خۆماڵییەکانیدا وێنەکە پێچەوانەیە، وشە و زاراوە لێرەدا ئاسانتر و ساکارترن. لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە خادیم بایەخی بەڕەوانبێژیە لەفزییەکان داوە ئەوەی پێوەندییان لەگەڵ ڕیتم و مۆسیقا زیاترە.

### شیعری لە ڕووی ناوەرۆکەوە

خادیم هەوڵی داوە شیعری لە هەموو بابەتەکانی کلاسیکی هەبێ، ئینجا ئەو ناوەرۆکانەی لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی پەیدابوون. بەگشتی شاعیر هەوڵ دەدا وەکو دەروێشێکی سۆفیزمی هوشیار خۆی بخاتە ڕوو. بۆ ئەم مەبەسە کۆمەڵێک شیعری شاعیرە گەورەکانی سۆفیزمی ئیسلامی کردووە بەپێنج خشتەکی. لەگەڵ ئەوەشدا بەشاعیرێکی داهێنانی شیعری سۆفیزم ناژمێررێ، بەڵکو لە وەسفی سۆفیزم هەندێ وێنەی جوانی هەیە. جگە لەوە شاعیر لە ناو ئامۆژگاریی ئاینی و گونجاندنی لەگەڵ سۆفیزم نوقوم بووە. لەگەڵ ئەوە

کاریگەریی کۆمەڵێک لە شاعیرانی کورد بەسەر خادیمەوە هەیە لە هەموویان زیاتر حەمدییە.

دەتوانرێ بەسەریەکەوە بابەتە کۆن و نوێکانی شیعری خادیم لەم وێنانەدا ببینرێن:

١- شیعری ئایینی: خادیم بایەخی زۆری بەشیعری ئایینی داوە، بەقەوارە لە هەموو مەبەسەکانی دیکەی زیاترە، شیعری دڵداری لێ دەربچێ. جگە لە تەرجیع بەندە ئایینییەکانی بەشێکی زۆر لە پارچە شیعر و قەسیدەکانی دیکەی لە بابەتی شیعری ئایینین. موناجات و نەعت و پێداهەڵدانی خەلیفەکانی ڕاشیدینی هەیە.

٢- شیعری دڵداری: لەمەدا هەستی بەرامبەر ئەندامە جوانەکانی دلبەری بەراوورد کردووە لەگەڵ دیاردەکانی سروشت تێکەڵ بەیەکتری کردوون. سۆزی دڵداری بەتین نییە بەرامبەر بەخۆشەویست.

٣- وەسف: لە وەسفدا شاعیر بەتوانایە، تەنیا وەسفی لەشولاری دلبەری نەکردووە، بەڵکو وەسفی سروشتی هەیە، هەر بەمەش نەوەستاوە، بەڵکو وەسفی جێگە و ئاوەدانی و شارانی وەکو کۆیە و سلێمانی هەیە.

٤- پێداهەڵدان: شاعیر شانازی بەو دۆستانەی کردووە کە خۆشی ویستوون، بەشان و باهووی کاربەدەست و دەرەبەگ و دەوڵەمەند و ناودارانی هەڵنەوتووە. لە شیعردا ڕێزی ئەو شاعیرانەی گرتووە کە شیعریانی کردووە بەپێنج خشتەکی. ئەو شاعیرانەی ستایشی کردوون لە دۆستانی سەردەمی ژیانی خۆی زۆرن، لەو ماوەیەدا پێویستە ئاماژە بکرێ بۆ بێخود و مەلا محەمەدی کۆیی و عەلی کەمالی و فانی و ئەحمەد شوکری.

٥- شیوەن و ماتەمنامە: لەم بابەتە شیعرەی کەمە، بۆ کەس نەکراوە شیعر بەڕادان بدا لای خادیم، ئەگەر مردنی خۆشەویستێکی کارێکی زۆری لە دەروونی نەکردبێ شیوەنی بۆ نەکردووە.

٦- نیشتمانپەروەری و کوردایەتی: کوردایەتی مەبەسی سەرەکی نەبووە لای شاعیر. هێزی شاعیرییەتی لە بیروباوەڕی ئایینییەوە لە خەیاڵیدا چەکەرەی کردووە، لەمەوە دەرباز بووە بۆ ئەو خاکەی شاعیر و هەموو خەڵکی کورد لیێ لە دایک بووە. هێزە شاعیرییەکە یارمەتی داوە لە داهێنانی شیعریدا سەرکەوتوو بێ.

لە بنجدا شاری سلێمانی خادیمی نەکردووە بەشاعیر، ئەو لە کۆیە و قەڵادزە شیعری



ناسیوە و زانیوە، بەڵام نێوەندێکی زۆر گرنگی وەکو سلێمانی کە خادیم خۆشی ویستووە لەبەر شیعر بووە. هەرچۆنێ بێ شیعرە نیشتمانییەکانی نموونەی شیعری داهێنراوی زمانی کوردین.

## نموونەی شیعری

### دڵداری

١

لە شیعرێکیدا خادیم دەڵێ:

سەر لە گێژی بەحری غەم وا دائیما ئەخولێتەوە
دڵ لەبەر دەردی جودایی خۆی لە خۆی ئەتلێتەوە
دەردی عەشقم زۆر گرانە بێ دەوایە سارییە
خۆ بپارێزن دەخیل با کەس لە من نەگرێتەوە
سەد دەخیل مەشاتەیانەی دڵمە چینی زولفەکەی
زۆر موقەییەد بەنەوا لەم بەرزییە بەربێتەوە
پێ بەنەرمی نێ لە چاوم چاوەکەم خاری موژەم
تا نەدا ئازاری پێت کەوتوومەتە بەرپێتەوە
عەیبە بۆ عاشق لە مەحشەر گەر بەتیری ماه ڕوخان
خوێن لە زامی جەرگ و دڵیا دائیما ئەتکێتەوە
وەک تکەی وێرانە ماڵەخوێنی دڵمە ئەشکی چاو
سەر ئەکا جۆشی لە هەردوو چاوەکەم ئەتکێتەوە
ئاگری جەرگم لە جۆشایە دەمێ ساکین نییە
حاڵەتی پەروانە باشە یەک کەڕەت ئەبرێتەوە
دەربەدەر بووم ئەی بەریدی عاشقان بادی سەبا
عەرزی حاڵی من بەرە بەڵکی بڵێ بابێتەوە
حەقیەتی (خادیم) بەخادیم بێ ئەگەر پیری موغان
ئاگرێکی وا لە دڵمایە کە قەت نەکوژێتەوە

لەم شیعرەدا ئاسایییە خادیم دڵداری بەدەردێکی گرانی بێ دەرمان بزانێ. ئەو عەشقە

بێ ئەنجامە، شێوەی سۆفیزمیانەیە نابێ بگاتە ئەنجام چونکە ئەو کاتە تەلیسمی داهێنانی شیعری بەتاڵ دەبێ. شاعیرانە خادیم دەڵێ خەڵکی با خۆیان بپارێزن و ئەم نەخۆشییە لە من نەگرنەوە، یا بە دلبەر دەڵێ پێ بەنەرمی بنێتە سەر چاوی بۆ ئەوەی دڕکی موژەی پێی بریندار نەکا، یا شوورەییبیە بۆ عاشقان لە ڕۆژی مەحشەردا ئەگەر خوێن لە برینی جەرگ و دڵیان نەتکێتەوە.

٢

خادیم بەم شیعرە ناسکە موناجات لەگەڵ دلبەردا دەکا:

ئەمەوێ مەستی چاوەکانت بم
بێ منەت با لە ساقیانت بم
گوێم لە ئاوازی نەی نەبێ خاڵی
تا لە ناو جەمعی عاشقانت بم
بمکوژی گەر بەتیری موژگانت
با فیدای دەست و هەم کەمانت بم
ئیفتیخارم بەڕەنگی زەردی خۆم
تا لە ناو عاشیقان نیشانت بم
چ غەمم زامی تیری موژگانە
گەر لە ژێر سایەی ئەمانت بم
سرری پەنهانی عەشقی تۆ لە دڵم
من فیدای سرری وا نیهانت بم
هەر زەمانێ ئەدەی بەوەسڵ وەعدە
ئەی فیدای وەعدە و زەمانت بم
جانی (خادیم) ژیانی یادی تۆیە
من بەقوربانی یاد و جانت بم

دلبەر هەموو شتێکی پێویستی دڵدارییە بۆ خادیم. چاوەکانی پیاڵەی مەیە سەرخۆشی دەکا. موژەی تیرە دڵدار بریندار دەکا. مۆسیقارە شاعیر خۆی بەقوربانی دەست و پەنجەی دەکا. کە خادیم شانازی بەڕەنگی زەردی نەخۆشیی دڵداری دەکا، لەبەرئەوەیە چونکە گەورەترین شەرەفی چنگ دەکەوێ شانازی پێوە بکا.



٣

لە شیعرێکی پڕ لە سۆزی دەروونی و هەستی ناسکی دڵداری خادیم دەڵێ:

ئیمشەو بەخەیاڵی ڕوخی دلبەر سەفەرم کرد
یادی دڵی پڕ ناڵە وو دوو چاوی تەرم کرد
سەد ناڵە بەجارێ لە دڵم دەرچوو لە هەر لا
هەر ناڵە بەدونباڵی کەماڵی ئەسەرم کرد
عەکسی ڕوخی تا هاتەوە ئاغووشی خەیاڵم
ئەعزام هەموو یەک یەک بووە چاو و نەزەرم کرد
ئەشکم کە لە خوێناوی جیگەر جارییە ئیمشەو
پڕ دامەنی سەبرم لە سروشکا گوهەرم کرد
بەم یادەوە ئەتلیمەوە تا فەیزی سەحەر دێ
وەک سوبح لە دامانەوە چاکی جگەرم کرد
لەم ڕۆژەوە عیشقی ڕوخی میوانی دڵم بوو
عەقڵم کە نەگونجا لەگەڵی دەربەدەرم کرد
موتریب بەنەی و ساقی بەمەی هاتنە مەجلیس
ئەم بەزمە چ شۆڕێکی لە ناو مەغزی سەرم کرد
سەد جۆشی حەلاوەت بەمەزاقی دڵ ئەدا نەی
بەم زەوقە بەدڵ ئارەزووی نەیشەکەرم کرد
تا بێ نیگەهێکم نەبوو بۆ عەکسی جەماڵی
بێهۆش لە سەرما بوو کە زەبتی نەزەرم کرد
ئەم مەستیی و خۆشحاڵییە وو جیلوەیی ڕوویە
خومبازە وەکو دامەنی چینی سەحەرم کرد
پێم خۆشە بزانم چ بەری ڕوو دڵی بردم
(خادیم) وەرە سۆراغی لە لای شیشەگەرم کرد

ئەم شیعرە گێڕانەوەی بەسەرهاتی دڵداریی شاعیرە، بەوێنەی خەونی نوستوویێک یا هوشیارێکی خەواڵوو دەیگێڕێتەوە. ئەوەندە هۆگری دلبەرە، ئەوەندە خۆشی دەوێ، ئەوەندە لێی دوورە بەخەیاڵیش نایەوێ وا بیر بکاتەوە کە لێی نزیک بۆتەوە. لەو ڕۆژەوە گرفتاری

دڵداریی ئەم نازەنینە بووە، دەربەدەرە. دەبێ هەر وا بمێنێتەوە بۆ ئەوەی دەرگای داهێنان لە ڕووی هونەردا دانەخرێ.

٤

لە شیعرێکیدا خادیم شەو دەکاتە هێلانەی نهێنییەکانی دڵداری:

کاتی وەسڵی عاشقانە تۆ دەمێ بڕوانە شەو
خۆی ئەسووتێنێ بەشەمعی دلبەری پەروانە شەو
چاوەڕێی ڕۆیشتنی ڕۆژە لە بۆ کاتی ویساڵ
پەردەپۆشی سڕی عەشقە هەردەمی مەستانە شەو
زوڵمەتی شەو فەزڵی زۆرە بورجی دورجی گەوهەرە
مەتڵەعی جیلوەی ڕوخی خورشیدی نوور ئەفشانە شەو
دەعوەتی مەعشووقە شەو بۆ ئێمە کاتی زارییە
سەتری عەیبی عەیب داران و گوناهکارانە شەو
ئاگری مووسا کە هەڵگیرسا لە وادی ئەیمەنا
مەوعیدی ئەسراری تەوحید و قسەی جانانە شەو
زوڵمەتی شەو بۆتە داغێ بۆ دڵی بوریانی ڕۆژ
بۆ تەجەللا چونکە خاسە بۆ دڵی خاسانە شەو
عاشقان دەرسی مەحەببەتیان لە تاریکی شەوە
حوسنی دلبەریە مودەرریس هەم دەبیرستانە شەو
چاوەنۆڕی نیو نیگاهێکی هەبێ عاشق لە شەو
سەد نیگاهی دلبەری خۆی وا لەسەر موژگانە شەو
گوێت لە ناڵەی نەی بێ (خادیم) چی ئەڵێی لەم بەزمەدا
کاتی وەسڵی عاشقان و عەیشی بێ پایانە شەو
بەزمگاهی عەیش و شادی ڕەزمگاهی شۆڕ و شەڕ
سەف شکێنی عەرسەیی مەیدانە بۆ مەردانە شەو
هەرکەسێ خواهانی دوڕڕی مەعریفەت بێ فرسەتە
پڕ لە دوڕ و گەوهەرە دەریایی بێ پایانە شەو



کاتی وەسڵی عاشقانە (خادیم)یش هوشیارە خۆی
قوڕ دەپێوێ تا سەحەر هەر ئاهـ و هەر ناڵانە شەو

لەم شیعرە ڕەنگینەدا شاعیر ئەوە دەردەبڕێ ئەگەر شەو نەبێ، ڕۆژیش نابێ. ژیانی ئادەمزاد بەبێ ڕۆژ ناچێتە سەر. بەیەکتری گەیشتن دڵدار و دلبەر بەشەو دەبێ. ئەگەر شەو نەبووایە ئاگری مووسا لە وادی ئەیمەن نەدەکرایەوە بۆ ئەوەی نهێنییەکانی تاک و تەنیایی کردگار ئاشکرا ببێ، لەم شیعرەدا خادیم گەلێ وێنەی شیعری داهێناوە لە بابەت شەو و نهێنییەکانییەوە.

## وەسفی بەهار

لە ناو شاعیرانی کورددا خادیم وەستایێکی زانا و هوشیارە لە هونەری وەسف بەگشتی و بەرهەمێکی شیعری بەفەڕی داهێناوە لەم بابەتەوە. بۆ نموونە لە وەسفی بەهاردا دەڵێ:

چاو هەڵێنە لەحەزەیێ بنواڕە ئەسراری بەهار
هەرچی فیکرت بۆی نەچێ تووایە ئەتواری بەهار
خۆت لە حەپسی پیرەهەن دەرکە میسالی بۆنی گوڵ
ڕووی لە ڕووی تۆیە دوو چاوی ئاشناکاری بەهار
پایەماڵی مەوجی تۆفانی گوڵە کەون و مەکان
سەوزە چاوی خۆی هەڵێنا کەوتە ئیزکاری بەهار
سەیری گوڵزاری ڕوخی کردووە یا ڕەب ئەڵێی
چەتری لێدا وەک پەڕی تاووس ئەشجاری بەهار
ڕەنگی دامەن چین و بۆنی گوڵ وەکو بێهۆشییە
چونکی دایم عەزمی ڕۆیشتنیە گوڵزاری بەهار
تۆ لە عەیش و زەمزەمەی ئەم گوڵشەنە غافڵ مەبە
ڕوو لە نابوودی و کەسادی دایە بازاڕی بەهار
بلبلی بێچارە پەروازی بەنەقدی ناڵە کرد
هاتە بازاڕی مەحەببەت بۆ خریداری بەهار
مەحرەمی نەبزی دڵی ئارامی من هەر عیشقە بەس
خەتتی سونبول تا ڕەگی گوڵ بۆ خەبەرداری بەهار

جیلوە تا من دیم نیهان بوو ڕەنگ و بۆ تا دیم شکا
فرسەتی بەزمی تەماشا هێندە بوو کاری بەهار
وەک غەنیمەت فرسەتێکە سەیری گوڵشەن یەک دوو ڕۆژ
پێکەنینی غونچەیە وون بوونی ڕوخساری بەهار
لالە داغ و گوڵ گریبان چاک و بلبل ناڵەگۆ
غەیری عیبرەت چی هەیە لەم باغە دیداری بەهار
ئەی خیرەد سۆراغی من ناکەی ئیتر وەک بۆنی گوڵ
من لەگەڵ بادی فەنا چووم سەرەوکاری بەهار
زامی دڵ (خادیم) کە پەنهانە لە ژێر پەردەی نەفس
وەک گریبانی منە چاکی دڵی زاری بەهار

ئەم وەسفەی شاعیر بۆ بەهار ئاسایی نییە وەک لە زۆربەی شیعری لەم بابەتە لە ئەدەبی کلاسیکیدا هاتووە. لێرەدا ڕاستەوخۆ وێنەی دیمەنەکانی بەهار لە گوڵ و بلبل و پەپوولە و کیژانی جوان هەڵنەبژاردووە بۆ ئەوەی بەراوورد و بەرامبەریان بکا وەک نموونەیێکی داهێنانی شیعری، بەڵکو ئەو دیاردانەی کردووە بەتارمایی بۆ ئەوەی تەنیا وێنەی گەشبینی و شادی دروست بکا، لەگەڵ ئەودا وێنەی ڕەشبینی و ناشادی دروست بکا. شاعیر دەڵێ بلبل ئەگەر دڵداری بکا بۆی ناچێتە سەر لە بەهارا نەژی، چونکە گوڵ بەبێ بەهار نابێ. کە خونچە دەپشکوێ و دەبێ بەگوڵ بەڵگەی کۆتایی بەهارە، ئەو کاتە گوڵ و موڵ بەسەردەچێ، بلبل دەناڵێنێ بۆ نەمامی گوڵ. ئەم وێنە ڕەوانبێژییە جوانانە لەم شیعرەدا بەدی دەکرێن.

## دڵداری لە بەرگی داناییدا

خادیم لە هەندێ لە غەزەلە دڵدارییەکانیدا هەوڵی داوە بەبیری دانایی و تارمایی گیانی سۆفیزم قانگیان بدا. ئەگەر ئەو شیعرانە نەبووبن بەداهێنانی بەرهەمی سیمبۆلی سۆفیزم لە ئەدەبی کوردیدا، بەڵام ئەدگاری ژیرانەی دانایی و هەناسەی وەسفی سۆفیزمیان وەرگرتووە. لەم نموونانەدا هەندێ لایەنی ئەم بیروڕایە ڕوون دەبێتەوە.



١

لە چوارینێکیدا خادیم دەڵێ:

ئەم نەشئەیە پڕ مەغزی سەرەشۆری مەحەببەت
کاسەی سەری مەنسوورە تەنبووری مەحەببەت
مووسا وو عەسا وو یەدی بەیزا وو بیابان
سەحرایی دڵی عاشیقە وا تووری مەحەببەت

مێشکی مەنسووری هەلاج و کاسەی سەری ئامێری ئاوازی دڵدارییە. مووسا و دار عەسا ئەفسانەییەکەی و کێوی توور بەڵگەی دڵدارین. لەم شیعرەدا خادیم دەیەوێ ئاسۆیێکی سۆفیزم لە ڕووی هەندێ لە شیعریدا بکاتەوە.

٢

دیسانەوە شاعیر لەگەڵ مەنسووری هەلاج دایە:

جیلوەیی ڕوویی گوڵڕوخان عەشقە
مەنزەری چاوی عاشیقان عەشقە
خۆی لە پەردەی لیباسی مەنسووری
گەر (انا الحق) ئەڵێ عەیان عەشقە

لەم چوارینەدا خادیم دڵداری ڕاست لەم وێنانەدا دەبینێ: ڕوومەتی دلبەرانی نازەنین، چاوی دڵدارانی عاشق، ناوەوەی مەنسووری هەلاج ئەوەی وتوویەتی «انا الحق» (من خوداوەندم).

٣

لە شیعرێکیدا خادیم دەڵێ:

ئەی بەیادی چاوەکەت لەبرێژە دڵ مەیخانەیە
وەی بەناوی تۆ چراغان خانەیی وێرانەیە
دڵ ئەکا مەشقی پەرێشانی بەیادی زولفی تۆ
وا پەرێشانە دڵم بۆ توڕڕەیی تۆ شانەیە
یەک نیگاهت ڕەنگی شۆخی خستە بەزمی جەمعەوە
شۆخیی چاوی غەزالانم خەتی پەیمانەیە

تا لە زوڵماتی دەروون هەر گا خەیاڵی ڕووت ئەکەم
سەر لە ڕەوزەن دادەنێ مەهتاب لەم وێرانەیە
خانەیی عومرم ئەبا سەیلی حەوادیس بۆ فەنا
ئەم کەلامەم گەر تەماشا کەن ئەڵێن ئەفسانەیە
تابەکەی لەفزی جودایی بێ لە بەینی ئێمەدا
ئاشنا بووم لە ئەووەل بۆ ئەڵێی بێگانەیە
تا لە ئیقلیمی فەنادا بووم بەتیفلی پەروەرش
شیری مەمکی دایەیی من بادەیی مەیخانەیە
ڕێی فەنا بگرە ئەگەر تالیب بەقایی «خادیم»ا
ڕووی لە سەنگی ئاسیا بەعاقیبەت ئەم دانەیە

ئەو نازەنینەی خادیم موناجاتی لەگەڵدا دەکا، ئەو دلبەرە کلاسیکییە نییە بۆتە بەڵگەی عەشقی مەجازی و ماچوموچ، هەروەها ئەو بتە یا پەرییە نییە سۆفییان وێنەی کردگار لە پەیکەریاندا دەبینن، بەڵام خادیم ئەدگاری هەردوو جۆرە دڵدارییەکەی کۆکردۆتەوە و لەو کیژە جوانەدا بەدی دەکا، واتە دڵداریی ئاسمانی و زەمینی، یا حەقیقی و مەجازی. وێنەی داهێنراوی ڕەوانبێژیی جوان بەرچاو دەکەوێ وەکو: شیری دایک مەیە، توانەوە لە ناو کردگاردا مانای مانەوەیە (بەقا و فەنا لە زاراوەکانی سۆفیزمە). ئادەمزاد کە دانەی گەنمە دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان بکەوێتە بەر بەرداش، ئاشی لێکردنی دانەوێڵە.

٤

لە چوارینێکیدا دەڵێ:

لەم حەلقەی دڵی دێوانە ئەلەرزی
بەم پرتەوی شەمعە پەروانە ئەلەرزی
لەم خانە خەیاڵی تۆ خەلیلە لە دڵمدا
بەم هەیبەتەوە سەد بت و بتخانە ئەلەرزی

لەم چوارینەدا شاعیر کۆمەڵێک زاراوەی تیۆری سۆفیزم و ڕۆمانتیکی و پراکتیکی دەروێشیزمی کۆکردۆتەوە و ئەم شیعرەی پێ داهێناوە. هەست بەفەزاییێکی گیانی دەکرێ زیاتر دەروێش و سۆفی تێگەیشتوو لە نهێنییەکانی دەگەن.



٥

لە چوارینێکی دیکەیدا دەڵێ:

بۆنی نەفسی هاونەفەسێکم بۆ دێ
لەم قافڵەوە دەنگی جەرەسێکم بۆ دێ
قاسید کە سەبا بوو لە سەبا ئەیهێنا
لەم بێکەسییەم بۆنی کەسێکم بۆ دێ

ئەو کەسەی شاعیر باسی لێوە دەکا دلبەریەتی، کەسی نییە لەو بەولاوە، ئەگەر لێی نزیک بێ هەموو گەردوون هی ئەوە، ئەگەر دوور بێ بێ کەسە و کەسی نییە. ئیتر ئەم بیرۆکەیەی بەهەندێ زاراوەی سۆفیزم ڕازاندۆتەوە.

## نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

لە شیعرێکی نیشتمانپەروەریدا دەڵێ:

لە حوببی نیشتمانا خوای لە خۆم ڕازی ئەکەم کوردم
لەسەر ئەم خاکە بۆ ئەم خاکە جان بازی ئەکەم کوردم
بەقەومی خۆم لە ئەقواما سەرئەفرازی ئەکەم کوردم
ئەگەرچی گۆشەگیرم فەخر و شانازی ئەکەم کوردم
کە زیندووبوونەوەی گۆڕم لەبەر تەلقینی کوردیمە

لەم پێنجینەدا خادیم لەسەر ئەوە سوورە کە کوردە و هیچ کەسێکی دیکە نییە. ئەمە دان پێدانانێکە بۆ هەموو کەس وا نەزانن خادیم کورد نییە و کوردایەتی ناکا. ئەو نەک تەنیا لەسەر ڕووی زەوی کوردایەتی دەکا، بەڵکو لە ناو گۆڕدا کە زیندوو دەبێتەوە لەگەڵ دوو مەلایەکەتە مەرنەمووکەکان بەکوردی قسە دەکا.

٢

خادیم لە قەسیدەی چوارەمی «تەرجیع بەندی نیشتمانی»دا لەگەڵ نیشتمان گفتوگۆ دەکا، دەڵێ:

ئەی وەتەن کوا مەجلیسی ئەحباب و نان و خوانەکەت
چییە! بەزمی بادە نۆشی و ساغیری پەیمانەکەت

کوانی ساقی خۆی و مەی! موتریب بەچەنگ و عوود و نەی!
مـەسـتـی سـەربەسـتـی بەئازادی گـەلی دیوانەکـەت
گـوڵشـەنی شـادیت چییـە! پەژمـوردە وو بێ ڕەونەقـە
کـوا نەسـیـمی عـەنبـەرینی سـوبحی عـەتر ئەفشـانەکـەت

لە وەرامدا نیشتمان دەڵێ:

دەستی دوژمن تێکی دا ئەحباب و نان و خوانەکەم
وا لە جێی مەی پڕ لە زەهرە ساغیر و پەیمانەکەم
بادەیی سـاقی لە خـوێنی جـەرگـمـە ناڵەم نەیە
کـەوتنە زیندانی ئەسـارەت وا گـەلی دیوانەکـەم
گوڵشەنی شادی سومومی زوڵمە سووتاندوویەتی
بۆتە شامی ماتەمم ئەو سوبحی عەتر ئەفشانەکەم

لەم دێڕانەدا خادیم قسە لەگەڵ نیشتماندا دەکا، ئەوە دەردەبڕێ مێژووی کۆنی ڕووناک بووە، خەڵکی کورد بەختیار بوون، بەڵام لە سەردەمی ئێستادا دواکەوتوو و نالەبار و بەدبەختن. لە وەرامدا نیشتمان (دایکی نیشتمان) دەڵێ: دوژمن پەرێشانی کردووم لەباتی مەی ژەهراو دەخۆمەوە، لەباتی ئاو خوێنی جگەرم دەخۆمەوە، ناڵەی دەروونم ئاوازی نەیە، ڕۆڵەکانم دەستبەسەر و دیلن.

**شیعری دیالێکتی گۆرانی**

خادیم کۆمەڵێک لیریکی بەدیالێکتی گۆرانی (هەورامی ناوچەی سلێمانی) هەیە، لە یەکێکیاندا دەڵێ:

سروەی بەهارەن
وادەی گـوڵشـەنەن گـوڵ و گـوڵزارەن
مـەشـشـاتەی سـەبا باوە وە گـوڵشـەن
پەی نەوعـەرووسان گـوڵزار و چەمـەن
پەی زولفی سـونبـول شانەگـەر مـەبۆ
پەی ڕوخسـاری گـوڵ جـەلاگـەر مـەبۆ
شـەمـعـەن پەروانەن گـوڵەن بولبـولەن
مـەجلیس ئارایش وە جـامی مـولەن



نێـرگس پیـاڵەی مـەی وەبانی سـەر
وێنەی سـوراحی وەبان تەشـتی سـەر

***

سـا باوەر تەشـریف ئەی نووری دیدەم
وەی دیدە جـوز تۆ کـەسێ نەدیدەم
با وەرە سـاتێ جـاکـەر وە یانەم
تەعـمیـر کە یانەی سەد جار وێرانەم
خـاڵی جە ئەغـیـار جێ شـاهانەتەن
(خـادیم) خـادیمی ئەی ئاسـتـانەتەن

لەم شیعرەدا خادیم گوڵ و گوڵزارێکی هەورامان و شارەزووری دروست کردووە بۆ ئەوەی کەنیشکە جوانەکان بانگ بکا یەکێتییێک لە نێوان سروشت و ئادەمزاد پێک بێنن لە پێناوی ئەوەی ڕەنگینیی ئەو خاکە و جوانیی کەسانی بەخەڵکی بسەلمێنن.

***

عەبدوڵڵا کوڕی محەمەد مەولوود ناسراو بەخادیم، شاعیرێکە جێگەی دیاری هەیە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. بەرهەمی شیعری زۆرە، دیوانی گەورەیە. شاعیرێکی هەست ناسک و خەیاڵ فراوانە. یەکێکە لە شاعیرە بەدیمەنەکانی شیعری دڵداری و وەسفی بووکی شیعر. لە وەسفی سروشت هاوتای کەمە، لەمەوە دەرباز بووە بۆ وەسفی شتی دیکەش. لە هەندێ لە مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی وتووە، ئاگاداری ئەدەبی میللیی کێشی خۆماڵی بووە، بەشداری تێدا کردووە. تەنانەت بۆ پیرۆزبییش بێ شیعری بەدیالێکتی گۆرانی وتووە.

ئاسۆی پێوەندیی کۆمەڵایەتی خادیم فراوان بووە، هەڵسوکەوتی برایانە بووە لەگەڵ شاعیر و ڕۆشنبیرانی سەردەمی ژیانی خۆی. ستایشی کردوون و شیعریانی کردووە بەپێنج خشتەکی. جێ پەنجەی شاعیر لە بە هونەریکردنی شیعری کوردی و موتروبەکردنی بەڕێبازی ڕۆمانتیکی ڕوون و ئاشکرایە.

# بەشی بیستەم

## کامیران بەدرخان

## ١٨٩٥ - ١٩٧٩

### ژیانی

کامیران کوڕی ئەمین عالی کوڕی بەدرخان پاشا لە ڕۆژی ٢١ی ئاغستۆسی ساڵی ١٨٩٥ لە گوندی مەقتەلەی نزیک شاری تەرابلوسی شام لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەکانی سووریا بردۆتە سەر، هەندێکی دیکە و خوێندنی ناوەندی لە ئەستەموولّ تەواو کردووە. هەر لەو شارەدا خوێندنی زانستییەکانی مافی لە قوتابخانەی حوقووق بردۆتە سەر. لە پاشانا خوێندنی باڵای لە ئابووری سیاسی لە زانستگای لایپزیگ لە ئەڵمانیا بەئەنجام گەیاندووە و باوەڕنامەی دوکتۆرای وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە مەڵبەندی ژیانی لە سووریا.

لە ساڵانی ١٩٤١ - ١٩٤٥ لەگەڵ جەلادەت بەدرخانی برای خەریکی ڕۆژنامەگەری و بڵاوکردنەوەی کتێب بووە بەزمانی کوردی و ئەلفوبێی لاتینی. لە دوو شاری گەورەی سووریا و لبنان، دیمەشق و بێرووت کاریان کردووە. لە ساڵانی ١٩٤٣ - ١٩٤٦ لە بێرووت کامیران خەریکی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی «ڕۆژا نوو»ی هەفتانە بوو بەدوو زمانی کوردی و فەرەنسی. لە پاڵ ئەو ڕۆژنامەیە کۆواری «ستێر» وەک پاشکۆیێکی «ڕۆژا نوو» لە ساڵانی ١٩٤٣ - ١٩٤٥ چەند ژمارەیێکی لێ بڵاوکردۆتەوە.

لە دوای جەنگی دووەمی گێتی و دەرچوونی فەرەنسا لە سووریا و لبنان و دروستبوونی سووریا وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ مافی نەتەوەیی و مرۆڤایەتی کوردی سووریا خرایە ژێر پێ. بەم هۆیەوە کامیران لە ساڵی ١٩٤٧ لە سووریا دەرچوو و لە پاریس نیشتەجێ بوو. لەم ماوەیەدا دەستی کرد بەچاپکردنی بڵاوکراوەیێک بەناوی «بڵاوکراوەی نێوەندی لێکۆڵینەوەی کوردی». ژمارەیێکی زۆری لێ دەرچوو. لە ساڵی ١٩٤٨ ڕووی کردە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ڕاپۆرتێکی پێشکێش بەدەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان (UN) کرد لە بابەت مافی مرۆڤایەتی و نەتەوەیی میللەتی کوردەوە. لەو ساڵەوە کامیران دەستنیشان کرا، لە «ئامۆژگای زمانە زیندووەکانی ڕۆژهەڵات لە پاریس» بوو



بەیاریدەدەری ئەو مامۆستا کوردناسەی فرەنسییان فێری زمانی کوردی دەکرد لە ڕووی فۆنێتیکەوە وەک زمانی دایک و هەڵگری زمانەکە.

لە تەمەنی نزیکی شەست ساڵی ناتالیا ئۆتۆڤیتسکی بەنەژاد پۆڵۆنی هێنا، یار و یاوەرێکی باش بوو بۆی لەو تەمەنەدا. لەو ڕۆژگارەدا لە «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا»وە نزیک بوو، بەشداریی جموجۆڵی ڕۆشنبیری و کۆنگرەکانیانی دەکرد، بەتایبەتی لە کۆنگرەی بەرلین (١٩٦٠) جێگەی کامیران دیار بوو لەگەڵ ئیحسان نووری پاشا لە تارانەوە هاتبوو، هەروەها دوکتۆر خالیس ئۆکانی تورک و دۆستی کورد لە بوڵگاریاوە ڕووی کردبووە بەرلین بۆ بەشداریکردن لەو کۆنگرەیە.

لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ لە کوردستانی عیراق کامیران پێوەندی پێیەوە هەبوو، لە دوای بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ بۆ یەکەمین جار کامیران و خێزانی سەریان لە کوردستانی عیراق دا، بەڕێگەی بەغداوە هاتنە کەرکووک و هەولێر و بەڕێگەی سنووری حاجی ئۆمەرانەوە گەڕانەوە پاریس.

لە ساڵی ١٩٤٧ەوە کامیران تا دوایی ژیانی نیشتەجێی پاریس بوو تا لە ڕۆژی ٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨ لە پاریس کۆچی دوایی کرد. لەسەر وەسیەتی خۆی لەشی درایە نەخۆشخانە بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەی زانستیی پزیشکی لەسەر بکرێ.

### کامیرانی ڕۆشنبیر و سیاسی

کامیران لە منداڵییەوە تەنیا پێوەندی لەگەڵ ئاوەدانی بچووک و ئاقاری کشتوکاڵی نەبووە، لە شارە گەورە و پێشکەوتووەکانی وەکو شام و بێرووت و ئەستەموولّ ژیاوە، شارانی ئەورووپای دیوە بەتایبەتی ئەڵمانیا و لە پاشانا پاریس بووە بەمەڵبەندی ژیانی. هەموو قۆناغەکانی خوێندنی تەواو کردووە، زمانی کوردی و تورکی و عەرەبی و ئەڵمانی و فرەنسی زانیوە، قسە و نووسین و وانەی پێ داون. ئەمە هەمووی زەمینەی بۆ خۆش کردووە ببی بەڕۆشنبیرێکی بەدیمەن. لە باوک و مامەکانی فێری گەلێ کەل و قوژبنی سیاسەت و دیپلۆماسییەت بووە، ئەمانە هەندێکیان بەڕۆژنامەگەری و هی دیکەیان بەسیاسەتی ڕۆژانەوە خەریک بوون لە پێناوی مافی کورد و داوای سەربەخۆیی. بەم جۆرە کامیران بوو بەڕۆشنبیرێک توانای ئەوەی هەبوو لە هەموو کاروبارێکی خوێندەواری بۆ کورد بنووسێ بەپێی خواستی ئەو قۆناغەی کاری تێدا دەکرد، لەوانەیە کارە ڕۆشنبیرییەکانی بەگشتی زۆر قووڵ نەبووبن، چونکە سروشتی کارەکانی بۆ مەبەسی

پەروەردە و فێرکردن بوون. زۆر جار خۆی دەیووت: خەون بەوەوە دەبینم زارۆکێن کورد فێری ئەلفوبێی کوردی بکەم، هەروەها فێری کوردایەتییان بکەم، بەلاّم ڕۆژگار وای کرد خەڵکی بەتەمەن گەورەی ئەوروپایی فێری زمانی کوردی بکەم.

لە سیاسەتی ڕۆژانە و پێوەندیی دیپلۆماسی لە ناو کورددا بەدەگمەن یەکێکی وەکو کامیران بەدرخان دەکەوێتە بەرچاو. کەسێکی دیمۆکراتی لیبرالی بوو، دوور لە شۆڕش و هێمن و لەسەرخۆ بوو، ئامادە بوو لەگەڵ هەموو دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عیراق و سووریا و ڕووسیا دابنیشێ و قسەیان لەگەڵدا بکا، بەلاّم پێوەندی لەگەڵیاندا وەکو یەک نەبوو. لە دوای ساڵی ١٩٢٥ پێوەندی لەگەڵ تورکیا پچڕابوو، شۆڤێنییەتی دەسەلاّتی سووریا لە دوای ١٩٤٧ ڕێگەی لە کامیران بڕی بوو، تا کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا نەیدەتوانی لەگەڵ کوردی عیراق زۆر نزیک ببێتەوە، لە ڕووی ڕۆشنبیری و خوێندەوارییەوە ئاشنایەتی لەگەڵ کوردی ڕووسیا هەبوو. لەگەڵ دەسەلاّتی شای ئێران پێوەندیی کامیران دیپلۆماسییانە بوو، بەگشتی تا پلەیێک پێوەندی لەگەڵ دەسەلاّتی شای ئێران باشتر بوو لە هەموو دەوڵەتەکانی دیکەی بەشێکی هاوولاّتیان کورد بوون.

کامیران کەسێکی بێ لایەن و سەربەخۆ بوو لە ڕووی پارتیبایەتی و ڕێکخراوی سیاسییەوە بەتایبەتی لە دوای جەنگی دووەمی گێتی. لە پەنجاکاندا گەلێ هەوڵ درا ببێ بەئەندام لە «دەستەی ئاشتیخوازانی گێتی»ی سەر بەیەکێتیی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە. بەلاّم ئەوەی نەکرد، ئەم هەڵوێستەی کارێکی باش بوو، نەیدەویست بەخاوەن بیروباوەڕێکی دیاریکراو بناسرێ، چونکە خۆی سەر بەدیمۆکراتییەت و لیبرالییەتی ولاّتانی ئەوروپا و ئەمەریکا دەزانی، بەلای ئەوەوە ئەمە قازانجی بۆ کورد زیاترە.

ئەو ماوەیەی کامیران لە فرەنسا بوو هەوڵ و تەقەلای دەدا بەیارمەتی فرەنسا «ئامۆژگای کوردی» دابمەزرێنێ، لە هەندێ لە کاربەدەستانی فرەنساوە نزیک بوو بەتایبەتی لەوانە ماندیس فرانس، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا بەڵێنی پێ درابوو ئەم هیوایەی بهێننە دی. وا بوو لە کاتێکدا دەوڵەتی فرەنسا بڕیاری کردنەوەی ئەم ئامۆژگایەی دا کامیران لەسەر مردن بوو. بەم پێیە باوکی ڕاستەقینە و دڵسۆزی ئەم ئینیستوتەی کورد لە پاریس کامیران بەدرخانە.



## کارە زانستی و ئەدەبییەکانی

کامیران لە ساڵی ١٩٤٠ دەستی داوەتە نووسین، لەو سەردەمەی لە سووریا و لبنان لەگەڵ جەلادەت بەدرخانی برای خەریکی ڕۆژنامەگەری بووە، وتار و شیعر و هەموو بابەتێکی خوێندەواری لە هەردوو ڕۆژنامە و کۆواری خۆی لە بێرووت بلاّوی دەکردنەوە، هەروەها لەوانەی جەلادەت لە دیمەشق دەری دەهێنان.

کامیران لە هەردوو قۆناغی ژیانیدا لە سووریا و لە فرەنسا، کۆمەڵێک کاری ئەدەبی و زمانەوانی و کۆمەلاّیەتی و سیاسی و ڕۆشنبیریی گشتی بەزمانانی کوردی و تورکی و ئەڵمانی و فرەنسی بلاوکردۆتەوە، زۆربەیان لە بابەت فێربوونی زمانی کوردی و پەروەردەکردنی کوردەوەن لە پێناوی پاراستنی زمانی کوردی و بەخوێندەوارکردنی لاوانی کورد. لێرەدا هەندێ لە کارەکانی دەخرێنە بەرچاو.

١- بەرهەمێکی زۆری هەیە لە بابەت زمانی کوردییەوە، بایەخی زۆری بەلایەنی پراکتیکی داوە، لەگەڵ ئەوەشدا لایەنی تیۆری پشتگوێ نەخستووە.

٢- نووسینی لە بارەی ئەدەبی کوردییەوە زۆرە بەهەموو ئەو زمانانەی قسەی پێ کردوون، شیعری کوردی وەرگێڕاوەتە سەر ئەو زمانانە.

٣- لە داهێنانی ئەدەبیدا بەشداری کردووە، کۆمەڵێک شیعری کوردی هەیە بەناوی «دڵێ کوڕێن من» بلاّوکراوەتەوە.

٤- چوارینەکانی خەیامی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، جگە لەوە قورئانی بەکوردی لێکداوەتەوە، حەدیثی پێغەمبەری کردووە بەکوردی.

سەرجەمی کارە زانستی و ئەدەبییەکانی کامیران تەنیا بەکتێب و سیپارە بلاونەکراونەتەوە، زۆربەیان لە کەلێن و لاپەڕەی گەلێ ڕۆژنامە و کۆواری کوردی و تورکی و عەرەبی و ئەڵمانی و فرەنسی پارێزراون، پێویستە کۆ بکرێنەوە، چونکە لە بەردەستی نەوەی نوێی کورد نین.

## شیعری

لە دانیشتنێکدا کامیران وتی: من شاعیر نیم، بێ نەوایی و بەلەنگازی منداڵی کورد منی هان داوە شیعر بڵێم بۆ ئەوەی بەکوردی پەروەردە بن. کامیران وەکو هەموو لاوێکی کورد بەشیعر دەست پێ دەکا، لە دواییدا شیعر نەبوو بەپیشەی، لە ناو ئەوەی

هۆنیبوویەوە بەرهەمی وا دەکەوێتە بەرچاو ڕووی ئەوەی هەبێ بچێتە ناو مێژووی ئەدەبی کوردییەوە.

کامیران بەدرێژایی ژیانی کۆمەڵێک شیعری بڵاوکردۆتەوە، لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە لەم ئەدگارانەدا خۆیان دەنوێنن.

١- شاعیر لە بەرهەمیدا تەنیا کێشی سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە، لەوانە بەزۆری حەوت بڕگەیی (٤ + ٣) کێشی منداڵان و «هەلوور بەلوور تەکامە» و کێشی هەشت بڕگەیی (بەزۆری ٤ + ٤) کێشی گۆرانی کوردی و کێشی دە بڕگەیی (٥ + ٥) باوترین کێش لە شیعری میللیی سەرزار و نووسراوی کوردیدا. هەروەها لە قافیەدا، جووت قافیە (مەسنەوی) و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی بەکارهێناوە.

زمانی کوردی ئاسانە، خەڵکی نەخوێندەوار و بۆرە خوێندەوار تێی دەگەن. بەزۆری شیعری ئاراستەی منداڵانی قوتابخانە کراوە، لەبەر ڕەوانیی مۆسیقا و ڕیتم زوو لەبەر دەکرێن، وەکو هەموو بەرهەمێکی ماکی جوانکاری تێدا بێ، ئەگەرچی بۆ منداڵان و نەخوێندەوارانیش هۆنرابنەوە، کەسانی خوێندەوار دەهەژێنێ و چێژی لێ وەردەگرن.

٢- مەبەسی بنچینەیی کامیران لە دانانی شیعر فێرکردن و پەروەردەیە (دیداکتیکی)، لەبەرئەوە لە ڕووی ناوەرۆکەوە خەریکی نیشتمانپەروەری و کوردایەتییە، باس لە مێژوو و بەسەرهاتی کورد دەکا، لە دەستدرێژیی دوژمنانی کورد دەدوێ، بەتایبەتی ئەو کارەساتانەی دەسەڵاتی تورک لە دوای جەنگی دووەمی گیتی بەسەر کوردی هێناوە. ئامۆژگاری منداڵ و لاوانی کورد دەکا نیشتمانی خۆیان خۆش بوێ، فێری زانستی و ئەدەب و هونەر بن، بەبێ قەڵەم نەتەوە ناپارێزرێ، بەبێ چەک دوژمن دوور ناخرێتەوە.

بەرهەمی شیعری کامیران بەدرخان نموونەییێکی جوان و ڕەنگینی شیعری پەروەردەیی و فێرکردنە بۆ زۆربەی خەڵکی کۆمەڵی کوردەواری هۆنراوەتەوە.

## نموونەی شیعری

### هەیڤ و ستێر (مانگ و ئەستێرە)

لە لیریکێکیدا کامیران دەڵێ:

ئیشەڤ شەڤە شەڤ ب شەڤە
دێ دگەری تربا خەوە ڤە
هەیڤ دەرکەت ستێرا خوەڤە



دل کەتیمە ئو سینگ ژارم
بێ وەلات و بێ پاژارم
ئەردێ خوە ڕە ئەز حەیرانم
بریندار و بێ دەرمانم
ژ کوردان ڕە ئەز قوربانم
دل کەتیمە ئو سینگ ژارم
بێ وەلات و بێ باژارم
بێ خوەیی مە ئەز تەنێ مە
یەک ژ جامێرێن دنێ مە
ژ بێ بەختی ئەز کەتیمە
دل کەتیمە ئو سینگ ژارم
بێ وەلات و بێ باژارم
ئیشەڤ شەڤە شەڤ ب شەڤە
باڤێ من تێ گۆرا خوەڤە
هەیڤ دەرکەت ستێرا خوەڤە
دل کەتیمە ئو سینگ ژارم
بێ وەلات و بێ پاژارم

ئەم لیریکە ئاه و ناڵەی کەسانێکە لە دەروونێکی بریندار و پڕ لە ئازارەوە هەڵقوڵاوە، ڕەنگدانەوەی ئەو کارەساتە نالەبارەیە لە پێشانا دەوڵەتی عوسمانی و لە پاشانا دەوڵەتی تورکیا بەسەر بنەماڵەی بەدرخان و میللەتی کوردیان هێناوە. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم بەدرخان پاشا لە شاری جزیرە و ناوچەی بۆتان ئاوارەی وڵاتی شام کراوە، خۆی و کوڕ و نەوەکانی لە ناوچە تورکی و کوردییەکانی ئەنادۆڵ دوور خراونەتەوە، کامیران لە سووریا لە دایک بووە، ئەو کاتەی ئەم شیعرەی نووسیوە ڕژێمی دیکتاتۆری لە تورکیا لە لووتکەی جەنگدا بووە بۆ لەناوبردنی میللەتی کورد. لەم شیعرەدا بۆ کورد دەلاوێنێتەوە چونکە مەینەتیی هەموو کوردی گرتبووەوە، خۆی و کەسوکاریشی بەشێک بوون لە کورد.

## شێخ سەعید

لە لیریکێکیدا دەڵێ:

شێخ سەعیدێ بەهەشتی
زەلامەکی مەزن بوو
د تاری یا شەڤێ دە
ژ بۆنا میللەت ڕا بوو
مللەت نەزان ئێخسیر
ژ خێرا خوە بێ خەبەر
د خەوەکە گران دە
بێ قاسید و بێ ڕێبەر
وەکە ستێرا سوبەهێ
شێخ سەعید هات ژ پیران
ب باوەری ب سوندان
ب هەڤال و ب مێران
مللەت نەزان و ئێخسیر
ژێ ڕە نەبوو ئاریکار
شێخ سەعید دار ڤەکرن
شابوون دژمن و نەیار
شۆرێ شێخی ڕەحمەتی
خویناوی دە ڤەمری
لێ کوردستان هێ ساغە
ئو کوردستان نەمری

کامیران لەم شیعرەدا یادی شێخ سەعیدی پیران دەکاتەوە، قارەمانێکی کورد بوو لەوانەی لە ڕووی تیرۆری مستەفا کەمال وەستان. یەکێک بوو لە قوربانییەکانی ڕێگەی ڕزگاریی نەتەوەی، لە پێش ئەو و لە پاش ئەویشدا گەلێ قارەمانی دیکە سەریان ناوەتەوە. بەشێوازێکی دڵسۆزانەی ڕۆمانتیکیانە شاعیر ئەوە دەردەبڕی لە شەوی



تاریکی هەژاری و دواکەوتوویی شێخ سەعید لە خەو هەڵسا و هەڵمەتی برد، لەبەرئەوەی بێ کەس و بێ پەنا بوو سەرنەکەوت، دوژمن ئەو و گەلێک لە یار و یاوەرانی وەک ئەوی لە سێدارە دا، بەڵام کوردستان هەر ماوە و نامرێ.

## گۆڕستان

لە لیریکێکی دیکەیدا کامیران دەڵێ:

تەنشتا دەشتا مووشێ
کوشتنەکە خویندار بوو
نە تەنێ میر و مێرخاس
سەرمیان ژی بریندار بوو
نەیار هەمی شەووتاند
نە گوند بەردا ژی نە دەشت
هێستر گر بن و هاوار
مەهان چار و ڕۆژان هەشت
وەکێ دژمن نێزیک بوو
بێ گومان بۆ نکاری
سێزدە کچێن کوردستان
خوە ئاڤێتن رووباری
ل ناڤ کەفێن ئاڤا سار
هەتا ئیرۆ ژ بۆ ڤان
سەد گرین و سەد کۆڤان
سەد مەقام و سەد ستران

لەم لیریکە کورت و بچووکەدا کامیران بەسەرهاتێکی قارەمانانەی کیژی کورد دەگێڕێتەوە. بەسەرهاتێکە ڕووی داوە، بەشێوازێکی ڕۆمانتیکیانە لەو ڕووداوە ڕیالیستییە دەدوێ و دەڵێ: لە ڕۆژی هەشتی مانگی نیسانی ساڵێک لە دەشتی شاری مووش دوژمن بەسەر کوردی دادا، گەورە و مێرخاسانیان سەربڕی، دەشت و دەر و گوندیان سووتاند، دار و بەرد کاول بوو، کە جانەوەرەکان لە ژنان نزیک بوونەوە، سێزدە کچی کورد

خۆیان هاویشتە ناو ڕووبار بۆ ئەوەی لەشی پاک و خاوێنیان نەکەوێتە بەردەستی گورگەبۆرە چەپەڵەکان. ئەم ئازایییەی کچانی کورد بوو بەسەرچاوە، شاعیر و گۆیندانی کورد بەسەدان گۆرانی و مەقام و سترانیان هۆنیوەتەوە و ئەدەبی میللیی سەرزاریان پێ دەوڵەمەند کردووە.

**دەنگێ دێ**

لە لیریکێکیدا کامیران دەڵێ:

کورمانجی زمانێ باڤ و کالە
تربا خوە دە دێ ب وی دنالە
کورمانجییە دەنگ و شۆرا پێشین
کورمانجییە دەنگ و شۆرا پاشین
سۆر و گەور و کەسک ب ڕەنگێ کوردی
ب کورمانجی تەنێ ب دەنگێ کوردی
باڤێ من و دادکا سپی پۆر
بانی مە دکن ژ تاری یا گۆر
کورمانجی زمانێ باڤ و کالە
تر با خوە دە دێ ب وی دنالە

لەم شیعرەدا کامیران وشەکانی «کورد» و «کرمانجی» وەک زاراوەییێک بۆ یەک مەبەس بەکار هێناوە. لە مێژووی گشتی و مێژووی ئەدەبی کوردیدا گەلێ جار ئەم دوو زاراوەیە وەک ناو بۆ کورد بەکار هێنراون. لە بنجدا وشەی «کرمانج» بۆ بەشێکی گەورە لە تیرە و هۆزەکانی کورد بەکار هێنراوە. شاعیر لە زمانی کوردی دەدوێ، زمانی دایک و باوک و باپیران. میللەت ئەگەر زمانی نەتەوەیی نەپاراستایە بنەمای ناسیۆنالی لە دەست دەچوو، لەبەرئەوەیە ئەم شاعیرە و گەلێ لە ڕۆشنبیرانی کورد بەدرێژایی مێژوو شانازییان بەو زمانەوە کردووە، وەکو میللەتێکی دواکەوتوو ئەگەر زمانیان نەپاراستایە، وەک هەندێ لە میللەتانی دیکەی مێژوو لەناودەچوون.

***

کامیران بەدرخان، هەندێ جار بە«کاموران»یش ناودەبرێ، لە باشووری کوردستان



«کامەران»ە، کەسێکی نووسەر و شاعیر و زانا و سیاسی و دیپلۆماسی بەرچاوی سەدەی بیستەمە. پلەکانی خوێندنی تەواو کردووە مامۆستا بووە لە دەسگا بەرزەکانی خوێندن. هەمـوو ژیانی خوێندەواری بۆ کـورد خەرج کـردووە. وتاری نووسیوە، شیعری داناوە، لێکۆڵینەوەی زمانەوانی و ئەدەبی و کۆمەلایەتی هەیە. لەگەڵ ئەوەی پارتییایەتی نەکردووە، بەلام لە سیاسەت نزیک بووە. پشتی هەموو بزووتنەوەییێکی کوردی گرتووە لە پێناوی بیری ڕزگاریی نەتەوایەتی. لە ڕۆژنامەگەری نزیک بووە، کەسێکی شارەزا بووە لە وتووێژی دیپلۆماسی. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا وەک باڵیۆزێکی سیاسی و خوێندەواری کورد بوو لە ئەورووپا.

## بەشی بیست و یەکەم

### عەرەبی شەمۆ (عەرەب شامیلۆڤ)

**١٨٩٥ – ١٩٧٨**

### ژیانی

عەرەب کوڕی شەمۆ (شەمسەدین) کوڕی شامیل بەپێی دەستووری بنەماڵەی ئێزیدییان خۆی و باب و باپیرانی لە چینی شێخانن. لە نێوەندی کۆمەڵی کوردی بەناوی «عەرەبی شەمۆ» و لە ناو ڕووساندا بە«عەرەب شەمۆ یێڤیچ شامیلۆڤ» ناسراوە. لە ساڵی **١٨٩٥** لە گوندی سووسز لە ناوچەی قارس لە کوردستانی عوسمانی لە دایک بووە. ژیانی سەردەمی منداڵی وەکو هەموو کوردێک قورس و نالەبار بووە، زیاد لەسەر ئەمە وەک ئێزدییێک بەربەرەکانی کراوە و بەبێ دین لە قەڵەم دراوە. بەهۆی ئەوەی لە بنەماڵەی شێخان بووە ئایینی ئێزیدی تا ڕادەیێک ڕێگەی داوە فێری خوێندن و نووسین بێ، ئەگینا تەنیا دەسەڵاتی عوسمانی لە ڕووی خوێندەوارییەوە هۆی دواکەوتنیان نەبووە، بەڵکو قەدەغەکردنی خوێندن و نووسین لە لایەن ئایینەکەی خۆیانەوە کاریگەرتر بووە.

لە دەوروبەری شۆڕشی ئۆکتۆبەری **١٩١٧** عەرەب لە گوندی ساری قامیش بووە لە ناوچەی قارس، لەو کاتەدا ئەو پارچە خاکەی عوسمانی لە لایەن ڕووسیای قەیسەرییەوە داگیر کرابوو. لەو ڕۆژانەدا دەسەڵاتی قەیسەری عەرەبی زیندانی کردبوو، بەتاوانی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی بۆلشەڤیکی و لە شاری ستاڤرۆپۆل لە باکووری قەفقاس دەخرێتە بەندیخانەوە. ماوەی ساڵێک لەو بەندیخانەیە دەمێنێتەوە. بەهۆی دانانی پیلانێکی نهێنییەوە لە بەندیخانە ڕادەکا و ڕوو دەکاتە مۆسکۆ، هەر لەو کاتەدا لە ساڵی **١٩١٨** لە پارتی کۆمۆنیست دەبێ بەئەندام. عەرەب یەکەمین کورد بووە لە ڕووی خوێندەواری و خەباتی پراکتیکییەوە لەو پارتییەدا بووە بەئەندام. لە ساڵانی **١٩٢٠ – ١٩٢٤** دەبێ بەقوتابی و لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی لە مۆسکۆ دەخوێنێ. ئەم خوێندنە جۆرە وەرسووڕانێک بووە لە ژیانی خوێندەواری عەرەب، شارەزایی لە زمان و ئەدەب و مێژوو و جوگرافیای کورد و کوردستان پەیدا کردووە. جگە لەوە کادیرێکی پرۆپاگەندەی باشی لێ هەڵکەوتووە لە کاروباری سیاسەت و پارتییایەتی. لەبەرئەوە لە ساڵی **١٩٢٤** دەینێرن بۆ شاری یەریڤان و دەکرێتە بەرپرسیار و نوێنەری



پارتی کۆمۆنیست لە ناوچە کوردییەکانی ئەرمەنستان و گورجستان بەتایبەتی ناوچەی ئەلەگەز.

بۆ ماوەی هەشت نۆ ساڵ عەرەب نوێنەری کورد دەبێ لە هەموو کاروبارێکی پارتییایەتی و پێوەندیی کورد بەدەسەڵاتی دەوڵەتەوە. وەکو خۆی دەیووت ماڵی تایبەتی خۆی نەبووە، هەر ڕۆژە لە ئاوەدانییێک کاری کردووە و هەر شەوە لە ماڵێک خەوتووە. لە ساڵی **١٩٣٢** ڕووی کردۆتە شاری سانت پیترسبورگ (ئەوسا لینینگراد) و بووە بەقوتابی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی لە بەشی مێژوو کۆششی کردووە. ماوەی شەش ساڵ لەو دەسگا زانستییە بەرزە خوێندوویەتی. لەو سەردەمەدا زانای ڕۆژهەڵاتناس یووسف ئۆربێلی بەنەژاد ئەرمەن دۆستی کورد بووە، یارمەتی عەرەب و هەموو قوتابییە کوردەکانی دیکەی داوە لەو دەسگایەدا، هەروەها زانای بەناوبانگی زمانەوانی نیکۆلای مار لەو ڕۆژگارەدا کەوتبووە چەندوچوونی زمانەوانییەوە لەگەڵ ستالین، وا بوو هەندێ لە قوتابییان و لایەنگرانی تیۆریی مار گیران و ئاوارە کران بۆ ناوچە دوورەکانی ڕووسیای پان و بەرین. پڕووشکی ئەم کارە ناپەسەندە بەر عەرەبیش کەوت نەک تەنیا لەبەرئەوەی لایەنگری تیۆریی مار بوو، بەڵکو زیاتر لەبەرئەوەی کورد بوو. تاوانەکەی ئەوە بوو گۆیا پێوەندی لەگەڵ کوردی دەرەوە هەیە، بەڵگەی ئەمە بڵاوکردنەوەی چیرۆکی «شڤانێ کورد»ە لە سووریا و هەوڵدان بۆ وەرگێڕانی بۆ زمانی فەرەنسی. ئەوەی ئاشکرایە ئەم چیرۆکە لە ساڵی **١٩٣٠** لە یەریڤان بەزمانی کوردی چاپ کرابوو، ئیتر لە دەرەوەی ڕووسیا هەرچی لەگەڵ ئەم بەرهەمە بکرێ خاوەنەکەی بۆ دەبێ بەرپرسیار بێ!

لە ساڵی **١٩٣٧** عەرەب نامەی خوێندنی باڵای تەواو کردبوو، لەسەر بەرگریکردن بوو کە بەر ئەو هێرشە ناڕەوایە کەوت و نێررایە سیبیریا. بێ دەنگ و بێ سەنگ ماوەی بیست ساڵی ڕەبەق لە ناو دۆزەخی ئەم ئاوارەییەیە مایەوە. لە ساڵی **١٩٤٦** کچە ڕووسێکی هێنا و بوو بەخاوەن ماڵ، لەو ژنە سێ کچی بوو. لە ساڵی **١٩٥٧** لە دوای لێبووردنەکەی پارتی کۆمۆنیست لەوانەی لەوە پێش بەناهەق تاوانبار کرابوون عەرەب لەگەڵ ماڵ و منداڵی گەڕایەوە یەریڤان، ئەو کاتە تەمەنی لە شەست ساڵی تێپەڕی کردبوو. ئیتر بەناوی کادیری پارتی کۆمۆنیست تەقاوێت کرا. لەو کاتەوە ژیانێکی هێمن و لەسەرخۆی بردەسەر، تا کۆتایی ژیانی خەریکی داهێنانی ئەدەبی بوو، بەتایبەتی نووسینی ڕۆمان. عەرەبی شەمۆ لە ساڵی **١٩٧٨** لە شاری یەریڤان کۆچی دوایی کرد.

## عەرەبی ڕۆشنبیر

قۆناغی یەکەمی خوێندەواری عەرەب لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە دەست پێ دەکا تا ساڵی **١٩٣٧**. لەم ماوەیەدا جگە لە جموجۆڵی سیاسی و کاری پارتییایەتی، عەرەب دەوری گرنگی هەبوو لە دروستکردنی خوێندەوارییێکی تازە لە ناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا. ئەو یەکەمین کەس بوو لە ڕۆژنامەی «زاریا ڤوستۆکا» (شەفەقی ڕۆژهەڵات)ی ڕووسی لە شاری تفلیس ئەلفوبێی کوردی لەسەر بنجی لاتینی لە ٢١ی تەمووزی **١٩٢٨**ی بڵاو کردەوە، لە پاشانا لەگەڵ کوردناس ماراگوولۆڤ بەناوی هەردووکیانەوە ئەو ئەلفوبێیە بەڕەسمی لە لایەن دەسەڵاتەوە دانی پێدانراوە. لە ساڵانی **١٩٢٤ - ١٩٢٨** لەو ڕۆژنامە ڕووسییەی شاری تفلیس وتار و لێکۆڵینەوەی لە بابەت کوردەوە زۆرە. دیارە لەم وتارانەدا لەبەرئەوەی بەزمانی ڕووسی بوون ڕەچاوی ئەوەی کردووە ئەو جۆرە زانیارییانە بخاتە ڕوو کەڵکی ئەوەی هەبێ کورد بەڕووسی زمان بناسێنێ. جگە لەوە مەبەسی بنچینەیی عەرەب بەرپاکردنی شۆڕشی خوێندەواری و ڕۆشنبیری بوو لە نێوەندی کوردی قەفقاس. بۆ ئەم مەبەسە بەزمانانی کوردی و ڕووسی و ئەرمەنی وتاری زۆرە لە بابەت کوردەوە، گەلێ لایەنی ڕۆشنبیریی کورد دەگرێتەوە، بەتایبەتی بایەخی زۆری بەچەسپاندنی ئەلفوبێی لاتینی داوە، لە زمانەوانیدا هەوڵی داوە بەراوورد لە نێوان دیالێکتە بچووکەکانی سەر بەدیالێکتی کرمانجیی باکوور بکا. لە بابەت پێوەندیی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیستێمی کۆنی دەرەبەگییەوە نووسینی هەیە، لە ژیانی ئابووری تازەشدا ئاوڕی زۆری لە سیستێمی کۆڵخۆز (کێڵگەی هەرەوەزی) داوەتەوە. لەگەڵ ئەم هەموو جموجۆڵییە و بەرهەمە زۆرییەی عەرەب لە بابەت هەموو لایەنەکانی ژیانی خوێندەواری نەتەوەی کوردەوە هێناویەتییە ناوەوە پیشەی سەرەکی بەرهەمی ئەدەبی بووە و لە ڕۆماندا داهێنەری یەکەمە.

## نووسەری ڕۆمان

عەرەب لە قۆناغی یەکەمی ژیانیدا، کە لە ساڵی **١٩٣٧** کۆتایی پێ دێ، لەگەڵ هەموو کۆششە ڕۆشنبیرییەکانی چیرۆکنووس و ڕۆماننووس بووە. یەکێکە لەو دوو کەسە، ئەو و عەلی عەبدولڕەحمان مەشقی شیعر نووسینیان نەکردووە، ئەگەر بەپێی نەریتی ئەوروپاییان بووایە دەبوو ئەوانیش وەکو نووسەرەکانی دیکەی کورد و هەموو نەتەوەکانی



ڕووسیا لە ژێر کاریگەریی ئەدەبی ڕووسی شیعر و پەخشان بەکار بێنن لە بەرهەمی ئەدەبی داهێنراودا، کەچی بەرهەمی ئەم دووانە بەهۆی پەخشانەوە دروست بووە.

لە قۆناغی یەکەمیدا مەشقی نووسینی چیرۆک و ڕۆمان لە لای عەرەب پەیدا بوو. لە ڕووی ڕوخسارەوە لاساییکردنەوەی ئەدەبی ڕووسی بووە. چونکە لەوە پێش هیچ جۆرە تاقیکردنەوەیێک لە ئەدەبی کوردیدا نەبووە لەمەڕ چیرۆک و ڕۆمان نووسین. بەم جۆرە عەرەب بیری لەوە کردۆتەوە ئەوەی لە ئەدەبی ڕووسیدا ڕۆمانی پێ دەڵێن و بەو زمانە نووسراوەتەوە، ئایا شتێکی واش بەزمانی کوردی نانووسرێتەوە!؟ بێ گومان شتی وا بەزمانی کوردیش دەنووسرێتەوە. لێرەدا عەرەب لە ناوەرۆک و ڕووداو و خەڵکی نزیک خۆی دەگەڕێ و چیرۆک و ڕۆمانیان لێ دروست دەکا. لەو ساڵانەدا **١٩٣٠ - ١٩٣٦** مەشقی نووسینی ڕۆمانی کوردی لای عەرەب دەست پێ دەکا. ڕاستە دەڵێن بەرهەمی هونەری و ئەدەبی بەکامڵی لە دایک دەبێ، بەڵام ئەم جۆرە بەرهەمە لە ئەدەبی کوردیدا نەبووە، ئەوەی لەوەوە نزیک بووبێ حیکایەتی بەرگوێی ئاگردانی میللیی نەنووسراوە، ئەمە زۆر یارمەتی عەرەبی داوە بتوانێ بەرهەمێک دابهێنێ وا لەو ڕۆمانە ڕووسییانە بکا کە نووسەر ئاگاداریانە. لەبەرئەوەیە بەرهەمە نووسراوەکەی لەو حیکایەتە نەنووسراوانەوە نزیکە. جگە لەوە ئەو گیروگرفتانەی عەرەب دەیەوێ بیانخاتە ناو ڕۆمانەکانیەوە لەو گیروگرفتانەوە نزیکن کە حیکایەتی بەرگوێی ئاگردان دەیانخاتە ڕوو.

ڕۆمانەکانی عەرەب «شڤانی کورد»، «ڕەبەن»، «کوردی ئەلەگەز» نموونەی یەکەمی هونەری ڕۆمانی کوردین کە لە ساڵانی **١٩٣٠ - ١٩٣٦** لە لایەن عەرەبەوە نووسراونەتەوە. ناوەکانیان ڕەنگدانەوەی دوو دیاردەی پێچەوانەی یەکتری کۆمەڵی کوردەواری ئەو وڵاتەن، واتە ژیانی کۆچەری و شوانکارەیی لە لایێک، لە لایێکی دیکەوە ژیانی نیشتەجێیی و کشتوکاڵی. ئەم دیاردەیە تا ئێستاش ماوە. شارۆچکەی ئەلەگەز لە بناری شاخی ئەلەگەزە، خەڵکی ئەوێ و گوند و ئاوەدانییەکانی دەوروبەری تا ئێستاش لە هاویندا دەچنە سەر شاخ و لەوێ هەموو بنەماڵەیێک هەواری تایبەتی خۆی هەیە و زۆزانی پێ دەڵێن، لە پاییزدا دەگەڕێنەوە ناو گوندەکانی خۆیان.

لەو ڕۆمانانەدا عەرەب لە ژیانی ئەو خەڵکە دەدوێ لە سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، زۆربەی ئەوانە لە ژێر دەسەڵاتی تورکی عوسمانی و تورکە کەمالییە تازەکان یا قەلاچۆ دەکران یا ئاوارە دەبوون. بێ گومان ئەمە دەبێتە سەرچاوە بۆ بەراووردکردن لە نێوان ئەو دوو ژیانەدا، نەوە کۆنەکە تێی دەگا و نەوە تازەکەش نەفرەت لە کۆنەکە دەکا و

دەستخۆشی لەوانە دەکا کە تازەکەیان ڕەخساندووە.

قۆناغی دووەمی ژیانی نووسەر بیست ساڵ ئاوارەیی لە خاکی سیبیریا، ئەدەبی لە بیر نەبردبووەوە، دەیتوانی بنووسێ، بەڵام چۆن و کێ بۆی بڵاو دەکاتەوە! ئەوەی سەیر بێ دەیووت هیچ ڕق و کینێک لە دەروونم دروست نەبووبوو بەرامبەر بەدەسەڵات. باوەڕی تەواوم بەفەلسەفەی دەسەڵاتەکە هەبوو، ئەو خراپەیەی بەمن و بەخەڵکی دیکە کرا کردەوەی ناهەمواری پیاو خراپان بوو. ئەمە دەستووری بیروڕای عەرەب بوو، هەندێ لە نزیکەکانی لەگەڵی نەبوون، چونکە سەرداری وڵات کە ستالین بوو لە دوای خۆی بەولاوە بەقسەی هیچ کەسێکی نەدەکرد. ئەمەو دەبوو خۆی ڕێگەی ئەو پیاو خراپانەی نەدابایە کردەوەی وایان لێ ڕووبدا.

قۆناغی دوایی ژیانی ئەدەبیی عەرەب لە ساڵی ١٩٥٧ەوە دەست پێ دەکا تا کۆتایی ژیانی. لەم ماوەیەدا جەوهەری ڕاستی نووسەر دەردەکەوێ وەک نووسەرێکی بەتوانا لە هونەری ڕۆمانی کوردیدا، بەرهەمەکانی ڕووی ئەوەیان دەبێ بکرێن بەزمانی ڕووسی و زمانی هەندێ لە میللەتەکانی قەفقاسی ڕووسیا و ئەو بێگانانە پێشوازییێکی باشی بەرهەمی عەرەب بکەن و وەک داهێنانێکی ئەدەبیی بەرز بکەوێتە بەرچاویان.

ناوەرۆکی ڕۆمانەکانی ئەم سەردەمەی لە دەوری دوو مەبەسی سەرەکی دەسووڕانەوە. یەکەمیان بڵاوکردنەوەی بیری فەلسەفی سۆسیالیزم وەک ئیدیۆلۆجییەتێک مرۆڤایەتی لە چەوساندنەوە ڕزگار دەکا. دووەمیان یەکێتیی خاکی کوردستان و میللەتی کورد و هەوڵدان بۆ یەکگرتنی ئەو خاکە پارچە کراوە بۆ ئەوەی کوردیش بەسەربەرزی وەکو میللەتانی دیکە بژی. عەرەب دەیویست ئەم ئارەزووەی بەڕێگەی ئاشتی بەدی بێنی.

لە ساڵانی ١٩٥٧ و ١٩٥٩ ڕۆمانی «بەربانگ» و «ژینا بەختەوەر»ی بڵاوکردەوە. لە ناوی ئەم کردەوە ئەدەبییانەوە هەندێ لە ناوەرۆکیان ئاشکرا دەبێ «بەربانگ» ڕەمزی شەفەقێکی تازەیە، لە دایکبوونی کۆمەڵێکی نوێ. ئەو ڕۆژە تازەیە تەنیا بەسەر کوردی ئەوێ هەڵنەهاتووە، بەڵکو لە ئاسۆی خاکی هەموو نەتەوەکانی ڕووسیا سەری دەرهێناوە. ئینجا «ژینا بەختەوەر». ژیانی بەختیاری لە کۆمەڵێکی سەربەستدا، هەموو کەسێکی گرتۆتەوە، چونکە ئەگەر دەوڵەمەندیش لەم کۆمەڵەدا نەبێ هەژاریشی تێدا نییە. عەرەب لەو کاتەی لە بنجدا ئەو ڕۆمانانەی بۆ ئەوەیە باری قورسی ژیان بۆ هەموو ئادەمزادێک سووک بکا، ئەو لە کۆمەڵی کوردەواری دەدوێ، بەزمانی کوردی قسەیان بۆ دەکا. واتە ناسیۆنالیزم و ئەنتەرناسیۆنالیزم تێکەڵ بەیەکتری دەکا.



لە ساڵی ١٩٦١ ڕۆمانێک بەناوی «کوردی ئەرمەنستان» دەنووسێتەوە. لە ڕاستیدا ئەمە سیناریۆ بووە بۆ فیلمێکی سینەمایی لە بابەت ژیانی کوردی ئەرمەنستانەوە، بەتایبەتی لە ناوچەکانی شاخی ئەلەگەز و ئاوەدانییەکانی بناری شاخ و دەشتی ئەلەگەز. هەموو لایەنی ژیانی ئەو کوردانە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و خوێندەواری و ئەدەبی و هونەری دەگرێتەوە.

لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا عەرەب لەسەر شێوازی تایبەتی خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام ئەوە هەیە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە هەست بەگۆڕانی بەرەوچوون بۆ پێشەوە دەکرێ. تاقیکردنەوەی زۆری لە زمانی کوردی، ڕستە و تەعبیر و لێکسیکۆن و وشە و زاراوە بەرەو پێشەوە دەبا. هەندێ لەو کەرەستانە لە زمانانی ڕووسی و ئەرمەنی وەردەگرێ، چونکە ناوەرۆکی ڕۆمانەکانی ئەوە دەخوازێ. ئەو لە بنەڕەتدا هەرچەندە پارێزگاری ژیانی کوردی کردووە لە کۆمەڵی کۆچەری و کشتوکاڵیدا، بەڵام مەبەسی بنچینەیی ئەوەیە مەدەنییەتی پیشەسازی لە کۆمەڵی کوردەواریدا بخولقێنی بۆ ئەم مەسەلەیە پێویستی بەزاراوە و لێکسیکۆنی زمانێکی بەرز هەیە. لەم لایەنەوە تاقیکردنەوەی عەرەب لە پێشخستنی زمانی کوردی زۆرە بۆ ئەوەی زمانەکە پڕ بەپێستی ناوەرۆکی ڕۆمانەکە بێ.

لە ساڵی ١٩٦٦ عەرەب ڕۆمانی «دمدم»ی بڵاوکردەوە. ئەمە نموونەی ئەو هەنگاوە بوو ناوەرۆکی ناسیۆنالی ببێتە مەبەسی سەرەکی لە نووسینی ڕۆماندا و ئەنتەرناسیۆنالی بەپلەی دووەم ببێتە هەوێنی ئەو بیروڕایانەی نووسەر دەریان دەبڕێ. ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە عەرەب بیرۆکەی ئەم ڕۆمانەی لە ڕووداوێکی مێژوویی وەرگرتووە. هەر ئەوەندە پارێزگاری ڕووداوە مێژووییەکانی کردووە ئەوەندەی کەڵکیان هەیە بۆ ئەو ڕووداوە نوێیەی نووسەر لە پێناوی داهێنانی ئەدەبییدا دروستی دەکا. بەم جۆرە ڕۆمانەکە کارێکی داهێنانی ئەدەبییە، هیچ پێوەندییێکی بەزانستی مێژووەوە نییە. نووسەر ڕاپەڕین و بەرگریکردنی خانی لەپزێڕین لە قەڵای دمدم دەکا بەرەمز بۆ بەرگریکردن لە هەموو کوردستان. قارەمانان لە دانیشتوانی هەموو هەرێمەکانی کوردستانن. ڕووداو و خۆ ئامادەکردن لە هەموو شار و ئاوەدانییەکانی کوردستان بۆ بەرگری لە قەڵا بەرچاو دەکەون. نووسەر بایەخی زۆر بەهاوسێیانی کورد دەدا، بەلایەوە پێوەندی پێیانەوە پێویستە دۆستانە و ئاشتییانە بێ. بایەخدانی بەئەرمەن زیاتر لەوەوە هاتووە خۆیان لە نزیک ئەوانەوە دەژین، ئەگینا پێوەندی و هاوسێیەتی کورد لەگەڵ تورک و فارس و عەرەب لە

ئەرمەن زۆر زیاترە. ئەگەر لە ڕۆمانەکەدا هەندێ دیاردە هەبێ لە ڕووی مێژوو و جوگرافیاوە ناڕاست بێ، کارێکی زۆر ئاساییيە، چونکە ڕۆمانی مێژوویی بەگشتی وەک داهێنانێکی ئەدەبی تەماشا دەکرێ نەک تیۆرییێکی زانستی مێژوو.

لە سەرەتای حەفتاکان عەرەب خەریکی نووسینەوەی ڕۆمانی «هالاو» بوو لە بابەت خەباتی کورد لە کوردستانی گەورەدا لە پێناوی مافی نەتەوەییيەوە. هەر لەو کاتەدا پڕۆژەی نووسینەوەی ڕۆمانێکی دیکەی دانا بوو بەناوی «گوندی ئێمە»وە.

***

عەرەبی شەمۆ لە ڕیزی یەکەمی ئەو ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەرانە دەوەستێ کە دەوری باڵایان هەبوو لە خەمڵاندنی خوێندەواری و ڕۆشنبیریی کوردی لە وڵاتی قەفقاسی ڕووسیا لە سەدەی بیستەمدا. یەکەمین نووسەری کوردە لەو وڵاتە و لە هەموو کوردستاندا کە ڕۆمانی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، تەنیا بایەخی بەم هونەرە گرنگە داوە و لە هەموو نووسەرانی دیکە زیاتر بەرهەمی لەم بابەتەی خستۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

عەرەب تەنیا نووسەر نەبوو، کارگەرێکی زانستی و کۆمەڵایەتی بوو، ئەلفوبێی بۆ کورد دانا، زمانی کوردی بژار دەکرد، ئامۆژگاری لاوانی دەکرد، فێری سۆزی مرۆڤایەتی و گیانی کوردایەتی دەکردن. هانی خوێندنی دەدان، ڕێگەی بۆ خۆش دەکردن بچن لە وڵاتی دوور بخوێنن. لە ئێسگەی شەمەندەفەر بەڕێی دەکردن بۆ ئەو وڵاتانە. دەسەڵاتی داپڵۆسینی ستالینی بیست ساڵ بەدەستبەسەری ئاوارەی سیبیریای کرد. لە پاشانا وتیان ئێمە هەڵە بووین، هەرچۆنێ بێ ئەوان مردن، بەڵام عەرەبی شەمۆ مایەوە.

# بەشی بیست و دووەم

## نووری شێخ ساڵح

**۱۸۹٦ – ۱۹٥۸**

### ژیانی

نووری کوڕی شێخ ساڵح کوڕی شێخ غەنی کوڕی سەید عەبدولقادر بە بنەچە دەچێتەوە سەر بنەماڵەی سەیدانی بەرزنجی و بەدرێژایی تەمەنی لە شێخ مەحموود نزیک بووە. لە ساڵی ۱۸۹٦ لە سلێمانی لە دایک بووە. لە بنجدا ناوی دوو وشەی لێکدراو بووە «محەمەد نووری». هەندێ نووسینی بەناوی «م. نووری» بڵاوکردۆتەوە. لە شیعردا ناوی ڕاستەقینەی خۆی «نووری» کردووە بەنازناو، هەندێ جاریش «شێخ نووری» بەکارهێناوە.

خوێندنی بەرایی لە قوتابخانەی تایبەتی خواجە ئەفەندی بووە، بەرنامەی خوێندنی هەموو قۆناغەکانی حوجرەی مزگەوتی تەواو کردووە تا گەیشتۆتە قۆناغی موستەعیدی و ئیتر وازی لە خوێندنی ئایینی هێناوە و ئیجازەی مەلایەتی وەرنەگرتووە.

باوکی نووری خەریکی ئاڵوێری بازرگانی بووە لە پێش جەنگی یەکەمی گێتی وازی لێ هێناوە و ئیشەکەی داوەتە دەست نووری و یەکێ لە کوڕەکانی دیکەی. ئیتر لەگەڵ برای بەمەبەسی بازرگانی هاتوچۆی ئێران دەکا. لەم کارەدا چەند جارێک مایەپووچ دەردەچێ و ناچار واز لە کارەکە دێنێ و دەست دەکاتەوە بەخوێندن، لە پێشانا قوتابخانەی سەرەتایی تەواو کردووە. لە هاوینی ۱۹۱٦ بووە بەقوتابیی ڕوشدییەی سوپایی سلێمانی، بەڵام بەهۆی مردنی ئامۆزاییێکی وازی لە خوێندن هێناوە. جگە لەوە هەوەسی ئەوەی نەبووە ببێ بەسوپایی. بەگشتی سەرچاوەی خوێندنی نووری لەو قوتابخانانە بووە کە لەسەر پرۆگرامی حوجرەی مزگەوت ڕۆیشتوون.

نووری ماوەیێکی زۆری ژیانی بەمووچەخۆری میری بردۆتە سەر. لە ساڵی ۱۹۲۱ لە شارەوانی سلێمانی کاتبی دووەم بووە، لە ساڵی ۱۹۲۲ کراوە بەکاتبی یەکەم. لە ساڵانی ۱۹۲٦ – ۱۹۲۷ بووە بەمووچەخۆری کارگێڕی پیشەسازان. چەند جارێک لە کاروباری میری تووشی دوورخستنەوە بووە، هەروەها گیراوە و لە گرتووخانەدا بەند کراوە.

لە ساڵانی ۱۹۳٥ – ۱۹۳۹ لە کارگێڕی خەزێنە لە سلێمانی و هەولێر مووچەخۆر بووە.



لە دوای جەنگی دووەمی گێتییەوە کراوە بەمودیری ناحیە لە ناودەشت و باڵەک (نزیک گەلاڵە) و تەق تەق و سەنگاو و بارزان و وارماوە. لە دوا ڕۆژانی مووچەخۆریی میری لە ساڵی ۱۹٥٥ بۆ ماوەی سێ ساڵ لە کار دوورخراوەتەوە.

لە سەردەمی لاویەتیدا نووری حەزی لە کچێک کردووە. وا ڕێک کەوتووە شووی بەیەکێکی دیکە کردووە. هەرچۆنێ بێ مێردی ئەو ژنە مردووە، بەم هۆیەوە نووری بەخۆشەویستەکەی شاد بووە. لە شێخ مەحموودەوە نزیک بووە، خۆشی ویستووە، ئەمە ڕایکێشاوە بۆ ئەوەی ڕقی لە ئینگلیز بێ. نووری کەسێکی هونەرپەروەر بووە بەتایبەتی لە گۆرانی. دەنگی زۆر خۆش بووە، شارەزاییێکی تەواوی لە مەقام و گۆرانییە کلاسیکییەکان و میللییەکانی ناو کوردەواری (فۆلکلۆر) بووە. تا پلەییێک ئەم بەهرەیە یارمەتی داوە گوێییێکی مۆسیقی بەهێزی هەبێ و هەڵە لە کێش و قافیەی شیعریدا نەکا.

نووری لە ۲۰ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹٥۸ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

#### کێش و قافیە

نووری یەکێکە لە شاعیرە دەگمەنەکانی ئەدەبی کوردی زۆرترین بابەت و هونەرەکانی ئەدەبی کلاسیکی و خۆماڵی لە ڕووی ڕوخسارەوە لە بەرهەمی شیعری خۆیدا بەکاری هێناوە. نوێکردنەوەکانی تایبەتین بەخۆی و لە ئەدەبی کوردیدا بەناوی ئەوەوە تۆمار کراون. ئەم دیاردانە لەم تێبینییانەی لای خوارەوە دەکەونە بەرچاو:

١– لە بەحرە عەرووزییەکاندا نووری دەوڵەمەندە، حەوت بەحری عەرووزی بەکارهێناوە: هەزەج، ڕەمەل، موزاریع، موجتەس، خەفیف، ڕەجەز، سەریع.

٢– لە کێشە خۆماڵییە سیلابییەکاندا هەموویانی بەکارهێناوە، حەوت و هەشت و دە بڕگەیی و کەرتەکانی.

٣– لە یەکێتیی قافیەدا بەشێکی زۆری دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی بەکارهێناوە وەکو: ا ت خ د ر ش ع ف ک ل م ن و وو ۆ (ە – ـە) ی ێ.

٤– شیعری جووت قافیە (مەسنەوی) لە بەرهەمیدا زۆرە (ا ا ب ب جـ جـ..).

٥– ئەم وشانە لە پاش قافیەی شیعریدا بەرچاو دەکەون: ئەکا، بێ، تێناگەم، من، منە،

بگری، دێنێ، ئەیزانی، مەحشەر، کەی، ترین، شەراب، منم، کەین، ڕواوە، نەگەیی، بوو، ئەگری، ئەکەی، کورد، کە (بکە)، من، ئەمڕۆ، دڵ، کەم (بکەم)، ئەکەم، چەمەنە، منە، شەو، کوردستان، نەبوو، خۆم، مووەزەف.

٦- زۆرترین شیعری بەحری عەرووزی شاعیر بەپێی دەستووری کلاسیکی یەکێتیی قافیەی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی زۆر لەم بابەتە شیعرەی لە ڕووی قافیەوە جووت قافیەیە (مەسنەوی). ئەمەیان دەچێتە ناو نوێگەرییەکانی شاعیرەوە.

٧- لە دیوانی شاعیردا بەرهەمێکی زۆر بەرچاو دەکەون لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی ڕێک خراون. بەپێی دەستووری ڕەچاو کراو بۆ ئەم جۆرە شیعرە پێویستە قافیە مەسنەوی بێ، لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر بەرهەمی لەو جۆرەی هەیە کێشی خۆماڵییە، بەڵام یەکێتیی قافیەی شیعری عەرووزی تێدا بەکار هاتووە. ئەمەش یەکێکە لە نوێگەرییەکانی شاعیر.

## لیریک و قەسیدە

نووری لە هەردوو بابەت شیعری بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی، لیریک و قەسیدەی هەیە. لیریکی لە قەسیدەی زیاترە. لە لایێکی دیکەوە دەتوانرێ قەسیدەکانی بەچیرۆکەشیعر یا شیعری چیرۆکی (پۆێیم) بژمێررێن، لەوانە:

١- کاروانی ژیان: لە ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٥٨ لە سلێمانی نووسراوەتەوە. گێڕانەوەیێکی سیمبۆلییە، شاعیر کەوتۆتە گەشت، یا لە خەونیدا لە شاری ژیان دەگەڕێ، ئەو جێیەی هیچ جۆرە گیروگرفتێکی تێدا نییە. نویشکی گێڕانەوەکەی ئەوەیە هەندێ کەس بەئاسانی دەگاتە ئەو ژیانە، هەندێ کەسی دیکە هەر ڕەنج دەدا کەچی تا گۆیی گۆڕیش نایگاتێ.

٢- لە خەوما: لە ٨ی ئاغستۆسی ١٩٥٨ نووسراوەتەوە. لەم چیرۆکە شیعرییەدا درێژەدا لە هەڵسوکەوتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و پێوەندیی نێوان دەسەڵات و خەڵکی عیراق دەدوێ لە دەوروبەری جەنگی دووەمی گیتی و ناوەڕاستی سەدەی بیستەم. باس لە فەرمانڕەوایی سەردەمی عەبدولئیلاهی وەسی و نووری سەعیدی وەزیر دەکا. لە پەیمانی بەغدا دەدوێ کە یەکێ لە مەبەسە گرنگەکانی ڕەتکردنەوەی بزووتنەوەی نەتەوەیی و بیری کوردایەتی بوو لە هەموو کوردستانەکاندا، بەتایبەتی کوردستانی عیراق.



٣- لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا (١٩٥٤ - ١٩٥٧) دەسەڵاتی بەغدا عومەر عەلی کردبووە موتەسەریفی سلێمانی بەناوی ئەوەی بەشێوازێکی یەکسانی فەرمانڕەوایی بکا، کەچی بەڕاستی لە پێناوی چەوساندنەوەی خەڵکی سلێمانی و بەربەرەکانی بیری کوردایەتی لەوێ کرابوو بەکاربەدەست. لەو شیعرەدا نووری کەموکورییەکانی دەگێڕێتەوە، دژایەتیکردنی لەگەڵ بنەماڵەی شێخان و خوێندەوار و ڕۆشنبیرە ئازادیخوازەکان. هەروەها باس لە کردەوە و دەستدرێژییەکانی خولەپیزە (مەحموود محەمەد) دەکا.

## قەسیدەی بەندی

یەکێ لە خاسیەتە گرنگەکانی دیوانی نووری ئەوەیە کۆمەڵێک قەسیدەی بەندی دەور دەکاتەوە. هەندێکیان شاعیرانی دیکە بۆی نەچوون و تازەن، بڕێکی دیکەیان بەژمارە زۆرن و شاعیرانی دیکە ئەم هەناسە درێژەیان نەبووە لەم جۆرە شیعرەدا. لە دیوانی نووری لەم بابەتەوە ئەم وێنانە دەکەونە بەرچاو:

١- بەندی چوارین: لە کۆی بەندەکانی ئەم جۆرە قەسیدانە ئەم قافیانە دەبینرێن: (ا ا ا ا)، (ا ا ب ب)، (ا ب ا ب)، (ا ب ب ب)، (ا ا ا ب)، (ا ب ب ا).

٢- بەندی پێنجین: لە ناو بەندەکانی ئەم جۆرە قەسیدانە ئەم قافیانە دەبینرێن: (ا ا ا ا ب)، (ا ا ا ب ا)، (ا ب ب ا ا)، (ا ب ب ا جـ).

٣- بەندی شەشین: لە ناو بەندەکانی ئەم جۆرە قەسیدانە ئەم قافیانە دەبینرێن: (ا ب ا ب جـ جـ)، (ا ا ا ا ب ب)، (ا ا ا ا ا ب)، (ا ا ا ب ب ب). جگە لەمە قەسیدەییێکی بەندی شەشینی هەیە قافیەی ڕەنگاوڕەنگی تێدا بەکار هێناوە بەبێ سنوور.

٤- بەندی حەوتین: ئەم جۆرە قافیەی تێدا بەکار هێناوە (ا ا ا ا ا ب ب).

## موستەزاد

موستەزاد لە شیعری کلاسیکیی کۆندا دێڕی شیعری بریتی بووە لە نیوە دێڕێکی درێژ و نیوە دێڕێکی کورت، کەچی نووری ئەم وێنە تازانەی لە هونەری موستەزادی کوردیدا داهێناوە:

١- دوو نیوە دێڕ شیعری درێژ و تەنیا نیوە دێڕێکی کورت بەم قافیانە (ا ا ب)، (ا ب ب).

٢- چوار نیوە دێڕی درێژ و تەنیا نیوە دێڕێکی کورت (ا ا ا ا ب).
٣- دوو نیوە دێڕی درێژ و نیوە دێڕێکی کورت (ا ب ا)، (ا ب ب)، (ا ا ا).
٤- پێنج نیوە دێڕی درێژ و تەنیا نیوە دێڕێکی کورت (ا ا ا ا ا ا)، (ا ب ا ا ب ب).
٥- نیوە دێڕێکی درێژ و نیوە دێڕێکی کورت (ا ا)، (ب ب).

### تەرکیب بەند

لە دیوانی نووری لە هونەری تەرکیب بەند لیریکێک دەکەوێتە بەرچاو، لە چوار بەند پێکهاتووە، هەر بەندی هەشت دێڕە لەسەر یەکێتیی قافیە. تەرکیبەکە واتە دێڕی دوایی هەموو بەندەکان، دێڕێکی دیاریکراو نییە، مانای هەموویان یەکە لەگەڵ هەندێ دەسکارییەوە.

### چوارین

نووری کۆمەڵێک هونەری چوارینی ڕەسەنی خۆی هەیە. جگە لەوە کۆمەڵێک چوارینی عومەر خەیامی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی لەسەر کێش و قافیەی خەیام خۆی.

### تاک

لە بابەتی تاک دیوانی نووری کۆمەڵێک دەور دەکاتەوە ژمارەیان دەگاتە دەوروبەری بیست دانە.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

نووری پارێزگاری ناوەڕۆکی شیعری کلاسیکی کردووە، نوێگەری لە شیعرە داهێنراوە تازەکانیەتی:

١- لە شیعرە کلاسیکییەکانیدا تا پلەیێک پارێزگاری یەکێتیی بابەتی کردووە، واتە بابەتەکانی دڵداری و وەسف و ستایش و پێداهەڵدان و داشۆرین و هی دیکە. لەمانەدا دەتوانرێ ئەوە بووترێ ئەگەر زمانی لێ دەربکرێ ئەو شیعرانەی سیما و ئەدگاری قوتابخانەی کوردستانی باشووریان پێوەیە. جگە لەوە لە هەندێ لیریکی لەم بابەتەیدا ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی تازەی هێناوەتە ناوەوە.



٢- لە شیعرە نوێیەکانیدا پارێزگاری گیانی چیرۆکی و بەسەرهات و ڕووداوی کردووە، لەبەرئەوە قارەمان و کات و شوێن و بزووتنەوەی دروست کردووە، هەمووی لە بەسەرهاتی ڕۆژانەی خەڵکی کورد بەتایبەتی و خەڵکی عیراق بەگشتی وەرگرتووە. لەم لایەنەوە هەندێ لە شیعرەکانی دەبن بەسەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوە لە مەیدانی مێژوودا.

شیعری نووری بەهەموو جۆرێ ئاوێنەییێکە هونەروەرانە وێنەی ژیانی کوردەواری کێشاوە لە کاتی خۆشی و ناخۆشی و بەختیاری و بەدبەختیی میللەتی کورددا.

## دەوری نووری لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا

نووری یەکێکە لە شاعیرە سەرەکییەکانی نوێکردنەوەی ئەدەبی کوردی، ئەوەی لە دوای جەنگی یەکەمی گێتیی سەدەی بیستەم لە ناوچەی سلێمانی سەری هەڵدا. شاعیر وەکو پێویست بوو بەلاساییکردنەوەی قوتابخانەی نالی دەستی پێ کرد، لە دواییدا یەکەم هەنگاوی نوێکردنەوە ئەو ئاشنایەتییە بوو کە لەگەڵ شیعری عوسمانی پێشکەوتووی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم لە ناوەوە بوو. نووری خۆی و هاوڕێکانی ئەو شیعرە نوێیەی عوسمانییان کردبوو بەڕێبەر کە شیعریان بەو شێوازە دەنووسی و ناویان نابوو «لاسایی شیعری عوسمانی»، لەوەوە ئیتر بەرە بەرە لە کلاسیکییە لاساییەکە دوورکەوتنەوە، ئەویش زیاتر لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، نەوەکو لە ڕوخساردا. لەبەرئەوە ڕاستیی داهێنانی نووری لە ڕوخساردا دەردەکەوێ، بەتایبەتی کێش و قافیە مەشقێکی گرنگ بوو بۆی. چاکسازی تێدا کردووە و بووە بەقاڵبێک ناوەڕۆکی تازەی تێدا داڕشتووە. شاعیر ئەو توانا هونەرییەی هەبوو دیاردەی پێچەوانەی یەکتری لە سیفەتەکانی شیعری کۆن و نوێ کۆ بکاتەوە و تێکەڵی یەکتریان بکا و شتێکی تازە دابێنێ. واتە توانای ئەوەی هەبوو پارێزگاری شتە کۆنە ڕەسەنەکان و شتە تازە داهێنراوەکانی خۆی بکا. لەمانە ئەوەی دروستی کرد وەکو بەرهەمێکی داهێنراوی ڕەسەن چووە ناو ئەدەبی کوردییەوە. بەم جۆرە نووری تا دوایی ژیانی وەک شاعیرێکی داهێنەر مایەوە. لەبەرئەوە بوو بەسەرانی ئەو شاعیرانەی دەستێکی درێژیان هەبوو لە بزووتنەوەی «شیعری نوێ»ی کوردی لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی.

نووری تەنیا وەکو شاعیرێکی گەورە و لە ڕوو و نوێکەرەوە لە مێژووی ڕۆشنبیری کوردیدا خۆی نانوێنێ، بەڵکو بایەخی زۆری بەلێکۆڵینەوەی ئەدەبی و ڕەخنە و ڕەوانبێژی و کێش و قافیەی شیعری ئیسلامەوی داوە. واتە لە سەردەمی خۆیدا پسپۆڕ و لێزانێک بووە لەو زانست و زانیارییانەی کەوتنە ناوەوە بۆ مەبەسی ناسینی بەرهەمی ئەدەبی لە ناو هەموو نەتەوەکانی گێتیدا.

مەبەس لە بەکارهێنانی زاراوەی «ئیسلامەوی» بۆ ئەو بەرهەمە ئەدەبی و شارستانییەت و مەدەنییەتەیە کە لە ئەنجامی لێکدانی کولتووری عەرەب و عەجەم و تورکی عوسمانی و کورد لە دوای ئیسلام دروست بوو، نەک بەمانا ئایینییەکەی. ئیتر لە زانستی ئەدەبدا لە ئەنجامی ئەو گۆڕان و دەسکاری و داهێنانە تازانەی نەتەوە موسوڵمانەکانی ناعەرەب کردیان، شێواز و دەستووری تازە کەوتنە ناوەوە. ئەمە لە بەشداریکردنی ڕۆشنبیری هەموو ئەو نەتەوانە پەیدا بوو. بۆ بەڵگە شیعری عەرەبی کلاسیکی پێش ئیسلام تا سەردەمی فەرمانڕەوایی عەباسیانیش تەنیا «قەسیدە» بوو. هونەرەکانی دیکە لە لایەن نەتەوە ناعەرەبەکانەوە دروست بوو و لە دواییدا هاتە ناو ئەدەبی عەرەبیشەوە، وەکو چوارین و پێنج خشتەکی و موستەزاد و تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و گەلێکی دیکە.

کۆمەڵێک دەستوور و نەریت لە ئەدەبی ئەو نەتەوانە دروست بوو، زانین و فێربوونیان کارێکی پێویست بوو بۆ لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی هەموو ئەو نەتەوانە. بۆ ئەم مەبەسە لێکۆڵینەوەی زانایانی ئەدەبی عوسمانی وەردەگرت و لەگەڵ بەرهەمی شیعری کوردی دەیگونجاندن. بۆ ئەم ئامانجە کۆمەڵێک باس و وتاری نووسیوە لە پێناوی ڕوونکردنەوەی دەستوورەکانی ڕەخنە و ڕەوانبێژی و کێش و قافیە و هەموو زانیارییێکی پێوەندی بەبەرهەمی ئەدەبییەوە هەبوو و لە ڕۆژنامەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی شاری سلێمانی بلاوی دەکردنەوە، ئێستا و ئەوساش ئەم جۆرە باس و وتارانە نرخی ئەکادیمییان هەیە بۆ فێرکردنی قوتابیانی هەموو قۆناغەکانی خوێندن.





## سروشتی جوانی کوردستان و دڵداری

ئەوەندەی نووری بایەخی بەسروشتی کوردستان و بەهار و نەورۆز داوە ئەوەندە خەیاڵی بۆ دڵداری و جوانی ژن نەچووە. ئەگەر جوانی مێیینە هەندێ جار بزواندبێتی لە ناو وەسفی سروشت شاردوویەتییەوە.

١

نووری لە وەسفێکی بەهاردا دەڵێ:

بەهارە ئەمڕۆ لە باغا وەنەوشە مەستی ئەکا
سەبا لە پەڕەی گوڵ دا دراز دەستی ئەکا
لە من فیدایی تری لێرەدا نییە ئەمڕۆ
بەغەیری غونچە کە ڕەفعی حیجابی هەستی ئەکا
لە خاکپای گوڵا وا بەگریە کەوت بولبول
دەڵێی برەهمەند مەستانە بت پەرستی ئەکا
ئەدەب لە سەرووی سەهی وەرگرە ئەگەر ژیری
لەگەڵ بلندی خۆیا هەوای پەستی ئەکا
ئەگەرچی مەی نییە لەم بەزمەدا بەتەنگەوە نیم
بەبێ پیاڵە لە باغا وەنەوشە مەستی ئەکا

نووری باس لە دیاردەی هەست پێ کراو و ناسراو دەکا، شتە ئاساییەکان لە وێنەی شیعریدا بەجۆرێک دەجوولێنێ داهێنانی نوێی هونەرییان تێدا دروست دەکا. ئەگەر ئەو وێنە تازانە لەگەڵ شیعری کلاسیکی کۆن بەراوورد بکرێن، چەند وێنەیێکی نوێ دەکەونە بەرچاو: بای شەماڵ دەست درێژ دەکا بۆ گوڵ، غونچە پەردەی هەستی هەڵدەماڵێ. بلبل لە گوڵ دەپاڕێتەوە وەکو ئەو برەهمەنە هیندییەی موناجات لەگەڵ براهمای خوداوەندیاندا دەکا. لە سەرەتای شیعرەکەدا نووری دەڵێ وەنەوشە وا خۆی پیشان دەدا کە مەست و سەرخۆشە، لە دوا دێڕیدا ئەوە دەردەبڕێ وەنەوشە بەبێ مەی سەرخۆشە.

## ٢

له شیعرێکیدا نووری وەسفی بەهاری سلێمانی دەکا:

سلێمانی چ خۆشە نەوبەهاران
بەلەنجەولارەوە دێن گولعوزاران
بەچاوێکی لە شەرما کەم هەڵاتوو
ئەپچڕێنن هەناوی دڵ فیگاران
چەمەن کەوتۆتە خەندە و من بەگریان
ئەناڵێنم وەکو هەوری بەهاران
جەوانانی چەمەن هاتوونە لەنجە
بەئاوازی جگەرسۆزی هەزاران
درەخشانە برووسکەی شەو لە شەوقا
وەکو ئاهی دڵی شەو زیندەداران
بەسروەی بای سەحەر ئارایشی دا
عوزاری گوڵ وەکو ڕووی گولعوزاران
گوڵاڵە بانگ کرا بۆ سوور و شایی
بەتارای سوورەوە ڕەقسان و ڕەخشان
بریقەی پوولەکەی دەسماڵی لامل
وەکو ئەنجوم لە دەوری ماهی تابان
ڕشێنەی ڕووح ئەپرژێنێ بەدڵدا
قریوەی پێکەنینی پۆیلەداران
بەتەرزەی ئەم بەهارە زۆر ئەترسم
کە بشکێ جامی تۆبەی تۆبەکاران

نووری جوانیی بەهاری سلێمانی تەنیا لە دیمەنی نەبزووتوو نابینێ، بەڵکو بەبزواندنی کیژە جوانەکانی سلێمانی دیمەنی بەهار دەبزوێنێ. لەنجەی ئەو جوانانە بووە بەسەما لەسەر ئاوازی بلبل هەزارەکان. شاعیر دوور لە وێنە ڕەوانبێژییە کلاسیکییەکان وێنەی ڕەوانبێژی تازەی داهێناوە کە بەراوورد لە نێوان ئەندامە جوانەکانی لەشی ئەو نازەنینانە دەکا لەگەڵ گوڵ و گوڵاڵەکانی بەهار.



## ٣

نووری شیعرێکی بەتایبەتی بۆ نەورۆزی ساڵی **١٩٥٨** هۆنیوەتەوە، وەکو لە ناوەرۆکیدا دەردەکەوێ بەهەناسەیێکی سیاسی و هەستێکی کوردایەتی دایناوە، لەو سەردەمانەی ڕژێمی مەلیکی عیراق ڕێگەی لە ئاهەنگەکانی نەورۆز دەگرت لە کوردستانی عیراقدا. هۆی نووسینەوەی ئەم شیعرە لە لایەن نوورییەوە ئەوە بوو، لە زستانی **١٩٥٨** دەستەی نووسەرانی کۆواری «شەفەق» لە کەرکووک هەوڵیان دا مۆڵەت لە حوکوومەت وەربگرن بۆ گێڕانی ئاهەنگی نەورۆز لە یەکێ لە هۆڵی سینەماکانی کەرکووک. لە پێشانا دەسەڵات بەڵێنی دا ڕێگە بەگێڕانی ئەو ئاهەنگە بدا، لە پاشانا دوو سێ جار هەڵوێستیان گۆڕی. هەرچۆنێ بێ سێ ڕۆژ پێش جەژنی نەورۆز دەستەی نووسەرانی شەفەقیان ئاگادار کرد بەوەی مۆڵەت نادرێ ئاهەنگی نەورۆز بەئاشکرا و نهێنی لە کەرکووک و دەرەوەی شاردا بکرێ، ئەوەی بیکا بەرپرسیار دەبێ. لەبەرئەوە زۆربەی دەستەی نووسەرانی شەفەق ناچار بوون لە کەرکووک بچنە دەرەوە. هەندێکیان بۆ سلێمانی و برێکیان ڕوویان کردە هەولێر.

نووری ڕۆژێک پێش نەورۆز ئەم هەواڵەی بیستبوو، بەم هۆیەوە ئەم شیعرە جوانەی نووسیبووەوە:

ئاگری نەورۆز بەشاپلێتە و پەرۆ ناکرێتەوە
زوو ببێتە خۆڵەمێش و تینی دامرێتەوە
ئاگری نەورۆز بەگیان و دڵ ئەبێ وا خۆش کرێ
گەر بەخوڕ دیجلە و فوراتی بێتە سەر نەکوژێتەوە
هاتوو گەر شێتانە مەنعی جەژنی نەورۆزت کرا
لازمە گیانت بەمەردی بیخەیە ژێر پێتەوە
دەست و پێ ئێسکی شکا و چیلکە و چەوێڵی چاوگە بێ
لاشە هەروەک داری زەنگەقڵیشە کۆ بکرێتەوە
خوینی لاوان نەوت و بەنزین بێت برژێتە سەری
گڵپەیێکی وا بسێنی شەو دانەمرێتەوە
پیاو بزیرڕێنێ وەکو شێری ژیان هەڵمەت بەرێ
ژن بەدەوری ئاگرا بگری و بلاوێنێتەوە

خۆش ئەبێ ئەوسا بلێسەی ئاگری نەورۆزەکەت
ئەو حەلە سەیری گوڵی کە چۆن دەمی ئەکرێتەوە
دەس ئەکاتە پێکەنین بۆ بولبولی باغی وەتەن
هەر بەیەک سروەی بەیان ئەشنێتەوە ئەخنێتەوە
چەند بەخۆشی بولبولی خۆشخوان ئەخوێنێ بۆ گوڵان
چۆن چریکەی سەرچڵی عەرشی عەزیم ئەگرێتەوە
بەو زمانی حاڵەخۆشە ئەم نزایەت بۆ ئەکا
ڕەببی ئەم ڕۆژە هەموو ساڵێ بەخۆشی بێتەوە

شاعیر بەشێوازێکی هونەری و شیعرییانە باس لە لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی جەژنی نەورۆز دەکا ، چۆن لە لایەن دەسەڵاتە داگیرکەرەکانی کوردەوە کراوە بەداردەست بۆ بەربەرەکانی کورد و خواردنی مافی مرۆڤایەتی و نەتەوەیی. شاعیر کورد هان دەدا بێ دەنگ نەبن لە داواکردنی مافی ڕەوایان. وێنە داهێنراوەکانی نووری بەڵگەی ئەوەیە شاعیر توانیویەتی مەسەلەی سیاسی دوور لە سۆز بخاتە ناو قاڵبێکی جوانکاری ئەوتۆوە شاکارێکی ئەدەبی لێ دروست بکا. نووری دەڵێ پێویستە چیلکە و چەوێڵ بۆ ئاگری نەورۆز بەکار نەهێنرێ بەڵکو پێویستە ئێسک و پریسکی شەهیدانی کورد کۆ بکرێتەوە، لەباتی نەوت بەخوێنی لاوان ئەو ئاگرە دابگیرسێنرێ، پیاو شێرانە هەڵمەت بەرێ، ژنیش لە دەوری ئاگر واوەیلا بکەن و بلاوێننەوە. ئەو کاتە جەژنی نەورۆز بەڕاستی دەکرێ و کەس ناتوانێ قەدەغەی بکا.

٤

لە شیعرێکی لیریکی تازە بابەتدا کۆمەڵێک مەبەسی شیعری کلاسیکی لە دڵداری و وەسف و ستایش و پێداهەڵدان و نامەی دۆستایەتی بەشێوازێکی نوێ دەردەبڕێ، بەم جۆرە دەست بەشیعرەکە دەکا:

بولبول فیداتم
حەیرانی سۆز و دەنگ و سەداتم
قوربانی وورشەی باڵی خێراتم
فیدای زانیاری و مێشکی وورياتم



لەو تۆزە مێشکەی خوا بەتۆی داوە
زانیاران هەموو سەریان سوڕماوە
دەمێکە مەیلی لای یاران ئەکەم
تاسەی دیدەنی نازداران ئەکەم
بدە لە شەققەی باڵی نەرم و سووک
بڕۆ تا چەمی خاسەی ناو کەرکووک
لەوێوە باغچەی خانەقا دیارە
مێرغوزارێکی تەڕ و ئاودارە
بنیشەرەوە سەر لقی چڵێ
دەس کەرە ناڵە هەردەم بۆ گوڵێ
شمشاڵی گەرووت دێنێتە خرۆش
دڵی دڵداران دەهێنێتە جۆش

لەم شیعرەدا نووری بلبل دەکاتە نامەبەر، یادی خۆشەویستان دەکاتەوە. یەکێ لەوانە لە کەرکووک دادەنیشێ، وەسفی جێی زیندەگانییان بۆ بلبل دەکا و دەڵێ ماڵیان لە لای دەستە ڕاستی بەستی خاسەی بەناوبانگی کەرکووکە، واتە خانەقای سەید ئەحمەد.

ئینجا لەسەر شیعرەکەی بەردەوام دەبێ و داوا لە بلبل دەکا ڕاسپێرییەکان بەو خۆشەویستە بگەیەنێ:

ڕاسپێریم هەیە گوێ بگرە بەزەین
بچۆرە خزمەت شێخ کاکە حوسەین
بڵێ ئەی نووری دوو دیدەی (نووری)
نووری خەریکە بمرێ لە دووری
عەقڵ و شعووری وا نزوول ئەکا
مەیلی هاتنت بۆ قەیتوول ئەکا
زۆرم پێ خۆشە وەک غونچەی بەهار
بگەشێیتەوە لە دەم جوێبار
ئاواتەخوازم ڕۆژی هەزار جار
چۆن شەماڵ ئەدا لە چیا و نزار

بەسروە دلّم فێنک کاتەوە
غەمی کۆن و نوێم لە بیر باتەوە
پێکەوە لە گوێی ئاوێ دانیشین
ئەو بەپێکەنین من بەگریە و شین
بێنمەوە بیری بەزمی ئەو شەوە
ئێستاش نازانم خەیاڵە خەوە
ئەو شەوە ماری ئەگریجەی ماری
لە هەستم ئاڵا بەلەنجەولاری
گێسووی وەک ماری ماری لە ئەستۆم
نەوعێ ئاڵا بوو پێم نەبوو بڕۆم
وای بێهۆش کردم بە بادەی چاوی
عەقڵ و شعوورم نایە پێناوی

خۆشەویستەکەی شاعیر کاکە حوسێنی خانەقایە، دۆست و برادەریەتی. پلە و پایە و کەسێتی هەرچی بووبێ بووە بەسەرچاوەی ئیلهامی شیعری. کەچی لایەکەی دیکەی ئەم زاتە ڕۆشنبیرێکی شارەزا بوو لە مێژوو و ئەدەبی کوردی و مێژووی ڕۆشنبیری کوردەواری، یەکێ بوو لەوانەی لە نالی گەیشتبوون و بە«نالی»ناس ناسرا بوو. بەدرێژایی ژیانی نەبوو بەمووچەخۆری میری و خەریکی کشتوکاڵ و بەرهەمی زەویوزاری خۆی بوو.

نووری بەبلبل دەڵێ ئەوە بەکاکە حوسێن بگەیەنی کە بیری دەکا. وەک دەردەکەوێ لەو کاتەدا لە ئاوایی قەیتوول بووە، ئارەزوو دەکا ئەویش بچێتە ئەوێ، کاتێکی خۆش پێکەوە ببەنە سەر. سەیرانی ناو گوڵ و گوڵزار و گوێی جۆگەلەی بەهار بکەن. لەوەدەمە پڕ لە شادییەدا پێکەوە بیر لەو شەوە خۆشە دەکەنەوە کە چاویان بەجوانی ماری ناوێک ڕوون بووەوە. ئەم ڕووداوە لە یەکێ لە شانۆکانی بەغدا (مەلها = تیاترۆ) بووە کە شاعیر و کاکە حوسێن پێکەوە چاویان بەو سەماکەرە جوانە کەوتووە کە ناوی ماری بووە. ئیتر شاعیر کەوتۆتە گەمەی ڕەوانبێژی و بەراوورد و لەیەکچواندن لە نێوان ناوی «ماری» و بسک و ئەگریجەی کە لە «مار» دەکا و سەرچاوەیێکی گرنگە لە شیعری کلاسیکی کۆنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.



## لەو ڕۆژەوە تۆی دیوە

قەسیدە بەندە چوارینەکەی بێخود «لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە» بەناوبانگە لە ئەدەبی کوردیدا. هەندێ لە شاعیرانی کورد لەسەر کێش و قافیە و مانای نزیکی ئەو قەسیدەیە شیعریان هۆنیوەتەوە. نووری قەسیدەیێکی بەندی شەشینی داناوە بەناوی «دڵی من» لە ڕۆژی ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٥١ لە سەنگاو هۆنیویەتییەوە.

بەم بەندانە قەسیدەکەی دەست پێ دەکا:

لەو ڕۆژەوە تۆی دیوە پەرێشانە دڵی من
سەودازەدە وو بێ سەروسامانە دڵی من
پیشەی خەفەت و شیوەن و گریانە دڵی من
گا وێڵی کەژ و کێو و بیابانە دڵی من
گا دەربەدەری کووچەیی شارانە دڵی من
سەرسامی پەل و بەردی مناڵانە دڵی من

***

هەرچەندە بەدوویا ئەگەڕێم شار و وولاتان
دەشت و کەژ و سەحرا وو چیا و چۆڵ و بیابان
نایدۆزمەوە بێ سەروشوێن ڕۆییوە دیسان
شێتانە ئەبێ ڕووی لە چ لا کردبێ یاران
وەک بولبولەکەی وێڵی گوڵستان بە بەهاران
ئاخۆ لە چ گوڵزارێ غەزەلخوانە دڵی من

***

گاهێ وەکو لافاوی چیا ڕوو لە بیابان
وەک هەوری تەڕی فەسڵی بەهاران لە نزاران
وەک بولبولی ئاوارە لە گوڵزار و گوڵستان
مەستانە ئەسووڕێتەوە هێلانە پەرێشان
شمشاڵی گەرووی پڕ لە چریکەی غەم و هیجران
هەر ساتە بەدەردێکەوە ناڵانە دڵی من

***

ساتێ بەهەوا و مەیلی پەرستش بەگوڵی ڕووت
جێی مەسجیدە بۆ سوجدەیی میحرابی دوو ئەبرووت
بەینێ بەخەیاڵاتی گرێ و پێچی سەری مووت
پابەندی کلێسایە زونناری دوو گێسووت
حەیرانە لەبەر ڕووت و پەرێشانە لەبەر مووت
گەه کافر و گەه شێخ و موسوڵمانە دڵی من

***

ساتێ نەبوو دنیا بگەڕێ تۆزێ بەکامی
ڕۆژێ نەبوو سەد دەفعە نەکولێتەوە زامی
زۆرم پەلە کرد دڵی نەبێ گیرۆدەیی دامی
بێهوودە بوو خۆی تووشی بەڵا کرد بەنەفامی
ڕووحی بەفیدا کرد و کەچی هەر نەبوو ڕامی
ئێستا بەشەو و ڕۆژ بەشی گریانە دڵی من

وێڵ و سەرگەردان لەم شیعرەدا دڵی شاعیرە. لە سەرەتادا ڕوو دەکاتە یەکێک، لەوەپێش دیوبەتی و گرفتاری بووە، خۆشی ویستووە، لە دڵی دەگەڕێ چونکە مەڵبەندی دڵدارییە، لە هەموو جێیێک بۆی گەڕاوە و نەیدۆزیوەتەوە. شاعیر هەوڵ دەدا دڵدارییەکەی بخاتە ناو بیری سۆفیزمەوە. ئەو دڵە پەرێشانە ڕووی کردۆتە مزگەوت لەوێ میحراب لە برۆی دلبەر دەکا، ئینجا چووە بۆ کەنیسە چونکە لەوێ زوننار لە دوو گێسووی خۆشەویست دەکا. جوانی موتڵەقی سۆفیزم کافر و موسوڵمانی بۆ نییە، وێنەی کردگار لە هەموو جوانێک دەبینرێ. دڵی شاعیر شپرزەیە هەموو کات و ساتێ پیشەی تەنیا گریانە. ئینجا شاعیر دەڵێ:

نەمدیوە دڵی وا بەد و ئاخرشەڕ و نەکبەت
ڕێ لێ هەڵەبووی چۆڵ و بیابانی مەحەببەت
لاسار و سەهەند و سەرەڕۆ و سەر بەموسیبەت
وەک بایە لە لای سەرزەنەش و پەند و نەسیحەت
گوێ ناگرێ لە جوێن و هەڕەشە و تەعن و مەلامەت
یا ڕەببی چ بێهۆش و چ نادانە دڵی من



سەد خۆزگە بێ بەو ڕۆژە کە نەمبیست بوو ناوت
نەمچێشت بوو تامی مەیی مەیخانەیی چاوت
نەمدی بوو دەس و پێی دڵەکەم هەڵقەیی داوت
ئازاد بوو لە پێچ و خەمی ئەگریجەیی خاوت
وا ئێستا لە تاو ئاگری هیجرانی بەتاوت
فرمێسکی ئەڵێی تەرزە وو بارانە دڵی من

***

خۆ کفری نەکرد تێپەڕی کرد ڕۆژێ بەلاتا
زوو هۆگرت بوو وا کە ئەگریا بەدواتا
سووتا وەکوو پەروانە لە ناو شەوقی چراتا
ئەتلێتەوە بێچارە لە ناو دەرد و بەڵاتا
خوێنی بەهەدەر ڕۆیی لە پێناوی هەواتا
خۆڕایی نییە مەیلی لە تۆرانە دڵی من

***

ئیتر بەسە هێندە مەدە ئازار و عەزابی
با نەشکێ پیاڵەی پڕ و برژێ مەیی نابی
با نەدرێ سەحیفەی ئەدەب و دەرس و کیتابی
خۆت نەختێ بپارێزە لە دوعا وو لە عیتابی
جوابت چ ئەبێ ڕۆژی جەزا وەختی حیسابی
جێی زیکری خودا و مەرکەزی ئیمانە دڵی من

***

شەرت بێ دڵەکەم بگرم وا بیدەمە بەردار
زنجیر و کەلەپچەی کەم هەتا دێتەوە بەربار
بیهێنمەوە ناو قەفەسی سینە وەکوو پار
بیدەم بەنیگارێکی وەفادار و خەریدار
گوێ بگرێ لە ناڵین و لە گریان و لە هاوار
با بەس بگەڕێ ئەم کەژ و کێوانە دڵی من

شاعیر سەرزەنشتی دڵی دەکا، بەبێ هۆش و نەفام لە قەڵەمی دەدا. بەتەعبیری جوان شاعیر ڕوو دەکاتە دلبەری و دەڵێ: خۆزیا هەر لەو ڕۆژە بوومایە کە ناوتم نەبیستبوو، ئەو کاتە دڵم تووشی ئەم هەموو فرمێسک و مەینەتییە نەدەبوو. شاعیر گفتوگۆ لەگەڵ خۆشەویستدا دەکا، گلەیی لێ دەکا، ئەوەی دلبەر لەگەڵ شاعیری دەکا پاداشی دڵداری نییە، چونکە کە ئەوی خۆش ویستووە لە ئایین دەرنەچووە. لە پاشانا ئامۆژگاری دەکا بۆ ئەوەی ئازاری نەدا، بەزەیی پێ بێتەوە، ئەوجا لە ڕووی دلبەر دەوەستێ و بەڵێن دەدا ئیتر ڕێگە بەدڵی نەدا ئەم هەموو ئازارە بچێژێ. دەیخاتە بەندیخانەوە بۆ ئەوەی بحەسێتەوە و ئەم هەموو دەشت و کێوانە نەکا. شاعیر قەسیدەکەی بەم بەندانە کۆتایی پێ دێنێ:

ئەوسا بگەڕێ یارێ بدۆزێتەوە بۆ خۆی
تێر سوجدە بەرێتە بەری میحرابی دوو ئەبرۆی
ئیتر نەگەڕێ شار و دەر و دەشت و چیا بۆی
ئۆباڵی هەتا هێندە نەچێتە مل و ئەستۆی
بەڵکو ئەمە خوایە کە کەمێ بێتەوە سەر خۆی
با هێندە نەسووڕێتەوە شێتانە دڵی من

***

بڕوا سەری خۆی هەڵگرێ ڕوو کاتە دیارێ
یارێ بگرێ خەندە بەلەب شوهرەیی شارێ
دەم پڕ لە شەکەرخەندە مەلەک چەهرە نیگارێ
بارانی غەزەب هێندە لە ڕوانینی نەبارێ
بێنێتە سەما ڕووحی ڕەوانم بە ووتارێ
نەشکێنێ هەموو ڕۆژێ بەسەد تانە دڵی من

***

یارێکی وەها ترسی خوداوەندی لە لا بێ
ڕەحمی بەقەدەر زەڕڕەیی موویی لە دڵا بێ
ترسێکی لە پرسینەوەیی ڕۆژی جەزا بێ
دەرحەق بەحەبیبانی بە عەهد و بە وەفا بێ
زوڵمێکی کە بوو مەرحەمەتیشی لەگەڵا بێ
دەس هەڵگرێ لەم شیوەن و گریانە دڵی من



ئەم ئاه و ئەنینی دڵە گیانە بەشکایەت
هەر بەردی سەری ڕێتە هەتا ڕۆژی قیامەت
تۆ تێمەگە ئەفسانەیە کردوویە بەعادەت
هەر خاکی بەری پێتە بەشەوق و بەشەتارەت
بیبەخشە کە خنکاوە بەلافاوی نەدامەت
هەرچەندە کە لاسارە بەسەزمانە دڵی من

***

وا دیارە کە ئاگات لە دەسی خۆت نییە (نووری)
تۆ شاعیری لای خۆت و ئەڵێن ئەهلی شوعووری
ببڕێتەوە ئەم ڕاز و سکاڵایە لە دووری
گوێ مەگرە لە ناڵە و لە عیتاب و لە شرووری
بێهۆش و سەراسیمەیە مەڕوانە قوسووری
تۆ هەرچی بکەی بەندەیی فەرمانە دڵی من

شاعیر دڵی لە بەند ئازاد دەکا و ڕێی پیشان دەدا لە وڵاتێک بگەڕێ و یارێکی لێ بدۆزێتەوە، کەسێکی ڕێکوپێک و بەوەفا و دڵسۆز بێ و لە جوانانی شیعری کلاسیکی نەکا. لە دواییدا نووری گلەیی لە خۆی دەکا بۆ ئەو قسانەی خستوویەتییە ناو قەسیدەکەیەوە و ئینجا ڕوو دەکاتە خۆشەویستەکەی و پێی دەڵێ: تۆ ئازادی هەرچی دەکەی. بەو مانایەی دەیکاتەوە بەجوانە عاشق کوژەکانی شیعری کلاسیکی. ئامادەیە دیل بێ بۆ هەموو فەرمانێکی بۆی دەردەکا.

لە ڕووی لۆجیکییەوە نووری کۆمەڵێک وێنەی پێچەوانەی یەکتری کێشاوە، ئەم ناکۆکییانە بوون بەمایەی سەرکەوتنی قەسیدەکە چونکە هونەر زۆرتر پێوەندی لەگەڵ چێژ و خەیاڵدا هەیە کەمتر لەگەڵ ڕاستی و لۆجیک.

## ڕەشبینی و نائومێدی لە شۆڕشی ڕۆمانتیکیدا

ئەدگاری ڕەشبینی و دڵشکاوی و نائومێدی لە سەرانسەری دیوانی نووری بەدی دەکرێ، ئەمە وێنەی ڕاستەقینەی ژیانی بووە، چونکە هێمن و لەسەرخۆ و ئاسان نەبووە بۆی.

١

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

سەفەر کەوتە خەیاڵی هەمدەمی ئەییامی هیجرانم
بیناغەی سەربەسەر ڕووخا هەموو ئامالی عیمرانم
لە ئوفقی ئاسمانی دیدە گوم بوو میهری ڕووی بۆیە
سیەهـ بەختانە وەک شەو تیرەکی ئەڕژێتە دامانم
لە گوڵزاری خەیاڵی وورد و خواشتا دڵ وەکو بولبول
خەریکی بەستنی هێلانەیێ بوو بۆ گوڵی جوانم
لەپڕ گەردوونی بێ ڕەحم و وەفا بێ سووچ و تاوان
دەسێکی نایە بینی بولبولی زاری غەزەلخوانم
زمانی شیعری گرتم شێوەیی ئادابی شێواندم
فەساحەت کەوتە ناڵین و بەلاغەت کەوتە گریانم

گەردوون بەپێی ئارەزووی شاعیر نەسووڕاوە، لە گێتیی گەشبینی دوور بووە و لە ئێش و ئازار نزیک بووە. لەم شیعرەدا وێنە کلاسیکییەکانی ڕەشبینی بەهەموو جوانییانەوە بەکاری نەهێناون، چونکە لەگەڵ گیانی ڕۆمانتیکی نوێ ڕێک ناکەون. شاعیر وشە و تەعبیری نوێی خستۆتە فەرهەنگی شیعرییەوە، وەک: ئوفقی ئاسمانی دیدە، سیاهـ بەختانە وەک شەو، لە گوڵزاری خەیاڵی وورد، فەساحەت کەوتە ناڵین، بەلاغەت کەوتە گریان و گەلێکی دیکە.

٢

لە شیعرێکی پێنجینی ڕۆمانتیکیدا بەناوی «ئادەمیزاد» دەڵێ:

لە ناو شەپۆڵی غەما سەرنگوون و بێ ئارام
بەکێوی سەختی ژیانا بەپێ و چنگەڕنێ



خەریکی هەڵمەتی سەرکەوتنە بگاتە مەرام
لەپڕ نشێوی کلۆڵییێ بواری لێ ئەتەنێ
بەداوی جەور و خەفەت تاروپۆی لە ئێش و لە زام
زەبوون و ڕێ هەڵە بووی دەشتی چۆڵ و هۆڵی بەڵا
شکستە باڵ و شپرزەی پلاری دەستی قەدەر
نە دەست گیرێ لەلاوە دەستی بداتە پەلی
نە هاودەمێ خەفەتی خۆی لە لا بدا بەهەوا
بە لاییێکا ئەیەوێ تێپەڕێ نییە ڕەهبەر
لە بەردەمیشیەوە تاریکە سێبەرێکی وەها
هەتاکو چاو بڕ ئەکا توند و تاڵ بیم ئاوەر
ئەدا بەلایەوە ئەخنێتەوە بەئیستیهزا
هەوڵ ئەدا کە بچێ بیگرێ بەڵام سێبەر
چلۆن ئەگیرێ بەهێزی شەلێکی بێ سەروپا
ئەمانە ئەم کەژ و ئەم سێبەر و شەپۆلە یەکی
نموونەیە لە هیوایە و لە ڕێگەیایە بەبار
کە چاوی پێ ئەکەوێ بۆی ئەچێ بەئیستیعجال
بەتەنگەوە نییە ڕاهاتووە لەگەڵ ئیهمال
هەتاکو ئەودەمە ئەینێنە قەبری تیرە و تار

ئەم لیریکە بەڵگەییێکی دیکەیە نووری بەگەورەترین شاعیری نوێکەرەوەی قوتابخانەی کرمانجیی باشوور دابنرێ لە سلێمانی لە نێوان هەردوو جەنگی گێتیی سەدەی بیستەم.

ئەم شیعرە هەرچەندە لەسەر بەحری موجتەسی عەرووز دانراوە، شاعیر بەگەمەی هونەری لەگەڵ قافیە و وشە و وێنەی ڕەوانبێژی تازە بابەتی دوور لە قاڵبی کۆن توانیویەتی بەرهەمێکی نوێ دروست بکا و جوانییێکی تازە بێنێتە ناو شیعری کوردییەوە. لە قافیەی هەر چوار بەندی شیعرەکە سێ جۆرە سیستێمی بەکارهێناوە (ا ب ا ب ا)، (ا ب جـ ا ب)، (ا ب جـ جـ ب). زمانی کوردییێکی پەتییە، لە شیعری کۆن بەرچاو ناکەوێ. لە ڕووی لێکسیکۆنەوە مانای تازەیە، لێکچواندنی مەتریالی نییە. ڕوومەتی یاری نەکردووە بەگوڵاڵە، یا گوڵاڵە جوانی لە ڕوومەتی یار وەرگرتبێ، بەڵکو ژیانی پڕ لە

ئەندێشەیە، لە ڕووناکییەوە دوورە لە سێبەر یا لە تاریکستاندا دەژی. کەسێکی بێ سەروپا چۆن دەتوانێ سێبەر بگرێ، واتە زاڵ بێ بەسەر ژیانی کوڵەمەرگی! نووری توانیویەتی شیعری کوردی لە ڕەوانبێژیی مەتریاڵییەوە، کە ئەویش نرخی خۆی هەیە، دەرباز بکا بۆ ڕەوانبێژیی گیانییەوە.

### ٣

لە لیریکێکی ڕۆمانتیکییانەیدا بەناوی «گریەی خوسران» نووری جەوهەری شۆڕشی شیعری نوێی کوردی لە سلێمانی دەخاتە ڕوو:

بگری! ئەی شاعیری ناتەوان بگری
مرد لە ڕووحی منا هەموو ئامال
«بیخودانە کفن بدوش ملال»
(بێ ئیختیارانە کفن بەشانەوە)
ئەگەڕێ سەرسەری پەری خەیاڵ

***

بگری! ئەی ڕووحی غەمنیشان بگری
کە بەکوللی نەما لە شیعری منا
زەرڕەیێ لەفزی ڕێک و پڕ مەعنا
وەکو ئەفسوردە ئەگەڕێ سەرما

***

بگری! ئەی چەهرەیی خەزان بگری
گریەی دڵ بەکوڵ بکا هەیەجان
بتەوێ گریەکەی بە وەقفی خەزان
گریەیێکی غەریب و بێ سامان

***

بگری! ئەی ناڵە و فیغان بگری
گریەیێکی وەها بەجۆش خرۆش
کە نەمێنێ نە عەقڵ و فەهم و نە هۆش
خەرقەیی ماتەمی و ناڵە بە دۆش



بگری! ئەی هەوری بێ ئەمان بگری
تۆی چاوانی من بکەی تەمسیل
گریەی چاوی تۆ ئەکەم بە دەلیل
وەکو تۆ خوێنی دڵ ئەکەم بە سەبیل

***

بگری! ئەی شیعری ناتەوان بگری
بگری! ئەی ڕووحی غەمنیشان بگری
بگری! ئەی چەهرەیی خەزان بگری
بگری! ئەی ناڵە و فیغان بگری

ئەم لیریکە لە ڕووی ڕوخسارەوە لە شەش بەند پێکهاتووە، هەر بەندی چوار نیوە دێڕ شیعرە، قافیەی بەندەکان بەم جۆرەیە (ا ب ب ب). وشەی «بگری» لە سەرەتا و دوایی یەکەم نیوە دێڕی شیعری هەموو بەندەکان و نیوە دێڕ شیعری بەندی دوایی هاتووە، واتە (٢٠) جار وشەکە دووبارە کراوەتەوە، جگە لە وشەی «گریە» ئەویش پێنج جار دووبارە و سێ بارە کراوەتەوە.

نووری لەم شیعرەدا ڕوو دەکاتە شتی گیانی و مەجازی، ئەوانەی بەبیر هەستیان پێ دەکرێ وەکو شیعری بێچارە، گیانی غەمگین، ڕووی پاییز، ناڵە و فیغان، هەوری بێ ئەمان، ئەمانە هەموویان لە شین دان. شاعیر هانیان دەدا بگرین چونکە پێوانەی داهێنانی هونەری نەماوە. لە پاشانا ڕوو دەکاتە ئەو شتانەی قسەی لەگەڵدا کردن شیوەن خۆش بکەن.

## بەختیاریی گیان و ناهەمواریی گوزەران

نووری لە لایێک لە کون و کەلەبەری ژیانی ئادەمزاد دەگەڕێ و پەنا بۆ خوو و ڕەوشت دەبا و فیکری دانایی ڕۆژهەڵات هەڵدەسەنگێنێ، لە لایێکی دیکەوە دەنوارێتە گوزەرانی هەژار و بێ نەوایان، ئەمەی پێ چاکترە لە سەرشۆڕی.

١

له شیعرێکیدا بەختیاری له لووت بەرزیدا دەبینێ:

سەعادەت گەر بەڕاستی تۆ دەپرسی غیرەتی نەفسە
ئەگەر بەدناویی شارت نەوێ نەفست بەڕەڵڵا کە
ئەگەر بەرزی مەسیحت بۆ نەبێ تەقلیدی یووسف کە
ئەگەییە ئاسمان هەوڵێ بدە زیندانێ پەیدا کە
له پانایی زەمینا جێت نەبێ شاخ و چیا زۆرە
ئەگەر قەسرت نەبوو عاجز مەبە غارێ بەمەئوا کە
له ناو شاری عەدەمدا بێ غەمی و ئاسوودەگی زۆرە
ئەگەر ژینی زەریفت دەس نەکەوت مردن تەمەنناکە
جیهان بێ ئێمە زۆر تێپەڕیوە و تێپەڕ ئەبێ زینهار
بەکردەی چاکە ناوێکی نەمر بۆ خۆت موهەییا کە
له هەوراز و نشێوی ڕێی ژیانا قەت مەناڵێنە
ئەمەل مەبڕە تەحەممول بگرە بێ عەزمی تەوەللا کە

لەم ئامۆژگارییانەیدا نووری لە سنووری دانایی ڕۆژهەڵات و دەستووری ئایینە جیاوازەکان نەچۆتە دەرەوە. ئاوڕدانەوەی زیرەکانەی هەیە، توانیویەتی وێنەی شیعری داهێنراو دروست بکا. کەم شاعیر هەیە باسی کەرامەتی مەسیح و جوانیی یووسفی نەکردبێ، کەچی ئەم شاعیرەمان لە بەراوردەکەیدا دەڵێ ئەگەر بەرزی مەسیحت نەبوو، واتە نەچووی بۆ ئاسمان وەکو ئەو لاسایی یووسف بکەرەوە و هەوڵ بدە زیندانێک پەیدا بکەی، مەبەس بیرەکەیە کە براکانی یووسف خستبوویانە ناویەوە. لەم شیعرەدا نووری وەسفی ئادەمزادێک دەکا وەکو خۆی دەیەوێ، لە ئەنجاما ئەم وەسفە کەسانی ڕەسەنی زانا و هونەرمەند و شاعیر و ڕۆشنبیر دەگرێتەوە، چونکە سەر بۆ کەس شۆڕ ناکەن تەنیا بۆ کەسانی وەکو خۆیان نەبێ.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا خەڵکی هان دەدا نەفرەت لە هەژاری بکەن، بەڵام لەو خراپتر ئەوەیە پیاو دیل بێ و ئازاد نەبێ:



هەمواره غەریبی کووچەشاری بێ
ماتەمزەدە زووخاوی جگەرخواری بێ
شەو تا بەسەحەر بەدەردەوە ناڵەت بێ
چاتر لەوەیە کە یاری ئەغیاری بێ

***

برسی و ڕەش و ڕووت بەعاجزی و غەمگینی
ڕابوێری بەبێ نەوایی و بێ تینی
لەو دەشتە لەبەر هەتاوی سوور گوڵچنی
قوبووڵترە نەک ڕووی ڕەقیبێ ببینی

***

پشتت لە مەرارەتا لە ژێر بارا بێ
ڕووحت لە ڕەزالەتا لە ئازارا بێ
جێی نوستن و ڕاحەتت لە ناو نارا بێ
نەک پادشەهیت لە گەفتی ئەغیارا بێ

***

ئاوارە و زار و دەربەدەر و ڕیسوایی
بۆ قەترەیە ئاو لە تینووا خنکاوی
بۆ لوقمەیە نانی جۆ و دۆ داماوی
زۆر خۆشە ئەڵێن لەبەر ڕەقیب هەستاوی

***

بەڕۆژ پووش و پەلاش و زی بماڵی
بەشەو تا وەقتی سبحەینێ بناڵی
بنۆشی دەمبەدەم زووخاو و تاڵی
نەوەک بێگانە بێ و ڕوو کەیتە ماڵی

ئامۆژگاری نووری لەم لیریکەدا شاعیرانەیە، وەسفێکی وردی ژیانی هەژاری دەکا لە ڕووی مەتریاڵی و گیانییەوە. برسیەتی و ڕەنج و ئازار و ئاوارەیی و دەربەدەری. ئەگەر

ئادەمزاد ئەم هەموو ئازارە بچێژێ لەوە چاکترە پیاوی ناکەسێک یا پاشاییێکی بێگانە بێ.

**گوێم لە ناڵینی کچێ بوو**

بەناوی «پەچە» نووری شیعرێکی لەسەر زمانی کچێکی کوردەوە هۆنیوەتەوە، لە ساڵی ١٩٤١ بڵاوی کردۆتەوە. شیعرەکە بەم بەندە دەست پێ دەکا:

گــــوێم لە ناڵـینی کـــچێ بوو دوێنێ ئەیلاوانەوە
وا بەتەئســـــیـــر و بەســـــۆز ئەیووت دڵی ئەتوانەوە
دەنگ و ڕەنگی وا نەبیستراوە و نەبینراوە لە کەس
کـــۆنە قــــەتماغـــەی برینی ناو دڵی ئەکــولانەوە
ئەیووت ئەم ڕووپۆشە تەنیا ڕووی نەپۆشیوین و بەس
ڕووبەڕووی خـۆمـان حوقـووقی نایەنە ناو نسـیـانەوە
قـەت نەبوو ڕۆژێ بەسـەربەسـتی حەقێ داوا بکەین
بۆ بەشی خـۆمـان بچـینە سـاحـە وو مـەیدانەوە
ئەووەل و ئاخر خـەتای ئەم ڕووڕەشـەی ڕووپۆشـە بوو
بوو بەمـانیـعـمـان نەچووینە کـۆمـەڵی پیـاوانەوە
دایگرن توخـودا فـڕێیـــدەن بیـــخـــەنە تەندوورەوە
حـەیفـە ڕۆژی ڕوو ئەنێنە ناو شـەوی دەیجـوورەوە

نووری شیعرەکەی لەسەر شێوەی تەرجیع بەند داناوە، بریتییە لە سێ پارچە، هەریەکەی پێنج دێڕە شیعرە، تەرجیعەکەی دێڕی شەشەمە لە هەموویاندا دووبارە دەبێتەوە.

لە سەرەتادا شاعیر ئەوە دەردەبڕێ کچێک بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە دەلاوێنێتەوە، شین و شەپۆر دەکا بۆ ڕووپۆش «پەچە» دەڵێ تەنیا ڕووی دانەپۆشیوە بەڵکو مافی هەموو ژنانی خواردووە، بۆتە هۆی ئەوەی نەچنە ناو پیاوانەوە و بەشداری لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵ نەکەن. لە تەرجیعـەکەیدا دەڵێ ڕووپۆش داگرن و بیخەنە تەندوورەوە. ئینجا شـاعیـر لە بەندی دووەمدا دەڵێ:

زوڵمی ئەم غـەدداره بوو حوکمی موساواتی نەهێشت
جینسی ئێمـەی خسـتە حـاڵێکی لە پیـاو پاڕانەوە
بۆ بەشی ئێـمـە کـفن بـوو وا لە دنیـا و ئاخـیـرەت
لێـــرە ڕەش لەولا ســـپی ببـــڕێ بەباڵامـــانەوە
حەز ئەکـەی پرسـە لە پیـران و لە پێشـینانی خـۆت
کێ پەچەی دیوە بە ڕووی خـاتوونی کـوردسـتـانەوە
کەی پەچە بۆتە سەبەب بۆ عیـففەتی جینسی لەتیف
کـافـری دڵ تیـرە دەخلی کـوا بەسـەر ئیـمـانەوە
دایگرن بیگرنە ناو خـــۆتان و دەوری لێـــبـــدەن
بەڵکو بیـبـینم بەچاوی خـۆم بەڕوح کـێـشـانەوە
دایگرن توخـودا فـڕێیـــدەن بیـــخـــەنە تەندوورەوە
حـەیفـە ڕۆژی ڕوو ئەنێنە ناو شـەوی دەیجـوورەوە

شاعیر ئاماژەی هونەریی جوانی هەیە کە بەزمانی کچەکەوە دەڵێ بەشی ژن لە هەردوو گێتی تەنیا کفن بووە. لێرە کفنی ڕەش و لەوێ کفنی سپی. هەروەها دەڵێ لە پیران و پێشینانی دنیا بپرسن کەی خاتوونی کوردستان پەچەی گرتۆتەوە! ئینجا داوا دەکا پەچە داگرن و دەوری بدەن بۆ ئەوەی لە کاتی گیانەڵادا چاویان پێی بکەوێ. لە دواییدا شاعیر بەم بەندە کۆتایی بەلیریکەکە دێنێ:

کــــۆمـــەڵێ بگرن لە دەوری ئەلوەداعی لێ بکەن
ناوی با بڕواتە ناو لافـــاوی ئەم نیـــســــانەوە
بیـــخـــەنە تابووتەوە بینێن بەشـانی عـــەزمـــەوە
بیـــخـەنە قـەبرێ بەلووتکەی گـردەکـەی سـەیوانەوە
تۆبە بێ یا ڕەببی دفنی ئەو لەوێ جـائیـــز نیـــیــە
بیـــخـــەنە چاڵێکی قـوولی گـردەکـەی گـاورانەوە
مـەجلیـسـێکی مـاتەمی بۆ دابنێن و یەک بەیەک
وەرنە تەعـزێکەی بەدڵخۆشی و بەڕووی خەندانەوە
ئەم سکاڵایە بەفیکر و شیـعری (نووری) تێـمـەگەن
ئەو کـچە دەنگ خـۆشـە بوو ئەیووت بەدەم گریانەوە
دایگرن توخـودا فـڕێیـــدەن بیـــخـــەنە تەندوورەوە
حـەیفـە ڕۆژی ڕوو ئەنێنە ناو شـەوی دەیجـوورەوە

ئینجا بەهەناسەیێکی کۆمیدیانەی هونەری شاعیر داوا دەکا دەوری پەچە بدرێ، ماڵئاوایی لێ بکرێ و بخرێتە ناو تابووتەوە و بەرەو گۆڕستانی گردی سەیوان ببرێ. بەڵام شاعیر زوو پاشگەز دەبێتەوە چۆن ئەم شەرەفە بدرێ بەپەچە و لە سەیوان بنێژرێ! بەڵکو بخرێتە چاڵێکەوە لە گردی گاوران، ئەوجا بەدڵ خۆشی و خەندە و پێکەنینەوە پرسەی بۆ دابنرێ. لە دواییدا نووری ئاوڕدانەوەییێکی جوانی هەیە، دەڵێ من ئەم شیعرەم دانەناوە، بەڵکو قسەی کچە کوردێکی دەنگ خۆشە بەدەم گریانەوە دەیووت.

نووری لەم شیعرەیدا وەستایەتی نواندووە بەوەی باس لە کێشەییێکی کۆمەڵایەتی دەکا بەشێوازی دراما دەریدەبڕێ، هەندێ تراجیدیا، کەمێ کۆمیدیا، گریان و پێکەنینی بەکارهێناوە و ئاسۆییێکی کۆمەڵایەتی و جوانکاری داوەتە شیعرەکە.

## لەگەڵ سەعید قەزاز

نووری دۆستایەتی لەگەڵ سەعید قەزازدا بووە (محەمەد سەعید کوڕی عەبدولمەجید کوڕی ئەحمەد قەزاز ١٩٠٤ - ١٩٥٨) لە زیاتر لە جارێک لە شیعردا یادی کردۆتەوە.

سەعید قەزاز لە ساڵی ١٩٤٨ موتەسەڕیفی کەرکووک بووە. لەو کاتەدا نووری مودیری ناحیەی تەق تەق بوو. بەشیعر نامەیێک بۆ سەعید قەزاز دەنووسێ و داوای لێ دەکا لە تەق تەق بیگوێزێتەوە:

(ن) ناوی جەرگم هێند برینی پێوەیە وا سیل ئەکا
(و) وا خەریکە غەم شوعوور و عەقلەکەم تەبدیل ئەکا
(ر) ڕوح لە دەرچوونایە بۆ وەسڵی زولەیخای لوتفەکەت
(ی) یووسفی ئاوارەکەت وا مەیلی عیزرائیل ئەکا
(ب) بەرد ئەبارێنێ بەسەرما یەک لەسەر یەک چەرخی دوون
(و) وەک سیاپۆشان ووجوودم ماتەمێ تەمسیل ئەکا
(خ) خەم وەها خوێنی دڵی هێناوەتە سەر دیدەکەم
(ز) زیللەت و ئاه و فیغانم شێوەنێ تەشکیل ئەکا
(م) مردنم لا چاترە لەم ژینە گەردوونی دەنی
(ت) تووڕەیە دایم لە جەمعی عوشرەتم تەنزیل ئەکا
(ج) جەوری ئەم غەددارە ڕەببی ڕوو نەکاتە دوژمنم
(ن) نەختە ئاوێکی لە ڕێدا لێ بە بەحری نیل ئەکا



(ا) ئانێ بێشەی شێر ئەکاتە لانەیی ڕێوی غەریب
(ب) بەینێ ئەیبینی کە سەر گەرگەڕ بەلاشەی فیل ئەکا
(ت) تابەکەی تالاوی ئەم زەهرەت بچێژم ڕۆژ و شەو
(ا) ئێش و ئازارت هەتا کەی کەیف و خۆشیم دیل ئەکا
(ر) ڕوو لە کوێ کەم گێژەلووکە و گەردەلوولی نەگبەتی
(ز) زیندەگی و خۆشیم بەسەد مەرگ و خەفەت تەبدیل ئەکا
(و) ووس بە ئیتر بەسیە هاوار و بەیانی دەردی دڵ
(ی) یاری خۆت مەعنای سکالاکەت بەحەق تەئویل ئەکا
(ت) تێدەفکرم دێتە گوێم دەنگێ بەئەسپایی ئەڵێت
(ح) حامییێکی خۆت هەیە ئەو حاڵی تۆ تەعدیل ئەکا
(و) واز لەم و لەو بێنە هەر بۆ ئەو بەرە شەکوای دڵت
(ی) یاری پێشووی خۆتە لوتفی خۆی بەتۆ تەشمیل ئەکا
(ل) لەم قسانە لادە نۆبەی ئیحتیراماتە و سەلام
(ا) ئاشنایان با نەڵێن هەر بۆ حەجی خۆی تیل ئەکا
(ک) کاکی خۆمە زۆر سەلامی لێ دەکەم سەدیقمە
(ا) ئەو موئەششیرمە ئەزانم ئیشی من تەعجیل ئەکا
ئەووەلی هەموو میسرەعەکان کۆ بینەوە
میسرەعێکە قەسد و ناوی شاعیرێ تەسجیل ئەکا
خۆت ئەزانی موخلیسە بۆیە بەبێ پەروا ئەڵێت
(نووری بۆ خزمەت جەنابت ئارەزووی تەحویل ئەکا)

لەم شیعرەدا نووری گەمەیێکی هونەری کردووە. لە سەرەتای شیعرەکەوە تیپی وشەی یەکەمی هەموو دێڕە شیعرەکان تا دێڕی چواردەمین بەسەریەکەوە کۆبکرێنەوە کە دەکاتە ٢٨ تیپ، ئەم ڕستەیەی لێ دروست دەبێ «نووری بۆ خزمەت جەنابت ئارەزووی تەحویل ئەکا»، ئیتر ئەمە بووە بەنیوە دێڕی دووەمی دوا دێڕی شیعرەکە. لە دێڕی پێش دوایی شاعیر دەڵێ ئەگەر یەکەمین تیپی هەموو نیوە دێڕەکان کۆبکرێنەوە مەبەسی نووسینی شیعرەکەیە بۆ ئەوەی سەعید قەزاز لە مەبەسی نووسینی شیعرەکە بگا.

نووری بەخەیاڵێکی شاعیرانە وەسفی ژیانی خۆی دەکا لە تەق تەق. ئەگەر لایەنە

داهێنانە شیعرییەکەی لێ دەربکەوێ، شیعرەکە وا دەکەوێتە بەرچاو لە دۆستێکەوە بۆ دۆستێک نووسراوە هیچ پاڕانەوە و مەراییبێکی تێدا نییە. سەعید قەزاز ئەم بەرهەمەی بەشیعرێکی بەرز حسێب کردووە و تکای شاعیری گەیاندۆتە ئەنجام، چونکە کەسێکی خاوەن چێژی ئەدەبی بووە و دڵ و دەروونی بەشیعری بەرز بووژاوەتەوە.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا نووری گلەیی لە سەعید قەزاز دەکا:

دێتە بیرت ئەودەمەی تۆ ڕووت لە ڕووی پەیمانە بوو
من دڵ و خوێنی دڵم بۆ تۆ مەیی و مەیخانە بوو
دێتە بیرت هەر بەتەنیا تۆ لە پەردەی سینەما
سینەما بووی و لەوێدا غەیری تۆ سیما نەبوو
دێتە بیرت کارەبای ڕووی حوسنی خولقی تۆ لە کوێ
شوعلە ئەفزا بوایە (نووری) زوو لەوێ پەروانە بوو
دێتە بیرت کۆمەڵی جاران و شەوگارانی زوو
گفتوگۆی مەجلیس هەموو هەر ڕاستیی مەستانە بوو
دڵ لە باغی سینەدا بۆ تۆ لە ڕیشەی جەرگ و دڵ
ڕۆژ و شەو هەوڵی چنین و بەستنی هێلانە بوو
شارەزای ڕێ بوو ئەکەوتە بەردەمت دڵ دێ بەدێ
شاری بێ میهر و وەفایی ئەو حەلە وێرانە بوو
چی بەسەرهات ئەو زەمانەی ڕاستیی و عەهد و وەفا
لای ڕەفیق و ئاشنایان شێوەیی پیاوانە بوو
چۆن موبەددەل بوو بەسەفرای تاڵی ئێش و دەردی دڵ
ئەو شەرابەی شەمعی جەمعی ئاشنا و بێگانە بوو
تێگەیشتم بۆ نەماوە شێوەیی میهر و وەفا
تاکو ڕۆژی یەک دڵی ئاوا نەبوو ئاوا نەبوو
بۆ شتی چاکە مەعازەڵڵا بکەومە سەر زمان
ئەو خەیاڵاتەی کە من ئەمکرد هەموو ئەفسانە بوو



زووم ئەزانی من کە قەت ناکەومەوە بیری یەکێ
واسیتەی ئەم بیرکەوتنەم بۆ نەقلی ئەم بارزانە بوو
ئەو شەوەت بیرە لە بەزمی وەسڵی یا دوو بەدوو
تا بەیانی هەر بەیانی ڕازی دڵدارانە بوو
ئێستە تۆ بوویتە وەزیر و من مودیرێکی فەقیر
شەرتی ئینساف و مورووەت وا بزانم وا نەبوو

نووری ئەم شیعرەی لە زێبارەوە لە ساڵی ١٩٥١ بۆ سەعید قەزازی نووسیوە لەو کاتەی خۆی گواستبوویەوە بۆ شوێنێکی بەدڵی نەبوو. ئەم لیریکە نامەیێکی شیعری کراوەیە لە کەسێکەوە بۆ دۆستێکی نزیک و خۆشەویست. نامەیێکە سۆزی میهر و وەفای لێ دەتکێ. هەرچەندە هەڵوێستەکە ئەوە هەڵدەگرێ نووری تیژتر بێ، کەچی بەپێچەوانەوە وتەکانی لە گلەیی بەولاوە هیچی دیکە نییە. ئەمە وێنەی داهێنانێکی بەرزە لەوانەی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری لە جێگە و کات دەردەچن و دەبن بەکارێکی موتڵەق.

## بۆ مێژوو

عومەر عەلی ئەفسەرێکی سوپایی بوو، لە ساڵانی ١٩٥٤ - ١٩٥٧ بوو بەجێگری موتەسەریفی سلێمانی. دامەزراندنی بۆ بەڕێوەبردنی ئەم کارەی حوکوومەت بۆ مەبەسی سیاسی بوو نەک چاککردنی باری ژیانی ئەم لیوایە (پارێزگایە) گرنگەی کوردستانی عیراق. سلێمانی نێوەندێکی خوێندەواری و سیاسی پێشکەوتوو بوو، خەڵکەکەی بزێو بوون، عومەر عەلی کابرایێکی کۆنەپەرستی تۆرانی بوو، چاوی بەبینینی کورد هەڵنەدەهات. ڕقی لە بنەماڵەی شێخانی سلێمانی بوو. لە بنجدا تورکچی بوو، بەناوی ئیسلامەوە لای ئاسایی بوو عەرەبچیەتی بکا، وا لە ناو خەڵکی خۆی پیشان دەدا ڕەوشتی یەکسانی لە عومەری کوڕی خەتاب و ئازایی لە عەلی کوڕی ئەبووتالیب بۆی ماوەتەوە. بەهەموو حسێبێکیش کەسێکی بێ بار بوو.

نووری مەلحەمەیێکی (داستانێکی شیعری) دەوروبەری سێسەد دێڕە شیعری هۆنیوەتەوە. بەپێی مەرجەکانی شیعری کلاسیکی قەسیدەیە، لە ئەدەبی میللیی سەرزاریش (فۆلکلۆر) «بەیت»ی پێ دەڵێن. هەرچۆنێ بێ بەڕوخسار و ناوەرۆک لە بەیتەوە نزیکە. شیعرەکە لە چەند بەشێک پێکهاتووە، لە کردەوە ناهەموارەکانی ئەم کابرایە دەدوێ. لەم ماوەیەدا نوبشکی مەلحەمەی نووری «بۆ مێژوو» دەخرێتە ڕوو.

نووری بەم دێڕانە دەست بەشیعرەکەی دەکا:

کڵۆڵی جێگایێ بگرێ
مێروولەی باڵ ئەگرێ ئەفڕێ
شێری ئەبێ بەمام ڕێوی
توولە ئەوەڕێ بەخێوی
پەسمایە بەرز ئەکاتەوە
دوێنێی خۆی بیر ئەباتەوە

لە پاشانا ئەوە دەردەبڕێ دەسەڵاتی نێوەندی لە بەغدا کەسێک دەستنیشان دەکا بۆ بەڕێوەبردنی سلێمانی:

گەڕا دنیا سووڕایەوە
کون و قوژبن خولایەوە
بۆ ئەم کارە ناهەموارە
عومەر عەلی دۆزرایەوە
هیچی بەگەورە خۆ دانەر
ئەوی نووسیبوویە دەفتەر
دایە دەستی عومەر عەلی
پێی ووت برۆ لا یوسئەلی
برۆ بۆ سەر سلێمانی
ئەمەش پڕۆژەی نیهانی
دوژمنی گەورەی نیشتمان
عومەر عەلی وا نارد بۆمان
خۆی دوژمنی کوردەواری
دوژمنێکی شیرەخواری

کابرا دەستێکی باڵای هەبوو لە ڕووتکردنەوەی خەڵکی لە پێناوی پێکەوەنانی ماڵ و سامانێکی زۆر. بۆ ئەم مەبەسە ژنی دەوری گرنگی هەبوو لە کۆکردنەوەی ماڵی مفت. شاعیر دەڵێ:



خانم دەلالی خۆی هەبوو
هەموو ڕۆژێ بەیانی زوو
ئەینارد بۆ ناو شار بپرسێ
کێ شتێکی لێ هەڵدەسێ
دەلاڵ ئەچوو ئەخولایەوە
ماڵێکی بۆ ئەنایەوە

ماڵ دەستنیشان دەکرا. هەواڵیان بۆ دەچوو خانمی موتەسەریف پاشا تەشریف دەفەرمووێ. دەست و دیاری خانەخوێ بۆ میوان ئەو زێڕانەیە کە نووری دەستنیشانیان دەکا:

چەرەسی ئەم شاهانایە
سەرپەرچەم و گەردانەیە
یا بازن یا پاوانەیە
دەستێ جلی کوردانەیە
حێل و مێخەک لاگیرەیە
پشتێنی پێچکە لیرەیە

لە بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەی سلێمانی ڕەنگە عومەر عەلی تەنیا لەوە ڕاست بووبێ کە هەموو کردەوەیێکی خستۆتە پاڵ ئینگلیز و حوکوومەتی بەغدا، هیچی لە خۆیەوە نەکردووە، هەمووی بەفەرمانی ئەوان بووە. نووری بەزمانی عومەر عەلییەوە دەڵێ:

ووتی ئینگلیز ئەمری داوە
وەزیر خەتی وا کێشاوە
ئەبێ ئەم کارە هەر بکرێ
نابێ دەقیقە دوا بخرێ
ئەم شێخانە نابێ بێن
ڕەگیان ئەبێ دەربێ لە بن

ڕق و کینی ئەم کابرایە بەرامبەر بەبنەماڵەی شێخ مەحموود بێ سنوور بوو، زیاتریش مەسەلە بەربەرەکانی گیانی کوردایەتی بوو، چونکە عومەر عەلی جلخوار بوو وەکو نووری دەڵێ:

ئەندامی حیزبی تۆران بوو
دوژمنی گەورەی کوردان بوو
خوێن ڕشتنی کوردی لە لا
زۆر بێ نرخ و زۆر ئاسان بوو

نووری مەلحەمەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

عومەر عەلی کە نێرراوە
لەوێ نەخشەی بۆ کێشراوە
دوژمنی کورد هەچی بکا
نابێ کوردێ باسی بکا
بۆ ساڵح کۆییە لۆمە
ئەم سێ شیعرە لەگەڵ تۆمە
ئەوەتی دنیایە
ئادەمیزادی وا تیایە
لەو کەسانەی کوردیان ناوە
شتی وا ڕووی نەداوە
ئەوەندە تۆ بێ ویجدان بی
نابێ لە توخمی کوردان بی

کار و کردەوە نابەجێکانی عومەر عەلی لە خۆیەوە نەبوو، لە بەغدا نەخشەی بۆ دەکێشرا. ئیتر ئەو دوژمنی کوردە لە بەغدا عومەر عەلی هەڵبژاردووە کارەکە بگەیەنێتە ئەنجام. بەڵام ئەوەی مایەی ئاخ و داخ بێ ئەو کەسەیە کە ناوی ساڵح کۆییە و قارەمانی پیلان و کردەوەکانی عومەر عەلییە. خراپەی ناکورد بۆ کورد لەوانەیە قووت بدرێ، کەچی خراپەی کورد بۆ کورد کارەساتە، هەر کوردێک ئەوە بکا دەبێ لە نەژادی کوردان نەبێ وەکو نووری دەڵێ.

## تەرمی شێخ مەحموود

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦ شێخ مەحموود لە بەغدا کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەیان گواستەوە بۆ سلێمانی، ڕووداوەکانی ئەم گواستنەوە و خۆپیشاندانەکانی سلێمانی و تا



ناشتنی لە مزگەوتی گەورە وەک ڕووداوێکی گرنگ چووە ناو مێژووی میللەتی کورد بەگشتی و ناوچەی سلێمانی بەتایبەتی.

بۆ ئەم مەبەسە نووری شیعرێکی هۆنیوەتەوە وەک شیوەن و ماتەمنامە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕووداوێکی مێژوویی بەشیعر تۆمار کردووە پێوەندی بەناشتنی جەستەی شێخ مەحموودەوە هەیە. شیعرەکە بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

شەو بوو جەنازەکەی کە گەیشتە کەناری شار
گیرایە ناو ژمارەییێکی زۆری بێ شومار
بردیانە بەندیخانە کە بیبینێ شێخ لەتیف
دەستێ بکاتە گەردنی باوکی هەژارەوە
کوژرا ژنی ڕەشۆڵ بەیەکەم گوللە بێ گوناه
داخێکی نا بەجەرگی گوڵ و لالەزارەوە
وەک ئەختەری ڕەشۆلی بەستەزمان لە ئاسمان
چۆن زوو کوژایەوە بەڕوخی تابدارەوە
زوو نەوجوانی تر وەکو ئەو کوشتە و جەریح
شارانەوە هەموو بەلەشی زامدارەوە
زانرا نەتیجەکەی کە شتێکی فەلاکەتە
عالەم لە ترسی گوللە کشانە کەنارەوە
سبحەینێ وەزعی مەملەکەتم زۆر شپرزە دی
هەر شورتەیە و خولەی دێ بەدۆنکی و بەدارەوە
وەک ڕووی نەدابێ حادیسەییێک ئەمر ئەدەن ئەڵێن
عالەم ئەبێ خەریک بێ بەسەر ئیش و کارەوە
تیجوال مەنع کرا لە دەمی عەسرەوە هەتا
ڕۆژ هەڵئەهات و شەوقی ئەخستە دیارەوە
بۆ مەنعی ئەو کەسانە ئەهاتن لە دوورەوە
حازر کرابوو شورتە بەپیادە و بەسوارەوە

لەو کاتەی شێخ مەحموود کۆچی دوایی کرد و جەستەیان هێنایەوە سلێمانی شێخ لەتیفی کوڕی لەسەر مەسەلەی سیاسی کوردایەتی گیرا بوو و لە گرتووخانەی سلێمانی

بەند کرا بوو. لەو خۆپیشاندانەدا جەماوەر تەرمی شێخ مەحموودیان بەرەو گرتووخانەی سلێمانی برد بۆ ئەوەی بۆ دوا جار شێخ لەتیف چاوی بەتەرمی باوکی بکەوێ. دەسەڵات بەرهەڵستییێکی بێ بەزەییانەی نواند بەرامبەر خۆپیشاندانی خەڵکی بێ چەک و ئاشتیخواز. تەقە دەستی پێ کرد، ئەختەری خێزانی ڕەشۆلی هونەرمەندی گۆرانیبێژ کوژرا. جەماوەر ناچاربوون بڵاوەی لێ بکەن بۆ ڕۆژی دوایی ناو شار ئاسایی نەبوو، پۆلیس لە هەموو لایێک دیار بوو. ئەو ڕۆژە لە پێش ڕۆژئاواوە جاڕ درا کەس لە دەرەوەی ماڵی خۆی نەمێنێ، ئەوەی سەرکێشی بکا لە لایەن پۆلیسەوە سزا دەدرێ. نووری لەسەر شیعرەکەی بەردەوامە:

بێجگە لەمەش ئەمر بەنەواحی و قەزا درا
نابێ بەناوی پرسەوە کەس بێتە شارەوە
سێ ڕۆژی ماتەمی کە دییان بەم حەقارەتە
بڕیار درا بەجارێ بەلادێ و بەشارەوە
غەمبار بن و جلی ڕەشی ماتەم لەبەر بکەن
پیر و جوان هەموو بەدڵی غەم گوسارەوە
وەختێ ئیدارە فەرقی بەعەزمی ئەمانە کرد
قانوونی هێزی شورتەیی لێ خستە کارەوە
پۆلیسێ جل ڕەشێکی بکەوتایە بەر نەزەر
ئەیبردە گۆشەییێکی پەنا و نادیارەوە
ئەووەل نەسیحەت و هەڕەشەی دەستی پێئەکرد
ئەیووت بەمانە خۆت مەخەرە گیر و دارەوە
پێتان ئەڵێم بەڕەسمی جلی ڕەش لەبەر مەکەن
یاساغە کەس ببینرێ بەلێوی بەبارەوە
پشتێنی ڕەش جەریمەیە بیگۆڕە تا زووە
تاکو فرێی ئەدەی بچۆ زوو خۆت بشارەوە

دەسەڵات تەنیا بەکردەوەکانی ناو شاری نەوەستا. فەرمانی دەرکرد خەڵکی ناوچەکانی دەرەوەی شاری سلێمانی نابێ بێن بۆ ناو شار و بەشداری لە پرسەی شێخ مەحموود بکەن. خەڵکی دەشت و گوندەکان بۆ دەربڕینی هەستی ناوەوەیان جلی ڕەشی ماتەمینیان



لەبەر کرد. پۆلیس سەرزەنشتی دەکردن، ئەوەی پێ خۆش نەبوو خەڵکی لەبەر شێخ مەحموود، غەمبار و لێوبەبار بن، یا پشتێندی ڕەش ببەستن. لە دواییدا نووری شیعرەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

هەر چایچییە و بەدەم شەقی پۆلیسەوە زەلیل
هەر سایەقە ئەناڵێ بەدەم لیس و دارەوە
ڕادیۆ بەزۆری شەق ئەبێ بکرێتەوە لە هەر
دوکان و چایخانە بەنەغمەی قەتارەوە
هەر جل ڕەشی هەژار بوو ئەیان برد لە زۆری لیس
ئەخرایە ژێر سوئالی گەلێ نالەبارەوە
قۆڵیان ئەگرت بەدوو کەس و ئەبرایە بەردەمی
قۆمیسەری بەفیز و کڵاوێکی لارەوە
ئەیووت بەمن بڵێن چییە کەوتوونەتە سەری
خۆت تووش مەکە بەکۆڵێ منالی هەژارەوە
کێ مردووە! سەبەب چییە ئەم حوزن و ماتەمە!
خۆ ئاسمان بەجارێ نەکەوتۆتە خوارەوە
لێی هاتە جەواب شپرزەیی شەق سەرشکاوی دار
ڕووی کردە قۆمیسەر بەدڵی زامدارەوە
من سەروەری وڵاتم و سەرداری قەومەکەم
بمرێ بەئێشی دەردی دڵ و ئیحتیقارەوە
من بێم لەبەر ڕەزای دڵی تۆ یا یەکێکی تر
نامووسی کوردەواری بنێمە کەنارەوە
تۆ و ئەو کەسەش کە وای ووتووە باشی تێبگەن
کورد نایەوێ بژی بەلەککەی عەیب و عارەوە

کۆچی دوایی شێخ مەحموود ڕووداوێکی گەورە بوو، دەسەڵاتی دەوڵەتی سەر بە بەغدا بەچاوێکی سووک تەماشای دەکرد و هەوڵی دەدا لە بەرچاوی خەڵکیش سووکی بکا، بەهەموو جۆرێ بۆی نەدەکرا هەتا بەزۆریش چایچی و دوکاندارانی سلێمانی وا لێ بکا تازیە نەگرن و ڕەشپۆش نەبن، وەکو ڕۆژانی ئاسایی ڕادیۆ بکەنەوە. بەچاوێکی سووک

تەماشای خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودیان دەکرد، بەڵام شاعیری لووت بەرز نووری وەرامی ئەوە بوو، سەروەری خاکم و سەرداری میللەتم مردووە، لەبەر ئارەزووی ئێوە نامووسی کوردەواری ناخەمە پشتگوێ، کورد دەیەوێ هەمیشە بەسەربەرزی بژی.

ئەوەی پێویستە لێرەدا ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە، بەسەرهاتی هێنانەوەی تەرمی شێخ مەحموود لە بەغداوە بۆ سلێمانی لە سەردەمی عومەر عەلی بوو کە جێگری موتەسەڕیفی سلێمانی بوو. ئەم کردەوەیەی ئەو کابرایە بەڵگەیێکی دیکە بوو دەسەڵاتی بەغدا بەچاوێکی سووک تەماشای کوردی دەکرد و ڕق و کینێکی زۆری لە بنەماڵەی شێخ مەحموود بوو و لەبەرئەوەی شێخ بۆ ماوەیێک مەلیکی کوردان بوو لە کوردستانی باشوور. ئەوەی دەگێڕنەوە ئەوەیە لە کاتی هێنانەوەی تەرمی شێخ بۆ سلێمانی عومەر عەلی لە شار نەبووە، ئەوەی کراوە جێگری کردوویەتی، ئەگەر لەوێ بووایە هەڵسوکەوتەکە هەر وا دەکەوتەوە کە ڕوویدا.

## نووری و ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ی بەغدا

کوودیتا عەسکەریتارییەکەی سوپای عیراق لە بەغدا، ڕووداوێکی لەپڕ و چاوەنۆڕ نەکراو بوو. زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی عیراق بەعەرەب و کوردەوە لەگەڵ ئەنجامی ڕووداوەکە بوون، چونکە بنچینەیی بوو لە ڕژێمی مەلیکییەوە وڵاتی گواستەوە بۆ کۆماری، ئەمە خۆی لە خۆیدا پێشکەوتن بوو. بەڵام لە دوای دوو سێ ساڵ چی بەسەرهات، ئەمەیان مەسەلەیێکی دیکەیە.

نووری وەکو زۆر لە شاعیرانی کورد لە شیعرێک زیاتری وتووە بۆ ئەم ڕووداوە. بێ گومان هەڵوێستی نووری ڕەنگدانەوەی ئارەزووی زۆربەی نەتەوەی کورد بووە.

شاعیر لە لیریکێکیدا لەم بابەتەوە بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

ئەمڕۆ کە چواردەیە لە تەمووز جەیشی بێ ئەمان
ئازانە هاتنە کایەوە وەک کێوی پڕ لە گیان
دەسیان بەجارێ دایە دەسی یەکتر هەموو
جەیش و شەعب مەرامی بەمەردانە خستە ڕوو
وەک دیجلە جەیش بەهێزی گەلی بێ حیسابەوە
بوونە شەپۆل و چوونە سەراپای ڕەحابەوە



شێرانە جەیشی داغ لە دڵ و شەعبی قارەمان
کەوتوونە خوێن ڕژاندنی میللەت فرۆشەکان

شاعیر بەشێوازێکی ئەدەبی باس لە ڕووداوی کوودیتا سوپاییەکە دەکا. بەڕاستی ئەم شۆڕشە دەبوو میللەت بیکا، بەڵام کە بۆی نەکرا بێ گومان پشتگیری لە سوپا کرد، ئەگەر ئەم پشتگیرییە نەبووایە کوودیتاکە سەری نەدەگرت. سەرکەوتنە سوپاییەکە بەگرتنی کۆشکی ڕەحابی بەغدای بنەماڵەی مەلیک پیرۆز بوو. لە ناو ئەو کۆشکە ئەندامانی بنەماڵەی مەلیک کوژران و لەناوبران، بەتایبەتی مەلیک فەیسەڵی دووەم و عەبدولئیلاهی خاڵی کە وەسی بوو.

ئینجا شاعیر ئاماژە بۆ گەورەترین دەسکەوتی دەکا لەم کوودیتایە:

ئیعلانی حوکمی تازە بەجومهوورییەت کرا
کورد و عەرەب شەریکە بەشن هەروەکو برا

ئەوجا باس لەو سەربەستییە دەکا کە ئەم کوودیتایە لەگەڵ خۆیدا هێنای:

کوێ ئارەزوو ئەکەی بچۆ سەربەست و دڵنیا
جاسووس و ترسی گرتن و لێدان و شەق نەما
ئەمجا بنوو بەبێ غەم و بێ ترس و بێ خەیاڵ
ئیتر نەما ژیانی زەلیلانە ژینی تاڵ

لە پاشانا بەم دێڕە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

ڕەببی بژی بەسوودەوە بۆ خاکی نیشتمان
بۆ تۆڵەسەندنی گەلی مەزڵووم و ناتەوان

شاعیر لە بۆچوونەکانی لەم شیعرە و ئەو شیعرانەی بۆ کوودیتا سوپاییەکەی عیراق هۆنیویەتییەوە ڕاستگۆ بووە، چونکە لە سەرەتادا ئەم ڕووداوە گەورەیە سوودی بۆ هەموو عیراق هەبوو، بەڵام لە دواییدا خۆی خواردەوە وەکو زۆربەی شۆڕش و کوودیتا گێتییەکانی دیکەی ڕۆژگارانی مێژوو. ئەم جۆرە شیعرانە نرخی جوانکارییان نادۆڕێنن و وەک نموونەی جوان لە مێژووی ئەدەبدا دەمێننەوە. کورد ئەگەر قازانجی لە کوودیتاکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدای کردبێ، لە دواییدا زۆرتر زیانی لێ کەوتووە.

## ژن

له شیعرێکیدا نووری له ژنی خراپ دەدوێ:

ژنی بەدچەشنی کۆلنج ژان ئەهێنێ
ئەگەر زوو نەیتەقێنی ئەتتەقێنێ
ژنێ ژن بێ لە ژانی ژینی دنیـــا
بەجۆرێ لات ئەدا سەر سورِ ئەمێنێ
ژنت گـــەر ژن نەبێ ژانە ژیانت
ژنێ ژن بێ هەمـــوو دنیـــا ئەهێنێ

لەم شیعرەدا نووری وەسفی ژنی بەد دەکا. بیرورِای لەم بابەتەوە ئاساییە. ڕەنگە شیعرەکە شتێکی تازەی تێدا نەبێ. نرخی هونەریی بەرهەمەکە لایەنی ڕەوانبێژییەکەیەتی. لەم پارچە شیعرە بچووکەدا دوازدە جار وشەکانی «ژن» و «ژان» و «ژین» و «ژیان»ی دووبارە کردۆتەوە. مۆسیقا و ڕیتمێکی خۆش ئاوازی داوەتە شیعرەکە و مۆزاییکێکی هارِمۆنییانەی لێ دروست کردووە.

***

نووری شێخ ساڵح لە سەدەی بیستەمدا نوێکەرەوەی قوتابخانەی کلاسیکی سەدەی نۆزدەمی کوردستانی باشوورە لە سلێمانی. پارێزگاری ئەدگاری شیعرە کلاسیکییە کۆنەکەی کردووە و لەگەڵ پێویستییەکانی سەردەم گونجاندوویەتی. شۆرِشەکەی لە ڕوخسار و ناوەرۆکی شیعردا بووە، گەمەی بە بەحری عەرووزی کێشی سیلابی و خۆماڵی کردووە. لە بەکارهێنانی قافیەی ڕەنگاورِەنگ وەستای بێ هاوتا بوو. تا پلەیێک دەستووری هەردوو جۆرە شیعرە عەرووزی و سیلابییەکەی پاراست. سەرکەوتنی لەوەدا بوو هەندێ مەرجی هونەریی تایبەتی بەهەریەک لەو دوو جۆرە شیعرە بۆ ئەوی دیکەیانی بەکارهێناوە. وەکو بەکارهێنانی یەکێتیی قافیەی شیعری عەرووزی بۆ شیعری سیلابی، یا پێچەوانە بەکارهێنانی جووت قافیە (مەسنەوی) تایبەت بەشیعری سیلابی بۆ شیعری عەرووزی.

نووری تا پلەیێک ناوەرۆکی شیعری کلاسیکی پاراستووە لە ڕووی بابەتەوە، دڵداری، وەسف، ستایش، هتد... تازەگەرییەکەی لە فراوانکردنی ئاسۆی ئەو شیعرانە بوو، لەگەڵ پارێزگاریکردنی مەبەسەکە، کێشەی کۆمەڵایەتی تێئاخنی و سیفەتی لیریکی ئەوروپاییانەی دایە شیعرەکەی.



نووری شاعیری ژیان بوو، دیوانی شیعری ئاوێنەی ڕووداو و بەسەرهات و ئامانجی میللەتی کوردە. هەرچۆنێ بێ داهێنانی هونەری و ئەدەبی دوور لە تیۆریی زانستییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوەییێکە مێژوونووس دەکارێ زانیاری لێ دەست بکەوێ. نووری شاعیرێکی سەرکەوتووی شیعری لاسایی کلاسیکی بوو، وەستایانە توانی دەورێکی باڵای هەبێ لە بزووتنەوە «شیعری نوێ»، بەشاعیرێکی نوێخوازی سەرکەوتووش لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا خۆی بنوێنێ.

# بەشی بیست و سێیەم

## عورفی

**۱۸۹٦ – ۱۹٦۱**

### ژیانی

عارف کوڕی شێخ مەحموود کوڕی مەلا نەسروڵڵای قازیبە، لە ساڵی ۱۸۹٦ لە سلێمانی لە دایک بووە. ناوی «عـورفی» هەڵبـژاردووە وەک نازناو بۆ تۆمـاری شـیـعـری. لە ناو خەڵکی بەعـارف قـاپ ڕەش ناسراوە. ئەم ناوە لەوەوە هاتووە لاقی تووکن بووە و بەشی قـاپی پێی ڕەش کـەوتۆتە بەرچاو. هێشـتـا منداڵ بووە دایک و باوکی مـردوون و هەتیـو ماوەتەوە ناچار مامی بووە بەباوک بۆی و بەخێوی کردووە. سەرەتا هەندێ لە بەرنامەکانی حوجرەی مزگەوتی خوێندووە، لە پاشانا بووە بەقوتابی سەرەتایی ڕوشدییەی سوپایی لە سلێمانی. بەهۆی هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی یەکەمی گێتی نەیتوانیوە ڕوو بکاتە بەغدا بۆ تەواوکـردنی خـوێندن. لەم مـاوەیەدا بەمـووچەخۆری مـەدەنی لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس دامەزراوە.

عورفی لە جەنگی یەکەمدا سەرباز بووە، بەدیل گیراوە و نێرراوە بۆ هیندستان. لە پاش کـۆتایی جـەنـگ و دامـەزراندنی دەوڵەتی عـیـراق گـەڕاوەتەوە سلێـمـانی و دەسـتی بەکـار کردۆتەوە لە جێی جارانی تا ساڵی ۱۹۲۷ لەو شوێنە ماوەتەوە، ئینجا چووە بۆ دەورەی قـۆمیسـەری پۆلیس و سێ ساڵ خوێندنی بردۆتە سەر، لە پاشانا لە ساڵی ۱۹۳۰ ڕووی کردۆتە خوێندنی بەرزتر لەم لایەنەوە تا بووە بەئەفسەری پۆلیس. ئەم کارەی لە شارەکانی سلێـمـانی و هەڵەبجە و پێنجوین و قەڵادزێ و چوارتا و هەولێـر بردۆتە سەر تا لە ساڵی ۱۹٤۹ خانەنشین کراوە. ئیتر خەریکی شیعر دانان بووە، لە کۆڕ و نێوەندی ئەدەبی نزیک بۆتەوە تا ڕۆژی ۱ی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹٦۱ بەنەخۆشیی دڵ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

### شیعری

عـورفی شـاعـیـرێک بـووە بۆ خـۆی شـیـعـری وتـووە، بیـری لەوە نەکـردۆتەوە بەرهەمی هونەریی لە دوای دروسـتـبـوونی ببێ بەدیاردەیێکی کـۆمـەڵایەتی، لەبەرئەوە تا بەسـاڵا نەچووە بیـری لەوە نەکـردۆتەوە بڵاویان بکاتەوە. شـاعـیـرێک بووە ڕاسـتگۆ، بەشـیـعـر ستایشی هیچ کەسێکی بەناو گەورەی نەکردووە، پێداهەڵدانی بۆ هیچ کەسێکی دیار یا کاربەدەست نەبووە. بەرهەمی شیعری عورفی ڕەنگدانەوەی پیشەی نەبووە وەکو پۆلیسێک یا ئەفـسـەرێکی پۆلیس بەڵکو بەپێـچـەوانەوە ڕەنگدانەوەی ڕەوشت و ئەخـلاقی ئاشـتیـخـوازانەی خـۆی بووە. لە پێـوەندیدا لەگەڵ خـەڵکی نەرم و نیـان بووە، لەو کـاتەی ئەگەر بەپێی پیشەی بووایە دەبوو زەبروزەنگی جەنگ و سوپایی لێ بباریێ.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

عورفی شیعری بەحری عـەرووزی زۆرە، شیعری کێشی سیلابی خۆماڵیشی کەم نییە. لە یەکـەمـیـاندا جگە لە یەکـێـتـیی قـافـیـە جـووت قـافـیـە (مـەسنەوی)شی بەکارهێناوە، لە دووەمیاندا جگە لە جووت قافیە یەکێتیی قافیەشی بەکارهێناوە.

لە شـیـعـرە عـەرووزییـەکـانی عـورفی تەنیـا کـێشی بەحرەکانی هەزەج و ڕەمـەل دەکەونە بەرچاو، لە دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عـەرەبی ئەم دەنگانە لە شیعریدا دەبینرێن: ا ب ت چ د ر ک ل م ن و وو ۆ (ە – ـە) ی ێ. لە پاش قـافـیـە ئەم وشـانە بەکـارهێنراون: شکا، ئەکـا، کـا (ئەکـا)، ناکا، کـورد، کـرد، دڵ، بکەم، کـەم (بکەم)، غـەم، کردم، کـەن (بکەن)، من، ئیـمـشـەو، بـوو، تۆ، ئیـمـڕۆ، نیـیـە، پارەیە، تۆ بێ، بێ (ببێ)، کـەی (بکەی)، ڕۆژێ.

شـیـعـری کـێشی سـیـلابی خۆمـاڵی هەیە، ئەوەی لە ناوەوەیە لەسەر کـێشی دە بڕگـەیی هۆنراونەتەوە، زۆربەیان وەسـتـانیـان لە ناوەڕاست دایە (٥ + ٥)، هەندێکیـشـیـان وەستانیان تێدا نییە.

بەگشـتی شیـعری عورفی بریتـییە لە غەزەل (لیریک) و قەسـیدە. جگە لەوە پێنجینی هەیە (ا ا ا ا ب). لە مـوسـتـەزاددا نموونەی ئەو بریتـیـیـە لە دوو نیـوە دێڕی درێژ و نیـوە دێڕێکی کورت. موستەزادێکی بەم بەندە دەست پێ دەکا:

بەسە هەڵسە وەرە کایە ئیتر تێکۆشە بۆ هۆزت
بپـارێزە لە گـورگی بێ ڕەزا مـاڵاتی ناو کـۆزت
بەتیرێکی ڕەزە دۆزت

بەم بەندە کۆتایی دێ:

که من مردم وەسییەت بێ وەتەندارانی شیرینم
لەسەر قەبرم بەکوردی بۆ بخوێنن وەعز و تەلقینم
بزانن کوردە ئایینم

عورفی هەڵبژاردەی شیعری مستەفا بەگی کوردی و شێخ ڕەزا و ڕەفیق حیلمی کردووە بەپێنج خشتەکی. بڕێک لە چوارینی خەیامی گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی.

### شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

لە مەبەسە کۆنەکانی شیعری کلاسیکی عورفی بایەخی بەشیعری دڵداری و وەسفی دلبەر داوە. وەسفی سروشت و بەهار و کەژەکانی دیکەی بەرچاو ناکەوێ، ئەگەر هەندێ دیاردەی سروشت لای هەبێ بۆ ئەوەی بووە ئەندامە جوانەکانی دلبەری پێ بچوێنێ. بەگشتی خۆی لە مەبەسەکانی ستایش و پێداهەڵدان و شانازی و داشۆرین و کراوە (ئیرۆتیک) و هی دیکە لاداوە. بێ گومان مەبەسی تازە لە سەدەی بیستەمدا لە ئەدەبی کوردی شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و غەزەلی سیاسی بوو. عورفی لەم بابەتە شیعرەی هەبووە، بەمە بەڕاستی بووە بەنوێنەری شیعری کوردی لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا بەوەی مەبەسە بنچینەییە هەمیشەییەکەی شیعری هەموو گێتی پاراستووە کە شیعری دڵدارییە، ئینجا پێویستیی کۆمەڵی کوردی لێ زیاد کردووە کە شیعری کوردایەتییە.

## نموونەی شیعری

### وەسف و دڵداری

١

عورفی بەم جۆرە موناجات لەگەڵ دلبەردا دەکا:

خۆزگە ئەمزانی دڵی من بۆچی وا حەیرانتە
هەروەکو پەروانە دەوری شەمعی رووی جانانتە
دڵ بەدڵ بۆ رابەرت ئیختیاری پێ نەما
دائیما فەرمانبەری فەرمانتە
فکرت وا بوو بۆ ڕەقیبت دەس لە ئێمە هەڵگری
ئەی دەخیلت بم نەکەی دەستی من و دامانتە



مەزرەعەی دڵ دەردی بێ ئاوی ئەکێشێ بۆ خودا
دەست و بردێ چاوەڕوانی قەترەیە بارانتە
دوا ئەوەی سینەم برینی کۆن سەری هەڵدایەوە
تێگەیشتم زەخمی نووکی تیرەکەی موژگانتە
هاژەیی فرمێسکی چاوم بەکرەجۆی گرتۆتە بەر
غەیر لە دووری تۆیە بۆیە وا بەکوڵ گریانتە
جەژنی قوربانە بەقوربان نۆبەتی قوربانییە
بۆ تۆ قوربانی بەقوربان گیانی من قوربانتە
تۆ لە کوێ ڕێزەی سواری نەوجەوانانت لە کوێ
تازە بەم عومرە نیازی عەرزەیی مەیدانتە
بەم هەموو دەرد و غەمە کەوتوویتە حاڵی هەم هەمە
تازە بێچارە نیازی بەزمی مەی خۆرانتە
دڵ لە دووریت شەو ئەسووتێ وەک فەنەر تاکو سەحەر
غەیر لە هیجرت شەوچراغی مەجلیسی دیوانتە
تافی جوانی چوو نەما کەوتوویتە حاڵی غەرغەرە
وا ئەزانم ئینتیزاری قەبرەکەی سەیوانتە
گردی سەیوان حورمەتی میوانەکانت ڕاگرە
پێنج و دوو ڕۆژێکی تر وا (عارف)یش میوانتە

لەم لیریکە عورفی وێنە ئاساییەکانی شیعری کلاسیکی دێنێتەوە یادی خوێنەر. تارمایی ئەوان کاری لێ کردووە، بەشێوەیێکی دیکە وەکو ئەوانی وتووە. لەم شیعرەدا هەوڵی داوە بۆ بەهێزکردنی ڕیتم ڕەوانبێژییە وشەییەکان بەکار بێنێ ئەوانەی دەنگەکانیان لە یەکتری دەکەن و ڕەوانییێکی مۆسیقی دەدەنە ڕستەکان. جگە لەو یادی گۆڕستانی بەناوبانگی گردی سەیوانی سلێمانی دەکاتەوە، چونکە بووە بەئەفسانە لەبەرئەوەی جەستەی هەموو داهێنەران و دڵداران و دلبەرانی گرتۆتە خۆ. داوای لێ دەکا ڕێز لە میوانەکانی بنێ. لە پاش ماوەیێکی کەم عارفیش دەبێ بەمیوانی.

عورفی واز لە گفتوگۆکردن ناهێنێ لەگەڵ دلبەر:

مەیالۆزێنە زولفت مەیخەرە بەر دانەیی شانە
بەشکڵی ئێستەکەی جوانە کەوا پەخشانی سەرشانە
بەرەنگی زاهیرم باوەڕ مەفەرموو شاد و خەندانم
تەماشای خانەیی سینەم بکە ئێرانە وێرانە
مەیەڵە ناحەزانت چاو ببڕنە باغچەیی سینەت
مەبادا دەس بهاوێژن بۆ ناو ئەو باغ و بێستانە
لە کۆڕی عەشقبازانا چراغی ڕووت ببینێ دڵ
بەناچاری بەدەوریا هەروەکو پەروانە سووڕانە
کە خورشیدی ڕوخت بینم سەباحی مەحشەرم هەڵدێ
کە زولفت دایەپۆشی تەنگی بانگی نوێژی شێوانە
دڵم زێڕێکە بێ هەمتا لە ناو بۆتەی غەما سووتا
لە گەرمی ئاگری ڕووتا لە تاوانا لە تاوانە
عەمارەتگاهی دڵداران بوو سینەم ئێستە بیبینە
بەجارێ دار و پەردووی داڕووخا ئەم خانە وێرانە
هەتاکەی کەم سەبووری ئەی سەبووری تۆوت هەڵگیرێ
شەو و ڕۆژم بناڵێنم بەدەم ئەم دەردی هیجرانە
برینی دەردی دڵ (عورفی) تەواوی ناکرێ ئیللا
تەبیبی ڕووی مەگەر بیکا عیلاجی ئەم برینانە

لەم لیریکەدا عورفی خەریکی وەسفی دوو دیاردەی پێچەوانەی یەکترییە لە سەری دلبەر. لە ڕەنگا دوو شتی جیاوازی تیایە. زولف و ڕوومەت، یەکێکیان ڕەش ئەوی دیکەیان سپی، واتە تاریکی و ڕووناکی، یا شەو و ڕۆژ. شاعیرانی کلاسیک هەندێ گەمەی ڕەوانبێژییان لەم لایەنەوە کردووە. عورفی وەکو ئەوانی دیکە لە کاتێکدا هەردوو دیاردەی شەو و ڕۆژ دەبینێ لەودەمەی کە زولف لەسەر ڕوو لادەچێ ڕۆژ هەڵدێ، پێچەوانە هەر جوانە کە زولف دەکەوێتە سەر ڕووی دلبەر و دەبێ بەشەو.





لای عورفی لە دلبەر بەولاوە کەس نییە شایانی ئەوە بێ موناجاتی لەگەڵدا بکا:

ئەگەر لوتفت ببێ ڕۆژێ بپرسی چۆنە ئازارت
ئەکەم گیانم فیدای زارت کە ناوم بێتە سەرزارت
فەلەک زانی کە ئەشعارم لەسەر ئەوسافی ڕووی تۆیە
(شکاندی پەنجەکەم تاکو نەنووسم وەسفی ڕوخسارت)
دەمێکە بێ سەروشوێنە دڵی من تازە پێم زانی
ئەسیر ماوە لە بەندی داوەکەی زولفی سیەه مارت
مەکە مەنعم ئەگەر گۆشەنشینی خەڵوەتم ئیمڕۆ
هەمیشە دوورپەرێزم لێت لە ترسی تەعنەی ئەغیارت
لەجیاتی ئەم هەموو قەهرەی لە ڕووی تۆوە کە چێشتوومە
خودا نەم هێڵێ گەر حەزکەم سەری موویی لە ئازارت
سەبەب من بووم لە تەعریفی خەت و خاڵت کەوا ئیمڕۆ
لە ناو جەمعی جوانانا شوکور وا گەرمە بازاڕت
لەسەر وەسفی گوڵی ڕووتا ئەبینم جوملە ئەشعارم
کە شیرینە بەشیرینی وەکو لێوی شەکەربارت
لە هیچ لایێ نەبێ لایێ عیلاجی دەردەدارێ کا
ئیتر (عورفی) بۆ لای کێ بەی بپرسێ دەرد و هاوارت

لەم غەزەلە موناجاتەیدا شاعیر ڕاز و نیازی خۆی بۆ دلبەر دەگێڕێتەوە ئیلهامی لە شیعرێکی تاهیر بەگ وەرگرتووە. بەڕاستی ئەم غەزەلەی عورفی لە غەزەلەکەی تاهیر بەگ ناکا، عورفی تەنیا لە یەک وێنەی شیعریدا نیوە دێڕێکی تاهیر بەگی لەگەڵ شیعرەکەی خۆی گونجاندووە. تاهیر بەگ دەڵێ فەلەک پەنجەی شکاند بۆ ئەوەی وەسفی ڕوخساری دلبەر نەکا، واتە هێشتا وەسفی نەکردووە، کەچی عورفی دەڵێ فەلەک کە زانی هەموو شیعری لە وەسفی ڕوخساری یارە، واتە وەسفی کردووە، پەنجەکەی شکاند. وێنەی شیعری جوان لەم غەزەلەدا هەیە، شاعیر تەنیا بۆ وەسفی ڕووی دلبەر تەرخانی کردووە.

## ٤

له شیعرێکیدا عورفی جەوهەری بنچینەیی دڵداری دەخاتە ڕوو، دڵداری سۆزێکە هیچ حسێبێک بۆ لاویەتی و پیریەتی ناکا:

ئەگەرچی من له عومرا چووم بەساڵا
خەیاڵ ئەڕوا لەگەڵ دوو چاوی کاڵا
برادەر بۆچ ئەکەی لۆمەم لە عەشقا
عەجەب نەتبیستووە کاڵا بەباڵا
نەمانی چاترە وەڵڵا لە بوونی
نەبێ دەستێ بەسەر ڕووی ووردە خاڵا
دوو چاوی من له بانی تەوقی سەرمە
کە یار پۆشی لیباسی ئاڵ و واڵا
هەموو عومرم ئەچێ یەکجار بەتاڵان
نەکەم وەختێ پەڕە لای ڕووی موتاڵا
چ خۆشە ڕابوێری هەر سەحەرگاه
لەگەڵ تازە گوڵاڵەی خوردە ساڵا
له مەدحی غونچە لێوانی بەڵەک چاو
دەماغم بەرز ئەبێ بۆ ئەوجی باڵا
وەکو تیغی دەبانی تازە ساو بێ
زمانم موو ئەکا بڕواکە لالا

لەم شیعرەدا عورفی ئەوپەڕی زێدەڕۆیی دەخاتە پێش چاو، لە نێوان دوو شت کە دڵداری کۆیان دەکاتەوە لە ڕووی تیۆرییەوە، ئەم دوو شتە نێرینەیێک و مێیینەیێکە. پیاوەکە زۆر پیر دەکا، کچەکە زۆر گەنج پیشان دەدا. ڕەنگە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی و سێکس و دەست تێکەڵ کردنی نێر و مێ، کارێکی بەجێ نەبێ چونکە دوو شتی جیاوازن، بەڵام لە ڕووی سۆز و ئەندێشە و خەیاڵ و چێژی شاعیرانە ڕەوشتێکە خەڵکانی ژیر و تێگەیشتوو لە لایانەوە کارێکی بەجێیە و وەک دیاردەیێکی سۆفیزم تەماشای دەکەن.



# نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

## ١

عورفی لە شیعرێکدا بۆ کورد دەلاوێنێتەوە:

ئەی وەتەن ڕووحی ڕەوانم قۆچەکەی قوربانتم
سەر لێ شێواو دڵ سووتاوی دەردی بێ دەرمانتم
ئاه چ دەردێکە ئەیچێژم ئەی وەتەن بۆ حاڵی تۆ
ئەشکی چاوی من دەلیلە ڕۆژ و شەو گریانتم
بۆ برینی دەردی دڵ بەس بگری ئەی دایکی وەتەن
مەمسووتێنە جان فیدایی ئێشەکەی زامانتم
ناڵەیی قەهری دەروونم ئاسمانی گرتە بەر
سۆزی دڵ بۆ ڕۆڵەکانی بێ سەروسامانتم
ئەی وەتەن دایکی هەزاران تاجدار و ئەنبیا
کەس لەوان فریا نەکەوتووی بێکەسی و تاوانتم
دەردی بێ ئاوی بکێشی تا گوڵی ئەرزی وەتەن
ئەی فریشتە چاوەڕوانی قەترەیە بارانتم
موشکیلە دەس هەڵگرم لێت خاکی شیرینی وەتەن
ئاخری عومریش ئەسیری خاکەکەی سەیوانتم

لەم شیعرەدا خوێنەر خەیاڵی بۆ ئەوە دەچێ کورد نەخۆش کەوتووە و لە سەرەمەرگ دایە و شاعیر لە بن سەری دانیشتووە و سەردوولکەی بۆ دەڵێ. دەردی ئەو کوردە نەبوونی سەربەستی و ئازادییە. دەردەکە گرانە، خاوەنی هێشتا نەمردووە، بەڵام ئەوەندە گرانە وەکو ئەوە وایە گومان لە مردنی نەبێ. شاعیر دەست لەو نەخۆشە هەڵناگرێ، ئومێدی ماوە برینی سارێژ بێ. عورفی ئەوەندە هۆگری ئەو خاکەیە کە کوردستانی ناوە، لە دوای مردنیش هەر لەو خاکە دەبێ لە گۆڕستانی گردی سەیوان دەنێژرێ کە بەشێکە لە خاکی کوردستانە خۆشەویستەکەی.

گفتوگۆی عورفی لەگەڵ گەلی کورددایە:

گوێگرە لەم گفتوگۆیەم ئەی گەلی بێداری کورد
تاکو حاڵی بی لە ئەوزاعی زەمان دەرباری کورد
ناڵەیی کورد وا گەیشتە مونتەهای ئەوجی فەلەک
نەمدی فریا کەوتوویێ ڕۆژێ بەدەم هاواری کورد
کورد ئەبێ تاکەی بناڵێنێ بەئێش و دەردەوە
کوا پزیشکێ چارەسازێ بۆ دەوای زاماری کورد
مەسڵەحەت وایە بمێنێ میللەتی کورد بێ مەتاع
تاکو ئالۆز بێ بەجارێ شۆڕشی بازاڕی کورد
کوانێ ساحێب هیممەتێ ئەی کۆمەڵی ئەمن و ئەمان
غیرەتی هەڵسێ قسەی خێری بکا دەرباری کورد
هەروەکو غەیر فەرموو تەجهیزی دەمێ بۆ تەجریبە
ڕۆژی خۆی ئەمجا ئەبینێ قووەت و کرداری کورد
تەفریقە لاچێ لە بەینا دەس بخاتە دەستی یەک
ئەیبینێ ئەو وەختە چۆنە هەڵمەتی تەییاری کورد
موویی مەردی لێت ڕوا بێ نابی لایەنگیری غەیر
دەک خودا گرتوو بێ هەرکەس بییەوێ ئازاری کورد

عورفی لەم شیعرەدا گفتوگۆ لەگەڵ کورد دەکا، ئەو میللەتەی تووشی دواکەوتوویی و مەینەتی ژیان بووە. شاعیر وەکو هەموو خاوەن هۆش و دڵسۆزەکانی نەتەوە کوردەکە خۆی تاوانبار دەکا پێش ئەوەی ملی بێگانە بگرێ. بۆیە هانی دەدا یەک بگرێ ئەو کاتە دەگاتە ئەو ڕاستییەی توانای زۆرە و دەکارێ بگاتە ئەو ئامانجەی عەودالّیەتی.

لەم شیعرەدا عورفی پاش قافیەی «دەرباری کورد»ی دووجار دووبارە کردۆتەوە. ئەمە لە دەستووری شیعری کلاسیکی خەوش نییە، چونکە دووبارەکردنەوەکە لەفزییە و لە ڕووی ماناوە نییە. «دەرباری کورد»ی یەکەم بەمانای سەرۆک و گەورە و سەردار هاتووە، کەچی ئەوەی دووەم بەمانای لە بابەت، دەرهەق هاتووە، لەبەرئەوە ئەمە خەوش نییە بەڵکو داهێنانە لە ڕووی ڕەوانبێژی و جوانکارییەوە.





عورفی مەلحەمەیێکی ڕەنگینی هۆنیوەتەوە لەسەر بەندی پێنجین، ئیلهامی لە شیعرە ناودارەکەی ئەدەب (میسباح) وەرگرتووە کە دەڵێ «دوێ شەو شەوی شەمبە...»، ئەمە تەنیا کارکردنێکی ڕووکەشی بووە، ئەگینا شیعرەکەی ئەدەب وەسفی شەوی بووکێنی نوسرەت خانمە، شاعیر و خانم لە ناو گێتیی سێکس نوقوم بوون، کەچی شیعرەکەی عورفی دیباجەکەی کوردایەتییە، ئەو شەوە شاعیر لەگەڵ دایکی نیشتمانە (کوردستان) نەک ئەو کیژە بووکەی ئەو شەوە دەبێ بسمرێ و ببێ بەژن. عورفی شیعرەکەی بەم پێنجینە دەست پێ دەکا:

دوێ شەو لە خەوا دیم سەنەمێ نازک و نازدار
شیرین دەهەنێ غونچە لەبێ وەک گوڵی گوڵزار
جانم بەفیدای بێ نەکو جارێکی هەزار جار
بۆ ئەو قەدە ئەو قامەتە ئەو لێوە شەکەربار
لاکین لە دڵا مات و مەلوول عاجز و غەمبار

لە دوای ئەم پێشەکییە بەجوانی و ناسکیی دایکی نیشتمان هەڵدەڵێ، خوێنەر وا لێ دەکا دڵی بچێتە ئەم پەیکەرە بێ هاوتایە. ئەم جوانە لێو بەبار بوو، چەما بووەوە، فرمێسکی دەڕشت، شاعیر ناچار بوو لێی بپرسێ:

ڕووحم بەفیدات بۆچی وەها مات و حەزینی
ئەسبابی چییە! ئەی سەنەما چاو بەگرینی
وا مات و مەلوولی شەو و ڕۆژ گۆشەنشینی
خۆزگەم بەوەی ئەمزانی چییە بۆچی غەمینی
مردم لە غەما خەڵقە دەخیل فرسەتە هاوار

دایکی نیشتمان وەرامی دایەوە:

لێم هاتە جواب و گوتی من مادەری کوردم
مەعلوومە کە پەروەردەکەری کوردی نەبەردم
بێ شک نییە ئێستە کە ئەبینی ڕوخی زەردم
سەد خۆزگە بەسەد خۆزگە کە من زووتر ئەمردم
نەمدیایە نەوەم بنە ئەسیر خادیمی خوێنخوار

من مادەری کوردانی زەمان هەر وەکو شێر بووم
شێرانی نەبەرد دایکی کوڕی کوردی نەبەرد بووم
ژێردەستی نەوەی من بوو هەموو مەملەکەتی ڕووم
ئێران و هەموو موڵکی خەتا خاکی قەرەقووم
ئەمبەخشی هەموو تاجی سەری قەیسەر و سەردار

میران و شاهانی کە لەسەر ئەم ئەرزە ئەژیان
کوردانی نەوەی من بوون لەسەر کورسیی دەوران
لەو بەحری ڕەشە بگرە هەتا خاکی خۆزستان
بێ غیرەتیان ئاخری گشت دەرچوو لە دەستیان
ئێستەکە زەلیل زار و زەبوون غەمگین لێو بەبار

ئەو وەختە کە من بیرەوەری دایکی وەتەن بووم
فەرماندەری دەور خانمی سەر موڵکی خوتەن بووم
کەس ناوی نەبوو غەیری نەژادی من و من بووم
بەخودا وا ئیتر موستەحەقی دفن و کەفەن بووم
ئێستەم کە ئەبینی شەو و ڕۆژ عاجز و بێزار

هەر ڕۆڵەیی من بوون لە جیهانا هەموو پێشڕەو
دایم لە حەشەمدا وەکو شاهی کەی و خوسرەو
ئێستەکە هەموو خادیمی دەرگاهی ئەم و ئەو
برسی و ڕەش و ڕووت بێ خەبەر و چاوی پڕی خەو
بەو نەوعە ئەبن بۆ گەلی بێچارە مەدەدکار

ئەی ڕۆڵە ئەمە غیرەتە من لێوە ئەبینم
سەرپۆشی سەرم بۆتە سەما فەرشە زەمینم
زووکە وەرە ناو هەڵمەتی مەردانە ببینم
سەرکەوتنی خۆتان و گەلان تاکو ئەمێنم
غیرەت بکەن و دەس بدەنە یەک بێنەوە بەرکار

دایکی نیشتمان شاعیرانە بەسەرهاتی کۆنی کورد دەگێڕێتەوە، میللەتی کورد دەوری لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بووە، دەسەڵاتی بەدەست خۆی بووە، بەڵام لە ڕۆژگاری



ئێستادا کەوتووە، بووە بەژێردەست. دایکی نیشتمان ئامۆژگاری ڕۆڵەکانی دەکا کۆشش و خەبات بکەن بۆ ڕزگارکردنی.

## شیعری دیالێکتی گۆرانی بەهەوای کرمانجیی باکوور

عورفی بۆ تاقیکردنەوەی خۆی ویستوویەتی شیعر بەدیالێکتی گۆرانی (هەورامی) بڵێ. هەرچەندە شیعرەکە مۆرکی گۆرانی پێوەیە، بەڵام شاعیر هەوڵی داوە زیاتر شێوازی دیالێکتی کرمانجیی خوارووی پێوە دیار بێ. لە شیعرەکەدا دەڵێ:

قوربان جەژنەکەی قوربانەن ئیمڕۆ
ڕۆژی قوربانی قوربانەن ئیمڕۆ
نیگای مەرحەمەت پەی دەردەداران
پەڕەی زامی دڵ دەرمانەن ئیمڕۆ

***

سەرگۆنای ئاڵی ڕووی نەوجەوانان
فێنکی دڵەی پیرانەن ئیمڕۆ
عەفووی گوناهان لە ڕووی مەرحەمەت
قوربان ئینتیزار فەرمانەن ئیمڕۆ

***

چەند ووردە خاڵی نەونەمامی نەو
سەرلێشێواوی زەمانەن ئیمڕۆ

***

یاران لە دووری باڵای ئازیزان
گشتی بێ تاب و تاوانەن ئیمڕۆ

***

جووتە دڵداری یەک نەگەیشتوو
لەیەک دوورکەوتووی نەمانەن ئیمڕۆ
(عارفی) بێکەس کەس لێی نەپرسی
مەردەن نەمەردەن یا مانەن ئیمڕۆ

ئەم شیعرە تاقیکردنەوەییێکی ئاساییە. دیالێکتی گۆرانی لە ناوچەکانی هەورامان و شارەزوور و گەرمیان و جێگەی دیکە مەشقی سەدان ساڵیان هەیە لە شیعری کوردیدا. لە دوای قوتابخانەی نالی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم تا ئەمڕۆ دیالێکتی کرمانجی باشوور جێی ئەوی گرتەوە، بەڵام شوێنەواری دیالێکتی گۆرانی کەم و زۆر تا ئێستا ماوەتەوە بەتایبەتی لە ئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر). زۆربەی شاعیرانی ناوچەی سلێمانی تاقیکردنەوەی شیعریان هەیە بەتێکەڵ کردنی هەردوو دیالێکت. عورفی یەکێکە لەو شاعیرانە.

***

عارف شێخ مەحموود ناسراوە بەعورفی شاعیرێکی ڕەسەنە، شیعری بۆ خۆی وتووە، کەس پێی بەڕادان نەداوە، خۆڕسک و سروشتییانە لە خەیاڵ و مێشکی هاتۆتە دەرەوە. شیعری ڕەنگدانەوەی سەردەمی ژیانی بووە، نموونەییێکی ڕەنگین و بەپێزی ڕۆژگار بووە. شیعری بۆ دڵی خۆی و هەمووکوردزمانێک وتووە. بۆ بیری کوردایەتی وتووە ئەوەی بۆ بنچینەییترین و گرنگترین کێشەی کورد کەوتۆتە ناوەوە کە ڕزگاریی نەتەوەییە، ئەو مەسەلەیە پێویستی بەئامۆژگاری هەیە لە پێناوی ئەوەی پەروەردەی بکا بۆ هەوڵ و کۆشش و خەبات بەمەبەسی کردنەوەی گرێی کێشە نەتەوایەتییەکەی کە تا ئێستاش نەکراوەتەوە.

# بەشی بیست و چوارەم

## کانی

## ١٨٩٧ – ١٩٥٧

### ژیانی

عەبدولجەبار کوڕی مەلا عەبدولڕەحمان کوڕی تەها کوڕی عەبدوڵڵای دۆغرەمەچییە. بنەچەیان دەچێتەوە سەر عەشرەتی جافی هەڵەبجە. بەم دوو دێڕە شیعرە خۆی بەخەڵکی دەناسێنێ:

زاهیرم هەر مەردی مەیدانم وەکو شێری دلێر
گوێت لە بەیتم بێ دەکا ئیسپاتی نوتق و قووەتم
عاریفی عەسرم ئەدیبم حوڕ و سەربەست و فەهیم
بێ موحابا شاعیرم مەشهوورە (کانی) شوهرەتم

نازناوی شیعری کانی بووە، لە ناو خەڵکی بەجەبار ئاغای کانی ناسراوە. کانی لە ساڵی ١٨٩٧ لە هەولێر لە دایک بووە، هێشتا منداڵ بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە. خوێندنی بەرایی لە حوجرەی مزگەوتی قەڵای هەولێر بووە. منداڵێکی هەراش بووە کە دەستی بەخوێندن کردووە. هەرچۆنێ بێ قۆناغەکانی خوێندنی تەواو نەکردووە بەڵام مەیلی بۆ خوێندنەوەی کتێب زۆر بووە، بەشداری لە کۆبوونەوەکانی نێوەندی ئەدەبی و ڕۆشنبیری کردووە. ناسیاوی لەگەڵ هەندێ ڕۆشنبیر و مێژوونووس و شاعیراندا بووە لەوانە حوزنی موکریانی و گیوی موکریانی و میهری شاعیری هەولێری و بێخود و زەکی هەناری و دڵدار و سافی هیرانی و ڕەفیق حیلمی و هی دیکە.

یەکەم کاری مووچەخۆری میری لە ساڵی ١٩٢٨ لە کارگێڕی «هەڵمەتی لەناوبردنی کوللە» بووە. لە ساڵی ١٩٢٩ گوێزراوەتەوە بۆ کەندیناوە و گوێڕ و شەقڵاوە و قوشتەپە. لە ساڵی ١٩٣٤ بووە بەفەرمانبەر لە کارگێڕیی سەرژماردن (نوفووس) لە قەزای ڕواندز. لە ساڵی ١٩٣٩ کراوە بەمووچەخۆری سەرژمێریی کۆیە تا ساڵی ١٩٤٣. ئینجا لە ساڵی ١٩٤٤ بووە بەمووچەخۆری ئازووقە (تەموین) لە هەولێر. لە دوای جەنگی دووەمی گێتی بووە بەمووچەخۆری دەسگای زانیاری (مەعاریف) لە هەولێر، لەم کارەیدا بەردەوام بووە تا ڕۆژی ١٢ی مایسی ١٩٥٧ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە.



### شیعری

شیعری کانی بەرهەمی ئەو نێوەندەیە کە لێی پەروەردە بووە. ناوچەی سۆران جێی جموجۆڵی شاعیر بووە لە نێوەندە گرنگەکانی بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی و ڕۆشنبیری کۆمەڵی کوردەواری نەبووە لە سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم. لەو سەردەمانەدا ناوچەی کۆیە نوێنەری سۆران بووە. کانی لە ڕۆژگارێکدا ژیاوە شوێنەواری ڕۆشنبیری و ئەدەب لەو ناوچەیەدا سەری هەڵدا. شاعیر ئاگاداری چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردی بوو لە ڕواندز (١٩٢٦)، بڵاوکردنەوەی گۆڤاری ڕووناکی لە هەولێر (١٩٣٥). هەروەها نێوەندی ڕۆشنبیری لە ماڵی خۆیان، باوکی مەلا بوو. لە سەرەتادا کانی بایەخی بەزمانی تورکی داوە، بەشەوقەوە لەیلا و مەجنوونی فوزووڵی خوێندۆتەوە، لە پاشانا هەندێکی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و چەند جارێکیش بڵاوکراوەتەوە. هەستی نەتەوەیی پاڵی بەکانییەوە ناوە بەتورکی شیعر نەنووسێ و بەکوردی بیهۆنێتەوە.

کانی شیعری بەحری عەرووزی لەسەر کێشەکانی هەزەج و ڕەمەل و سەریع داناوە. یەکێتیی قافیەی بەکارهێناوە. لەبەرئەوەی شیعری کەمە چەند دەنگێکی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی کردووە بەقافیە، هەرچی دەنگە تایبەتییەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبییە پشتگوێی خستوون. بایەخی بەپاش قافیە نەداوە، تەنیا چەند نموونەییێکی پاش قافیەی هەیە. هەروەها شیعری سیلابی خۆماڵیشی داناوە. بەزۆری کێشی حەوت بڕگەیی و هەشت بڕگەیی بەکارهێناوە، قافیەیان مەسنەوییە.

لە بابەتی لیریک بەولاوە لە دیوانی کانی بابەتەکانی دیکە ناکەونە بەرچاو. هەندێ بەندی چوارین و تاکی هەیە، بەم پێیە بەرهەمی شیعری لە رووی قەوارە و ژمارەی دێڕی شیعرەوە کورتن. هەندێ لە شاعیرانی سەردەمی خۆی شیعریان کردووە بەپێنج خشتەکی لەوانە میهری شاعیری هەولێر و جاهید و محەمەد سائیب. زمانی شیعری کانی سەر بەقوتابخانەی نالییە، بەڵام ئەوە هەیە ئەدگاری دیالێکتی بچووکی سۆرانی پێوە دیارە، ڕاستتر دیالێکتی بچووکی ناو شاری هەولێر نەک کرمانجەتی دەوروبەری.

ناوەرۆکی شیعری کانی سنوور کێشراوە، دڵداریی کلاسیکییانەی سەدەی نۆزدەمە. دەمی لە دانایی ڕۆژهەڵات داوە. هەندێ بیر و بۆچوونی هێناوەتە ناو شیعری کوردییەوە. بڕێکیش خەریکی داشۆرینی نەرمی کۆمیدیانە بووە زیاتر شەقڵی گاڵتە و گەپیان پێوەیە. بابەتی هەڵهێن (مەتەڵ)ی هەیە.

## نموونەی شیعری

### وەسف و دڵداری

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

ساقی وەرە ئیمشۆکە لە بۆم تێکە پیاڵە
بۆ مەززە لە ڕووت کافیە ئەم دانەیی خاڵە
هەرچەندە بەشەرع بادە حەرامیشە وەلێ من
بێ تەقیە دەخۆم جۆری لە دەستی تۆ حەڵاڵە
مەعلوومە کە ئەم حاڵەتە بێ سڕ نییە ئافەت
چاوم ئەگەر دەتبینێ زمانم وەکو لاڵە
خوێنی دڵمە عەکسی لە ڕووت کردووە ئیزهار
چاوم ئەگەر ئینکاری نەکا شاهیدی حاڵە
چەند خۆشە بکەم دائیمە من وەسفی جەمالت
زولفت شەوی تاریکە برۆت عەینی هیلالە
دەرناچی ئەبەد سووڕەتی تۆ نەقشە لە دڵ دا
مومکین نییە ئەم سووڕەتە بڕوا لە خەیاڵا
(کانی) بەسە ئیتر چییە ئەم عیشق و هەوایە
پیر بووی بەخودا عومری عەزیزت لە زەواڵە

شاعیر بەلێکدانەوەی ڕۆژهەڵاتییانە دڵداری تەنیا لە پیاودا دەبینێ، بەشی ژنی تێدا نییە، ئەو پیاوەش دەبێ لاو بێ و نابێ پیر بێ. مەسەلەکە بەلایانەوە دڵداری هەوەسی سێکسە و دامرکاندنەوەی بەدەست پیاوەوەیە. شاعیر توانیویەتی وشە کۆبکاتەوە و مانای زانراو و بیستراوی تێبخا و جۆرە مۆسیقاییێکی لێ دروست بکا و ببێ بەئارامی گوێ و وەکو بەرهەمێکی هونەری بکەوێتە ناوەوە.

لە تاکێکیدا کانی ڕوو دەکاتە دلبەری و پێی دەڵێ:

دووری لە نەزەر حازری دایم لە خەیاڵم
حەسرەت کەشی دیدارتم ئەی بەدری کەمالم

دلبەر بەلەش لە شاعیر دوورە، بەڵام ئەوەندە خۆشی دەوێ هەمیشە لە خەیاڵی دایە، لەبەرئەوە داوای لێ دەکا لێی نزیک بێتەوە.



### کانی و کوردایەتی

جارێکیان جاهیدی برازای کانی لێی دەپرسێ لەبەرچی زۆربەی شیعری دڵدارییە و شیعری نیشتمانپەروەری نییە. کانی بەم شیعرە وەرامی جاهید دەداتەوە:

وەتەن شیرینە لای من داخەکەم بەس کۆزی ساوایە
بەقیل و قالی من ئامانجەکەی ناگاتە هیچ پایە
ئەبێ ڕۆستەم سیفەت لاوانی من گورج و بەغیرەت بن
هەتاکەی چاوەکەم هەر لایلایە وو باوەشی دایە
مەڵێ بێ ئیش و کارم بەختەکەم سەرنگوون دێنێ
ئەگاتە مەقسەدی کاسب بەدوو سێ ئانە سەرمایە
بەشەر ئیللا بەکۆشش بەرز ئەکا بەیداغ و ڕەمزی خۆی
موحەققەق تەمبەڵی و سستی پەشیمانی لەگەڵ دایە
هونەرمەندانی زۆرمان مرد بەڵام نامرێ قسە و ناویان
قسەی نالی قسەی سالم هەتا دنیایە هەر مایە
کوڕم بورهان قسەم بگری لە دنیا هیچ زەرەر ناکەی
بەمەردی هەر ئەژی بۆ خۆت مەگەر لەم تاڵە دنیایە
لە (کانی) گەر دەپرسی بۆچی ئەشعارت هەمووی عیشقە
لە منداڵی بەناکامی سەرم پڕ عیشق و سەودایە

ئەم شیعرە لە لایەن کەسێکی ڕاستگۆوە وتراوە. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە کورد دواکەوتووە، بەئامۆژگاری دەردی تیمار ناکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا بەپێچەوانەی قسەکەی خۆی ئەوە دەردەخا و دەڵێ کورد پێویستە ئازا بێ وەک ڕۆستەم و داوای مافی خۆی بکا، دەبێ کۆشش بکا بەوە نەبێ ناگاتە ئامانج. لە دواییدا شانازی بەڕابردوو دەکا و ئەوە دێنێتەوە یادی خەڵکی شاعیرانی وەکو نالی و سالم ئەگەرچی خۆیان وەک لەش لەناوچوون، بەڵام ناو و کردەوەیان واتە شیعریان ماوە و نەمرە. ئینجا ڕوو دەکاتە بورهان جاهیدی برازای و پێی دەڵێ، پێویستە بەمەردی بژی، لە بارەی پرسیارەکەیەوە بۆچ شیعری هەمووی دڵدارییە! شاعیر ڕاستییەکەی بۆ دەربڕیوە کە وتوویەتی بۆ شیعری دڵداری خولڵقاوە و لە دەرەوەی ئەوە شیعری بۆ نایە.

## کەرەدێزە

کانی شیعرێکی کۆمیدی داناوە بەناوی «کەرەدێزە»وە، لە ناوەرۆکی شیعرەکە ئەوە دەردەکەوێ مەبەسی وەسفی کەرێک بێ، کەچی وا زان دەکرێ بۆ وەسفی کەسێکی دیاریکراو دانرا بێ ئەگەرچی هیچ ڕەمزێکی وای نەخستۆتە ناو شیعرەکەوە وا هەست بکرێ بۆ کەسێکی دیاریکراو ڕێکخرا بێ. بەگشتی لە وەسفی ڕاستیی گوێدرێژیش نەچووتە دەرەوە.

شیعرەکە لەسەر بنچینەی بەندی چوارین دانراوە (ا ا ا ب)، نیوە دێڕی چوارەم لە هەموو بەندەکاندا بەنیوە دێڕێکی دیاریکراو کۆتاییپیان هاتووە. بەم جۆرە دەست بەشیعرەکەی دەکا:

هەیتم کەرەکی دێزە چ عەفریت و بەهێزە
وەک جووتی دەکا ڕاستە خەتی ڕێزی لە ڕێزە
جۆی ناوێ بەرەڵلای کە لە ناو پووش و پەرێزە
قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە

***

ئەندامی گەلێ شیرینە زۆر دڵگیرە ڕەنگی
وەختی دەزەڕێ گوێ بدە وەک مەزرەحە دەنگی
ڕەهوانە سواری بە دەچێ میسلی خەدەنگی
قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە

***

گەر عومری دەپرسی کەمە چار وەختییە جاشە
وەستانی نییە جووتی ئەکا یانە لە ئاشە
بیفرۆشم ئەگەر ئیمڕۆ بەسێ لیرە بەلاشە
قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە

***

وەک ئەسپە سەروگەردەنی گوێ قیت و جوانە
باکی نییە هەرچەندی بکەی باری گرانە



ئەمسالی نییە قەتعی لە ناو قەومی کەرانا
قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە

لەم دێڕانەدا کانی وەسفی سەروسوکوت و ئەندامی کەرەکەی دەکا. گوێدرێژێکی بەهێزە، جووتی ڕێکوپێکە، ئەندامی جوانە، ڕەنگی دڵگیرە، خۆشڕەوە، تەمەنی لاویەتی هەیە، واتە جاشە. جگە لە جووت کردن باراشیش دەباتە ئاشی. نرخی گرانە. لە ناو قەومی کەراندا یەکانەیە، لە ئەسپ دەکا زیاتر لەوەی لە خێڵی گوێدرێژان.

ئینجا شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

ترست نەبێ باژۆ لە بیابان و لە کێوان
چەن لێی دەوەشێ قەوچ و قەڕاسە و جل و کورتان
نەستێنێ خودا مودەکی زۆر ئەم کەرە لێمان
قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە

***

ڕۆیین نییە ڕەهوانی ئەچێ یانە بەغارە
هەر وەک کەتە ڕێ نابینرێ تۆزی دیارە
وەختی نییە ئێستا کەرەدێز مەمرە بەهارە
قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە

***

پشت کووڕ و کەفەڵ خڕ سمتی کورت چوار پەلی ئەستوور
مووی کلکی درێژە قەوی موتریب بکە تەمبوور
(کانی) هەیە پەیدا ئەبێ وەک ئەم کەرە مەغروور
قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە

***

پێستیشی دەغارێ لە بۆ دەف بیدەمە حاجی
دەکرێتەوە ئەوجا لە مەقام حاجی میزاجی
لێدە دەفی کەر پاپخەکوێر کەتیە ڕەواجی
قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە

کەرەکەی کانی ئەوەندە بەهێزە لە بیابانان و لە کێواندا ماندوو نابێ. جل و کورتان و

قەڕاسە و زەنگوڵە و هەموو ئەسبابێکی پۆستەیی لێ دێ. خۆشڕەوە لە غاردانا سمی تۆز دەکا. سەرەڕای ئەم هەموو سوود و کەڵکانەی کەرەدێزە لە دوای مردن ئەگەر پێستی بغارێنن دەفی چاکی لێ دروست دەبێ بۆ حاجی. مەبەس حاجی عەبدوڵڵای مەقام بێژ و دەفژەنی بەناوبانگی ئەو سەردەمەی هەولێرە. هەروەها لە شیعرەکەدا ناوی پاپخە کوێریش هاتووە، ئەمەیان دەفژەنێک بوو شاگردی حاجی عەبدوڵڵا.

ئەم شیعرە وێنەیێکی کۆمیدی جوانە لە ئەدەبی کوردیدا، دەچێتە ناو «ئەدەبیاتی کەرنامە» بەناوی کۆمیدیییەوە. هەرچی لایەنی فەلسەفی و دانایی کەرنامەیە ئەمەیان لە وەسفی نالی بۆ کەرەکەی گەیشتۆتە لووتکە.

### عەیبە عەیبە

کانی کۆمەڵێک تاکی هەیە زۆربەیانی بۆ فیکری دانایی و ئامۆژگاری و قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و مەبەسی ڕەوانبێژی بەکارهێناوە.

لە تاکێکیدا دەڵێ:

عەیبی نییە شیعرم وەلێ بۆ ئەو کەسە عەیبە
نازانێ لە شیعر و دەڵێ ئەم شیعرە بەعەیبە

لە تاکێکی دیکەیدا دەڵێ:

با بمرێ حەسوود و بەد و ئەو فیکری بەعەیبە
تا ماوە نەجاتی نییە لەم فیکرە بەعەیبە

لەم شیعرانەدا کانی ستایشی شیعری خۆی دەکا و ئەو کەسە بەشەرمەزار دادەنێ کە لە شیعر ناگا و ئەوەی چاک بەخراپ ناوی دەبا. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە کەسی چاو لە بار و بەد لە ناو بچن، عەیبە نەمێنێ بۆ ئەوەی خەڵکی ڕزگارییان لێی ببێ. لە لایێکی دیکەوە دووبارەبوونەوەی وشەی «عەیبە» لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە ئاوازێکی نەرم و دڵگیری داوەتە شیعرەکە.

بەڕاستی لە کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتدا وشەی «عەیبە» دەوری خراپی هەیە، چونکە لە ڕەخنەی ڕەمەکی ناو خەڵک بەکار دەهێنرێ. وشەکە بۆ بەرهەڵستیی هەموو جۆرە هەڵوێستێک دەکەوێتە ناوەوە. زۆرجاریش ئەوەی لای یەکێک عەیب نەبێ لای یەکێکی دیکە بەعەیب لە قەڵەم دەدرێ.

***



جەبار ئاغا کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی دۆغرەمەچی ناسراو بە«کانی» خەڵکی هەولێرە. لە منداڵییەوە هەستی نەتەوەیی بووە. لە پێشانا شیعری تورکی عوسمانی زۆر خوێندۆتەوە، لە پاشانا ویستوویەتی شیعری بەکوردی بڵێ. لەم مەشقەدا سەرکەوتوو بووە. کۆمەڵێک شیعری لەسەر بەحری عەرووزی و کێشی خۆماڵی نووسیوە، شیعری کەمە بەڵام داهێنراوی هەیە. یەکێک بووە لەو شاعیرانەی گۆمی مەندی ئەدەبی و ڕۆشنبیری شلەقاندووە لە ناوچەی سۆران بەتایبەتی هەولێر و کاری کردبووە سەر ئەو لاوانەی لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم کەوتبوونە سەر هەوەسی هۆنینەوەی شیعر.

# بەشی بیست و پێنجەم

## ڕەفیق حیلمی

**۱۸۹۸ - ۱۹٦۰**

### ژیانی

ڕەفیق کوڕی ساڵح کوڕی عەبدوڵڵا لە ساڵی ۱۸۹۸ لە کەرکووک لە دایک بووە. لەسەر دەستووری کۆمەڵی عوسمانی لەقەبی «حیلمی» بۆ خۆی داناوە و بە«ڕەفیق حیلمی» لە ناو خەڵکیدا ناوبانگی دەرکردووە. باوکی لە ئەفسەرانی سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی بووە و بەبنەماڵە خەڵکی سلێمانین. سەرەتای خوێندنی قوتابخانەی لە کفری بووە. لە ساڵی ۱۹۰۹ چۆتەوە سلێمانی و لە پۆلی دووەمی قوتابخانەی ڕوشدییەی سوپایی وەرگیراوە، کە لە پۆلی سێیەم دەرچووە، پۆلی چوارەم لەوێ نەبووە ناچار بۆ ئەم مەبەسە ڕووی کردۆتە بەغدا و پۆلی چوارەم و پێنجەمی تێدا تەواو کردووە بەهیوای ئەوەی خوێندنی باڵای لە قوتابخانەی جەنگیی ئەستەمووڵ تەواو بکا. لەو کاتەی خەریک بووە کۆتایی بەخوێندنی ئەم قوتابخانەیە بێنێ لەگەڵ مامۆستاییێکی تێکچووە و لە قوتابخانە دوورخراوەتەوە. ئیتر لە ساڵی ۱۹۱۳ گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی خوێندنی قوتابخانەی ئامادەیی تەواو بکا. لەم ماوەیەدا بیروڕای خۆی گۆڕیوە و هەوەسی کەوتۆتە سەر خوێندنی «قوتابخانەی باڵای ئەندازیاریی ئەستەمووڵ». وا بوو لە سەرەتای جەنگی یەکەمی گێتی لە ساڵی ۱۹۱٤ بوو بەقوتابی ئەو دەسگا زانستییە. بەهۆی داگیرسانی جەنگ تەنیا دوو ساڵ لەو قوتابخانەیە خوێندوویەتی و لە ساڵی ۱۹۱٦ گەڕاوەتەوە سلێمانی.

لە یەکەم دەسەڵاتی شێخ مەحموود لە ساڵی ۱۹۱۸ لە سلێمانی ڕەفیق حیلمی مامۆستای ئەفسەرە گەورەکانی ئینگلیز بووە فێری زمانی فارسی و کوردی کردوون. لە ساڵی ۱۹۱۹ بەفەرمانی شێخ مەحموود بووە بەیاوەری ئەو ئەفسەرانە لە کۆیە و ڕواندز، بەڵام زوو لەگەڵیاندا تێکچووە تا گەیشتۆتە ئەوەی ئازار بچێژێ و ماوەیێک بخرێتە بەندیخانەوە. لە دوای ئازادبوونی دوکانی وردەفرۆشی لە سلێمانی داناوە. زۆری پێ نەچووە لە ساڵی ۱۹۲۰ چۆتەوە بەغدا، لێرەش ئۆقرەی نەگرتووە و زوو گەڕاوەتەوە سلێمانی و خەریکی ئاڵوێری بۆتەوە. ئینجا لە ساڵی ۱۹۲۱ تا ۱۹۲۳ لە کەرکووک



کارگێڕی قوتابخانەی سەرەتایی زەفەر بووە، لە سلێمانی کارگێڕی قوتابخانەی نموونەیی سەعادەت و قوتابخانەی ئامادەیی مەحموودییە بووە. لە ساڵی ۱۹۲۳ بووە بەیاوەر و سەردەستەی نوێنەرانی شێخ مەحموود، گەشتی ئەنقەرەی بووە، وەک نوێنەری شێخ بەڵام وا دەردەکەوێ هیچی لێ نەکەوتۆتەوە.

لەو ساڵانەی دەسەڵاتی عیراق دامەزراوە ڕەفیق حیلمی مامۆستا بووە لە کەرکووک (۱۹۲٤). لە ساڵی ۱۹۲٦ گواستراوەتەوە بۆ ئاوایی مەجەر ئەلکەبیر لە لیوای عەمارە لە باشووری عیراق. لە ساڵی ۱۹۲۸ گەڕاوەتەوە کەرکووک و بووە بەمامۆستای قوتابخانەی ئامادەیی. لە ساڵی ۱۹۳۰ گواستراوەتەوە بۆ سلێمانی. لە ڕووداوەکانی ئەو ساڵە بەتایبەتی ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی لە ٦ی ئەیلوول ۱۹۳۰ ڕەفیق حیلمی ناوی نییە. لەو ماوەیەدا گواستراوەتەوە مووسڵ و مامۆستای قوتابخانەی ئامادەیی بووە، تا ساڵی ۱۹۳٦ لە مووسڵ ماوەتەوە ئینجا گەڕاوەتەوە سلێمانی و زۆری نەبردووە گواستراوەتەوە بۆ قوتابخانەی ناوەندی ناسرییە لە باشووری عیراق.

ڕەفیق حیلمی لە ساڵانی ۱۹۳۸ - ۱۹٤۳ پشکێنەری دەسگای زانیاری (مەعاریف)ی قوتابخانە سەرەتاییەکان بووە لە بەغدا و بەعقووبە و سلێمانی. لە پاشانا بووە بەکارگێڕی زانیاری کەرکووک و بەعقووبە، ئەوجا کارگێڕی قوتابخانەی ئامادەیی کەرخ لە بەغدا. لە ساڵی ۱۹۵۲ کراوە بەکارگێڕی مەعاریفی شاری عەمارە، ئەوجا گوێزراوەتەوە و بووە بەجێگری ئەمینداری پایتەختی بەغدا (شارەوانی پایتەخت). لە ساڵی ۱۹۵٦ کراوە بەجێگری کارگێڕی قوتابخانەی نێوەندی ئامادەیی بەغدا تا ساڵی ۱۹۵۸ گوێزراوەتەوە بۆ کارگێڕی قوتابخانەی ئامادەیی شەرقییە لە بەغدا. لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ۱٤ی تەمووزی ۱۹۵۸ی بەغدا ماوەییێک بووە بەپاشکۆی ڕۆشنبیری لە باڵیۆزخانەی عیراق لە ئەنقەرە. بەپێی پلەی دڵخۆشی ڕەفیق حیلمی بەو گۆڕانەی لە عیراق ڕووی دا ئەو کارەی لە ئەنقەرە زۆر بچووک بوو نەدەبوو قوبووڵی بکا. بەڵام لەسەر ئەو کارە بەردەوام نەبوو و زوو گەڕایەوە بەغدا و دوا کاری سەرپەرشتی پشکێنەری پەروەردە بوو لە کارگێڕی زانیاریی بەغدا تا لە ڕۆژی ٤ی ئاغستۆسی ساڵی ۱۹٦۰ بەنەخۆشی هەرەسی ناو مێشک کۆچی دوایی کرد و هەر لەوێش بەخاک سپێررا.

## ڕەفیق حیلمی ڕۆشنبیر

ڕەفیق حیلمی وەک مامۆستاییێکی قوتابخانەکانی سەرەتایی و ئامادەیی مامۆستای وانە زانستییەکانی ماتماتیک و فیزیا و ئەندازە و ئەوانی دیکە بووە. لەو کاتەی پسپۆر بوو لە فێرکردنی قوتابییان، لە گۆڕەپانی دیکەی ڕۆشنبیری یەکێ بوو لە زانا دیار و بەدیمەنەکانی کوردانی سەدەی بیستەم.

لە مێژووی کورد بەتایبەتی مێژووی سەردەم ئاشنایەتی هەبوو. لەو کاتەی لە مووسڵ بوو لە ساڵی ١٩٣٤ بەزمانی عەرەبی لە بابەت مێژووی کوردەوە «کورد لە بەرەبەیانی مێژووە تا ساڵانی ١٩٢٠ - ١٩٣٢»ی نووسیوە و بڵاوی کردۆتەوە. لە وەرگێڕانا دەستی هەبوو، هەر لەو ساڵەدا لە مووسڵ «خولاسەی مەسەلەی کورد»ی لە زمانی فرەنسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی. جگە لەوە «نامیلکەی کۆمەڵایەتی»ی زیاگوگ ئەلبی نووسەری تورکی بەنەژاد کورد لە تورکییەوە گۆڕیویەتییە سەر زمانی کوردی. ئەمەو جگە لە «یادداشت»ی هەشت بەرگی لە ساڵانی ١٩٥٦ - ١٩٩٢ بڵاوکراونەتەوە. ئەمە توحفەییێکی ڕۆشنبیری کوردییە، لە مێژوو و بەسەرهاتی کورد دەدوێ لە کوردستانی عیراق لە ماوەی نیوەی یەکەم و ناوەڕاستی سەدەی بیستەم. ئەم بەرهەمە بەنرخە بە یادگارێکی ئەدەبی دەژمێررێ، بەڵگەی شێوازی بەرزی نووسینی پەخشانی کوردییە.

لە گۆڕەپانی ڕۆژنامەگەری لە سەرەتادا ڕەفیق حیلمی پێوەندی بەڕۆژنامەگەریی تورکییەوە بووە. زۆربەی نووسینی لەو کاتەدا بەو زمانە بووە تا دەگاتە هۆنینەوەی شیعر بەزمانی تورکی و دیوانێکی لەم بابەتەوە پێکەوە ناوە. لە ساڵی ١٩٢٢ لە ڕۆژنامەگەریی کوردی نزیک بۆتەوە، لە ڕۆژنامەی «بانگی کوردستان»ی نووسیوە. ئینجا لە ساڵی ١٩٢٣ ماوەییێک لە ڕۆژنامەی «ئومێدی ئیستیقلال» سەرنووسەر بووە. لە سییەکانی سەدەی بیستەم پاش ئەوەی دەسەڵاتی عیراق جێگیر بوو ڕەفیق حیلمی لە ڕۆژنامەکانی «ژیان» (سلێمانی ١٩٣٥) و «گەلاوێژ» (بەغدا ١٩٣٩ - ١٩٤٩) و «شەفەق» (کەرکووک ١٩٥٨) و «پێشکەوتن = التقدم» (بەغدا ١٩٥٨) و ڕۆژنامەی عەرەبی «الایام» (بەغدا ١٩٥٤ - ١٩٥٧) نووسینی زۆری هەیە. هەرچەندە لە دەستەی نووسەرانی ئەم ڕۆژنامە و کۆوارانە نەبووە، بەڵام ئەوەندە لێیانەوە نزیک بووە و زۆری بۆ نووسیون خەڵکی وایان زانیوە لە بەڕێوەبەرانی ئەم چاپکراوانە بووە.



## ڕەفیق حیلمی سیاسی

ڕەفیق حیلمی نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیر بوو، مامۆستای قوتابخانە بوو، هەندێ مەرجی بوونی بەسیاسی لە هەڵسوکەوتیدا بەدی دەکرا. چوار زمانی ڕۆژهەڵاتی کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی دەزانی، جگە لە زمانی فرەنسی، لە زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزیش سەری دەردەچوو.

ڕەفیق حیلمی کوردێکی بێ گەرد بوو، هەوەسی کوردایەتی گەیشتبووە پلەی پەرستن. گرنگترین خەسڵەتی ئەوە بوو سەری شۆڕ نەدەکرد بۆ ئەو گەورەیەی بەحسێب لەو گەورەتر بوو لە ئەنجامی بیرۆکەی دواکەوتوویی کۆمەڵی دەرەبەگی و باوکسالاری و ژیانی سایەی ئەمپریالیستی ئەوروپا. ئەم ڕەوشتەی ڕەفیق حیلمی بوو بەهۆی ئەم هەموو گواستنەوەیە لە جێیێک بۆ جێیێکی دیکە لە ژیانی مووچەخۆرییدا. کەچی بەپێچەوانەوە هەڵوێستی لەگەڵ ئەوانەی پلەی کۆمەڵایەتییان لە خوار ئەوەوە بوو زۆر نەرم و نیان و دیمۆکراتیانە بوو. لەبەرئەوە لای چینەکانی سەرەوە پەسەند نەبوو، لای ڕۆشنبیر و خوێندەوار و لاوان و قوتابیان جێگەی تایبەتی هەبوو لە ناو دڵیاندا.

قوتابیانی ڕەفیق حیلمی ڕاست بوون کە بیریان لەوە دەکردەوە سۆزی بەرامبەر بەشێخ مەحموود بێ پایانە، ئەمە لە شیعرێکیدا دەردەکەوێ بۆ کامەرانی نووسی بوو، وەک وەرامێک بۆ ئەو شیعرەی کامەران بۆ کۆچی دوایی هۆنیبوویەوە بۆ شێخ مەحموود. لەو شیعرەدا دەردەکەوێ پێوەندیی ڕەفیق حیلمی لەگەڵ شێخ مەحموود گیانی بوو، یەکسانییێک لە سۆزی هەردوو لایان هەبوو بەرامبەر بەئەوی دیکە. کە شێخ لە مەلیکی کەوت و هیچی بەدەستەوە نەما لە شیعرێکدا زیاتر هۆگری بوو. ئەو کاتە لاوێکی تازەپێگەیشتوو بوو خەریک بوو دەم لە حیزبایەتی بدا. لە ساڵی ١٩٢٠ هەوڵی داوە لەگەڵ لاوان «کۆمەڵەی سەربەخۆی کوردی» لە سلێمانی دابنێ. لەو سەردەمەدا هەرچەند لاوێک کۆششیان دەکرد بۆ دانانی ڕێکخراوی سیاسی. لە هەڵبژاردنی ڕێکخراوی «کۆمەڵەی کوردستان» لە ساڵی ١٩٢٢ لە سلێمانی ڕەفیق حیلمی زۆرترین دەنگی وەدەست هێنا. ئەمە ڕێکخراوێکی ئاشکرای کۆمەڵایەتی بوو.

لە ساڵی ١٩٣٠ لە هەولێر ڕێکخراوێکی بچووکیان دانا بوو بەناوی «کۆمەڵەی پشتیوان»، ڕەفیق حیلمییان بەسەرۆک هەڵبژاردبوو. لە هەموو ئەمانە گرنگتر ئەوە بوو قوتابیانی قوتابخانەی ئامادەیی کەرکووک کۆمەڵەییێکیان بەناوی «دارکەر» ڕێکخست، ئەم کارەیان لاساییکردنەوەی ڕێکخراوێکی میللی ئیتالیایی بوو بەناوی «کاربۆناری»،

ناوی کۆمەڵەکەشیان لەو وشە ئیتالیە وەرگرت کە «دارکەر یا دارفرۆش» دەگەیەنی. ئەم قوتابییە دڵسۆزانە بەتاقیکردنەوە و تەمەن نەگەیشتبوونە ئەو پلەیەی بتوانن ڕێکخراوی سیاسی بەڕێوە ببەن. کە ڕێکخراوەکە پەرەی سەند و ناویان گۆڕی و کردیان بە«پارتی هیوا» هانایان بۆ هەندێ لە ڕۆشنبیر و سیاسی کوردی ئەو سەردەمە برد. هەندێکیان ڕازیبوون، هەرچۆنێ بێ باڵندەکە لەسەر ڕەفیق حیلمی نیشتەوە، کرا بەسەرۆکی پارتی هیوا، ئەو ڕێکخراوەی پرۆگرامێکی نووسراوی ئاشکرا و ئۆرگان و بڵاوکراوەی چاپکراوی نەبوو، بەڵام پارتییەکی فراوان بوو لە هەموو چین و توێژەکانی میللەتی کوردی کۆکردبووەوە و دروشمی سەرەکی «بژی کورد و کوردستان» بوو. گەورەترین جموجۆڵی هیوا کەوتە ڕۆژگارانی جەنگی دووەمی گێتی (١٩٣٩ – ١٩٤٥). زۆرینەی سیاسەتمەدارانی کورد لە دوای جەنگی دووەم پێگەیشتووی پارتی هیوا بوون و ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەندامی ئەو پارتییە یا لە بەچکەشێرانی بوون. ڕەفیق حیلمی وەک سەرۆکێکی لێهاتوو و تێگەیشتوو هەڵسوکەوتی لەگەڵ کادیر و ئەندامانی هیوا دەکرد.

جموجۆڵی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئەدەبیی ڕەفیق حیلمی لە بەرچاو بوو. لە ساڵی ١٩٥٧ کە «کۆمەڵەی دانان وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی عیراق» لە بەغدا دامەزرا ئەندامێکی بەرچاو و دیار بوو لەو کۆمەڵەیەدا. بێ گومان زیاتریش لەبەرئەوە بوو تۆفیق وەهبی سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە بوو. لە دوای کوودیتای ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا جموجۆڵی زیاتر بوو چونکە ناسراویی لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم هەبوو و هەندێ لێیەوە نزیک بوو. لەم ماوەیەدا بوو بەجێگری سەرۆکی سەندیکای مامۆستایان و ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان و جێگری سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی عیراق لە بەغدا. لەم ڕۆژگارەدا ڕەفیق حیلمی لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد نزیک نەبوو. کە قانوونی دانانی حیزب لە دوای ١٤ی تەمووز جاڕ درا لەگەڵ لایەنە کوردییەکاندا نەبوو، بەڵکو لەگەڵ ئەو کوردانە بوو کە پشتگیرییان لە دامەزراندنی «پارتی کۆماری عیراقی» دەکرد.

## ڕەفیق حیلمی شاعیر و نووسەر

ڕەفیق حیلمی لە هەردوو چمکی ئەدەبی کوردی کەسێکی لە ڕوو و دیار بوو:

١- مێژوونووسی ئەدەب و ڕەخنەگر بوو. نووسینی لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە سەرچاوەیێکی گرنگن بۆ ناسینی ئەو ئەدەبە. لە ساڵی ١٩٤١ لە بەغدا بەرگی یەکەمی «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی» بڵاوکردەوە. بەرگی دووەمی دواکەوت لە ساڵی



١٩٥٦ لە بەغدا بڵاوکرایەوە. جگە لەوە کتێبێکی بەناوی «لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی سەردەم» لە ساڵی ١٩٣٦ بڵاوکردەوە. ئەم کتێبە لە فەرەنسییەوە گۆڕیوبەتییە سەر زمانی عەرەبی لە لایەن لووسی پوول مارگریت و کامیران بەدرخانەوە بەزمانی فەرەنسی لە ساڵی ١٩٣٠ لە پاریس بڵاوکرابووەوە.

٢- ڕەفیق حیلمیی شاعیر و نووسەر، لە منداڵییەوە هەوەسی شیعر دانانی بووە، لەو دەورەدا وەکو خۆی دەڵێ شیعر وتن بەزمانی تورکی عوسمانی باو بوو. دیوانێکی شیعری بەم زمانە پێکهێناوە. لە قۆناغی دووەمی شیعر وتنیدا خووی داوەتە زمانی کوردی. وەکو شاعیرانی دیکەی ئەو ڕۆژگارە غەزەلی لاسایی شیعری عەرووزی وتووە. لە ناو قاڵبی ئەو شیعرەدا کوردایەتی کردووە. زمانی شیعری ئاسان و ساکارە، کاری شیعری ڕۆمانتیکی عوسمانی نوێ بەسەر شیعریدا ڕوون و ئاشکرایە. هەروەها بەوە ڕاگەیشت بەشداری لە شیعری نوێدا بکا. لەگەڵ ئەوەی شیعری کەمە، بەڵام جێی خۆی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا دەکاتەوە. ئەگەر ڕەفیق حیلمی بەشێکی ژیانی بۆ شیعر تەرخان بکردایە بەرهەمی زیاتر دەبوو لەوەی کە هەیە.

## نموونەی شیعری ڕەفیق حیلمی

### وەسف و دڵداری

ڕەفیق حیلمی لە لیریکێکیدا بەناوی «بەتەرزی قەدیم» دەڵێ:

ماری زولفت نۆبەچی خەزنەی عەقیقی ئاڵ ئەبێ
تیری موژگان پاسەوانی دەوری چاوی کاڵ ئەبێ
من کە سەرمەستی سەفای ئەو نێرگسی مەستانە بم
ئاگەداریم کەی لە داوی زولف و دانەی خاڵ ئەبێ
ناز و عیشوەی دڵ فریبانت فریوی دڵ ئەدا
شەککەری گفتاری تۆ ببینێ مەسیحا لاڵ ئەبێ
دەستی ئیعجازی تەبیعەت چونکە خەتمە مەقسەدی
دەفتەری حوسنت بەخەتتی سەوزی لێو ئیکمال ئەبێ
دامەنی توورەی پەرێشانت لەسەر سەفحەی ڕوخت
عوقدە بو حەللی تەلیسمت باعیسی ئیشکال ئەبێ

حوسنی تۆ مەستوورە یەکسەر خۆ بەزولف و خەتت و خاڵ
مولْکی ئیسلامە بەئۆردوویی فەرەنگ ئیشغال ئەبێ
خاڵەکەی سەر گۆنەکەت بەم ڕەشیە هیندستانیە
یاخۆ شازادەی عەجەم مایل بەخەرقەی شال ئەبێ

بەکۆکردنەوەی وشە و وێنەی شیعری کلاسیکی لە وەسف و دڵداریدا شاعیر توانیویەتی تابلۆیێکی ڕەنگین دروست بکا لە وەسفی ئەندامی مەتریالی دلبەری خۆشەویست و ڕەوشتی مەعنەوی ئەو کەسە.

## کوردایەتی

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «بۆ کوردان» دەڵێ:

هیممەتی ئەربابی غیرەت بێستوون ئیمحا دەکا
ئەو کەسەی ساحیب حەمییەت بێ وەتەن ئیحیا دەکا
یەعنی ئەولادی وەتەن موحتاجی عیلم و سەنعەتە
گەر وەتەنپەروەر بێ شەخسێ مەکتەبێ ئینشا دەکا
نووری عیلم و مەعریفەت وا شەرق و غەربی گرتەوە
قەومی ئێمە تازە تەعلیمی خەت و ئیملا دەکا
ئێستە خۆ نەوعی بەنی ئادەم لە سایەی فەننەوە
بێ موحابا کەشفی ئەسراری یەم باڵا دەکا
بەسیە فیکری بێ سەمەر ئەمڕۆکە عەسری غیرەتە
موڵکی کوردستان لە ئێمە هیممەتی داوا دەکا
چونکە هەر ئەربابی عیلمە گەر بکا چارەی مەرەز
کورد ئەگەر عەقڵی ببێ جێگەی عولووم ئاوا دەکا
ئێستە بێ عیلم و هونەر ژینی بەشەر قابیل نییە
چۆن لە فەننی عەسری حازیر کوردی ئیستیغنا دەکا
ئەورووپا کەشفی لیسانی هێستر و بارگیری کرد
تازە کوردستانی ئێمە باسی ئەلفوبا دەکا



لەم شیعرەدا ڕەفیق حیلمی ڕوو دەکاتە لاوانی کورد و ئامۆژگارییان دەکا. ئەم شیعرەی لە کاتێک وتووە کورد دەسەڵاتی سیاسی گرتۆتە دەستی خۆی، بەڵام لە ڕووی خوێندەواری و ڕۆشنبیرییەوە لەو پلەیەدا نەبووە بتوانێ پارێزگاری ئەو دەسکەوتە بکا. لەبەرئەوە شاعیر هانی لاوان دەدا لەو کاتەی ئەورووپا کەشفی زمانی ئاژەڵی کردووە، لای ئێمە تازە هەوڵی نووسینەوەی ئەلفوبێی زمانی کوردی دەدرێ.

٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «یا پیری تەریقەت» شاعیر دەڵێ:

فیدای ئەو عەشقە بم بۆ مولک و میللەت
دەسووتێنێ فیداکارانی ئوممەت
ئەگەر بێتو نەبێ حورییەتی تام
وەتەن زیندانە گەر بشبێ بەجەننەت
خودایە کەی هەڵێ ڕۆژی سەعادەت
لەسەرمان لائەچێ دەیجووری نەکبەت
عەجەب لەو میللەتانەی موستەقیللن
چلۆن جاری دەبێ خوێنی حەمییەت
لە کام عەسرا لە کوێی دنیا وەکو کورد
کەسێ هەڵسا بکا ئیبرازی هیممەت
لە عەسری بیستەما مەستی فیداکار
جیهانی بەم سەباتە خستە حیرەت
ئیتر حەقمانە حورییەت وە یاخود
بەم ئەحواڵەش دەڵێن ئاساری وەحشەت
ئیلاهی خۆت دەسا لوتف و کەرەم کە
ببێ ئەم میللەتە نائیل بەڕەفعەت
سەباتی ئێمە مەعلوومی جیهانە
ڕەقیبان فیتنە ئەنگێزن حەقیقەت
حەسوودان ڕوو بەئێمە وەردەگێڕن
مەدەد یا حەزرەتی پیری تەریقەت

ئاوڕدانەوەییێکی سەرنج ڕاکێشەرە لە شاعیر کە ناوی شیعرەکەی ناوە «یا پیری تەریقەت» وەکو بڵێی لەگەڵ شێخی تەریقەت گفتوگۆ دەکا. هەروەها بەڕستەی «مەدەد یا حەزرەتی پیری تەریقەت» دوایی بەشیعرەکەی دێنێ. بەگشتی شاعیر باس لە هەڵسوکەوتی ئەو سەردەمەی کورد دەکا، مەسەلەی نیشتمانی و نەتەوەیی بەلایەوە ئەوەندە گرنگە ئەگەر بەرێگەی سیاسییەوە جێبەجێ نەبێ پێویستە بەرێگەی خەیاڵی سۆفیزم بگاتە ئەنجام، شاعیر ناچار دەبێ پەنا دەباتە بەر شێخی تەریقەت، چونکە ئەوەی بەکەس ناکرێ بەو شێخە دەکرێ، لەبەرئەوە یارمەتیی لێ داوا دەکا. ئەمە ئاوڕدانەوەییێکی هونەروەرییانەیە لە داهێنانی شیعردا.

### ٣

ڕەفیق حیلمی پارچە شیعرێکی نووری شێخ ساڵحی کردووە بەچوار خشتەکی:

لە دونیادا چ قەومێکە بکا میللییەتی ئیهمال
جیهانی پڕ جیدالە ئێستە بۆ تەئمینی ئیستیقلال
(خودایا بەسیە ئیتر لابرێ دەیجووری ئیزمیحلال)
(تولووعی پێ بکەی خورشیدی زۆر پاکی ئیستیقبال)
لە ڕێی حوررییەتا شەرت بێ بگاتە ئاسمان شینم
هەر ئیستیقلالە مەقسوودم هەتاکو باقییە ژینم
(لەگەڵ خولیایی هیجرەتدا بەسەرچوو عومری شیرینم)
(دەسا نۆبەی ویساڵە ئاه ئەی ئومێدی ئیستیقلال)
شەوی دەیجووری نەکبەت دوورکەوی یارەب لە کوردستان
سەفایی باغی جەننەت دەرکەوی یارەب لە کوردستان
(ئیتر سنجاقی میللەت سەرکەوی یارەب لە کوردستان)
(ئەوا نۆبەی ویساڵە لە ئاه ئومێدی ئیستیقلال)
مەعاریف ئێستە ئەتفالانی میللەتمان ئەکا تەنویر
مەلیک مەحموودی ئەووەل خۆی بەعەزم و هیممەت و تەدبیر
(ئوموری مولک و میللەت تا نیهایەت گەر بکا تەدویر)
(ئیتر نۆبەی ویساڵە ئاه ئەی ئومێدی ئیستیقلال)



ئەم شیعرە بۆ پیرۆزبایی دەرچوونی ڕۆژنامەی «ئومێدی ئیستیقلال» (١٩٢٣) لە لایەن نووری شێخ ساڵحەوە نووسراوە و ڕەفیق حیلمی کردوویەتی بەچوار خشتەکی. هەردوو شاعیر لە خۆشییانا وەختە باڵ بگرن، لە زەماوەندی دەست خستنی سەربەخۆیی نازانن چی بکەن! نووری دەڵێ کاروبار بۆ چاکەی میللەت ڕێک بخەن، ڕەفیق حیلمی ڕوو دەکاتە مەلیک مەحموود و داوای لێ دەکا دڵسۆزانە کۆشش بکا بۆ ئاسانکردنی باری ژیان و گوزەرانی خەڵکی.

**بۆ شێخ مەحموود**

لە کاتی خۆیدا بەهۆی کۆچی دوایی شێخ مەحموودەوە کامەران موکری شیعرێکی ماتەمی بۆ هۆنیبووەوە. ئەو شیعرە بووە سەرچاوەی ئیلهام بۆ ڕەفیق حیلمی بۆ ئەوەی وەرامی بداتەوە. لەم ماوەیەدا لیریکەکەی ڕەفیق حیلمی بەناوی «بۆ گیانی پاکی شێخ مەحموودی نەمر» گوڵبژێر دەکرێ. شاعیر دەڵێ:

کامەران گیان! کامەران بی
بۆ ئەو شینە زۆر بەسۆزەت
ڕابەری گەلی کوردان بی
بەو پێنووسە زۆر پیرۆزەت
بەلام گیانە باش بزانە
بەهەڵەچووی بەو شیعرانە
شێخ مەحموودی گەورەی کوردان
هەر زیندووە لە کوردستان
ئەڵێن مردووە نەمردووە
ئاخۆ بۆ کوێیان بردووە!

***

کەوا بوو ئەو شینەت لە چی
نەکەی تۆ بەهەڵە نەچی
شێخ مەحموود گەر بێتو بمرێ
تۆڵەی کوردان چۆن ئەسەنرێ!

لەم شیعرەدا ڕەفیق حیلمی ئەوە دەردەبڕێ شێخ مەحموود گیانێکە لە لایەن کردگارەوە لە پەیکەرێکی لە خۆڵ دروست کراو پارێزراوە، زیندوو و هەمیشەییە و هەرگیز لەناو ناچێ. لێرەدا شاعیر مەبەسی بیروباوەڕ و کردەوەیە نەک لەش ئەوەی لە خۆڵ دروست کراوە و دەبێتەوە بەخۆڵ.

ئینجا لەسەر شیعرەکەی دەڕوا و دەڵێ:

ئەو قارەمانە ئەو شێرە
قەت خوا نەکا کەم بێ لێرە
چەن جار گلا چەن جاریان کوشت
کەچی نەمرد نەمری کورد
جاری وا بوو وورد و درشت
پشتی تێ کەن ئەو لێ ئەبورد

لەم دێڕانەدا ڕەفیق حیلمی وێنەی شێخ مەحموود لە گەلی کورددا دەبینێ. ڕاستە هەموو تاکێک کۆتایی دێ، شێخ مەحموودیش بەلەش نامێنێ، بەڵام میللەتی کورد دەمێنێ. لەبەرئەوەی بەلای شاعیرەوە شێخ مەحموود میللەتی کوردە بۆیە نامرێ.

شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەلیریکەکەی دێنێ:

کاتێ گەیشتن بەئامانج
لە جێی دیاری لەباتی تاج
ئاڵای کورد بەرنە سەر قەبری
بەو جۆرە سا بگرن قەدری

***

ئەوسا ئیتر خوا هەڵناگرێ
فرمێسک ڕژاندن جێ ئەگرێ
چونکە ئەو قەبرە پیرۆزە
زیارەت ئەکرێت هەر بەم تەرزە

لەم دێڕانەدا شاعیر ئەوە دەخاتە ڕوو لە کاتێکدا کورد سەربەخۆیی تەواوی وەدەست بێنێ ئەو کاتە دەکرێ باوەڕ بەمردنی شێخ مەحموود بکرێ، چونکە لەو ڕۆژەدا ئاهەنگ دەگێڕدرێ بەهۆی ئەوەی ئاڵای کورد و تاجی مەلیکی دەبرێتە سەر گۆڕی.



## بۆ ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨

ڕەفیق حیلمی دڵی زۆر خۆش بوو بەهەڵگیرسانی کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووز و فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسم. بۆ ئەم مەبەسە ڕیزێک شیعری نووسیوەتەوە، دەمێک بوو لە شیعر نووسین کەوتبوو، یا کەم دەینووسییەوە.

١

لە یەکێ لە شیعرەکانیدا بۆ پیرۆزبایی ئەو ڕووداوە دەڵێ:

کوردەکان! هەستن بەجارێ ئیمڕۆ ڕۆژی خزمەتە
مل لە کۆتە و دەس لە زنجیرا نەماون فرسەتە
ڕۆژی ئازادی هەڵات و وا بەسەرچوو ڕۆژی ڕەش
بێتو ووریا بین لە دەس ناچێ ئیتر ئەم نیعمەتە
ساڵەها بوو گەل لە ژێر پێوەند و کۆتەی دیلییا
بیری ڕزگاری نەما ڕاهات بوو بەم زیللەتە
ئەو کەسانەی ناوی خۆیان نابوو دەستەی حاکمان
قەت نەیانزانی کە قەومێ کوشتنی زۆر زەحمەتە

ئەو قسە ڕاست و بەجێیانەی شاعیر لە دڵسۆزییەوە هەڵقوڵاون. زۆربەی خەڵکی عیراق لەسەر ئەم بیروباوەڕە بوون، تا ڕەفیق حیلمی خۆشی دەڵێ وریا بن، ئەم هەلە لە دەست مەدەن، کەچی لە پاشانا هەلەکە لە دەست چوو. شاعیر لە دواییدا دەڵێ:

نایەوێ ئیتر بڵێم زوڵمێ نەما نەیکەن خەڵک
تۆڵەیێکی هەر ئەسەن خوا چونکە کاتی ڕەحمەتە
ئەو کەسەی وا بێ بەدڵیا زاڵمانی دەوری کۆن
ئیکە بەسیانە سزا خۆی موستەحەققی لەعنەتە

شاعیر ڕاست بۆ مەسەلەکە چووە، ئەوەی نەفامانە زۆرداری دەکا چۆن بیر لەوە ناکاتەوە کردەوەی خراپ هەمیشە سەرناگرێ. دەبێ ئەوەش لە بیر نەچێتەوە ئەوەی دەڵێ هەڵگیرساندنی شۆڕش لە پارێزگاری کردنی ئاسانترە ڕاست دەکا، لەبەرئەوەیە زۆربەی ئەو شۆڕشانە خۆیان دەخۆنەوە.

## ٢

لە شیعرێکی دیکەیدا ڕەفیق حیلمی لە بابەت ئەو ڕووداوەوە دەڵێ:

ئۆخ چەن شیرین بوو ئەو دەنگە
دەنگی ئێسگەی چواردەی تەمووز
ئەڵێم ساڵ دوازدە مانگ خۆزگە
تەمووز ئەبوو بەڵێ تەمووز
جومهورییەت کە گەل هەموو
بۆ ئەم ئامانجە بەرزە بوو
ساڵەهای ساڵ وورد و درشت
خوێنی گەرم و گەشی ئەڕشت
قوتابی مامۆستا ئەفسەر
گەلی عیراق پاکی یەکسەر
بەشەو و بەڕۆژ بەبێ ووچان
تۆوی شۆڕشیان بۆ ئەچان

ئەو شیعرانەی ڕەنگدانەوەی هەست و نەستی زۆربەی خەڵکی عیراق بوون. شاعیر لە بابەت گەورەیی ئەو ڕووداوە دەڵێ خۆزگە ناوی هەموو مانگەکانی دیکەی ساڵ ون دەبوون و تەنیا تەمووز دەمایەوە چونکە ئەم بەسەرهاتە گەورەیەی لێ ڕووی داوە.

شیعرەکە بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

جومهورییەت دیموکراسی
ڕێگەی ڕاستی بەگەل ناسی
ئیتر بەسەگی جرتاوە
پاس ناکرێ کونەماسی
کورد و عەرەب سا بەبێ غەم
بچریکێنن پڕ بەیەک دەم
بلێن عەبدولکەریم بژی
بژی بژی بژی



شاعیر قسەی نەستەقی کوردی «سەگی کونە ماسی پاسی جرتاوە دەکا» ئاخنیوەتە ناو ئەم شیعرەوە. کونەماسی و جرتاوە ناوی دوو ئاوایین لە ناوچەی سلێمانی، سەگی یەکێکیان سۆزی بۆ گوندەکەی خۆی نییە پاسی گوندەکەی دیکە دەکا. لە ناوەڕۆکی شیعرەکە ئەو ڕاستییە دەردەکەوێ مەبەسی شاعیر ئەو وڵاتانەیە لەو ڕۆژگارەدا لەگەڵ دەوڵەتە ئەمپریالیستەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا بوون لە دژی عیراق. بەتایبەتی جەمال عەبدولناسیری میسر هەوڵی بێ وچانی دەدا بۆ بەستنی یەکێتی لە نێوان میسر و سووریا و عیراق لە پێناوی دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبی یەکگرتوو.

لێرەدا ڕەفیق حیلمی خاوەن هەڵوێست بوو وەکو کوردێک، سێ ساڵ لەمەوبەر (١٩٥٦) لە ماوەی دەستدرێژییە سێ قۆڵییەکەی بەریتانیا - فەرەنسا - ئیسرائیل بۆ سەر میسر جەمال عەبدولناسیر بەلای ڕەفیق حیلمییەوە قارەمانی گەورەی ڕۆژهەڵات بوو، کەچی لە مەسەلەی دژایەتی بەرامبەر بەعیراقی پاش ١٤ی تەمووز ڕەفیق حیلمی لە دژی عەبدولناسیر و سیاسەتی میسر وەستا. ئەو کابرا عەرەبە شۆڤێنییە هەر لە بنەڕەتدا دانی بەمافی تەواوی میللەتی کورد نەهێناوە.

***

ڕەفیق حیلمی ڕۆشنبیر و سیاسی و نووسەر و شاعیری گەورەی کورد بوو لە نیوەی یەکەم و ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا. کارە زانستی و داهێنراوە ئەدەبییەکانی لە مەیدانی مێژوو و ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسەت نامەخانەی کوردییان ئاوەدان کردۆتەوە. ڕەفیق حیلمی کەسێکی ئاشتیخواز بوو، دەیویست دیموکراتییانە هەموو کێشەیێک چارەسەر بکرێ. لە پەروەردە دەوری گرنگی هەبوو، زۆربەی ژیانی وەک مامۆستای قوتابخانە بەسەر بردووە. کەسێتیی تایبەتی خۆی پاراست بوو، سەری بۆ ئەوانەی بەناو لە خۆی گەورەتر بوون دانەدەنواند، دۆستی لە خۆی بچووکتر بوو، بەبێ قوتابی هەڵنەدەکەوت.

لە ئەدەبی کوردیدا جێ پەنجەی دیارە وەک مێژوونووس و ڕەخنەگرێکی ئەدەبی کوردی. هەروەها وەکو شاعیر و نووسەرێک بەرهەمی بەپێزی هەیە لە شیعر و وتاری پەخشانی هونەری.

# بەشی بیست و شەشەم

## قانیع

## ١٨٩٨ – ١٩٦٥

### ژیانی

محەمەد کوڕی شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ سەعیدی دۆڵاشی. دۆڵاش ناوچەیێکە لە مەریوان. لە تاکێکیدا بەم جۆرە خۆی بەخەڵکی دەناسێنێ:

لە ئەسلا خەلقی دۆڵاشم مەریوان شوێنی ئەجدادم

محەمەد (کابلی)م ئەمما تەخەللوس (قانیع)م ناوە

محەمەدی شێخ عەبدولقادر لە ڕۆژی ٥ی ئەیلوولی **١٨٩٨** لە گوندی کەولۆسی ناوچەی مەریوان لە دایک بووە. لە تەمەنی دوو ساڵی بووە کە دایکی و لە تەمەنی دە ساڵی بووە کە باوکی کۆچی دواییان کردووە. لەم تەمەنە بچووکەدا دەستدرێژی و زۆرداریی دەرەبەگ بۆتە هۆی ئاوارەیی و دەربەدەری. باوکی قانیع لە چینەکانی ناوەڕاستی کۆمەڵ و خاوەن زەویوزار بووە. دەرەبەگی گەورە و خاوەن دەسەڵات زەفەریان پێ بردووە و زەوییان داگیر کردووە. قانیع لەم بابەتەوە دەڵێ:

هەژاری پیشەمە تا ماوە عومرم

لە دەستی جەردەکانی کانی سانان

ئەمە هۆیێکی گرنگ بووە لە دواییدا قانیع ببێ بەدوژمنی دەرەبەگ و دەوڵەمەندان. لە دوای مردنی باوکی ئاغا سەید حوسێنی چوڕی گرتوویەتییە خۆی و لەبەر خوێندنی داناوە. بەدەربەدەری هەندێکی خوێندووە، بۆ یەکەم جار هاتۆتە شارەزوور، لەو ماوەیەدا وشەی «قانیع»ی کردووە بەنازناو. لە سەردەمی خوێندنیدا لە جێیێک ئۆقرەی نەگرتووە. بۆ مەبەسی خوێندن لە حوجرەی مزگەوتەکانی سنە و بانە و سەقز و بۆکان و شنۆ و کۆیە و مەهاباد (سابڵاغ) و هەولێر و کەرکووک و کرپچنە و پێنجوێن و سلێمانی و بیارە سووڕاوەتەوە. هەرچەندە قۆناغێکی زۆری خوێندنی حوجرەی بڕیوە، بەڵام حەزی بەمەلایەتی نەبووە و ئیجازەی دوازدە زانستییەکەی ئایینی ئیسلامی وەرنەگرتووە.

دوا قۆناغی خوێندنی لە سلێمانی بووە، بەهۆی مردنی مێردی خوشکییەوە، ئەو کاتە لە سایەی ئەو بووە، بەناچاری وازی لە خوێندن هێناوە. زۆربەی ژیانی لە گوندی ڕیشێنی شارەزووری بناری هەورامان بردۆتە سەر. بۆ پارووی نان و گوزەرانی خۆی هەموو کارێکی کردووە: کرێکاری، قۆڵچی دارستان، مەلایەتی، مامۆستای قوتابخانە، جووتیاری، وردەفرۆشی، چایچییەتی، دارفرۆشی، ئاشەوانی، چاوەشی کرێکاران.

لە سەردەمی فەقێیەتیدا حەزی لە کچێک کردووە، بەڵام بۆی نەبووە. ئەمە بووە بەسەرچاوەی ئیلهامی شیعری. لە ڕۆژانی سەردەمی ماوەی زێڕینی بەختی کورد لە ڕۆژگارانی جەنگی دووەمی گێتی و دامەزرانی کۆماری کوردستان سەری لە مەهاباد داوە، لە بەرێوەبەرایەتی پەروەردە کاری پێ سپێرراوە. لە دوای کوودیتای ١٤ی تەمموزی **١٩٥٨**ی بەغدا لە شارەزوور گیراوە و خراوەتە بەندیخانەی شاری عەمارە لە باشووری عیراق. بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی **١٩٦١** لە ترسی دەسەڵاتی عیراق چۆتەوە مەریوان، بەڵام لە دەسەڵاتی ئێران ڕزگاری نەبووە، بەناوی بیری کوردایەتییەوە گیراوە و ماوەیێک لە بەندیخانەی قەسری قەجەر لە تاران زیندانی کراوە.

قانیع لە ڕۆژی ٧ی مایسی **١٩٦٥** لە گوندی لەنگەردێ لە ناوچەی شلێری سەر بەپێنجوێن کۆچی دوایی کردووە.

### شیعری

#### لە ڕووی ڕوخسارەوە

قانیع دەسکاری مەرجەکانی شیعری کلاسیکی نەکردووە لە ڕووی ڕوخسارەوە. ژانر و بابەتەکانی پاراستووە، هەردوو جۆرە کێشی عەرووزی و سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە، لە بەحرەکانی عەرووزدا دەوڵەمەندە، کێشەکانی هەزەج و ڕەمەل و موزاریع و خەفیف و ڕەجەز و موتەقاریبی وەرگرتووە.

لە قافیەدا ئەم دەنگانەی بەکارهێناوە: ا ب ت ج چ خ د ر ز ژ س ش ع ق ک ل م ن و ۆ (ە – ـە) ی ێ. وەکو لەم تیپانە دەردەکەوێ شاعیر دەنگە تایبەتییەکانی ئەلفوبێی عەرەبی وەرنەگرتووە کەچی هەندێ لە تیپە تایبەتییەکانی ئەلفوبێی کوردی بەکارهێناوە.

لە پاش قافیەدا قانیع دەوڵەمەندە. بەزۆری ئەم وشانە لە شیعریدا کراون بەپاش قافیە: ئەکا، کا (بکا)، ناکا، دەب دەب، کچ، پووچ، شۆخ، باغ، کورد، بەس، هەس (هەیە)، شەرع، بووم، کوردم، ئەکەم، چی بکەم، ناکەم، نادەم، کردم، کەم (بکەم)، نەکەم، لێدەم،

خۆم، مىن، ئەمڕۆ، تۆ، بوو، بۆچییە، هەیە، گەرەکە، چییە، نییە، ئەدیبی، بی (ببێ)، چی، کوانێ.

قانیع غەزەل و قەسیدەی ئاسایی شیعری کلاسیکی زۆرە، هەموو مەرجەکانی ئەم جۆرە شیعرەیان تێدا هەیە. لێرەدا داهێنان و نوێکردنەوەی لە بەرچاوە بەوەی غەزەل و قەسیدەکەی کێشی عەرووزییە، بەڵام قافیەی مەسنەوییە. هەرچی شیعرە خۆماڵییەکانیەتی هەموو کێشەکانی ئەم بابەتەی بەکارهێناوە. دە برگەیی لە هەموویان زیاترە. لەم بەشە شیعرەشیدا قانیع تازەکردنەوەی هەیە. لە ناو شیعریدا یەکێتیی قافیە بەرچاو دەکەوێ. ئەم دیاردەیە تایبەتی نییە بەقانیع، شاعیرانی دیکەش هەیانە بەڵام کەمە.

قەسیدەی بەندی پێنجین (ا ا ا ا ب) لە دیوانی قانیعدا زۆرە، قەسیدەی بەندی شەشینی (ا ا ا ا ا ب) کەمترە. لە پێنج خشتەکیدا هەندێ شیعری حەمدی و بێکەس و مفتی پێنجوینی و فەریقی کردووە بەپێنج خشتەکی. جگە لەمانە لە دیوانیدا بابەتی چوارین و تاک دەبینرێن. لە شیعری قانیعدا هەندێ گەمەی هونەریی هەیە شاعیرانی دیکە بایەخی ئەوتۆیان پێ نەداوە وەکو ئەوەی شیعری بەزمانی کەسێکی لاڵەوە داناوە یا شیعری بێ نوختەی هۆنیوەتەوە.

### لە رووی ناوەرۆکەوە

ئاسۆی شیعری قانیع فراوانە، گەلێ لایەنی گرنگی ژیانی ئادەمزادی گرتۆتەوە. وەکو شاعیرانی دیکە مەبەسی سەرەکی شیعری قانیع دڵداری و کوردایەتی و وێنەگرتنی ژیانی نالەباری کۆمەڵە. لەوەوە دەرباز بووە بۆ هەندێ دیاردەی گەورە یا بچووک وەکو شاعیرێک توانیویەتی هونەرێکی لێ دروست بکا وەک کارێکی ئەدەبی پڕ لە جوانکاری بکەوێتە بەرگوێی خوێنەر. هەوای درامی لە شیعری قانیعدا دەبینرێ. بایەخی بەلایەنی تراجیدی داوە و لایەنی کۆمیدیشی پشتگوێ نەخستووە، لە گاڵتە و گەپ و پێکەنین بەدوور نییە. ئەمەی زۆرتر بۆ گاڵتەکردن بەدەرەبەگ و دەوڵەمەند و کاربەدەستان بەکارهێناوە. ئەم هەموو وێنە ژیانییانە لە شیعریدا بوونەتە هۆی ئەوەی قانیع لە لایەن خەڵکی کوردەوە خۆشەویست بێ و ڕێزی بگیرێ.



### جێگەی قانیع لە ئەدەبی کوردیدا

شیعری قانیع جێگەی دیار و تایبەتیی خۆی هەیە لە ناو دڵ و دەروونی خەڵکی کورد، چونکە ڕەنگدانەوەی هیوا و ئامانج و خەون و خەیاڵی ناوەوەیانە. قاڵبی کۆنی بۆ مەبەسی تازە بەکارهێناوە، دەستی درێژی هەیە لە بەمیللی کردنی بەرهەمی ئەدەبی لەبەرئەوە خوێنەری زۆرە، خەڵکی چێژی لێ وەردەگرن بۆیە چەپڵەی بۆ لێ دەدەن، لەبەرئەوەیە بەڕاستی شایانی ئەوەیە بەشاعیری میللی و چەوساوەکانی ناو کۆمەڵ ناوی ببرێ.

شیعری قانیع ڕەنگدانەوەی شیعری میلليی نووسراو و شیعری میللی سەرزارە. شیعرە عەرووزییەکانیشی لەگەڵ شیعری میللی گونجاندووە. بەگشتی بەرهەمی شیعری سەرچاوەییێکە ببێتە تێکست بۆ فێرکردنی زمان و ئەدەبی کوردی لە هەموو قۆناغەکانی قوتابخانەدا.

## گەشتی گوڵزاری دیوانی قانیع

### دڵداری

هەرچەندە شیعری بیری کوردایەتی و کۆمەڵایەتی مەبەسی سەرەکییە لە بەرهەمی قانیعدا، بەڵام دڵداری جێگەی تایبەتی هەیە.

١

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

دڵ دەڵێ یاری تەڕ و شۆخ و جوانم گەرەکە
دۆشەکی نەرم و شل و دەستەمـلانم گەرەکە
نەزەری دوور و خـەیاڵی پـڕوپـووچم نـاوێ
خەمی ئەبرۆی سیەهی حەڵقە کەوانم گەرەکە
مەکر و ئەفسوونی ئەم و ئەو لە نەزەرما هیچە
بۆقی نەی دەنگی دمەک ساز و چەقانم گەرەکە
داو و تەزویری درۆزن بە چ کـارم نـایەت
زیرە زیری شەوی تاریک و نیهـانم گەرەکە

لابە تەسبیحی دووسەد دانە لە بۆ ئیشی ڕیا
قەهقەهی غونچە دەم و چاوی جوانم گەرەکە
گەر بڵێن کەیفی ئەتۆش هەرچیت ئەوێ حازرە بۆت
سمتی خڕتی شلکی دوختەری خانم گەرەکە
(قانیعی) ویردی شەو و ڕۆژی ئەمەش هەر ئەیڵێت
ڕوومەتی سوور و خڕی ئافەتی جانم گەرەکە

لەم شیعرەدا قانیع لە دڵداری سۆفیزم دوورکەوتۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نزیکیش نییە لە دڵدارییەکەی دیکە کە مەجازی پێ دەڵێن، بەڵام لێی نزیک دەبێتەوە و بەرەو شیعری کراوە (ئیرۆتیکی) دەچێ. وەسفی ئەو ئەندامانەی ژن دەکا کە لە خەڵوەتی ماچوموچدا خۆشی دەدەنە پیاو.

٢

لە شیعرێکیدا قانیع بەناوی خۆشویستنی کچ لە چاکەی دەگەڕێ و بەرامبەر بەو خراپەی کوڕ دەخاتە ڕوو:

کوڕ بەبێ شک هەوری تاڵە هەروەکو پەروینە کچ
کوڕ وەکو خاشاک و خارە سۆسەن و نەسرینە کچ
بۆ نەخۆش و دەردی عاشق دوکتەر و شافی کچە
کوڕ وەکو هەنگی دڕندە و شانەیی هەنگوینە کچ
خوێن ڕژانن مەیل ئەکەی فەرموو وەرە سەر سەیری کوڕ
دڵ بەڕەحم و لاشە نەرم و نازک و ڕەنگینە کچ
کوڕ کە زۆر چاک هەڵکەوێ فەرهادە یا مەجنوونی شێت
کچ لە پەردەی عیسمەتا لەیلایە یا شیرینە کچ
کچ کە کەوتە ڕاوە کوڕ ئاسانە کوڕ گرتن لە لای
بازی تەڕلان و تەوار و واشە وو شاهێنە کچ
گەر حەوا نەبوایە ئێستەش ئادەمێ بوو بێ وەجاغ
بۆ زیادی ئادەمیزاد مایەیی تەئمینە کچ
هەرکەسێ مەیل و خەیاڵی حیفزی ئیسلامی بکا
بۆ بەخێوی باغی ئیمان هەروەکو پەرژینە کچ



کچ کە وەختێ کوڕ ئەبینێ (قانیعی) پەیدا ئەکا
جا کەوا بوو کوڕ بە هیچ و قابیلی تەحسینە کچ

لە ڕووی ڕەوشتی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەوە ڕەنگە ئەم وێنانەی قانیع دڵگیر نەبن، کەچی لە ڕووی هونەرییەوە داهێنانی جوانیان تێدایە. لە پاشانا ئەو تەنیا لە ڕەوشتە خراپەکانی کوڕ و ڕەوشتە چاکەکانی کچ گەڕاوە، ئەگەر نا بەڕاستی لە کوڕ چاکە هەیە، لە کچیشدا خراپە هەیە. قانیع وێنە و تەعبیری شاعیرانەی داهێناوە لەم بەراووردەیدا لە نێوان کوڕ و کچ و بەرهەمێکی ڕەنگینی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

٣

لە کۆمەڵێک تاکدا قانیع نموونەی جوان لە لیریکی دڵداریدا دەخاتە ڕوو، لە یەکێکیاندا دەڵێ:

ڕەقیب بۆیە شکاندی تای شوعاعی چاوی ئیدکم
هەتاکو کوێر ببم ئیتر، نەبینم بەژن و ڕوخسارت

ئەگەر تاهیر بەگ وتبێتی چارەنووس پەنجەی شکاندم بۆ ئەوەی وەسفی ڕوخسارت نەنووسم، قانیع وێنەیێکی دیکەی داهێنراوی لەم بابەتەی دروست کردووە. ڕەقیب ڕووناکی چاوی شکاندووە بۆ ئەوەی کوێر بێ تا بەژن و باڵای دلبەر نەبینێ.
لە تاکێکی دیکەیدا دەڵێ:

ئەگەر دلبەر زەکاتی نازی خەندەی خۆی بەمن بەخشی
تەسەللام دێ کە مەرجە بۆ هەوێنی شیعری دڵداریم

شاعیر دەزانێ دلبەر نازونووزی بەرامبەر نییە، ئەگەر کەمێکی بداتێ، واتە زەکاتی ئەو ناز و خەندەیە بەشی دەکا و دەبێتە سەرچاوە و هەوێنی شیعری دڵداری.

## کوردایەتی و نیشتمانپەروەری

گیانی کوردایەتی لای قانیع لە پێناوی سەربەخۆیی کوردستان وەک بیر و ئەخلاق تێکەڵ بەڕەگ و ڕیشە و خوێنی بووە، لە پەیکەری مەتریاڵی شاعیر جوێ نابێتەوە و لەناوچوونی بۆ نییە. کۆمەڵێک شیعر بەم مانایە کەوتوونەتە ناو دیوانی شیعرییەوە.

١

له شیعرێکیدا قانیع دەڵێ:

من کـه کـوردم با بنووسم دەفـتـەر و دیوانی کـورد
تا بەلەد بن ئەو کـەسـانـە مـوددەعین مـیـزانی کـورد
هەرکەسێ ئەسپی ئەزەل تاو دا لەسەر عەرسەی فەنا
پێ بنێـتـە بەزمگاهـ و مـەعـرەکـەی مـەیدانی کـورد
کێ دەڵێ نەم چەشـتــووە نووکی ڕمی کـوردی نەژاد
ڕانی دەرخـا تا ببـینم داغـمـەیی شـێـرانی کـورد
قـوڕ بپێوێ دایکی ئەو شەخسە ئەڵێ من موددەعیم
چۆن خەلاسی بۆ ئەبێ هەرگیز لە دەس مەردانی کورد
ئاشکرایە هەوڵـی کـورد ئەمـڕۆ بە بانگی بەرز ئەڵێم
بێن تەماشاکەن عەزیزم مەکتەب و عیرفانی کورد
سـەیری لبنان و گـەڕانی چین و مـاچین بۆ بکەم
تا ببێ بەفراو و مێرگ و چیمەن و کوێستانی کورد
مـەزهەری لوتفی خودایە خـاکی کـوردان (قـانیع)ـا
تۆ ئەزانی چی بنووسی دەفـتـەر و دیوانی کـورد

لەم شیعرەدا قانیع سوورە لەسەر ئەوەی دەبێ لەسەر کورد بنووسێ، بۆ کورد بنووسێ. بەو شـیعـرە دەتوانێ بەرامبـەر بەدوژمنانی کـورد بوەسـتێ چونکە زانست و زانیـاری و قوتابخـانە گەیشتـوونەتە پلەیێک بەهۆی ئەوانەوە کورد لەسەر خۆی بکاتەوە. سروشتی جوانی کوردستان لە لبنان و چین خۆشترە و ڕەنگی لە شیعرا داوەتەوە.

٢

له شیعرێکیدا ڕوو دەکاتە نیشتمان و خۆی بەقوربانی دەکا:

ئەگـەر مـردم وەتەن لاوانی تۆ خـۆش
ئەگـەر هیـتلەر نەمـا گـاوانی تۆ خـۆش
مـوخـەییـەر بم لە بەینی تۆ و بەهەشـتـا
لە جـەننەت دوور ئەبم سـەیرانی تۆ خۆش



هەمـوو حـووری مـوبارەک بێ بەزاهیـد
لە بۆ من هەر کچ و غـیلمـانی تۆ خـۆش
بەمن چی سـەیری باغ و قـەسـری لبنان
وەتەن سەحرا و کەژ و کێـوانی تۆ خۆش
ئەگـەر دنیـا نەمـا یەکـسـەر بەجـارێ
وەتەن گەرمیان و هەم کوێستانی تۆ خۆش
ئەگەر نەفعی خوسووسیت تیا نەمێنێ
مـوبارەک بێ وەتەن دەورانی تۆ خـۆش
ئەگـەر خـۆ (قـانیـعی) ئەمـڕۆ نەمـێنێ
وەتەن! ڕەببی وەتەن خـواهانی تۆ خـۆش

لەم شیعرەدا قانیع هەموو گەردوون لە نیشتمانی کورد کۆدەکاتەوە، واتە ئەگەر گەردوون نەمێنێ پێویستە کوردستان بمێنێ. هەموو شتێکی سەر ڕووی زەوی باڵاگەردانی نیشتمان دەکا. دەکـەوێتـە بەراوورد هەندێ وێنەی مـەتریاڵی وەردەگـێـڕێتـە سـەر وێنەی شـیعـری داهێنراو. هیـتلەر بەقوربانی گاوانی کورد دەکا، سەیرانی کوردستان لە بەهەشت خۆشترە، کچ و کوڕی کـورد خۆش بن، حووری بەهەشت پیرۆزی سۆفی بن. لە سـەرووی ئەم هەموو قوربانییانە ئەگەر قانیعیش نەما نیشتمان خۆش بێ.

٣

له شیعرێکیدا دەڵێ:

کـه من بۆم دەس نەدا ڕەندی دەسا تەقوا نەکەم چبکەم
ئەسـیـری زولفی تاتاتم کـە واوەیلا نەکـەم چبکەم
لە کـونجی سـەومـەعـەی زوهدم هەزاران شـێخ شاگـردە
لە شێخ بەدتر هەموو سەرفی قەدی تەرسا نەکەم چبکەم
ئەڵێن مـەجنوونی زوو شـەیدا بەباڵای سەوڵـی لەیلا بوو
منی شـەیدا فـیـدای باڵات ئەگـەر لەیلانەکـەم چبکەم
نە مـەحـویم تاکـو مـەحـوو بم نە نالیم تا بناڵێنم
بەشۆری شـیعـری شـیرینم فـەلەک شەیدا نەکەم چبکەم

لە ئەوسافی سەلاحەددین قەڵەم ماندوو بووە ئەمجا
ئەگەر وەسفی خورافاتی کوڕی کیسرا نەکەم چبکەم
خەیاڵم وایە بیری دڵ لە عوودی سینەما دەرخەم
لە بۆ ئەم هۆزە جێماوە دەنگێ بەرپا نەکەم چبکەم
لە گۆشەی باغی کوردستان هەزار (قانیع) بەبولبول بوو
لەباتی باغەوان ئەمڕۆ کە خۆم ڕیسوانەکەم چبکەم

دیباجەی ئەم شیعرە ئەوە دەگەیەنی قانیع دەیەوێ خۆی وەکو دڵدارێکی گێتیی سۆفیزن بخاتە ڕوو. هەندێ وشە و زاراوەی ئەدەبیی سۆفیزم بەکار دێنێ، بەڵام خۆی پێ ناگیرێ و گورج باز دەداتە ناو سامانی نەتەوەیی کورد. دەڵێ من شاعیری کورد مەحوی نیم تا مەحوو ببم، واتە لە ناو بچم، هەروەها نالیش نیم بۆ ئەوەی بناڵێنم. ئەوجا یادی سەلاحەدین دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە پاشانا بڵێ ئەگەر شیعر بۆ دواکەوتوویی کورد نەڵێم چبکەم! بەوێنەی هونەری ڕەنگێن کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ کە دەڵێ، لە باغی کوردستاندا ئەگەر قانیع بلبل بێ باغەوان ئەگەر خۆی ڕیسوا نەکا بۆ دواکەوتوویی کورد چبکا!

قانیع کە ئەم شیعرەی بۆ هاتووە، شیعرە بەناوبانگەکەی مەحوی لە خەیاڵیدا بووە، ئەوەی ئەم دێڕە سەرەتاکەیەتی:

بە نووری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چبکەم
بە شەمعێکی وەها چاری شەوێکی وا نەکەم چبکەم

٤

لە شیعرێکیدا قانیع دەڵێ:

کوردە چۆن نەگریم هەمیشە بۆ کزی و داماوی تۆ
چۆن قوڕی عالەم بەسەر خۆدا نەکەم بۆ ناوی تۆ
ڕەنگی زەردی جەرگی تۆیە من ئەسووتێنێ تەواو
شیعری من دەرمانی دەردە بۆ دڵەی زاماری تۆ
خوێنی تۆیە شەربەتی ڕۆژی جەلووسی ئەجنەبی
سەیری دوژمن کە لە شار و کووچە وو بازاڕی تۆ



سەوزە گیای کارێزی پاشا مێشکی باپیری منە
ئێستە وا فەرشە لە ژێر پێی دوژمنی خوێنخواری تۆ
ڕووحی بابانە لە گرد و مەقبەرەی سەیوان ئەڵێت
ڕۆڵەکانم! کێیە ئەو خەیمە لە ژووری شاری تۆ
لاوی کوردم! مردنت زۆر چاترە تا ژینی وا
ئەجنەبی بێت و لە گوێژە بێت بەفەرمانداری تۆ
خوێنی هاوخوێنت ئەڕێژی نۆکەری ئەگریتە دەس
هەی سەگم بەردایە زێڕ و لیرە وو دیناری تۆ
یادگاری هۆزی مادە داوەشێی بۆ مامەڵەت
لاپەڕەی مێژوو ئەنووسێ لەعنەت و ڕەفتاری تۆ
(قانیع)ا گوفتاری تۆ شیرینە یا شەکر و نەبات
کەتمی ناحەق بۆ بکەم شیرینترە گوفتاری تۆ

لەم شیعرەدا قانیع ڕوو دەکاتە کورد و بەجۆرێک بۆی دەلاوێنێتەوە وەک لە سەرەمەرگدا بێ. زۆرتر باس لە کردەوەی دوژمن دەکا و میللەت هوشیار دەکاتەوە چۆن دوژمنی بێگانە گردی سەیوان و شاخی گۆیژەی لە سلێمانی داگیر کردووە. شپرزەیی کورد دەگاتە ئەو پلەیەی قانیع قسەی پێ بڵێ: داوەشێی یەکێک یادگاری نەوەی میدیەکان بێ چۆن سەری بۆ بێگانە شۆڕ دەکا!.

٥

لە ساڵی **١٩٢٥** کەمالییە خوێنخۆرەکانی تورک کە قەسابخانەیان بۆ شۆڕشگێڕانی کورد نایەوە لە دیاربەکر، دوکتۆر فوئاد یەکێ بوو لەو نیشتمانپەروەرانەی لە سێدارە دران، بەیادی ئەو ڕۆژەوە قانیع ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە:

ئەی دوکتۆر فوئاد ئەی شێری نەمر
هەتا قیامەت بۆ کورد کەڵک گر
نەمردووی نامری نەخشی دڵمانی
ئێمە بولبولین هەر تۆ گوڵمانی
سەر تەقەکێشی نیشتمانپەروەری
لاوی دلێری کانی جەوهەری

هەرچەندە ئێستا لاشەت پەنهانە
زەخیرەی مێژووی بۆ ئەم زەمانە
قارەمانی گەل شێری ڕووی مەیدان
ئاخر لەسەر چی! وا تۆیان خنکان
بۆیە وا تۆیان هەڵکێشایە دار
کە هەوڵت ئەدا بۆ چینی هەژار
سووچت ئەو بوو کە فەرمووت کوردم
کوردی بەناموس بەدەستوبردم
سووچت ئەوە بوو فەرمووت نیشتمانیم
بیشم خنکێنن هەر کوردستانیم
سووچت ئەوە بوو دوژمن هۆز نەبووی
سووچت ئەوە بوو جاسووس کۆز نەبووی

پێش ئەوەی پەت بخرێتە ملی دوکتۆر فوئادەوە لەسەر قەنارە ئەم دێڕە شیعرە تورکییەی وتووە:

کیمدر بزی منع ایلەیەجک باغ جناندن
میرات پدردر گیرەرز خانە بزمدر

لە کاتێکدا محەمەد بەکر قوتابی ماجستێر بوو لە زانستگای سەلاحەدین لە هەولێر و نامەی ماجستێری لە بابەت کێشی شیعری کوردییەوە بوو، کە لە دیوانی قانیعدا چاوی بەم دێڕە تورکییە دەکەوێ، بەم جۆرە وەریدەگێڕێتە سەر زمانی کوردی:

کێ مەنع دەکا ئێمە لە گوڵزاری بەهەشتمان
میراتە لە بابمانەوە ئەم خانووە بۆمان

قانیع لەسەر دەستووری کلاسیکیی کۆن ئەم دێڕە شیعرە تورکییەی وەکو خۆی کردووە بەناوی شیعرەکەی. لە ئەدەبدا ئەم شیعرەی قانیع بەماتەمنامە دەژمێررێ. بەڵام بەڕاستی ماتەمنامە نییە، بەڵکو بەلای ستایشدا دەشکێتەوە. باس لە لاوچاکی و ئازایی و چاونەترسی و قارەمانیەتی دوکتۆر فوئاد دەکا. ئەو ڕۆشنبیرە کوردەی هەموو گیانی بریتی بوو لە نیشتمانپەروەری و خۆشەویستیی میللەتە دواکەوتووەکەی.

لەم ماوەیەدا پێویستە ئەوە ڕوون بکرێتەوە دوکتۆر فوئاد بۆچ ئەم شیعرە تورکییەی



وتووە و بەکوردی قسەی نەکردووە!. لە پێش هەموو شتێکدا کوردی باش نەزانیوە، بۆیە بەتورکی شیعری وتووە بۆ ئەوەی دەسەڵات بەدەست و ئۆردیانەکانی دەوری قەنارە لە قسەکانی بگەن. گرێی سایکۆلۆجی ئەم کوردە دڵسۆزە گەلێ دژوار بوو، تا لە دادگا قازیی تورک لێی پرسیوە تۆ کە زمانی کوردی نازانی بۆچ کوردایەتی دەکەی؟ وتبووی: من کوردم، لە نەزانینی زمانی کوردی ئێوە بەرپرسیارن، ئێوە قەدەغەتان کردووە.

### دانایانە لە کەموکووڕی کۆمەڵایەتی دەدوێ

قانیع دانایانە وێنەی ناگزووری و کەموکووڕی ناو کۆمەڵ دەدۆزێتەوە، کردەوەی دەسەڵات بەدەست لە دەرەبەگ و دەوڵەمەندان دەستنیشان دەکا. پەنجە بۆ هەندێ نەریتی دواکەوتووی ڕزیوی کۆمەڵ درێژ دەکا، وەک هەڵوێست بەرامبەر بەژن، باوەڕکردن بەشتی نادیاری وەکو جنۆکە و دێو و خێوی کە لەمە چێتریان پێ دەڵێن.

١

لە شیعرێکیدا ئەوە دەردەبڕێ کۆمەڵ بەشێوەیێک شڵەژاوە، چاکە خراپەیە، خراپە چاکەیە:

بێ حەیایی باوە ئەمڕۆ قوڕ بەسەرداکا حەیا
کەندەڵان بەر بەرز و شادە خۆی بشارێتۆ چیا
گوڵ ئەگەر عەقڵی ببێ قەت سەر لە خاک ناکاتە دەر
چونکە ڕۆژی دڕک و داڵە و گەرمی بازاڕی گیا
با لە هەورا سەرنگوون بن مانگ یا ڕۆژی جوان
شەمشەمەکوێرە ئەڵێ من نامەوێ شوعلەی زیا
ئەی فەلەک ڕاستۆ نەبی بۆ ڕێکوپێکی دەورەکەت
گورگ ئەبێتە شوانی ڕان و دز ئەبێتە ئەولیا
نێرەگا جووتێ ئەبەیتە ڕێزی لوقمانی حەکیم
فەیلەسووفێکیش ئەخەیتە ژێر چەپۆکی ئەشقیا
تۆ بە مێرووڵەی زەعیف ئیشی سلێمانی ئەکەی
خاتەمی مۆری نگینت کردە دەست دێوی هەیا

لەم شیعرەدا قانیع وێنەی جوانی هونەری دروست دەکا کە بەراوورد لە نێوان دوو شتی

پێچەوانەی یەکتریدا دەکا. کەندەڵان و شاخ، درک و گوڵ و هەندێ وێنەی دیکە. یەکەمی ئەوانە چاکە، دووەمیان بێ کەڵکە. ڕاستییەکەش ئەوەیە پێویستە پێچەوانە بێ. لە دوا دێڕی شیعرەکەیدا قانیع ناوی «دێوی هەیا»ی بردووە. ئەم ناوە دەسکردی خۆیەتی و قافیە ناچاری کردووە دێوێک دروست بکا ناوی «هەیا» بێ.

٢

لە شیعرێکیدا سێ دیاردەی گرنگ هەڵدەبژێرێ لە کۆمەڵی دواکەوتوودا نرخیان نییە:

سێ شتن ئەمڕۆ لە دنیا بێ وەجاغ و جێگەدار
شاعیران یەک عالمان دوو نیشتمانی کوردەوار
سێ شتن لەم دەورەدا هیچ شۆرەت و ناویان نییە
عەیبی دەوڵەتمەند و شیعری قانیع و مەرگی هەژار
وەک پلاوی خانەقا ئیسمێکی بێ جیسمن برا
یەک مرووەت دوو سەخاوەت سێ وەفای عەهد و قەرار
سێ نەخۆشی کەوتە دنیا هیچ دەوا و چاریان نییە
کیبر یەک بەرتیل دوو سێ موخلیسی پارە و دینار
سێ مەتاعی پڕ بەها ئەمڕۆ تەواو بێ قیمەتن
یەک شیعر دوو ڕاستی سێ حورمەتی خاک و دیار
بێ وەفایی لازمەی سێ تایەفەن لەم کاتەدا
دلبەر یەک کورسی دوو، سێهەم گوڵی غونچەی بەهار
سێ کەسن هەرگیز بەمەیل و ئارەزووی خۆیان نەکەن
(قانیعی) یەک، برسی دوو سێ بلبلی دێوانەکار

قانیع ژیرانە لە هەر دێڕێکی ئەم شیعرە سێ دیاردەی بەکەڵکی هەڵبژاردووە، کەچی لە ناو کۆمەڵدا نرخیان نییە. ڕەنگە لە زانستییەکانی مێژوو و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی ئەمانەی قانیع بیروڕای ئاسایی بن، بەڵام ئەو لە قاڵبی شیعری داهێنراو دایڕشتووە. لە دوا دێڕیدا ئەوە دەردەبڕێ سێ شت لە ناوەوەیە لە هەڵوێستێک دان، بەئارەزووی خۆیان نییە، یەکەمیان قانیع، دووەمیان کەسی برسی، سێیەمیان بلبلی شێتی گوڵ.



٣

لە لیریکێکیدا قانیع وەرامی ئەو کەسە دەداتەوە کە بەبێ کەس و ڕووتەڵە و ئاشەوان ناوی بردووە:

جەنابا! نامەکەت هات و گەیشتە دەس منی بێکەس
منت دانا بەکوردێکی هەژار و بێکەس و بێدەس
ئەگەرچی تۆ ئەنووسی ئاشەوانی فەخرە لام قوربان
کە چۆن ئەشعاری پڕ مانا و کەلامی گەوهەرینم هەس
ئەتۆ سامان و پارەی زۆر و کۆشکی بەرز و ڕەنگاوڕەنگ
منیش بێ قەوم و بێ عەشرەت قەسیدەی ئاگرینم هەس
ئەتۆ خنجێر و شمشێر و ڕم و نێزەت لە مەیدانا
منیش هەڵبەستی پڕ مانا و پەندی مەرهەمینم هەس
هەموو سامانی دنیا پێشکەشی تۆ بێ وەجاغ کوێری
منیش شا بەیتی ئاودار و هەزاران ئافەرینم هەس
کە تۆ مردی بەیەکجاری ئەبیتە مشتێ خاک و خۆڵ
منیش دوای مردنم ئینجا بزانە دەوری ژینم هەس
ئەتۆ نازت بەشەستێر و چەک و دینار و باغاتە
منیش نازم بەکوردان و بەکورد بڕوای متینم هەس

لەم شیعرەدا قانیع لەگەڵ ئەو دەوڵەمەندە دەدوێ کە بەچاوێکی نزم تەماشای هەژار دەکا. پێی دەڵێ تۆ هەموو شتێکی ژیانی بەختیارییت هەیە، کە بمری ون دەبی، بەڵام من شیعرم هەیە، قسەی جوانم هەیە، بڕوام بەمیللەتی خۆم هەیە، لە پاش مردن ناوم دەمێنێ.

قانیع وشەی «هەس»ی کردووە بەپاش قافیە، ئەم وشەیە بەمانای «هەیە» لە دیالێکتی ناوچەیی سنە (ئەردەڵان) بەکار دەهێنرێ.

٤

شێخایەتی تەریقەتی دەروێشیی بەمیرات دەمێنێتەوە لە شێخەوە بۆ منداڵەکانی، لەم لایەنەوە شاعیر دەڵێ:

کە شێخ وەفاتی فەرموو گەیشتە جێی نیهانی
شێخ زادە ئەو سەعاتە ئەبێتە غەوسی سانی

کەس نایە بۆ حیساب و کیتاب و ئیمتیحانی
چەسپاوی دەستی غەیبە نەجمە و نیشانی شانی

لەم چوارینەدا قانیع بەهەواییێکی کۆمیدیانە باس لە هەندێ نەریتی تەریقەتی دەروێشی دەکا. لە دوای مردنی شێخ بەبێ هیچ مەرجێک کوڕی گەورەی لە جێی دادەنیشێ. ئەمە نەخوێندەوار بێ، گێل بێ، کەم فام بێ گرنگ نییە، دەبێ تەکیە و خانەقا بەڕێوە ببا.

۵

قانیع لە هەڵوێستی خێزان و کۆمەڵ دەدوێ بەرامبەر بەکچ:

کچی بەستەزمان دەوری ژیانی
سینەمایێکە ئەگەر بزانی
کە لە دایک بوو ئاهەنگی نییە
ئەڵێن ئای کچە فائیدەی نییە
پێ پیرۆزانەی کەس بۆ ناهێنێ
هیچ کەس بەچاکە هەرگیز نایدوێنێ
پڕوپیرێژن دەوری دایکی ئەدەن
هەریەک بەجۆرێ دڵخۆشی ئەکەن
غەم مەخۆ خوا لەسەر کەرەم بێ
کوڕیشت ئەبێ خاترت جەم بێ
بۆ ئیشی ناوماڵ بۆ هاتوچۆی دەر
ئەمیش پێویستە لە جێی کارەکەر
سەد ساڵ نەخۆش بێ نابینێ دەرمان
لە جێی دڵخۆشی هەر چەپۆک لێدان
نابێ نان بخوا تا هەموو خێزان
نەچێتە دواوە لەسەر سفرەی نان
لە پاشان ئەمیش ئەگەر نەتۆرێ
لە پاش خوان بخوا و حاجەت بشۆرێ
ئەگەر بتۆرێ هیچ کەس نازانێ
بەبرسی ئەگری هەتا ئەتوانێ



لە ناو کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتدا بەگشتی وەکو یەک تەماشای کوڕ و کچ ناکەن. کوڕ مافی مرۆڤایەتی هەیە کچ نیەتی. ئەم نەریتە مێژووییە، لە دێرزەمانەوە هەیە، لە ئەنجامی دروستبوونی لەشی مرۆڤ لە ڕووی بیۆلۆجییەوە پەیدا بووە، لە پاشانا هەندێ بۆچوونی ئایینی کاری لێ کردووە و بەهێزتری کردووە، کوڕ بووە بەکارگەر و کچ بووە بەکار لێ کراوە. لەبەرئەوەیە لە دایکبوونی کچ جێی خۆشیی نییە، ئاهەنگی بۆ ناگێڕن، لە ناو ماڵدا بەچاوێکی نزم تەماشای دەکەن. ئەگەر برای هەبێ، بەتایبەتی تاقانەش بێ دەبێ «کاکە»ی پێ بڵێ هەتا ئەگەر لە خۆشی بچووکتر بێ.

٦

قانیع لە بابەت پێوەندی نێوان دەسەڵات بەدەست و ڕەنجبەری بێ نەواوە شیعری جوانی هەیە، لە یەکێکیاندا ڕەنجبەر هان دەدا ستایشی چەوسێنەرانی نەکا:

کاکی ڕەنجبەر لە کاتی گۆرانی
مەکە مەدحی ئەمیر و سوڵتانت
باسی هەوڵ و ژیانی ڕەنجبەر کە
باشترە تاکو وەسفی خانانت

ئامۆژگاری ئەوەیە ڕەنجبەر بەسەر شان و باهووی چەوسێنەرانی هەڵنەڵێ. ڕاستییەکەی ئەوەیە باس لە هەوڵ و تێکۆشینی خۆی بکا.

ئینجا قانیع ڕوو دەکاتە خۆی و دەڵێ:

نازی تۆ ئاغام لە ناو ڕەنجی منا پەرواز ئەبێ
ڕەنجی بازووی من نەبێ ئەم نازی تۆ بێ ناز ئەبێ

لەم دێڕە شیعرەدا قانیع ڕاستییێکی زانستی ئابووری دەخاتە ڕوو کە بەئاغای دەوڵەمەند دەڵێ: دەوڵەمەندی تۆ ئەنجامی ڕەنجی منە، ئەگەر ئەو ڕەنجە لە من نەدزی تۆ دەوڵەمەند نابی. ئەمە وەکو ئاشکرایە تیۆریی فەیلەسووفی سەدەی نۆزدەم کارل مارکسە (١٨١٧ – ١٨٨٣). لە ئەنجامی ئەم تیۆرییە سۆسیالیزمی زانستی دروست بوو.

## بووکی خەیاڵی خەونی هەرزەکار

قانیع شیعرێکی داناوە بەناوی «خاتوو شەیتان لە خەودا»، لە ناوی شیعرەکەوە ڕاستییێکی نالەبار دەکەوێتە ناوەوە. دیاردەیێکی ئاسایی لە دڵداری نێر و مێ وەردەگێڕدرێتە سەر کارێکی ناپەسەند.

هەرزەیێک لە خەونیدا بەبووکی خەیاڵی شاد دەبێ، خۆیان تێکەڵی یەکتری دەکەن. ئەو بووکە ئادەمزادە جوانە بەشەیتان ناودەبەن بۆ ئەوەی کوڕی هەرزە ببی بەتاوانبار.

قانیع بەم جۆرە شیعرەکەی دەست پێ دەکا:

ئەمشەو کە بەختم هاتە سەر شیرین جەماڵی وەک قەمەر
فنجانی مەم قەد نەیشەکەر پرسی لە وەزعی من خەبەر
هات زوو بەزوو کردی سەلام باڵا نەمامی خۆش کەلام
ووتم عەلەیکوموسسەلام ئەی دلبەری شیرین سییەر
حووریت وە یا جیننی و پەری سەروی وە یا نەیشەککەری
هێندە ئەزانم دلبەری باڵا بەچەشنی لیلوپەڕ
تۆ سووسەنی یا دەستە گوڵ یا داری مێخەک و سمڵ
ڕێگەت غەڵەت کرد یا بەدڵ هاتیتە لای دێوانە سەر
چاکی چلۆنی گیانەکەم! شەوقی دڵی بریانەکەم
باغی گوڵ و ڕێحانەکەم چۆن بوو کە هاتیتە سەمەر

قانیع خەونێک دەگێڕێتەوە، لەپڕ دلبەرێک پەیدا دەبێ، وەسفێکی هەستی مەتریالییانەی ئەندامە جوانەکانی لەشی دەکا. ئینجا کۆمەڵێک پرسیاری لێ دەکا. بەپاڕانەوە لێی دەپرسێ چۆن ڕێی ون کردووە و هاتۆتە لای دێوانەیێکی ڕووتەڵەی وەک قانیع. دلبەر وەرامی شاعیر دەداتەوە:

فەرمووی غەریبی دڵ بەغەم بێ ماڵ و مڵک و بێ درەم
گەر بێمە سەرباری کەرەم بێ فەرقە خاک وە یا گوهەر
هەڵسام لە بۆ ئیکرامی ئەو بۆ ئافەتی ئینعامی ئەو
منیش کردم سەلامی ئەو ڕوانیم لە پێ تا تەوقی سەر
دڵم بەترس و شەرمەوە دەروون بەئاهی گەرمەوە
چاوم لە تەوقی سەرمەوە پێم نا لە ئیشی پڕ خەتەر



کە دەستم خستە سەر ملی گوشیم دوولا ڕانی شلی
گەستم دوو چاوی پڕ کلی وەخت بوو کە ڕووحم بێتە دەر

بووکی خەون بەشاعیر دەڵێ کەسێکە حەز بەچاکە دەکا، لە یەکسانی دەگەڕێ، جیاوازی لە نێوان گەورە و بچووک ناکا، لە هەژار و دەوڵەمەند ناگەڕێ. ئەمە شاعیر هان دەدا لێی نزیک ببێتەوە، دەستی بۆ ببا، قۆڵی لە ملی بئاڵێنێ، بووک بەنازونووزەوە دەکەوێتە گفتوگۆ:

بەنازەوە لێم هاتە دەنگ مەکە و لاچۆ لێم کەوتە جەنگ
ڕوانیم کە ئەو گۆڕا لە ڕەنگ وەک پادشاهی تاجیوەر
فەرمووی دەلا ئەی بێ حەیا نە شێخی شێخ بی یا مەلا
نە زاهیدی نە ئەشقیا نە شاعیرێکی پڕ هونەر
نە ڕەندی نە قەڵەندەری نا فارسی نە بەربەری
کوردێکی پڕ دەردی سەری بێ قیمەتی وەک تووری تەڕ
تۆ فەقێی ماڵانگەڕی لار و درێژ و بێ فەڕی
کەی هاودەمی سەوڵی تەڕی هۆشت لە کوێیە بێ خەبەر

لەم دێڕانەدا دلبەر بەچاوێکی نزم تەماشای قانیع دەکا، بەکابرایێکی گەوجی بێ فەڕی عەمەلمەندەی دادەنێ، هیچ کار و کاسبییێکی نییە، جگە لەوە لە نەژاد و ئایینیشی دەکا ئەوە نەبێ بەکوردێکی دەربەدەری دادەنێ. قانیع لێرەدا مەبەسی ئەوەیە کەسی «ناکورد» ڕێز لە کورد نانێ تا دەگاتە بووکی خەیاڵ کە شەیتانی پێ دەڵێن، لەمەدا مەبەسی کوردایەتییە.

قانیع وازی لێ ناهێنێ، چونکە پێش ئەوە دلبەر ئەوەی پێ ڕاگەیاند کە لە دڵداریدا باوەڕی بەیەکسانی هەیە، ئینجا دەڵێ:

ووتم خانم لە ڕێی خودا ڕەحمێ بفەرموو بۆ گەدا
تۆ پادشا من بێ نەوا بەسییە ئیتر ناز و کەدەر
زانی کە من شێتی ئەوم دانیشت لەسەر جێگەی شەوم
حەرامی کرد خورد و خەوم من شەمع ئەو چەشنی فەنەر
دام کەند شەڕواڵی گوڵزەری دەرکەوت سوورینی مەرمەڕی
زاهیر بوو خەزنەی پڕ دوڕی هەی هەی چ گەنجێ کەوتە دەر!

هەستایە پێ حەیتەی زەلام لەو مەقسەدەی کردی سەلام
تێکەڵ بەیەکتر بوون تەمام وەک خەنجەر و کالانی زەڕ
ئەو کوێرە مارەی سەگ دەمە هێندە لە خۆی خاترجەمە
ئەتووت بەمۆری مەحکەمە نووسراوە بۆی بێ شۆڕوشەڕ
وەک گورزی دەستی لەندەهوور تاوێ لە دەر تاوێ لە ژوور
دڕی پەردەی گوڵباغی سوور کردی بەشیوەن و چەمەر

شاعیر ئەوە دەردەبڕێ کە شەیدای جوانیی ئەو نیگارینە بووە، وەسفی خەونەکەی دەکا چۆن لەگەڵ بووکدا دەچنە ناو یەکەوە. کە دەڕیێی گوڵگوڵی دادەکەنێ سمتی مەرمەڕی و خەزێنەی ناوگەڵی پڕ لە دوڕ و مرواری دەردەکەوێ، ئینجا هەستانی حەیتەی خۆی، ئیتر ئەم دوو شتە وەک خەنجەر و کالان دەچنە ناو یەکەوە و دەبێ بەئاژاوە و شۆڕش بەهەردووکیان پەردەی گوڵباغی سوور کون دەکەن. بووکی ئەم خەونانە کیژن و نەسمراون، لەو خەوەدا دەبن بەژن.

قانیع بەم جۆرە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

کاتێ کە هەستام لەم خەوە ڕوانیم کە هێشتا هەر شەوە
کردم لە بۆی شین و کەوە قورم پێوا تا تەوقی سەر
(قانیع) تۆ تەنیا و پڕ غەمی بێ عەشرەت و بێ هاودەمی
سەد کا زیاد بی هەر کەمی کۆتاکە باسی بێ سەمەر

لەم شیعرە ڕەنگینەدا وەکو خەونەکەی نالی کە بەمەستوورەی جوانەوە دەیبینێ، قانیعیش لەبەر هەندێ نەریتی کۆمەڵایەتیی کۆنەپەرست پاشگەز دەبێتەوە و ئەم کار و کردەوەیە بەبێ کەڵک دەژمێرێ.

## مەریوانی خۆشەویست

قانیع یادی ناوچەی مەریوانی مەڵبەندی ژیانی باب و باپیرانی دەکاتەوە:

برا خۆش بوو مەریوانم کە جێگەی جانی جانان بوو
نە جێگەی خەڵکی بێکارە و نە جێگەی جەوری دەوران بوو
مەساحەتگاه و مەیدانی درەتفێ جەننەتولمەئوا
زەل و زووزی زرێبارم بەعەینی باغی ڕیزوان بوو



نەسیمی سوبحی سەرمارۆ هەناسەی بەردی قاراوا
سەری گۆلبەندی میراجی تەماشاگاهی کەیوان بوو
گولاڵەی دەشتی دۆلاش وەنەوشەی گوێزەبەیخانم
لە چاوی بەد بەدووری کەی وەکو فیردەوس و غیلمان بوو
لە ئەربابی مەلا پرسن کە بەخشش تا چ ئەندازە
لە شێخ پرسن لە بۆ بێ تین چلۆن مەیدانی ئیحسان بوو
لە برقەی خەنجەر و وورشەی ستارخانی لە مل پیاوا
وەکو جەولانی ڕۆستەم بێ لە حەربی مولکی توران بوو
لە بۆ ئەربابی تەوقیع و بەجێ هێنانی موحتاجی
درۆ ناکەم ئەگەر بێژم لە دنیا کانی سانان بوو
بەتۆ چی (قانیع)! ڕۆژێ لە نەبوو بۆ تۆ بەکامی دڵ
لە سایەی جەهلی خزمانۆ لە بۆ تۆ حەفری نیران بوو

قانیع لەم شیعرەدا بەسەر هەندێ دیاردەی جوگرافی ناوچەی مەریوان هەڵدەڵێ و شانازی بەوەوە دەکا کە مەڵبەندی ژیانی باب و باپیرانی بووە، لەوانە یادی ئاوەدانییەکانی درەتفێ و زەل و زووز و دۆلاش دەکاتەوە، ناوی دیمەنە ڕەنگینەکانی گۆلی زرێبار لە دەشتی مەریوان و شاخەکانی سەر مارۆ و قاراوا دەبا، هاوینەهەواری گۆلبەند و سەروچاوەی کانی گوێزەبەیخانی لە بیر ناچێتەوە. بنەماڵەی شاعیر لەم هەموو بەهەشتەی خۆیان بێ بەش بوون لە ئەنجامی دەستدرێژیی دەرەبەگ و دەوڵەمەندانی کاربەدەست و هەندێ لە خزمەکانیشیان، لە زێدی خۆیان هەڵکەندران دەربەدەر بوون و شارەزووریان کرد بەمەڵبەندی ژیانی تازەیان.

لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەم شیعرەی قانیع شیعرەکەی شێخ ڕەزا دێنێتەوە یاد کە دەڵێ:

لە بیرم دێ سلێمانی کە دارولمولکی بابان بوو
نە مەحکوومی عەجەم نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو

## قانیع ئاگادار و هوشیار بوو

قانیع لەگەڵ کەم خوێندەواری و نەبوونی شارەزایی زۆر لە سیاسەت و مێژووی گشتی ئاگاداری ڕووداو بوو، بەزۆری ئەوەی پێوەندی بەکوردەوە هەبوو. هەندێ دیاردەی سیاسی و ڕووداوی مێژوویی و زانیاری گشتی لە شیعریدا ڕەنگیان داوەتەوە.

له چوارینێکیدا بەیادی برایەتی کورد و عەرەبەوە دەڵێ:

دەستە پاچە تێنەگەی لێم ئەی ڕەقیبی هۆزەکەم
میحنەتی تۆ فیکری قەومیمان لە بیر ناباتەوە
با من و تۆ پێکەوە هەردوو برا بین ئەی عەرەب
بێت و یەک بین موددەعی گۆوی هونەر ناباتەوە

لەم چوارینەدا شاعیر سوورە لەسەر ئەوەی برایەتی کورد و عەرەب دەوری مێژوویی دەبێ. لەو کاتەی شاعیر ئەم چوارینەی دانا و برایەتی پلەیێک بوو بۆ دەستخستنی هەندێ لە مافی نەتەوەیی و هەنگاوێک بوو بۆ گەیشتن بەهیوا و ئامانجی دوایی.

له چوارینێکی دیکەیدا دەڵێ:

حیلفی بەغدای شوومی فاشیستی کە هاتە گۆڕەوە
بۆ نیازی پڕ لە کینەی دوژمنی سەرشۆڕەوە
ماهەکی پەیمانی سەعداباده پەیمانی بەغا
خۆزگە میللەت ڕای ئەماڵی و شۆڕیەکردە گۆڕەوە

پەیمانی بەغدا (١٩٥٥) وەکو قانیع بۆی دەچێ زیندووکردنەوەی پەیمانی سەعداباد بوو (١٩٣٧). ئەم دوو پەیمانە لە نێوان دەوڵەتەکانی هاوسێی کورد یا چەوسێنەرەکانی میللەتی کورد و دەوڵەتە ئەمپریالیستەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەسترا بوو. لە ناوەرۆکیاندا لەسەر داوای هاوسێیانی کورد پەراگرافی وا بەرچاو دەکەوت بۆ بەربەرەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریی کورد دانرا بوون.

ئینجا لە تاکە شیعرێکیدا دەڵێ:

ئافەرم وەستا ڕەجەب بۆ سەنعەت و دەسکارەکەت
تۆپەکانت چەند قەڵای تورک و تەتەریان پێ شکان

وەستا ڕەجەب ئەندازیار و پسپۆڕی دارشتنی تۆپی جەنگی بوو لە سەردەمی میرنشینی سۆران لە نیوەی یەکەم و ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا جێی شانازی بووە لە لای قانیع، چونکە کاری ئەم وەستایە بەڵگەیێکی مێژوویی بووە بۆ ئەوەی کورد هەوڵی داوە ببێ بەخاوەنی دامودەسگای خۆی.



## گاڵتە و گەپ و گەمەی هونەری شیعری

قانیع شیعری بۆ هەموو سووچێکی ژیان بەکارهێناوە. بۆ بزە و پێکەنین و ڕابواردن، بۆ زاخاوی مێشک، بۆ گەمەی ڕەوانبێژی و قسەکردن لەگەڵ گوێ. کۆمەڵێک شیعری لەم بابەتەی هەیە دیوانی شیعری کوردی ڕەنگین کردووە.

١

لە شیعرێکیدا لاسایی لاڵێکی کردۆتەوە و بەزمانی ئەوەوە شیعری هۆنیوەتەوە:

کوکوکوردم ززوانم لەلەلاڵە تەتەواو
نەنەزانی مەمەمەماڵی کککردم خخراو
ڕەڕەفیقم سسواری ببببا بوون و منیش
ڕڕڕۆژی مەمەمەمەیدان کککەر دێنمە تاو
بۆ نەجاتی هۆهۆهۆزم لەلەباتی تتفەنگ
سسیواک ڕڕڕیش و کەکەکەشکۆڵی شکاو
لەلە لای خۆم مەمەلام و نەنەنەمزانی شتێ
غەیری باسی مەمەمار و قەقەقەور و حەحەساو
فەفەفیترە و زەزەکات و یەیەیاسینی نەخۆش
ئەئەئاگر جەجەحەننەم ببلێسەی بەبەتەتاو
پپپردی سسیرات و هەهەهەنگوینی بەهەشت
حوحوحووری ججوان و مەمەمەمیوەی تەتەواو
ددرێژی جەجەجاڵ و کوکوکورتانی کەری
کوکوکوشتن مەمەسیح و عەعەعەسای ببناو
ئەئەئێشک مەمناڵ و گەگەگرتن شەشەوە
هەهەهاڵی ژژنان و ببببوونی بەبەچاو
ئەئەمانە بەبەیانم کەکەکردن بەشیعر
لە مناڵی خەخەریک بوو هەهەتا بووم بەپیاو
(قانیع)ا شیعرت بەسافی قیمەت و نرخی نییە
تۆ تەماتە کە بەلاڵی ناوی خۆت خەیتەوە ناو

ئەو گەمە ڕەوانبێژییەی قانیع لەم شیعرەدا دروستی کردووە بۆ بزە و پێکەنین بووە بەشەوچەورەی ڕابواردن. شاعیر داهێنانی تێدا ڕواندووە. لە دوا دێڕی دەڵێ: ئەی قانیع دیارە ئەو شیعرە ئاساییەی کە خۆت دەینووسییەوە بێ نرخە، لەبەرئەوە شیعر بەزمانی لاڵەوە دەڵێی بۆ ئەوەی ناوت بێتە ناو ناوانەوە.

٢

قانیع هەوڵی داوە شیعرێک بڵێ ئەو وشانەی تێدا بەکار بێنی کە نوختەیان تێدا نییە، ناوی ناوە «شیعری بێ نوختە»:

کاکە سەلامم لە هاودڵدارم
لە مام و کەس و گەورە و سەردارم
لە دوای سلسلەی دوعا و سەلامم
هاودڵ گوێ گرە سا لە کەلامم
ئەلحەمدوللا ئالاّ هەڵکرا
ماوەی ئەهلی دڵ ئەمڕۆکە درا
سوئال گەر ئەکەی لە مولک و ماڵم
لەسەر مەرامە حاڵ و ئەحواڵم
لای دڵ گەرمم سادەی وەرە لام
سەرکەوە کەم کەم ڕوو لە ڕووی مەرام
ڕووکەرە ڕاسی داسی ئالاّی سوور
دەرەو کە عەدووی لار و هار لە دوور
ئەگەر لە مامی لارم سام ئەکەی
هەڵسە هەڕاکە لە مەرام ئەگەی
ئەو هەر عەدووی ڕوح گرۆی سەلامە
هەر لە درۆدا سەرداری عامە
کاکە ئەم ئالاّ مەرهەمی دەردە
مەرهەمی لاوی دڵ سڕوسەردە
هەرکەس لە هەر لا ووڕ و سەرسامە
ڕاکا ئەم ئالاّ کۆگای مەرامە



ئەم شیعرە ڕیزکردنی وشەیە، کەچی مانای تێدا هەیە. مانایێک لەگەڵ ئەقڵ قسە دەکا دوور لە خەیاڵ و ئەندێشە و سۆزی ناوەوەی ئادەمزاد، بەڵگەی وەستایەتی وردی شاعیرە کە توانیویەتی لەو وشانەی لە تیپی بێ نوختە پێکهاتوون ڕستەی بەمانا دروست بکا.

لە کاتی خۆیدا قانیع ئەم شیعرەی لە ساڵی **١٩٤٦** لە مەهاباد هۆنیوەتەوە وەک نامەیێک بۆ بێکەسی ناردووە بۆ سلێمانی، مژدەی هەڵکردنی ئاڵای کۆماری کوردستانی داوەتێ لە مەهاباد.

٣

قانیع لە شیعرێکیدا گاڵتە بەدەروێشێک دەکا:

دوێنێ دەروێشێ ووتی کەف بەدەف و دەف بەتەرەب
دەبە دەب دەب دەبە دەب دەب دەبە دەب
ووتم ئەی ئەحمەقی ئاشوفتە وەتەن چۆڵە ووتی
دەبە دەب دەب دەبە دەب دەب دەبە دەب
هەرچی هەوڵم لەگەڵ ئەو بەچکە سەگەدا ئەیووت
دەبە دەب دەب دەبە دەب دەب دەبە دەب
ووتم وا چاکە لە فیکری خۆیەوە بۆی دەربێم
بەمووروری گەلێ ئەبییام لە ناو بەم دەبە دەب
دەفم هەڵگرت و بە حەی حەی دەسی شێخم ماچ کرد
ووتم لێدەن بە عوموومی لە مەقامی دەبە دەب
من و شێخ و ژن و دەروێش هەموو تێکەڵ بووین
شێخ لە فیکری ڕەپێ سووری من و دەروێش دەبە دەب
(قانیع)ا بەسیە موحەققەق بە دووسەد وەک من و تۆ
تەرک ناکەن بە یەکێ بەزم و مەقامی دەبە دەب

قانیع لەم لیریکەدا گەیشتۆتە پلەیێکی بەرز لە شیعری کۆمیدیدا. ناوی دەنگەکانی دەف و ئاوازی یاهوو و حەی ئەڵڵای دەروێشانی خستۆتە ناو شیعرەکەیەوە، بۆ ئەوەی سووک و ڕەوان بکەوێتە بەرگوێ. ئینجا لە هەندێ نەریتی تەهلیلە و سەمای دەروێشان دەدوێ. حەلقەی زیکر گەرم دەبێ، ژن و دەروێشان و قانیعیشیان لەگەڵ دەبێ بەسەرۆکایەتی شێخ حاڵ دەیانگرێ. لەم بەزمەدا وەکو قانیع دەڵێ شێخ تەنیا خەریکی

ڕەپی سووری دەبێ بۆ ژنێک لەو جوانانەی دەروێشی شێخن، قانیع و دەروێشانی دیکەش بەچەقەنەوە سەمای بۆ دەکەن.

***

محەمەد کوڕی شێخ عەبدولقادری قانیع زادەی مەریوان و هاوولاتیی شارەزوور و ئاوارەی هەموو لایێکی کوردستان بەڵگەی ڕەنجبەر و زەحمەتکێشی کورد بوو. لە سەرەتادا لە ماڵێکی تێروتەسەل، لە دواییدا برسی و هەژار، چارەنووسی وەکو ئەوەی نەتەوەکەی بوو، ڕابردوویێکی مێژووی پڕ لە شانازی و ئێستاییێکی بەدبەخت.

قانیع شاعیرێکی ڕەسەن بوو، ئەو ڕاستییەی ئاشکرا کرد کە خوێندنی بەرز و زانیاریی زۆر بەڵگەی شاعیری نین. ئاسۆی شیعری فراوان بوو، بۆ هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵی وتووە. لەو شاعیرانەیە هێرشی بردۆتە سەر دەرەبەگ و دەوڵەمەند و کاربەدەستان کەچی ڕۆشنبیرەکانیان کە شیعری دەخوێننەوە چەپڵەی بۆ لێ دەدەن.

شاعیر بەخەیاڵ ژیانی هەژاری بۆ خۆی دروست نەکردووە، بەڵکو بەڕاستی ژیانی قورسی و هەژارانە بووە، بۆیە بووە بەسەرچاوەییێکی گرنگ بۆ داهێنانی شیعری کە بەڕاستی وێنەی ڕاستەقینەی ژیانی خۆی و زۆربەی خەڵکی ناو کۆمەڵە.

ئەم شاعیرە لە زۆربەی بابەتەکانی شیعری وتووە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە. شیعری دڵداری قانیع مەبەسی سەرەکی نییە لەگەڵ ئەوەش تیایدا سەرکەوتوو بووە. شیعری تایبەتی هەیە بۆ دڵداری، لە هەندێکیاندا ئاماژەی بۆ لایەنی کوردایەتی و ناگزووریی کۆمەلایەتی هەیە. لە بەرهەمیدا هەست بەبۆنی شیعری کراوە (ئیرۆتیک) دەکرێ، بەڵام وەک هەندێ لە شاعیرانی دیکە تێکەڵ بەشیعری داشۆرینی نەکردووە. قانیع لە دەرگاییێکی گەورەوە لە سەدەی بیستەمدا چۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

# بەشی بیست و حەوتەم

## ئەسعەد

## ١٨٩٨ - ١٩٧٦

### ژیانی

ئەسعەد کوڕی مەلا خالید کوڕی محەممەدی مەحویی شاعیر لە ساڵی ١٨٩٨ لە سلێمانی لە دایک بووە. سەرەتای خوێندنی ئایینی لای باوکی بووە، بەشێکی دیکەی لە حوجرەی خواجە ئەفەندی تەواو کردووە. ماوەیێک لە سەردەمی جەنگی یەکەمی گێتی لە قوتابخانەی ڕەسمیی عوسمانی خوێندووە. لە پاشانا دووبارە گەڕاوەتەوە لای هەندێ لە مەلایانی مزگەوت لەوانە لای باوکی و مەلا حوسێنی پیسکەندی و شێخ بابا عەلی تەکیە خوێندنی ئایینی تەواو کردووە و ئیجازەی دوازدە زانستییەکەی وەرگرتووە. لەو کاتەی خۆی بەشاعیر ناسیوە ناوی تایبەتی خۆی «ئەسعەد»ی کردووە بەنازناوی شیعری و لە ناو خەڵکی بە«ئەسعەدی مەحوی» ناسراوە.

لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا ئەسعەد لە بنەماڵەی شێخ مەحموودەوە نزیک بووە، بەتایبەتی لە شێخ لەتیفی شێخ مەحموود، ئەو کاتە ئەوە باو بوو چەند لاوێکی خوێندەواری هاوڕێی یەکتری هەوڵیان دەدا لە ڕێگەی ڕێکخراوەوە کوردایەتی بکەن، ناوێکیان لە ڕێکخراوەکەیان دەنا، مێژووی ئەو سەردەمە ناوی هەندێ لەو ڕێکخراوانە دەور دەکاتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ ئەمانە زۆر بڕیان نەدەکرد، ئیتر ئەسعەد لەگەڵ شێخ لەتیف و کەسانی دیکە بەشداری لە ڕێکخراوێکی لەم بابەتەی کردووە، بەڵام زوو تێک چووە.

لە ساڵی ١٩٤١ بەهۆی جموجۆڵی سیاسی لە پێناوی کوردایەتیدا لەگەڵ کۆمەڵێک لاوی ڕۆشنبیری کورد دەگیرێ و دەخرێتە گرتووخانەی سلێمانی، لە دوای ماوەیێک ڕەوانەی کەرکووک دەکرێ، لەوێوە بۆ بەندیخانەی حەویجە، زۆری پێ ناچێ ئازاد دەکرێ. لە بەهاری ساڵی ١٩٤٣ جارێکی دیکەش دەسەڵاتی حوکوومەتی عیراق بەتەما دەبێ بیگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ شێخ لەتیف و کۆمەڵێک لاوی ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەر خۆیان نادەن بەدەستەوە و ڕوو دەکەنە ئەودیو و لە شاری سەردەشتی کوردستانی ئێران نیشتەجێ دەبن. ماوەیێک بۆ ڕێکخستنی ئیشوکاری سیاسییان هەوڵ دەدەن ڕێکخراو دابمەزرێنن،



بەڵام کۆششیان سەر ناگرێ بەتایبەتی کە ناخۆشی دەکەوێتە نێوان ئەسعەد و شێخ لەتیف ئیتر یەکەمیان ناچار دەبێ سەردەشت بەجێ بێڵێ و بگەڕێتەوە سلێمانی. لەو کاتەوە واز لە سیاسەت دێنێ و ژیانی گۆشەگیری بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ. لە کارگێڕی ئەوقاف لە پێشانا وەک مووچەخۆرێک دادەمەزرێ، لە دواییدا لە ساڵی ١٩٤٦ دەکرێ بەئیمام و مودەریسی خانەقای خۆیان (خانەقای مەحوی) و بەم جۆرە هەموو ژیانی بەهێمنی و بێ دەردی سەری دەباتە سەر تا ڕۆژی ٢٥ی نیسانی ١٩٧٦ لە سلێمانی کۆچی دوایی دەکا و لە گۆڕستانی گردی سەیوان دەنێژرێ.

### شیعری

ئەسعەد نەوەی شاعیری ناودار مەحوییە، ئەگەر تەنیا چۆڕێکی لە باپیری وەرگرتبێ ڕووی ئەوەی دەبێ چەند لاپەڕەیێکی بۆ تەرخان بکرێ لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. ئەو وەکو باپیری بەردەوامیی قوتابخانەی نالییە، هەندێ جار خەیاڵی لە تارمایی شیعری مستەفا بەگی کوردی سەر هەڵدێنێ. شیعری نموونەیێکە شیعری لاسایی و ئاسایی کوردستانی خوارووی دەوڵەمەند دەکا.

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

زۆربەی شیعری لە ڕووی کێشەوە عەروزییە لەسەر هەردوو بەحری ڕەمەل و هەزەج هۆنراونەتەوە. لە بەحری موزاریع شیعری زۆر کەمە. بەپێی دەستووری ئەم جۆرە شیعرە یەکێتیی قافیەی هەیە. شاعیر زۆربەی دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە، بەڵام ئەو دەنگانەی تایبەتین بەئەلفوبێی عەرەبی بەکاری نەهێناون.

لە پاش قافیە ئەم وشە و ڕستانەی بەکارهێناوە: خودا، ئەکا، نەما، بڕوا، کوا، خۆشت، بۆچ، کرد، کورد، ئەی دریغ، مەرگ، دەخیل، بم، تۆم، ناکەم، ئەکەم، دایم، لێم، من، بێن، بێهوودە بوو، تۆ، ئەمشەو، تەوبە، بۆ بکە، کەس مەکە، یا حەبیبولڵلا، بووە، هەیە، نییە، بێ (ببێ)، هەبێ، نەبێ، چی، ڕەحمێ، ناوێ، ئەکەی.

شیعری کێشی سیلابی خۆماڵی و جووت قافیە (مەسنەوی) کەمە، هەوڵی نەداوە لە قاڵبی زۆربەی شاعیرانی کلاسیکی لەم لایەنەوە بچێتە دەرەوە، لەبەرئەوە ئەم جۆرە شیعرەی پشتگوێ خستووە. بەگشتی لە بابەتە کۆنەکانی شیعری کلاسیکی بایەخی بە پارچە شیعر داوە، واتە کورتە غەزەل بەواتای کۆنەکان و لیریک بەواتای تازەکان، بەم

جۆرە زۆربەی هەرە زۆری شیعری بەژمارەی دێڕ کورتن، ناگەنە ئەو ڕادەیەی قەسیدەیان پێ بووترێ. لە هونەرەکانی شیعری کلاسیکی لە دیوانی ئەسعەددا موستەزاد و پێنجین و بەندی چوارین و تاک و چوارین بەرچاو دەکەون.

لە موستەزادێکیدا تازەگەرییێک بەرچاو دەکەوێ:

بێ نەسیم تویی خودا بیهێنە بۆنی دلبەر
ئەی دلبەرم
ئا بە فریاما کەوە مەردی خودا تۆی ڕەهبەرم
تۆی ڕەهبەرم
لوتفی ئەو زاتە لەسەر هەرکەس کەوێتن ئەو کەسە
ساخودا بمکەی بەکەس داماوم و بێ جەوهەرم
بێ جەوهەرم
پێم ببەخشە مردنێ لەوبەر دەرەی پڕ گەوهەرە
گەردەکەی ئیکسیری چاوە مەزبەلەی تاجی سەرم
تاجی سەرم
وا لە تەوڕات و لە ئینجیلا مەدینە باس ئەکا
شوێنی شاهی ئەنبیایە فەخری عالەم سەروەرم
ئەی سەروەرم
بگرە باڵم یا موحەممەد من سەگی دەربانی تۆم
ڕووڕەشە (ئەسعەد) لە دیوانی خودا بێ ڕەهبەرم
بێ ڕەهبەرم

لێرەدا شاعیر لە دوو جێ دەسکاری موستەزادی کلاسیکی کردووە. یەکەمیان دێڕە کورتەکان لە دوا ڕستەی هەشت برگەیی دێڕە درێژەکان، وەک خۆیان وەرگیراون و دووبارە کراونەتەوە. دووەمیان دێڕە درێژەکان لە بەندەکانی یەکەم و دووەمدا یەک نیوە دێڕ شیعرن، لە بەندەکانی دیکەدا بریتین لە دوو نیوە دێڕ شیعر. ئەمە بۆ شاعیر بەداهێنان دەژمێررێ.



## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شیعری ئەسعەد بەگشتی لە مەبەسی دڵداریی شێواز کلاسیکی دەدوێ. لە ناو ئەو ناوەڕۆکەدا هەندێ مەسەلەی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی (کوردایەتی) بەدی دەکرێ، لە بیری دانایی و گازاندە و گلەیی لە گەردوون بەدوور نییە. ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و قسەی بەتوێکڵ لە نووسینیدا بەرچاو دەکەوێ. وتەی جنێوئامێز بۆ مەبەسی گاڵتە و پێکەنین بەکار دێنێ. پێداهەڵدان و ستایشی هەیە بەشێوازی کۆن بۆ خەڵکانێکی لە سەردەمدا دەژین.

فەرهەنگی وشە و زاراوەی کوردی لای شاعیر دەوڵەمەندە، وشەی کوردی پەتی زیاتر لە وشەی بێگانە لە شیعریدا بەکار دێنێ. هەندێ جار پاشگری «تن» دەخاتە سەر فەرمان، وشەی «دەڕوا» دەکاتە «دەڕواتن»، ئەمە لە شێوازی قسەکردنی ناوچەی سۆران هەیە، لە سلێمانی نییە. بێ گومان زۆر جار کێشی شیعری وای لێ دەکا وشەکە بەم جۆرە دەربڕێ.

## نموونەی شیعری

لە پارچە شیعرێکیدا ئەسعەد دەڵێ:

١

ڕۆژژمێری کوڵمی یارە خۆری لێ کردم بەدوو
کوانێ حەسری نەوعی فەردی ڕۆژی ئێمە بوو بەدوو
ماری زولفی بێ ئیجازەی بوو لەناکاو گەستمی
دڵ نەما جەرگیش بڕا دەرچوو حەیاتم زوو بەزوو
سوور و زەردی یاری من بوو نرخی سێو و بەی شکا
قوڕ بەسەرد با بکا مێوەفرۆشان دوو بەدوو
ڕووحەکەم پەروازەیە جانانە ئێستا ئیزنی دا
زیارەتیکا عاشقانی قوڕ بپێوێتن عەدوو

ئەسعەد ئەم شیعرەی بۆ وەسفی هەندێ ئەندامی دلبەر داناوە. لە سەرەوە تەماشای دەکا، لە پێشانا ڕوومەتی، ئینجا هەردوو بسکی، ئەوجا سنگ و مەمکی، کەرەستە کلاسیکییەکان بەکار دێنێ بۆ وەسفەکەی، ڕۆژ و مار بۆ کوڵم و بسک، سێو و بەهێ بۆ سنگ و مەمک. بزووتنەوە چێژی شیعری لە خەیاڵی کلاسیکییەوە هەڵدەقوڵێ. واتە

ڕاهاتن بەوێنە کۆنەکانی لەیەکچوواندن ئەم شیعرە خۆشەویست دەکا لە لای خوێنەر، ئەگینا لە ڕەوانبێژی شیعری نوێدا ئەم وێنە دروست کراوە کۆنانە باویان نەماوە.

## ٢

لە شیعرێکی دیکەیدا لە وەسفی دلبەر ئەسعەد دەڵێ:

ئەی نووری چەمم بێت و ئەمن ڕەهـ گوزەرت بم
ئەم جەژنە کە قوربانە بەقوربانی سەرت بم
شایانی تەحەممول نییە دڵ بێ لەبی ئاڵت
مەیلێکە فیدای گۆشەیی مەیل و نەزەرت بم
بێ نووری چەمت نووری نییە نووری چەمانم
قوربانی چەم و ڕێبیی چەم و خاکی دەرت بم
بۆ دەفعی غەم و غوسسەیی دڵ مەکتەبی تۆیە
بمنێرە سەرە و دەفتەری خۆت با نەفەرت بم
میحرابی منە تاقی دوو ئەبرۆیی کەوانت
تەقدیری بکە تاکو ئەبەد سەجدە بەرت بم
شادە هەموو کەس لەو چەمەن و ڕەوزەیی حوسنە
بێ مروەتییە گیانە ئەمن دەربەدەرت بم
تاکەی بەتەمای جیلوەیی تۆ (ئەسعەد)ی ئەغیار
ئەی نووری دڵم فەرموو بەقوربانی سەرت بم

لەم شیعرەدا ئەسعەد گفتوگۆ لەگەڵ دلبەر دەکا، یا ڕاستییەکەی ئەوەیە هەر خۆی قسە دەکا. خەریکی چەمی خۆشەویست دەبێ، واتە چاوی، هەوڵ دەدا لەو وشەیە هەندێ وێنەی ڕەوانبێژی وشەیی بکێشێ بەدووبارەکردنەوەی وشەی «چەم» کە بۆ مانای جیاواز لە شیعرەکە بەکارهاتووە. شاعیر هەوڵ دەدا دڵداری بەرامبەر ئەو دلبەرە لە چوارچێوەی زەمینێ بێنێتە دەرەوە بیخاتە دڵداریی سۆفیزمەوە، دلبەر خاوەن تەریقەتە، ڕێکخراوی هەیە، عەودالی ئەوەیە ئەندامی ئەو ڕێکخراوە بێ بۆ ئەوەی لە دلبەرەوە نزیک بێ.



## ٣

لە یەکێ لە شیعرە نیشتمانییەکانیدا ئەسعەد دەڵێ:

نانەوێ عەزمم بەحەپس و بەرگی گوێنی جانەوەر
شار و دێهاتم بسووتێ گەنجی بینە دەربەدەر
هەوڵی ئیستیقلالی کوردە چۆتە کەللەی سەرمەوە
کەڵکەڵە و خولیایێکە هێزی نییە بیکاتە دەر
هەر ئەبێ ئەم حوکمە بدرێ سەربەخۆیی دەس کەوێ
ڕۆڵەیی زەحمەت کە شانێ تاجی شاهی کاتە سەر
ڕووڕەشی و بێ حورمەتی بۆ ئەو کەسانەی خائینن
ئەیفرۆشن ئەم گەلەی داماو و دیلەی قوڕ بەسەر
(ئەسعەد) و یارانی وا لە کەرکووکان ئەسیر
بێکەس و بێمەلجەئو داماوون و دڵ پڕ کەدەر

ئەسعەد ئەم شیعرەی لە تەمووزی ساڵی ١٩٤١ وتووە لە کاتێکدا لەگەڵ چەند نیشتمانپەروەرێکی دیکەی خەڵکی سلێمانی گیراون و ڕەوانەی بەندیخانەی حەویجە کراون لە نزیک شاری کەرکووک. ئەوەی پێویستە لێرەدا ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە لە دوای کوودیتا سوپاییە کۆنەپەرستییەکەی بەغدا لە ساڵی ١٩٤١ کە بە«هەرای ڕەشید عالی» بەناوبانگە و لایەنگری نازییە هیتلەرییەکان بوو، کاروباری عیراق تێکچوو. بەڵام زۆری پێ نەچوو سەرانی عیراقی پێشوو و دەسەڵاتی ئینگلیز زوو گەڕایەوە وڵات. ئەمەیان هەلێک بوو بۆ گرتنی هەندێ نیشتمانپەروەری دژی ئینگلیز لە سەرانسەری عیراق بەناوی نازییەوە. هەندێ کەسی نەخوێندەواریش پێوە بوون لە ئەنجامی ناخۆشی و دوژمنایەتی لە ناو خەڵکیدا. هەندێ لە هاووڵاتییان دەمیان لە یەکتری دەدا و بەهەڵگری بیروباوەڕی نازی لە قەڵەم دەدران. ئەسعەد و گەلێ خەڵکی دیکەش بەم جۆرە بەند دەکران، بەڵام لە دواییدا هەموویانیان ئازاد دەکرد.

٤

له شیعرێکی دیکه‌یدا ئه‌سعه‌د ده‌ڵێ:

چه‌رخی به‌د چیت نه‌کـــــرد دایم بـه‌هۆزی کـــــوردان
ناوونیـــشـــانت به با داون له‌ســـه‌ر ڕووی جـیـــهـــان
به‌ش به‌شت کـردووینه‌وه بۆ مـیلله‌ت و قـه‌ومی عـه‌جیب
وه‌ک عـرووس و عـاره‌ب و فـورس و شیـمـالی تورکه‌کان
بووینه گـۆی ته‌شـه‌رروع وا کـه‌وتووینه ده‌س نادانه‌وه
هه‌م وه‌کـو فـوتبـۆڵ به‌ده‌م نووکی شـه‌قـینی گـۆڵـه‌کـان
واحـیـدێکی بێ مـه‌قـیـسین و قـیـاسـێکی نه‌زۆک
فـاعـیلی بێ عـامـیل مـه‌عـمـولی ده‌ستی دێوه‌کـان
به‌نده وو خـزمـه‌تگوزاری تۆیه (ئه‌ســعـــه‌د) ئه‌ی برا
هایم ئاســا بۆیه کـه کـه‌وتووینه شـاخ و کـێـوه‌کـان

ئه‌سعه‌د له کاتێکدا ئه‌م شیعره‌ی نووسیوه له ساڵی ١٩٤٢ که ئاواره‌ی سه‌رده‌شت بووه. جه‌نگی دووه‌می گێتی له جه‌نگه‌یدا بوو. به‌شێکی خاکی کوردستانی دابه‌شکراو گۆڕه‌پانی شه‌ڕ بوو، له کوردستانی ئێران و ئه‌و هه‌رێمانه‌ی له ژێر ده‌سه‌ڵاتی رووسیا بوون به‌تایبه‌تی له ئازربێجان و ئه‌رمه‌نستانی سه‌رده‌می ده‌سه‌ڵاتی سۆڤیه‌ته‌کان. شاعیر هیچ ئومێدێکی به‌وه نه‌ما بوو ئه‌نجامی جه‌نگ کارێک ده‌کا له چاکه‌ی بزووتنه‌وه‌ی رزگاری کورد ده‌بێ. له‌به‌رئه‌وه ره‌شبـینه له‌و دوارۆژه نزیکه و ئه‌م شیـعـره ره‌نگدانه‌وه‌ی راستی هه‌ستی ناوه‌وه‌یه‌تی.

٥

له شیعرێکیدا دیسانه‌وه شاعیر له ئه‌نجامی جه‌نگی دووه‌م ده‌دوێ له بابه‌ت چاره‌نووسی کورده‌وه:

ئه‌ترسم ئه‌ی وه‌ته‌ن له‌م جـه‌نگه‌شـا دیل و بێ به‌ش بین
وه‌کو ده‌وری جه‌هاله‌ت هه‌ر خه‌ریکی حیله وو غـه‌ش بین
ئه‌مـان ئه‌ی نه‌وجـه‌وانینه ده‌خـیله فـرسـه‌ته هه‌ستن
له ماسه‌ی سوڵحی عاله‌م به‌ڵکو ئێمه‌ش خاوه‌نی به‌ش بین
دزی عـه‌یبـه به‌سـه کـوشتن زه‌مـانی وه‌حشـییـه‌ت تاکـه‌ی
له‌به‌ر زوڵم و زه‌لاله‌ت بۆچی ئێـمـه پیس و ڕووڕه‌ش بین
ئه‌وانه‌ی حـه‌ق شـوناسن گـه‌ینه ڕوتبـه‌ی عـاله‌می باڵا
له ڕێگه‌ی چه‌وتیـا تاکـه‌ی براله گـوێ کـوته‌ی وه‌ش بین
دوورا کـفنی حـه‌سـره‌ت بۆ هه‌مـوو کـوردێ به‌ده‌رزی غـه‌م
که ته‌قدیری ئه‌زه‌ل (ئه‌سعـه‌د) وه‌هایه ئێـمه بێ به‌ش بین

ئه‌م شیعره‌ش له سه‌رده‌می جه‌نگی دووه‌می گێتی وتراوه. دیاره مه‌سه‌له‌ی نیشتمانی کورد ته‌نیا هیوا و ئامانجی شاعیر نه‌بووه، به‌ڵکو زۆربه‌ی نیشتمانپه‌روه‌ران بیریان له‌وه کردۆته‌وه. زۆریان هه‌ستیان به‌وه کردووه توانای میلله‌ت له‌و پله‌یه نه‌بووه بتوانێ ئامانجی بهێنێته دی، هه‌روه‌ها ئه‌و مه‌رجانه‌ش له میلله‌تدا له ناوا نه‌بوون بتوانێ پارێزگاریی ده‌سکه‌وت بکا. له‌به‌رئه‌وه‌یه تووشی ره‌شبینی بووه و زیاتر مه‌یلی بۆ ئه‌وه ده‌چێ هه‌لی جه‌نگی ئه‌مجاره‌شی له ده‌ست بچێ، دوارۆژیش ئه‌م راستییه‌ی خسته ڕوو. به‌ڵگه‌ی ئه‌مه ئه‌وه بوو له کوردستانی ئێران (١٩٤٦) هه‌ندێ ماف ده‌س که‌وت که کۆماری کوردستان له مه‌هاباد دامه‌زرا، به‌ڵام ئه‌ویش زوو ڕووخا.

٦

له شیعرێکیدا ئه‌سعه‌د ده‌ڵێ:

بۆ وه‌رامی پرســیـــارم، عـــه‌رزی مــیــری پیـــر ئه‌کـــه‌م
هه‌ر به‌گـوێی گه‌وره‌ی به‌هۆش و خـاوه‌نی ته‌دبیـر ئه‌که‌م
ژار و ژه‌نگی ئه‌م زرووفـــه ده‌وره‌یی ئه‌قـــتـاعـــیـــیـــه
وا له‌ســه‌ر مـاڵی فـه‌قـیـره کـۆمـه‌ڵێ ته‌حـقـیـر ئه‌کـه‌م
ڕۆژی ڕوونـــاکـم ئــه‌بــێ ده‌وری نــه‌زانــیــنـــی نــه‌بــێ
دوژمنی ژوور و ده‌رم ئه‌و ســـاته کـــه زنجـــیـــر ئه‌کـــه‌م
شـۆڕشی مـه‌سنه‌د ئه‌کـا بێ قـیـمـه‌تانی خـود په‌سـه‌ند
بۆ نه‌مـــانی داگـــیـــرییـــه‌ت عـــاله‌مێ ته‌نویر ئه‌کـــه‌م
پرســیـــارم لێ ئه‌کـه‌ی مـیـرم زه‌کی (ئه‌سـعـه‌د) ئه‌ڵێ
کـــار و فـــرمـــانم به‌لاشــه خــۆ له ناو ژێری ئه‌کــه‌م

وەک دەردەکەوێ نامەنووسین لە نێوان ئەسعەد و مێژوونووس ئەمین زەکیدا بووە. ئەم شیعرە نامەییێکی شیعرییە ئەسعەد لە ساڵی ١٩٣٨ بۆ ئەمین زەکی نووسیوە. لەو شیعرەدا باس لە هەندێ لایەنی ناگزووریی کۆمەڵایەتی کورد دەکا. هێرش دەباتە سەر دەرەبەگ بۆ ئەوەی لەسەر هەژار بکاتەوە. دەوری خوێندەوار پەسەند دەکا لە پێناوی ئاراستەکردنی خەڵکی بۆ کاری بەکەڵک. بەگشتی شاعیر ناڕازی بووە لە نەبوونی یەکسانی و دادپەروەری لە ناو کۆمەڵدا.

٧

شاعیر ڕوو دەکاتە کەسێکی مێشک بەتاڵی خۆ بەزل زان و دەڵێ:

کەریەتی چەند خۆشە میرم بێ مەراق و بێ غەمە
تێگەییو شیوەن ئەکاتن عاقلی بێ غەم کەمە
قەپ لە جۆ دابگرە فەرموو ئەی جەنابی گوێدرێژ
ئەو کەسەی وەک تۆ نەبێ خواب و خۆراکی هەر غەمە
پێم بڵێ تاکەی ئەرێژم ئەشکی نەومێدی فەلەک
ئاهی حەسرەت سەر ئەخا گڕ هەروەکو مووشەدەمە
مەرحەبا ئەی غەم بە ئانێ سەد سلاوم لێ ئەکەی
ئیش و کارم بوو بە جوابی تۆ عەزیزم ئەم دەمە
بۆ ئەبێ غونچەی هیوا پشکوێ ئەسارەت ووشکی کا
کوانی شایی (ئەسعەد)! ئەم شینەیە و ئەم ماتەمە

ئەو کەسەی شاعیر گاڵتەی پێ دەکا ژمارەیان لە ناو کۆمەڵدا کەم نییە. بەشێوازێکی قەشمەری ئامێز ئەو کەسە دادەشۆرێنێ و لەگەڵ کەر بەراووردی دەکا، ئەوەی هەردووکیان کۆ دەکاتەوە بێهۆشییە، ئەمە مایەی ئاسوودەیی و بێ غەمییە، بەپێچەوانەی ئەوانەی بیر دەکەنەوە و بەتەنگ چارەنووسی هەموو ئادەمزادێکن. نویشکی بۆچوونی شاعیر ئەوەیە ئەگەر مرۆڤ بیر لە بەختیاری نەکاتەوە بۆ ئەوەی بەدبەختە، دەبێتە ئەو بێهۆشەی وەکو گوێدرێژ وایە، بەڵام ئەوە هەیە گوێدرێژ نازانی بێهۆشە کەچی ئەو کەسە وا دەزانی هۆشی هەیە، شاعیر بەبێهۆشی لە قەڵەم دەدا.



٨

ئەسعەد بۆ شێخ مەحموود ئەم چوارینەی وتووە:

بۆ گولانی شۆڕەسوارێ چاوەکەم هاتۆتە گل
ئەشکی سوورم هاتە خوارێ مێزەرم کەوتۆتە مل
ئەی سەبا تووبی خودا عەرزی حوزوورم بۆ بکە
دەردی پیری یا غەمە ئەو شێرەیی کردۆتە جل

شێخ مەحموودی سوارچاک لە ساڵی ١٩٥٠ لەسەر وڵاغ دەگلێ و ئازاری پێ دەگا. بەم هۆیەوە ئەسعەد ئەم چوارینەی بۆ دادەنێ. داوا لە ڕۆژگار دەکا پێی بڵێ لەبەرچی شێخ تووشی ئەو ناخۆشییە بووە، لەبەر پیرییە یا غەم و پەژارەی گەردوونی بێبارە! ڕەنگە لەبەر هەردووکیان بێ! ئەگینا شۆڕەسوار لەوانە نییە لەسەر ئەسپ بگلێ.

***

ئەسعەدی مەلا خالیدی مەلا محەمەدی مەحوی، شاعیری نەوەی دووەمی قوتابخانەی نالی و نەوەی یەکەمی باپیری خۆی مەحوییە، بەڵام زیاتر چۆتەوە سەر شێوازی نالی نەک باپیری. لە ڕووی ڕوخسارەوە مەرجەکانی شیعری کلاسیکیی کوردی پاراستووە، کێشی عەرووز و یەکێتیی قافیەی بەکارهێناوە. لە ناوەرۆکدا بۆ بابەتە گرنگەکانی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم چووە. نموونەی سێ بابەت بەگشتی لە دیوانیدا دەور دەبێتەوە. دڵداری و ئەڤین بەشێوازی کلاسیکی، نیشتمانپەروەری و کوردایەتی لە قالبی شیعری ئاسایی کلاسیکی، لە دوا جاردا بایەخی بەشیعری دانایی و گاڵتە و گەپ و قسەی بەتەوسەوە داوە. کوردی زانی باش بووە، ڕیتم و مۆسیقای شیعری ڕەوانە.

# بەشی بیست و هەشتەم

## ناسیح

**۱۸۹۸ – ۱۹۸٦**

### ژیانی

ناسیح کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی سەبغەتوڵڵای حەیدەریبیە. لە ساڵی ۱۸۹۸ لە هەولێر لە دایک بووە. لە شیعریدا ناوی ڕاستی خۆی وەک نازناو بەکارهێناوە. بڵاوکەرەوەکانی کۆمەڵە شیعری بەناوی «دیوانی حەیدەری»یەوە بڵاویان کردۆتەوە، ڕاستتر ئەوە بوو بەناوی «ناسیح»ەوە بێ.

خوێندنی سەرەتایی لە حوجرەی مزگەوت بووە. لە جەنگی یەکەمی گێتیی سەدەی بیستەمدا گەیشتۆتە پلەیێکی باش لە خوێندنیدا. لە ماوەی پاش داگیرکردنی هەولێر لە لایەن ئینگلیزەوە (۱۹۱۸) لە ڕووی خوێندەوارییەوە خۆی پێگەیاندووە. کتێب و چاپەمەنی ئەو سەردەمەی خوێندۆتەوە بەتایبەتی دیوانی شاعیران و مێژووی ژیانی ناودارانی کورد. لە ساڵی ۱۹۲۵ بەمووچەخۆری میری دامەزراوە، ماوەی سی ساڵ لە دادگاکانی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی فەرمانبەر بووە تا ساڵی ۱۹۵۵ لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە. لەوەدەمەوە خەریکی حەسانەوە و خوێندنەوە بووە و لە نێوەندی ڕۆشنبیرییەوە نزیک بووە و پێوەندی بەخوێندەوارانەوەی پێ خۆش بوو. تا ڕۆژی ۲ی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۸٦ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

### شیعری

ناسیح شیعری بۆ خۆی و بۆ خەڵکە هەرە نزیکەکانی وتووە، تا چاپکردنی دیوانی لە ساڵی ۲۰۰۰ لە نێوەندی ئەدەبی کوردی لە کوردستانی عیراق و لە ناو شاری هەولێر بەگشتی بەشاعیر نەناسرا بوو. شیعری کەمە، لە ناویاندا هەست بەهەندێ ئاوڕدانەوە و داهێنانی هونەری دەکرێ.

لە بابەت ڕوخساری شیعرییەوە زانیاری لەم تێبینییانەدا دەست دەکەوێ:

١- لە بەحری عەرووزیدا تەنیا کێشی ڕەمەل و هەزەجی بەکارهێناوە.



٢- لە قافیەدا ئەم دەنگانەی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی دەکەونە بەرچاو: ا ب ت ر م ن (ە – ـە) و ێ.

٣- لە پاش قافیەدا ئەم وشە و ڕستانەی بەکارهێناوە: یا ڕەسوولوڵڵا، دەکا، شەو، مەکە.

٤- شیعری لە بابەتی لیریکە، ژمارەی دێڕەکانیان لە دوازدە دێڕ کەمترن. بابەتی قەسیدە لە بەرهەمیدا بەرچاو ناکەوێ.

٥- لە دیوانی شیعریدا قەسیدەی بەندی پێنجین (ا ا ا ا ب) و قەسیدەی بەندی شەشین (ا ا ا ا ب ب) دەبینرێن.

٦- هەندێ شیعری درێژی بابەتی داستان (بەیت)ی نووسیوە، بەڵام هیچ یەکێکیان لە ڕووی هونەرییەوە لە پلەی لیریکەکانی نین.

٧- ناسیح شیعری بەشێک لە شاعیرانی کوردی کردووە بەپێنج خشتەکی، لەوانە: نالی، سالم، حاجی، مەحوی، شێخ ڕەزا، وەفایی، حەمدی، سافی، زێوەر، کەمالی، نووری شێخ ساڵح، دڵدار.

لە شیعری بابەتی وەسف و دڵداریی ناسیح دەتوانرێ دەستەیێکی لێ هەڵبژێررێ، ئەوانی دیکەی لەو پلەیەدا نین. لەم تێبینییانەی لای خوارەوە هەندێ لایەنی شیعری لە ڕووی ناوەرۆکەوە ڕوون دەبێتەوە.

١- شیعری ئایینی (موناجات و نەعتی پێغەمبەر) جێگەی دیاری هەیە لە شیعریدا.

٢- شیعری وەسف و دڵداری.

٣- ستایش و پێداهەڵدان.

٤- پەند و ئامۆژگاری، ئەمەیان بەبیری شەریعەتی ئایینی ئیسلامەوە پیشانی دەدا.

٥- شیوەن و ماتەمنامەی زۆرە، جێگەیێکی دیاری لە دیوانیدا داگیر کردووە. لە بنجدا شیوەنەکانی بۆ کەسوکاری نزیکی خۆی بووە وەکو باپیر و باوک و دایک و کوڕ و برا و هەندێ لە ژن و پیاوانی خزمی خۆی و برادەر و دەوڵەمەند و ناودارانی شاری هەولێر. لە ناوی ئەو کەسانەی ماتەمنامەی بۆ نووسیوون ئەو ڕاستییە دەردەکەوێ کەسێکی شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیریان تێدا نییە خزمەتی کولتووری کوردی کردبێ.

## نموونەی شیعری

### وەسف و دڵداری

١

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

هەردوو زولفی چەند جوان هاتوونە خوار
بۆ سەری کوڵمی لە ڕەنگی گوڵهەنار
شادییێکم من نەدی لەم ژینەدا
هەر لە پێش دەرگایی عیشقا خاکسار
زووکە موتریب تۆ لەگەڵ ساقی بەجووت
با موغەننیش بێ لەگەڵ سەنتوور و تار
سادە ڕوویانتان لەگەڵ بێ تاوەکو
مەست و سەرخۆش بن لە نەشئەی بەزمی یار
بەزمەکی پەنهان بگێڕن تا بەیان
شەرتە حازر بن هەموو خووبانی شار
جێ نەهێڵن بەربوت و قانوون و عوود
تاکو لێتان تێک نەچیتن بەکیبار
وا دڵی (ناسیح) دەناڵێ چەشنی نەی
چونکە دڵ یێکە و غەمیشی سەد هەزار

لەم شیعرەدا ناسیح دەیەوێ هەموو جوانان کۆ بکاتەوە بۆ بەزمی شەوێکی پڕ لە ئاواز و مۆسیقا لەوانەی شاعیرانی کلاسیک لە شیعرەکانیاندا وێنەیان کێشاوە. دلبەرەکەی خۆشی تەنیا لە دێڕی یەکەمدا ئەوەی بەرکەوتووە باس لە دوو زولفی بکا چۆن دەوری کوڵمی سووریان داوە. هەرچی شاعیر خۆشیەتی لەم بەزمەدا هیچی بەرنەکەوتووە، چونکە دڵ یەکێکە و خەفەت سەد هەزارە.



٢

لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

ڕەفیقان توخودا گەر بوو سەفەرتان ئێوە لای یارم
بڵێن پێی گەر بزانێ ئەو لە ژینم چەندە بێزارم
نییە حاجەت بەخەنجەر گەر مورادی کوشتنی من بێ
بە ئەبرۆ گەر بکا ئیما منم کوژراوی دڵدارم
وەفایان بۆ نییە گەر تۆ بزانی دلبەر و یاران
کە مەعرووزی زەوالە چاک دەزانن حوسنەکەی یارم
منم مەجبووری حوسنی یاری چاوبازی خوماری خۆم
لەسەر ئەم حالەتەش دەمرم نییە تەبدیلی ئەفکارم
وەکو دێوانە هەر گێژی فیکر پەرتی وەها مەبهووت
لە دووری دلبەر و یاران گەڕیدەی شار و بازاڕم
لە بۆ گوڵ بۆ فیغان و زاری بولبول هەر سەحەرخێزە
ئەتۆش (ناسیح) سەحەرخێز بی دەبینی کوڵمی گوڵنارم

لەم شیعرەیدا ناسیح لە یار دوورە. لەباتی ئەوەی وەکو شاعیرانی دیکە بەخەیاڵ لە یار نزیک بێتەوە، هاوڕێیانی ڕادەسپێرێ دەردی دڵی بۆی باس بکەن. حەز بەوە دەکا ئەوانیش خۆشیان بوێ چونکە ئەمە دەبێتە بەڵگەی چێژی بەرزی ئەو جوانەی لە ناو کیژە قەشەنگانەدا هەڵیبژاردووە.

٣

لە تاکێکیدا ناسیح دەڵێ:

چاوەکەم پڕ ئاوە چاوم ڕۆژ و شەو بۆ چاوەکەت
چاری چاوم کەس نییە بیزانێ غەیری چاوەکەت

لەم دێڕە شیعرە جوانەدا شاعیر وشەی «چاو»ی چەند جارێک دووبارە کردۆتەوە. جگە لە پیشاندانی وێنەییێکی هونەری بۆ چاوی خۆی و چاوی دلبەر، جۆرە داهێنانێکی ڕیتمی مۆسیقی داوەتە شیعرەکە بەدووبارە و سێبارەکردنەوەی وشەی «چاو».

## شین بۆ سالمی کوڕی

سالم حەیدەری (١٩٢٦ - ١٩٧٧) کوڕی شاعیر یەکێ بوو لە ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەرانی کورد. خوێندنی بالای لە زانستیی کشتوکاڵدا تەواو کردبوو. لە میسر کۆچی دوایی کردبوو، بەم هۆیەوە ناسیح دەڵێ:

گوڵی باغی ئەمەلم تاقەت و هێزی لە تەنم
هەوینی ژین و حەیاتم کوڕەکەی شەنگ و شەنم
ڕۆژ و شەو فیکر و خەیاڵم بوو کەوا من دەمرم
پاشی من سالم دەکا تەجهیزی لەحد و کەفەنم

***

پاشی تۆ دنیایی ڕوونم لێ بووە داروززەلام
وەعی و ئیحساسم نەماوە وا لە خۆم بێ خەبەرم
بۆچی بڕیاری جودابیت لەگەڵ من دا وا بە زوو
ئاگرت بەردا لە جەرگم قەت نەما هۆش لە سەرم

ئەمە ناڵەی باوکێکی پشت شکاوە لە دەروونێکی پڕ لە سۆزەوە بۆ جیگەرگۆشەکەی بووە بەشیعر. ئەوە ڕاستە دایک و باوک نایانەوێ مەرگی منداڵیان ببینن. ئارەزووی ناسیح نەهاتە دی بەوەی خۆی پێش کوڕە گەورەی بمرێ.

***

ناسیح عەبدوڵلا حەیدەری شیعری بۆ خۆی و نزیکەکانی وتووە. شیعری لە ڕۆژنامە و کۆوار بلاونەکردۆتەوە، لە دوای مردنی دیوانی چاپ کراوە و پێشتر خەڵکی وەک شاعیر نەیانناسیوە. شیعری کەمە، لە بابەتەکانی ئایینی و دڵداری و ئامۆژگاری و ستایش و شیوەن و ماتەمنامەی وتووە. لە دڵدارییەکانیدا هەندێ نموونەی جوانی هێناوەتە ناو دیوانی شیعری کوردییەوە.

# بەشی بیست و نۆیەم

## ویسالی

**١٩٠٢ - ١٩٧٣**

### ژیانی

محەمەد کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ تەها مەردۆخی، لە شێخانی قەرەداغە، لە گوندی تەکیە لە ٢٢ی مارتی ١٩٠٢ لە دایک بووە. لەو کاتەی هەستی بەشیعر وتن کردووە وشەی «ویسالی» هەڵبژاردووە و وەک نازناو لە شیعریدا بەکاری هێناوە. لە دوای لە دایکبوونی بەماوەیێکی کەم دایکی مردووە، کە تەمەنی گەیشتۆتە شەش ساڵی باوکیشی کۆچی دوایی کردووە. ناچار ئامۆزاکانی دەیگرنە خۆیان تا تەمەنی دە ساڵی شوانی بۆیان کردووە. ڕۆژێک مەڕەکان دەبا بۆ گوندی قۆپی، کۆمەڵێک فەقێ لە سەیران دەبن. کە شوانکارە چاوی بەفەقێکان دەکەوێ بەزەیی بەخۆی دێتەوە، وا بیر دەکاتەوە ئەگەر هەتیوی بێ دایک و باوک نەبوایە ئەویش دەبوو بەقوتابی حوجرە. فەقێکان بانگی لای خۆیانی دەکەن، مامۆستایان شێخ بابە عەلی چاوی پێی دەکەوێ و بەڵێن دەدا یارمەتی بدا بۆ خوێندن. مامەکانی کە بەمەیان زانی ڕێگەیان نەدا بخوێنێ، هەر چۆنێ بێ شێخ بابە عەلی هەوڵی دا و لە دەست مامەکانی ڕزگاری کرد. لەبەرئەوەی بۆی نەدەچووە سەر لە قەرەداغ لە نزیک مامەکانیەوە دەست بەخوێندن بکا، شێخ بابە عەلی نامە بۆ شێخ عومەری قەرەداغی دەنووسی لە سلێمانی لە حوجرەی خانەقای مەولانا ببێ بەقوتابی.

حەمەی تەمەن دە ساڵی ڕوو دەکاتە سلێمانی و دەبێ بەقوتابی لە حوجرەی خانەقای مەولانا، لای شێخ عومەری قەرەداغی و شێخ مارفی قەرەداغی دەخوێنێ. لە دوای پێنج ساڵ شێخ عومەر دەینێرێ بۆ گوندی هەرزنی لە ناوچەی ئالانی کوردستانی ئێران لە نزیک پشدەر، سێ ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە.

لە تەمەنی هەژدە ساڵی ڕوو دەکاتە گوندی خوارەمیر دوو ساڵ لە حوجرە دەخوێنێ ئینجا بۆ ماوەی ساڵێک لە گوندی بێتووش بەرنامەکانی خوێندنی مەلایەتی دەباتە سەر. لەو کاتەدا کە تەمەنی بیست و دوو ساڵ دەبێ حەز لە کچێکی خزمی مامۆستای خۆی دەکا، بەم تاکە شیعرە هەستی ناوەوەی دەردەبڕێ بەرامبەر ئەو خۆشەویستە:



برۆ تاق و مەمک جووت وەک تاژی کەوتوومە دووت
قامیشەڵانی جیسمم بە بەرقی حوسنی تۆ سووت

لە دوای ئەوە هەوڵی خوازبێنی دلبەرەکەی دەدا، بەتووڕەیی وەرامی دەدەنەوە بە بەهانەی ئەوەی لە ئامۆزاییێکی مارە کراوە. ئاغا دەست ڕۆیشتووەکان هەوڵی بۆ دەدەن و پارەیێکی زۆر دەدەنە ئامۆزای کچەکە ئیتر بۆ ویسالی تەڵاقی دەدا و بەم جۆرە بەخۆشەویستی شاد دەبێ. ئیتر شاعیر لەگەڵ خێزانی بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەخوێندن و مەلایەتی لە ئاواییەکانی بارێی گەورە و بارێی بچووک لە ناوچەی سیوەیل و هەروەها لە گوندەکانی باسنێ و سپیدارە لە ناوچەی ماوەت دەباتە سەر. ئینجا ڕۆژگارێکی دیکەش لە ئاواییەکانی سوورەقەڵات و بەردەزەرد و سنجەلی و ڕەشەکانی دەژی. بۆ دوا جار گەڕاوەتەوە سنجەلی و لەوێ خێزانی خۆشەویستی بەکارەساتێک کۆچی دوایی دەکا. لە دوای ماوەیێک ژنێکی دیکە دێنێ و لە سلێمانی نیشتەجێ دەبێ تا لە ڕۆژی ٢٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣ لە سلێمانی کۆچی دوایی دەکا و هەر لەوێش دەنێژرێ.

### شیعری

لە بابەت ڕوخسار و ناوەڕۆکی شیعرەوە ویسالی زۆربەی هونەری شیعری کلاسیکی و مەبەستەکانی کۆکردۆتەوە. ئەوەی جێی سەرنج دانە لە ڕووی ڕوخسارەوە لە هەموو بابەتەکانی شیعری کلاسیکی نەنووسیوە کەچی لە ناوەڕۆکدا جۆراوجۆر و دەوڵەمەندە.

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

لە شیعرە عەرووزییەکانیدا ویسالی بەحری هەزەج و ڕەمەل و موزاریع و ڕەجەز و موتەقاریبی بەکارهێناوە، شیعری سیلابی خۆماڵی کەمە، هەموو کێشەکانی بەکارهێناوە بەتایبەتی دە بڕگەیی. لە بابەت قافیەوە دەوڵەمەندە. یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی) و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی شیعری لاسایی عوسمانی هەیە. ئەم جۆرە قافیانە لە شیعریدا بەرچاو دەکەون: (ا ا ب)، (ا ا ب ب جـ جـ)، (ا ا ا ا)، (ا ا).

لە شیعری یەکێتیی قافیەدا هەندێ لە دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە وەکو: ا ب ت د ر ز س ش غ ف ق ک ل م ن و وو (ـە - ە) ی ێ. لە پاش قافیەدا ئەم وشانەی بەکارهێناوە: نابێ، من، بێ، کەی (بکەی)، هەتاکەی (کەینێ)، دەکا، بڵێ چی، کرد، یا ڕەسولەڵڵا، بیارە، تەوێڵە، من، کە (بکە)، محەمەد

(موحەممەد)، کێچ، میراودەلبیە، سەماوەر.

لە دیوانی ویساڵیدا لیریک و قەسیدە (پۆیێم) و پارچەی لە حەوت دێڕە شیعر کەمتر و چوارین و قەسیدەی پێنجین دەکەونە بەرچاو. لە پێنج خشتەکیدا باڵا بووە، شیعری کۆمەڵێک شاعیری کردووە بەپێنج خشتەکی، لەوانە: وەفایی، تاهیر بەگ، زێوەر، سادق، فانی.

ویساڵی بایەخی بەشیعری موناسەبات و نامەی نێوان برادەران داوە، هەندێ لایەنی ژیان و کردەوەی ئەو برادەرانەی خستۆتە ڕوو. جگە لەمە بووکی نوێی دروست کردووە وەک قارەمانی شیعری دڵداری. شیعری لەم بابەتەی ناوی «ئامینە» و «ڕەیحان» دەور دەکەنەوە.

زمانی شیعری لە ڕووی فەرهەنگییەوە لە زمانی شیعری کلاسیکی زمانی ستانداردی قسەی ناو خەڵک و زمانی ئەدەبی میللی پێکهاتووە. ئاسانی و قورسیی زمانەکە لە مەبەسی شیعرەکە دەردەکەوێ. بایەخی زۆری بەڕەوانبێژی نەداوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکی وەرگرتووە و کەمێکیشی داهێناوە. لە پەخشانیشدا «مەولوودنامە»ی هەیە.

**شیعری لە ڕووی ناوەرۆکەوە**

ویساڵی تا پلەیێک کەسێتی هونەریی خۆی لە شیعری کوردیدا هەیە، تا ڕادەیێکیش داهێنانی لە بەرچاوە، خوێنەری کورد بەشەوقەوە شیعری دەخوێنێتەوە و گوێی لێ دەگرێ. لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر لە ناو گێتیی خەیاڵی هەندێ شاعیری گەورەی پێش خۆی تواوەتەوە وەکو نالی و مستەفا بەگی کوردی و ئەدەب (میسباح) و حەمدی و بێخود. هەرچۆنێ بێ کۆمەڵێک شیعری کە دەکەوێتە بەرگوێی خوێنەر یەکسەر شیعرێکی ئەو شاعیرانەی دێتەوە یاد. زۆر جار ڕەنگە تەنیا لەبەرئەوە بێ کێش و قافیەی شیعرەکەی ویساڵی لەگەڵ کێش و قافیەی ئەو شاعیرە یەکتری دەگرنەوە. هەرچی ناوەرۆکی ئەم جۆرە شیعرانەیە هەندێکی وەرگیراون و هی دیکەیان لە داهێنانی ویساڵی خۆیەتی. لەگەڵ ئەم هەموو تێبینییانە ئەم شیعرانە و شیعرەکانی دیکەی ئەم شاعیرە لە پلەیێکی بەرزی هونەری دان.

مەیدانی ناوەرۆکی بەرهەمی ویساڵی فراوانە، مەبەسە کلاسیکییە کۆنەکان و برێک لە تازەکانی گرتۆتەوە. هەندێ شیعری تایبەتییە بەمەبەسێک، هەندێ جاریش لە شیعرێکدا دوو مەبەس یا زیاتری تێکەڵ بەیەکتری کردووە.



ئەم بابەتانە لە شیعری ویساڵیدا دەبینرێن: موناجات (ئیلاهییات و نەعت و ستایشی ئایینی)، غەزەلیات و دڵداری، وەسفی هەمووو دیاردەیێکی ژیان و سروشت، نیشتمانپەروەری و کوردایەتی، ستایش و پێداهەڵدان، داشۆرین، کراوە (ئیرۆتیک)، هەندێ جار ئەم دوو مەبەسەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە.

ویساڵی لە وەسفدا توانایێکی تایبەتی هەیە، لە وەسفی ژیانی خۆیەوە دەستی پێ کردووە بۆ وەسفی ژیانی کۆمەڵ، کیژی جوان، ئینجا سروشتی کوردستان، وەکو دیمەنەکانی دەشتی مێرگاس و گوندی تەکیەی قەرەداغ و گوندی خوارەمیر تا دەگاتە مێش و مەگەز و کێچ و ئەسپێ و شتی دیکە.

**نموونەی شیعری ویساڵی**

**دڵداری**

١

لە شیعرێکیدا ویساڵی دەڵێ:

دڵ لە حەسرەت چاوی نازارە کەوا زاری دەکا<br>
هەروەکو سەی دەر ڕەقیبیش دێ برینداری دەکا<br>
نەوعی ئاهوو سرکە ئەسڵا دەفعەیێ بۆم ناگیرێ<br>
وەک غەزالەی بەڕ لە دەشتی غەفڵەتا یاری دەکا<br>
مووەدەتێکە وون بووە لێم قەلبەکەی غەم دیدەکەم<br>
تازە بیستوومە لە باغا کەسبی عەتتاری دەکا<br>
وا بە سەهلی تێ مەگەن دەردی گرانە عاشقی<br>
هەرکەسێ بی تالیبی بێ زوو گرفتاری دەکا<br>
دڵ وەها تالیب بە قەترەی نێو دەهانی دلبەرە<br>
نەوعی بولبول تا سەحەر بۆ غونچە گوڵ زاری دەکا<br>
گەر ببەخشێ شوعلەیێ بۆ دڵ بە چاوی مەرحەمەت<br>
ساعەتەن پەروانە ئاسا خۆی فیداکاری دەکا<br>
دڵ کە میحنەت کێشە قوربان وا فەقیر و سابیرە<br>
ئەییووب ئاسا حەمد و شوکری حەزرەتی باری دەکا

ئاگری هیجرانی دلبەر سینەیی کون کردووم
بەرقی حیرمان خوێن لە چاوی عاشقان جاری دەکا
ئێستە گەر مەهجوورە لە من غەمزەدە یاری عەزیز
باعیسی بەدکار ببینە ئەو کە بەدکاری دەکا
هەرکەسێ بەدکاری ئیشە یاخودا کوێر بێ و زەلیل
هەروەکو سەگ عاشقی شەیدا کە دڵداری دەکا
ئەی موسوڵمانان (ویساڵی) شێت بووە بۆ لەعلی یار
هەروەکو مەجنوون لە کێوان مەشقی ئازاری دەکا

دڵدارییێکە ویساڵی بەچێژی ڕۆژهەڵاتییانە دەیکا. وەسفی جوانیی ئەندامی لەش، دوان لە کردەوە و کرداری دلبەر بەدڵی شاعیر بێ یا نا. باس لە سەبری ئەیووب ئەو پێغەمبەرە پیاوچاکە دەکا، کە بووە بەڕەمزی چێشتنی ئێش و ئازارێک لە وزەی کەسدا نییە هەڵیگرێ، لە پێناوی ئەوەی کردگار لێی ڕازی بێ. بەمە دەیەوێ خۆشەویستییەکەی بگەیەنێتە پلەی ئەڤینیی کردگاری.

## ٢

ئامینە ناوێک بووە بەبووکی خەیاڵی ویساڵی بەم جۆرە بۆ هاوڕێیانی وەسفی دەکا:

ڕەفیقان سەیری ئامین کەن کە چ مومتاز و شیرینە
لە باغی جوانیا دائیم خەریکی ناز و گوڵ چینە
لە بۆ ماچی دەمی کوڵمی تەماشا ئەرقەمی زولفی
بە میسلی ئەژدەها هەردوو چ مەنناعێکی پەرژینە
دووسەد عاشق لە لای بمرن ئەبەد ڕوویان لە لا ناکا
ئەوەندەی عەیبە ئامینە کە چەند بێ ڕەحم و بێ دینە
بەجوانی ماهی ڕوخساری بە نەوعێ مەست و مەغروورە
لە کەس باکی نییە ئەسلا لە تیری تانە تەئمینە
بە تیری غەمزەیی نازی دڵ و جەرگم بریندارە
بیحەمدیللا شەهیدم من بە سوێی ئەو زامە خوێنینە
وەکو مەجنوونی سەرگەشتە هەمیشە جێم دەرودەشتە
لە عەشقی ڕوویی ئامینە کە دڵ هەر شوغلی ناڵینە



ڕەفیقان ئێوە هەروەک من تەماشای جوانی ئامین کەن
جەمالی جوانی ڕەنگینە بەڵێ قابیل بە تەحسینە
دەمی ئاخر ئەگەر جارێ ببینم ڕوویی پڕ نووری
سەلب نابێ ئیمانم ئەو مردنەیشم لە لا ژینە
زەعیف و زەردی ئامینم نەخۆشی دەردی ئامینم
لە دووری یاری شیرینم ووجوودم خەیلی بێ تینە
ئەگەر بۆم بانگی ئامین کەن بخوێنن سوورەتی یاسین
کە زیندوو ئەبمەوە دووبارە بە ئەو ئەلفازە شیرینە
(ویساڵی) دڵ بریندارە بە دەردی خۆی گرفتارە
شیفای ئەو دەرد و ئازارە بە ماچی لێوی ئامینە

ویساڵی تەنیا بۆ داهێنانی شیعری ڕوو دەکاتە هاوڕێیانی و وەسفی جوانی ئامینە دەکا، ئەگینا خوانەخواستە مەبەسی ئەوە نییە ئەو وەسفە کاریان لێ بکا و هەموویان حەز لە ئامینە بکەن و وەکو ویساڵی بۆی شێت بن. لەوانەیە مەبەسیش ئەوە بووبێ ئەو هاوڕێیانە لە دوای ئەم هەموو وەسفە بەچاوێکی دیکە تەماشای شاعیر بکەن و بەکەسێکی خاوەن چێژێکی بەرزی دابنێن، چونکە جوانێکی بێ وێنەی وەکو ئامینە دلبەرییەتی.

دیسانەوە شاعیر لە بابەت ئامینەوە لە پێنجینێکیدا دەڵێ:

نەماوە حاڵەتی ژینم لە دەس چوو ڕووحی شیرینم
ڕەفیقان بێنە سەر مەیتم هەتا ماوم بکەن شینم
دەسا ئامینە خۆی بانگ کەن بخوێنێ جارێ یاسینم
مەلا مەمشۆرە کفنم بۆ مەکە و مەخوێنە تەلقینم
وەکو پەروانە سووتاوم شەهیدی عەشقی ئامینم

## ٣

لە شیعرێکیدا ویساڵی موناجات لەگەڵ دلبەردا دەکا:

بێ عەتری گوڵت بولبولی دێوانە بڵێ چی
بێ شەمعی ڕوخت کۆششی پەروانە بڵێ چی

بێ زینەتی شمشادی قەد و قامەتی بەرزت
جیلوەی حوسن و لەنجەیی جانانە بڵێ چی
بێ شوعلەیی خورشیدی خەت و گەردنی سافت
فانۆس و چرا و لالەیی شاهانە بڵێ چی
تا چاوی خومارت سەبەبی ڕاحەتی دڵ بێ
ئاوازی نەی و نایی لە مەیخانە بڵێ چی
بێ کۆششی سەیری حەرەمی کەعبەیی حوسنت
دەروێش و هەموو ساکینی بتخانە بڵێ چی
بۆ ماچی دەمی تۆیە دڵی عاشقی مسکێن
وا خەستە وو غەمگێن و پەرێشانە بڵێ چی
لەو فەسڵەوە دوورە لە گوڵستانی ویساڵت
دڵ مات و مەلوول کەوتووە بێ جانە بڵێ چی
بێ جانی ویساڵی تۆ زەمانێکە (ویساڵی)
مەجنوون و سەراسیمە وو عوریانە بڵێ چی

لەم لیریکەدا شاعیر سیفەتی کۆمەڵێک لە ئەندامە جوانەکانی دلبەر کۆ دەکاتەوە لەگەڵ ناوی دەستەیێک لە خاوەن دڵان بەرامبەریان دەکا. لەولاوە هەندێ دیاردەی پێوەندییان بەدڵدارییەوە هەیە دەخاتە ڕوو، وەکو بلبل و پەپوولە و شاه و مەیخانە و بتخانە بۆ ئەوەی بڵێ ئەگەر ئەو سیفەتانە نەبن تاقمی دووەم بڵێن چی! بۆ بەڵگە ئەگەر شەوقی ڕوومەتی دلبەر نەبێ پەپوولە چی بۆ دەکرێ!.

٤

لە چوارینێکیدا دەڵێ:

شەرابی جەننەتم ناوێ بە غەیری وەسڵی مەعشووقان
کە بێ زینەت ئەمێنێ شەمعی لاچوو مەجلیسی ڕەندان
(ویساڵی) عاشقی یارە لە دووری یارە بیمارە
دڵی پڕ جۆش و هاوارە ئەڵێ یاڕەب بەسە حیرمان

ئەگەر ویساڵی بەدلبەر شاد بێ زۆر ئاساییە شەرابی بەهەشتی ناوێ. ئەگەر یەکێک



شەرابی بەهەشت ڕەت بکاتەوە دیارە گەیشتۆتە پلەیێکی بێ بەشی واوە کردگار نەبێ کەس ناگاتە فریای بۆ ئەوەی لە دلبەر نزیکی بکاتەوە.

## نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

لە شیعرێکیدا ویساڵی لە ساڵی ١٩١٩ نووسیویەتییەوە دەڵێ:

ئەی گەلانی کورد هۆشتان بەخۆ بێ
زۆر کەس بە خوێنتان تینووە و موشتاق
وەک دۆشاو و ماست تێکی هەڵ مەدەن
نەوەک موحتاج بن بە کووچە و سوقاق
بەماری زەمان یەکتر مەگەزن
تا نەکەن مەیلی تریاقی عیراق
برا تێک مەدەن خاکی کوردستان
خۆ دوچار مەکەن بە دەردی وەناق
گەر لە گوێ بگرن بەندی (ویساڵی)
موفیدە موفید تا ڕۆژی میساق

شاعیر هاوار بۆ هەموو گەلی کورد دەبا بەگەورە و بچووکەوە، لە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ، تێیان دەگەیەنی ئاگاداری خۆیان بن، دوژمنیان زۆرە لەبەرئەوە لە ناوەخۆدا نابێ دووبەرەکی هەبێ.

ئەم شیعرە وەکو دیارە لە کاتێکدا وتراوە، شێخ مەحموود لە ئەنجامی شەڕی بازیان لە لایەن ئینگلیزە داگیرکەرەکانەوە و لە دوای دادگاکردن ئاوارەی هیندستان کراوە. لەبەرئەوە شاعیر سوورە لەسەر ئەوەی پێویستە لە کۆمەڵی کوردەواریدا یەکێتی بەسەر هەموو شتێکی دیکەوە زاڵ بێ.

٢

لە قەسیدەیێکیدا ویساڵی باس لە واقیعێکی دواکەوتووی میللەتی کورد دەکا، وەکو هەیە نا وەک خەیاڵێکی ڕۆمانتیکییانەی ڕۆشنبیرێک لە فیکری خۆیدا دروستی دەکا و بەڕاستی دەزانێ:

تۆ کە پیاوی ڕوو لە زانین کە بە قەسەدت هەر ئەگەی
گەر بزانی زانین ئاخر مەقسەدت حاسیل ئەکا
گەر نەزانی دائەمێنی عاقیبەت هەر وەک فلان
لێک بەزانین باری عەیشی دین و دنیات ڕاست ئەکا
ئاسیای ئێمە کە کورتە باعیسی بێ عیلمییە
ئەوروپایی چونکە فەننین بوونە فەوقی ئاسیا
تۆ ئەگەر یەک ڕەنگ پەرست بی هەڵبژێرە ڕەنگی یەک
چونکە یەک ڕەنگ مەرتەبەی وا گەیوەتە ئەوجی سەما
تا ئەتوانی ئیختیاری دوو ڕەنگی هەرگیز مەکە
هەرچی دوو ڕەنگە هەمیشە سووک و ڕیسوا و نارەوا
ئیتتیفاق و ئیتتیحاد بۆ کورد نییە غەیری نیفاق
چون نیانە ئەم دوانە دائیمە کەوتوونە دوا
کورد ئەگەر دەست کورتی بێڵێت هیچی بێ جەوهەر نییە
وا لەبەر ڕووت و ڕەجاڵی بوونە پوولی نارەوا
لەم زەمانە عیلم و سەنعەت واسیتەی پێشکەوتنن
بێ بەشین لەو دوانە بووینە لاتی ئەم کێو و چیا
باغی کورد تازە نەمامە ئەکبەر ئاودێری ئەوێ
باغ کە ئاودێری نەبێت نەشئە و نەما لە کوێ ئەکا
کورد لە ئەووەل بەختی کەچ بوو هەر کەچی بۆ هاتە پێش
بولبولە و ناگاتە گوڵ هەرچەند ئەخوێنێ و هەوڵ ئەدا
کێوەکانی خاکی کوردستان کەوا گرتوویە تەم
ئاهی مەزڵوومە کەوا تاریکی کرد ئەرز و سەما
خاکی کوردستانی ئێمە ئێستا بێ ناز کەوتووە
چونکە بێ ساحێب بوو ئەسلا ڕەنجی کورد گشت چوو بە با
خاکی کوردستانی ئێمە ئەمسەرەوسەر خەزنەیە
نەفعەکەی بۆ غەیرە کوردیش وا لە بەش ساقیت کرا



ئێستە خوێنیشم بڕێژن مەوتینی خۆم هەر ئەوێ
دەستی لێ هەڵناگرم یەعنی هەتا ڕۆژی قیامە
ئەم قەسیدەی تۆیە هەرکەس بیستیی و جوان تێی گەیشت
گەر بە هیممەت بێ (ویساڵی) مەرتەبەی عالی ئەکا

شاعیر لەگەڵ کورد قسە دەکا و پێی دەڵێ دەبێ بزانی دواکەوتووە، هەوڵ بدا پێش بکەوێ، خۆی هەڵنەخەڵەتێنێ وابزانێ پێشکەوتووە. زانست و زانیاری دەرمانی هەموو دەردێکی کوردەوارییە. بەڵگەی ئەوەیە ئاشی ئێمە باش ناگەڕێ چونکە زانستیمان نییە، کەچی ئەوروپا بەزانستی و پیشەسازی هەموو ئاسیای داگیر کرد. بەکورد دەڵێ یەک ڕەنگ بێ، دوودڵ نەبێ. بەلایەوە کورد لەبەرئەوەی تازە نەمامە سەرۆکی باشی دەوێ. ئەو سەرۆکە نییە، لەبەرئەوە سروشتی کوردستانی دەوڵەمەند و سامانی نەتەوەیی دوژمن دەیخوا. نیشتمان هەرچی دەبێ با ببێ، ویساڵی خۆشی دەوێ، خۆی بەقوربانی دەکا.

## لەگەڵ کیژ و کەڵەشێر و چایە و سەماوەر

١

لە وەسفی کیژدا شاعیر دەڵێ:

ئەی برادەر سەیری شوورەی جەیشی بێ سامانی کیژ
وا هەموو بێهۆش و مات و عاجزی حەیرانی کیژ
هەروەکو هەوری غەزەب ئالوودەپۆشی ڕووی زەمین
یوحتەمیل دنیا ببێتە سەر بەسەر وێرانی کیژ
کێ هەیە ئیمڕۆ بلێ من پاڵەوان و سەفدەرم
گەر درۆ ناکا بەڕاستی بێتە بەر مەیدانی کیژ
دەوڵەتی ئینگلیز و ژاپۆن و هەم یۆنانییان
گشت فیراریان کرد لە دەس لەشکری ئەڵمانی کیژ
من کەوا ناشارەزا و بێ وەسیلە و قوڕبەسەر
وا بەزیللەت کەوتمە دوای جادوویی دیوانی کیژ
کەی ئەبێ یارەب نەجاتم بێ وەکو مووسا لە چنگ
لەشکری فیرعەونیان و حیلەیی هامانی کیژ

گەنجی سەبر و نەقدی عومر و پارچە پارچە عەقڵ و هۆش
هەر بەیەک شەو پاکی بوو غارەت و تالانی کیژ
هەرچی ئەیبینی لە عالەم ڕۆژ و شەو هاوارییە
دائیما وەک من لە دەستی زوڵم و تێهەڵدانی کیژ

ویسالّی شێوازێکی کۆمیدی و سیمبۆلییانەی بەکارهێناوە لە وەسفی ئەم گیانلەبەرە بچووکە بەلەش و گەورەیە بەئازاردانی خەڵکی. ئادەمزادی بەهێز و بەزەبر دادیەتی بەدەست کێچەوە. بۆ بەهێزی کێچ شاعیر بەلەشکری ئەڵمانی دەچوێنێ چۆن لە سەرەتای جەنگی دووەمی گێتی چوون بەگژ ئینگلیز و یابان و یۆنانەوە. لە پاشانا خێڵی کێچ لەگەڵ لەشکری فیرعەون و فیڵ و فەنەری هامان بەراوورد دەکا. خەڵکی ڕووی زەوی لەگەڵ شاعیر کەوتوونەتە ژێر باری زوڵم و زۆری کێچەوە.

شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

من کە خۆم دی وا زەلیل و مەلجەئیشم هیچ نەبوو
ناعیلاج هەڵسام و چوومە خزمەتی سوڵتانی کێچ
شەرحی حاڵی خۆم بە زیللەت دا لە خزمەتیا تەواو
یەعنی تاکەی مردم ئیتر بەسیە سەرگەردانی کێچ
پێی ووتم لاچۆ خزم چیت دیوە باسی چی ئەکەی
لێرە کوا کێچ! وا ئەڵێن پەیدا بووە دەرمانی کێچ
تۆ بڕۆ بۆ پشدەر و بیتوێن و دۆڵێ و شارەزوور
جا لەوێ ئەیبینی بێ شک سەف سەفی گورهانی کێچ
من بڵێم چی ڕووحەکەم بۆ ئینتیقامی ئەم حەقە
خۆت ئەزانی چەندە وەحشین میللەتی عوریانی کێچ
ئێستە چارەت یا تەنووری گەرمە یا ئاوی کوڵاو
زوو عیلاجی خۆت بکە تا نەبی نادانی کێچ
ئەی (ویسالّی) مژدە بێ لێت ڕەنگە ڕاهی بی لە دەس
حەربی کوففاری یەهوود و زەحمەتی زیندانی کێچ

شاعیر ناچار دەبێ بچێتە لای سوڵتانی تیرەی کێچ، بۆ ئەوەی شپرزەیی خۆی بۆ بگێڕێتەوە. لێی دەپاڕێتەوە لەم مەینەتییە ڕزگاری بکا. لە وەرامدا سوڵتان ئەوەی تێ



دەگەیەنی لێرە کێچ هیچی وا نەکردووە مایەی گازاندە بێ، پێی دەڵێ بڕۆ بۆ ناوچەکانی پشدەر و بیتوێن و دۆڵێ شارەزوور، لەوێ چاوت بەبەزمی کێچ دەکەوێ. هەرچۆنێ بێ ویسالّی چاوەنۆڕی ئەوەیە لە ئازاری کێچ ڕزگاری ببێ و هیوای ئەوەیە مرۆڤایەتی لە دەست جوولەکەی کافر و کێچی بەدفەڕ ڕزگارییان ببێ.

ویسالّی ئەم شیعرەی لە ساڵی ١٩٥٠ هۆنیوەتەوە. ئەوە ئاشکرایە لە دەوروبەری جەنگی دووەمی گێتی و پاش جەنگیش چینە هەژارەکانی ناو کۆمەڵ لەبەر پیس و پۆخڵی تووشی ئازاری ڕشک و ئەسپی و کێچ و مێش و مەگەز و ئەو جۆرە زیندەوەرانە دەبوون. هەروەها لە فەلەستینیش مەسەلەی دژایەتی عەرەبی موسوڵمان و جوولەکە کەوتبووە ناوەوە و زۆربەی خەڵکی موسوڵمانی سەر ڕووی زەوی لە دژی دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل بوون. لێرەدا شاعیر بەبیروباوەڕێکی ئایینییەوە ئازاری کێچ لەگەڵ جوولەکە بەراوورد دەکا.

## ٢

لە وەسفی کەڵەشێرێک شاعیر دەڵێ:

ئەوا بۆت هات کەڵەشێرێکی مل ڕووت
لە بۆی پەیدا کە جنسی ببنە هاوجووت
هەتا زوو یاری بۆ ساز کەی درەنگە
نەوەک سوێی بێتەوە بێچارە بێ جووت
لە غوربەت دا ئەگەر بمرێ بەبێ جووت
هەموو ئۆباڵەکەی ئەو دێتە ئەستۆت
عەجەب جنسێکە حەیفە تۆ و بڕاو بێت
کە لاهووتی بوو خودا هێنایە ناسووت
لە بۆ زینەت هەڵی بگرە زەمانێک
دروس کە پاوانە بۆ پێی لە یاقووت

لە کوردەواریدا کەڵەشێر تەنیا بۆ گۆشتی بەخێو ناکرێ، بۆ جوانی و شەڕە کەڵەشێریش بەکار دەهێنرێ. گێتیی ئەو باڵندەیە بووە بەسەرچاوە بۆ داهێنانی شیعر لە ئەدەبی نەتەوەکاندا. ویسالّی لەم شیعرەیدا بایەخی بەلایەنی سێکسی ئەم باڵندەیە داوە وەک نێرێک لە نەژادی خۆی، داوا لە خاوەنەکەی دەکا ژنی بۆ بێنێ، واتە مریشکی بۆ پەیدا بکا.

## ٣

له وەسفی چایە ویسالّی دەلّێ:

برادەر هەرکەسێ چابێ دەبێ ئەو یاوەری چابێ
لەگەڵ ئەسبابی چایی حازر و دائیم موهەییا بێ
کە چا بێ هەر لەگەڵ چابێ کە چا بێ موئنیسی چا بێ
بەچا بێ نیسبەتی چابێ کە چا بێ هەمسەری چا بێ
لە دنیا چایە مەمدووحە بەبێ چا عەیشی مەقبووحە
بە چا مەیخانە مەنجووحە بە چایە مەجلیس ئارا بێ

***

لەسەر ئەم ئەرزە ڕەنگینە خەبیس بۆ پیسە بیبینە
کە چا بۆ قەندی شیرینە نیکۆیی بۆ بەدان نابێ
بەلّێ هەر چیزە بۆ چیزێ ئەنێرێ چیزێ بۆ چیزێ
بەلّێ هەرڕێزە بۆ ڕێزی خەراپە نابێ بۆ چا بێ

***

حەقیقەت چی بلّێی وایە فەقەت عەقدی لە دڵ دایە
چ مەردێ لایقی چایە چ مەردێ لێی مووبەڕڕا بێ
(ویسالّی) تۆ وەرە مەیدان جوابی دە وەکو مەردان
کەسێ چاکە لە نێو خووبان کە چاکەی ئەو هووەیدا بێ

***

کەسی تالیب بەچایی بێ دەبێ لایق بە شاهی بێ
نە کوردێکی بەڕڕانی بێ سەفیهو ڕوو بە سەحرا بێ
کەسێ ئەهلی تەبیعەت بێ دەبێ بۆ چا بە ڕەغبەت بێ
لە دووری چا بە میحنەت بێ دەبێ غوربەتکەشی چا بێ

***

کەسێ بێ تەبعی مەوزوون بێ دەبێ بۆ چایی مەحزوون بێ
بە شوربی چایی مەمنوون بێ کە چایە لەززەتی چا بێ



کەسێ وەک من کە بێ چا بێ دەبێ دایم لە غەمدا بێ
وەکو پەروانە سووتا بێ زەلیل و عاجزی چا بێ
(ویسالّی) ئێستا بۆ چایە وەکو مەجنوونی شەیدایە
بە دایم وێلّی سەحرایە مەگەر لەیلای چا با بێ

چایە و سەماوەر و کەلوپەلی ڕەنگیان لە ئەدەبی کوردی داوەتەوە. لەم قەسیدە درێژەدا شاعیر خۆی بەلایەنی ڕەوانبێژییەوە خەریک کردووە، بەتایبەتی لە ڕووی ڕیتم و ئاوازی دەنگی وشەکان بەگشتی و زیاتریش بەکارهێنانی وشەی «چا» بەهەردوو مانای «چایە» و «چاک» بەمانای باش.

## ٤

له وەسفی سەماوەر ویسالّی دەلّێ:

تەماشاکەن لە مەیدانا سەماوەر
خەریکی شین و گریانە سەماوەر
میسالی بێوەیی کورمردە دایم
خەریکی شین و گریانە سەماوەر
هەمیشە چاو پڕ ئاو و دڵ پڕ لە ئاگر
لە زومرەی دڵ حەزینانە سەماوەر

***

عەجایب مەجلیس ئارایە و دڵ ئەفرووز
وەکو شەمعی شەبستانە سەماوەر
بەمیسلی بولبولی شەیدا شەو و ڕۆژ
بەئاه و سۆز و گریانە سەماوەر

***

بە کۆهی بێستوونی هیجری چایی
عەجەب فەرهادی بێ جانە سەماوەر
گرفتاری خەمی زولفەینی یارە
بەمیسلی شێخی سەنعانە سەماوەر

وەکو دەروێش و شێخی ئەم زەمانە
خەریکی تەپڵ لێدانە سەماوەر
بە زاهیر گەرچی مەستی ناری عەشقە
بە دڵ مەشغوولی ڕەحمانە سەماوەر

لای ویساڵی سەماوەری بەنەژاد ڕووس بەمانای «خۆی دەکوڵێ» بووە بەرەمزی گیانلەبەرێکی نائاسایی، ئاوی ناو زگی و کوڵان و گیزە گیز و بەجۆش هاتنی بووە بەبەڵگەی چێژ و خەیاڵی سۆفیزم. دیمەنی سەماوەر لە کۆڕی عاشقان و شاهاندا ویجد و مەستی دەخاتە دڵ و دەروونی خاوەن دڵان. دەمێک فەرهادە بۆ شیرین و دەمێکی دیکە شێخی سەنعانە بۆ کچە گاوور دەناڵێنێ. قسە پڕ لە سۆزەکانی ئەوەیە تەپڵ و یاهووی دەروێشان ناو دەروونی گەردوون دێننە هەژان. بەڕاستیش ئیشوکاری سەمارەر ئامادەکردنی چایەیە.

## لەگەڵ نالی و ئەدەب و بێخود

ویساڵی قەسیدەییێکی بەندی پێنجینی کراوەی (ئیرۆتیکی) داناوە، ئیلهامی لە نالی و ئەدەب (میسباح) وەرگرتووە، مەستوورەی نالی و نوسرەت خانمی ئەدەبی هێناوە و تێکەڵی یەکتربیانی کردووە، کێش و قافیە و پاش قافیە و زمانی شیعری و لێکسیکۆن و ڕەوانبێژی هەردوو شاعیری پاراستووە، ئینجا هەندێ خەیاڵ و چێژ و ئەندێشەی خۆشی تێ ئاخنیوە و قەسیدەییێکی ڕەندی لێ دروست کردووە.

ویساڵی شیعرەکەی بەم پێنجینانە دەست پێ دەکا:

ئینسانی وەکو من کە فەلەک نەفرەتی دابێ
بەم حاڵە هەموودەم لە وەتەن دوور و جودا بێ
پابەندی ڕەهی غوربەت و دووچاری بەڵا بێ
بێچارە دڵی تا لە غەم و غوسسە ڕەها بێ
وا چاکە بەشەو دلبەری غەمخواری لە لا بێ
غەمخواری وەفاپەروەری خۆش نەقش و نیگارێ
یەک سیمبەری تاجی سەری میهری دیارێ



باڵا میان عەرعەری قەد سەروی چنارێ
دڵداری جەبین ئەنوەرێ هەم لالەعوزارێ
هەر تایە لە زولفی بە مەسەل ماری سیا بێ
بینایی بەسەر ڕاحەتی دڵ قووەتی تەن بێ
ئەرکانی حەیات و سەبەبی نەزمی بەدەن بێ
شمشاد قەدێ مووکەمەرێ لالە سەمەن بێ
نەشکوفتە گوڵی غونچە دەمێ بەستە دەهەن بێ
پێویستە کە غەمخوار و یاری بە وەفا بێ
نەورەستە گوڵێ بێ کە بە بێ خار و دڕک بێ
یاری بێ تەڕ و تازە وو گوڵبەرگی لەچک بێ
بینتێکی بەدەن نازک و هەم نەرم و شلک بێ
وەک ناری خڕی گوڵ بە دەمی تازە مەمک بێ
دندانی وەکو گوهەر و دوڕ بە بەها بێ
هەرچەندە کە هەر دێتەوە سەر چاردە ساڵی
گەر بێتو هەماغووشی کەسێ بێ بە حەڵاڵی
خاریج بێ لە تەقریری زمان حەددی کەمالی
بیروون بێ لە تەحریری قەڵەم حوسن و جەمالی
ئەربابی سەفا مەعدەنی حەق کانی حەیا بێ
نەقشین و سیەه پەرچەم و ئەگریجە موعەتتەر
ئەبرۆیی هیلالی وەکو میحرابی بەرابەر
موژگانی وەکو نێزە وو چاوی وەکو ئەختەر
ڕوخساری دەکا حوجرەیی تاریک مونەووەر
خورشید سیفەت ساحیبی ئەنوار و زیا بێ

لەم پێنجینانەدا ویساڵی لاسایی ئەدەب (میسباح) دەکاتەوە، ئەویان وەسفی ئەندامە جوانەکانی نوسرەت خانم دەکا ئەمیان ئەندامی ئامینە خان. وێنە داهێنراوەکان هەر

ئەوانەن لە شیعری کلاسیکیدا هاتوون. شاعیر هەوڵ دەدا وەکو ئەدەب لە ئەندامی دلبەرەکەی بدوێ لە تەوقی سەرییەوە تا بنی پێی. بەگشتی باسی هەموویان دەکا، بەڵام بەرێز لە سەرەوە خوار نابێتەوە، بەڵکو هەرچی خەیاڵی بۆ بچێ باسی لێوە دەکا. بەم جۆرە شاعیر لەسەر وەسفەکانی دەڕوا و دەڵێ:

موشکین و موعەنبەر مووێ ڕوومەت گوڵەباغێ
چاومەست و کەمان ئەبرۆیێ ڕوو شێوە چراغێ
ڕۆژ بێتە گوڵی مەجلیس و شەو شەمعی وەتاغێ
خاڵێکی لە گۆنا بێ وەکو زاغێ لە باغێ
ئەو خاڵە خەیاڵی خیرەدی حوکەما بێ

شەوگاری وەها یەعنی دەمی پاییز و زستان
زۆر خۆشە لەگەڵ هاودەم و هەم سوحبەتی مەستان
واسیل بێ بە باغاتی گوڵی سینە وو بوستان
نارنجی شەمامەی بەغەلی بگری لە دەستان
پڕ چنگ وەکو بەی سەری پەنجەسوا بێ

جانانی سنەوبەر بەری قەد میسلی مناریێ
تەرلانی بەدەن شووش و جوولانی گوڵەناریێ
فەتتانی نەباتێ لە دوو لێوانی ببارێ
بستێنە بەدەم بۆسەوە شیرین مەزارێ
یاقووتی ڕەوان بە مەسەل ئاوی بەقا بێ

ئەندامی کە سەر تا بە قەدەم زێوەر و خشلن
وەک سینە بە سنجاقەوە وەک دەستی بەبازن
گەه ماچی دەمادەم بکە گەه دەس لە گەردن
لاولاو سیفەت دەم بە دەم تێکەڵی یەک بن
یەک بۆسە لە خەددی سەمەنی ئەرز و سەما بێ

ڕووبەندی لە ڕوو لابدە با دەرکەوێ خاڵی
هەمسەر بە لەگەڵ دەسرەی ڕەش و چەفتەیی ئاڵی



یەک تەن بە لەگەڵ سینە وو پشت و بز و باڵی
یەکسەر کە کراسی بەر و یەکبەر کە شەواڵی
واسیل بە بەگەنجێ کە تەلیسمی نەشکا بێ

شاعیر هێشتا لە وەسفی ئەم پەیکەرە جوانە دایە، خەریکی سنگ و مەمکیەتی، باس لە ماچ و مووچ و دەسبازی دەکا. شەوانی پاییز و زستانی هەڵبژاردووە بۆ ئەم کارە، چونکە درێژترین شەوانی هەموو کەژەکانن. لە وەسفیدا شاعیر لە سنگ و مەمک بەرەو خوارتر دەبێتەوە تا دەگاتە ئەوەی کراسی دلبەر هەڵدەداتەوە بۆ ئەوەی بگاتە ئەو گەنجینە سەر مۆرەی تەلیسمی نەشکاوە. زۆربەی قەسیدەکە بۆ ئەمە تەرخان کراوە، دەڵێ:

گەنجێکی وەها بێ بە مەسەل خەزنەیی سوڵتان
مومکین نەبێ دیداری لە بۆ دیدەیی ئینسان
مەحفووز بێ لە فیکری بەد و مەحرووس بێ لە تالان
نەیدیبێ چ ئەعزایێ بەجوز پەنجەیی دەستان
سیرڕێ بێ کەمانەندی سوها بێ نەسوا بێ

قوببێکی موددەووەر بە مەسەل بەیزەیی بەیزا
دورجێکی موجەوهەر بێ وەکو دورجی شەهنشا
مەخفی بێ لە عالەم لە سەرا تا بە سووڕەییا
گوڵ گون بێ مەیان لە نەزەر لالەیی حەمرا
دوڕڕێکی درەخشەندە وەکو نەجمی سەما بێ

بەرجەستە بێ ئەو قوببە وەکو قوببەیی قەندیل
مەمدووح بێ لە نێو عالەم و لایق بێ بە تەبجیل
نەیدیبێ بەنی ئادەم و نەیکردبێ تەحسیل
ئەم عالەمە تالیب بێ لە بۆ وەسڵی بە تەعجیل
دوککانی توحەف بە حورووف عەینی بەقا بێ

نوکتێکی دەقیق بێ کە شرووحی نەکرا بێ
بەحسی ئەوێ بۆ خەلقی هەموو عەینی خەتابێ
وەک غونچەیی نەشکوفتە حیجابی نەدڕا بێ
وەک دوڕ و سەدەف ساحیبی ئیعزاز و بەها بێ
ئایینە سیفەت جیلوەدەهو عەکسی نما بێ

وەک خەیمەیی سوڵتانی دەبێ ڕوو لە هەوا بێ
ڕەنگین بی بە بەرزی لە نەزەر میسلی سەما بێ
وەک کارگی کوێستانی سپی بێ بە سەفا بێ
هێند تورت و لەتیف بێ سەری نەختێ قلّیشا بێ
پۆشیدە وەکو سۆفی لە نێو خەڵوە خزا بێ
یا کۆمەڵە زیوێ لە سەخا دوور و بەعید بێ
وەک لەعلی بەدەخشانی عەجەب سفت و سەعید بێ
گوڵبەر بێ وەکو ناری خڕ و تازە ڕەسید بێ
وەک بەرگی گوڵاڵ وەقتی نیهان قەترە چەکید بێ
دڵ تەنگ بێ بە روشدی وەکو تەبعی مەلا بێ
شەیئێکی تیا بێ بە مەسەل چووزەرە ڕێواس
درزێکی پەیا کردبی بەو دوڕڕە چو ئەڵماس
مەحفووز بێ لە بەدکار (من الجنة والناس)
تەوسیفی دەمی تەنگی سەر خەڵکی بکا کاس
قورسێکی موزەهەب بێ وەکو دورجی تەلا بێ
گەنجینەیی ئەو گەنجە بلوورینە سورین بێ
وەستا بێ لەسەر ساقی وەکو دوڕڕی سەمین بێ
زانوویی وەکو قوببەیی ڕەنگین حەسین بێ
ساقی وەکو ئەستوونەیی زەڕڕین مەتین بێ
کەعبی وەکو یاقووت لە بۆ قووەت دەوا بێ
ئەقدامی عەسەل بێت و موسەففا بە کەمالی
وەک شیری سپی بێت و وەکو مەی بێ بە ئالی
یارێکی عەقەب نازک و مەتبووعی (ویساڵی)
خڕ بێت و مودەووەر بێ وەکو سێو بێ بە کاڵی
بۆ دەردی (ویساڵی) بەری پێی ئاوی شیفا بێ

لەم پێنجینانەدا ویساڵی لاسایی نالی دەکاتەوە، لە گەنجینەکەی مەستوورە ئیلهام وەردەگرێ بۆ گەنجینەی ئامینە. هەندێ وێنەی نالی وەکو خۆی دووبارە دەکاتەوە، هەندێکی دیکە داهێنانی خۆیەتی. وەسفەکانی ویساڵی وەکو لێکدانەوە یا ڕوونکردنەوەی



وەسفی نالی دەکەونە بەرچاو. یەکێ لە داهێنانەکانی ویساڵی ئەوەیە وەسفی سمتی خڕی ئامینە دەکا، وێنەکە وا دەکێشێ وەکو ئەوەی سمتەکە پاسەوانی گەنجینەی دلبەری نازدار بێ، لە ژووررووی لاق و ڕانیەوە یاقووتی نەسمراو لە نێوان دوو گردی زیوین خۆی دەنوێنێ.

شاعیر بەهەناسەییێکی دڵداری زەمینی ئەم شیعرەی وتووە، هەندێکی لە شاعیرانی پێش خۆی وەرگرتووە، هەندێکی دیکەی لە داهێنانی خۆیەتی، بەمە مەبەسی شیعری کراوەی سەدەی نۆزدەمی لە سەدەی بیستەمدا تازە کردۆتەوە.

## ٢

لە پێنجینێکی دیکەیدا ویساڵی لە سەراوپەردەی دلبەری ئەدەب (میسباح) خەون بەبووکی شیعری خۆی دەبینێ:

دوێ شەوێ لە مەیکەدە شاهید بە ڕوویی نازەوە
هاتبووە بەزمی عاشقان بەسەد رمووز و ڕازەوە
ئامادە بوو موتریب لەوێ بە تار و چەنگ و سازەوە
ساقیش بە جام و بادەوە بە غەمزە و فەخر و نازەوە
گەدا بوو پادشا لەوێ بەسەد هەزار ئەیازەوە
عەجەب شەوێ بوو ئەو شەوە جام بلوورینی دەم بەدەم
دائیر بوو دایم پڕ لە مەی مانەندی دەوری بەزمی جەم
جۆش هاتبوو بەناری عەشق کوورەی دڵی ئەهلی کەرەم
لەم دەوری پڕ عەدالەتە نەما بوو زوڵم و جەور و غەم
ڕەقیب خەریک بوو شەق بەرێ بەڕەنگی وەک بەرازەوە
بەڵێ زۆر خۆش بوو ئەودەمە سەیری گوڵستان و چەمەن
ڕەنگین بوو سارا بە گوڵی مینا وو لالە وو سەمەن
ئاوازی قومری و عەندەلیب خۆش بوو لە گوێچکەی ئەنجومەن
هەرکەس باوەشی گرتبوو شیرین حەبیبەی گوڵ بەدەن
منیش ئەمروانی بۆ دلبەر کە بێ لە ڕێی نیازەوە
کە دیم لە وەختی سوبحدەم شۆخێ بە دوو شەمامەوە
سەلامی کرد و هاتە پێش قەدەم قەدەم بەلامەوە

لەبانی نایە سەر لەبم بە ناز و ئیبتیسامەوە
لە خۆشییا هۆشم نەما حەیاتی خستە قامەوە
بۆ قەتلی عاشق هاتبوو بە شەمع و جان گەدازەوە

حەمدەن زەمانی عوشرەتە ڕۆیی بەجارێ هەوری غەم
ساریێژ بوو زامی تیغی غەم نەماوە هیچ دەرد و ستەم
حەدیقە جوان و خۆش هەوا هەروەک گوڵستانی ئیرەم
مەیخانە ساز و پڕ نەوا لە دەنگی ساز و زیڕ و بەم
بە جامی زەڕلی من ئەدا ساقی بەعیشوە و نازەوە

ئەی نەونیهالی مەستی جەم ئەی یاری گوڵعوزاری من
ئەی سەروی باغی گوڵ بەدەم ئەی شۆخی نازداری من
ئەی شەمعی عاشقان بەجەم ئەی نووری چاوی تاری من
ئەی دافیعی دەرد و ئەلەم ئەی غونچەیی هەزاری من
هێنای بەهاری عاشقان بەڕەنگ و بۆیی تازەوە

بەلەنجە چون کەبووتەری لە شێوەدا وەکو پەری
مەوزوونە سەروی قامەتت مانەندی تەبعی ئەنوەری
حەیاتی جاویدان ئەدەی بەلێو کە عەینی کەوسەری
کردت بە ڕۆژ دەیجووری شەو بە ڕوو وەک شەمسی ئەنوەری
تەسدیقە دەعوای یووسفیت بەجووتێ چاوی بازەوە

سوبحی فەرەح تلووعی کرد ڕەقیب خەریکی هیجرەتە
عوسرەت بەجارێ باری کرد ڕۆژی ویساڵ و عوشرەتە
ڕۆیی زستانی حوزن و غەم بەهاری عەیش و لەززەتە
مژدە (ویساڵی) مەیکەدە ئیمڕۆ میسالی جەننەتە
مەعشووقە ڕووی لە ڕەحمەتە لە لوتفی بێ نیازەوە

لەو خەونەدا شاعیر بەدلبەری شاد دەبێ، جێگە سەر ڕووی زەوی نییە، لە بەهەشت دایە چونکە خۆشەویست لە پەری دەکا. کات شەوە، مۆسیقا و گۆرانییە، مەی نۆشی و مەستیی و جوانییە. شاعیر هەوڵ دەدا ئەم ڕابواردنەی گیانی بێ، لە سۆفیزمەوە نزیک بێ، بەڵام جامی مەی لە زێڕ دروست کردووە بەمە شێوەییێکی ئوروستوکراتی داوەتە کۆڕی غیلمان و پەرییان.



## ٣

لە قەسیدەبەندێکی چواریندا ویساڵی سەر لە شیعرە بەناوبانگەکەی بێخود دەدا «لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دڵی من...» بەمانا لەسەر هەوای ئەو شیعرە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە دەڵێ:

مەجنوون و سەراسیمە وو داماوە دڵی من
سەرگەشتە وو دێوانە و خەلافاوە دڵی من
بەینێکە لە من وون بووە خەجڵاوە دڵی من
نازانم ئەو مردووە یا ماوە دڵی من

ئاخۆ وەکو یەعقووب لە کوێ مەشغووڵە بەگریان
یاخود لە کوێ مەحبووسە وەکو شاهیدی کەنعان
مەعلووم بەدەمی تیغی غەم و غوسسەیی دەوران
ئەندامی وەکو قیمەیی کوتراوە دڵی من

پرسیومە گەلێ جار لە ئەحباب و لە ئەغیار
دێوانەیی جننی بووە یا عاشقی دڵدار
بۆ چ وا بووە بێگانە لە باغات و لە گوڵزار
دەردی ئەبێ چی بێ لە چ ئاڵاوە دڵی من

لەو ساتەوە ڕۆیشتووە تۆراوە لە یاران
نەمزانی بۆ کوێ چووە ئەو ئەبلەهی نادان
وەک وەحشی ئەبێ چوو بێ لە بۆ چۆڵ و بیابان
یا ڕەببی بە چ مەتلووبێ خەریک ماوە دڵی من

چبکەم چ بڵێم بۆ دڵەکەی زار و عەلیلم
باوەڕ بکە لەوساوە منیش خوار و زەلیلم
نەماوە لە هیچ لاوە کە بێدار و ڕەزیلم
یاڕەب بکەی ڕەحمێ لێی قەوماوە دڵی من

وەک حەپسێ لە زیندانی غەما بێکەس و دیلم
کوێی بۆ بگەڕێم بۆ دڵەکەی عاجز و زیرم

دایم لە خـــەیاڵمـــایە ئەبەد ناچێ لە بیـــرم
ئاخــــۆ بـە چ داوێکـەوە تاســــاوە دڵـی مـن
لەوســـاوە کـــە ئاوارەیە لەم خـــاک و وولاتە
هەرچەند ئەگەڕێم بێ ئەسەر و بێ دەنگ و ماتە
وا دیارە لە لای یاری بە ئومێـــدی خـــەلاتە
بۆیەکــە وەها بێ ســەروشــوێن مــاوە دڵی من

ئەگەر شیعرەکەی بێخود لە نزیکەوە لێی بیستـرا بێ بۆ برازاییێکی وتووە لە ڕووباری دیجلەی بەغدا خنکاوە، کەس نازانی ئەمەی ویسالّی بۆ کێی وتووە! شاعیر وەکو چۆن لە ڕوخساری شیعرەکەی بێخود نەچۆتە دەرەوە، لە ناوەرۆکیشدا لە دەوروبەری ئەو سووڕاوەتەوە. هەندێ ڕستەی وەکو خۆی گواستۆتەوە، هەندێکی دیکەی وشەکانی گۆڕیوە بەمەرجێ هەر ئەو مانایە دەدا بەدەستەوە کە بێخود مەبەسی بووە. لەبەرئەوە ئەم شیعرەی ویسالّی زادەی ماتەمنامەکەی بێخودە. جگە لە ویسالّی شاعیری دیکەش لاساییان کردۆتەوە و شیعری ڕەندیان هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

***

محەمەدی کوڕی شێخ ئەحمەدی ناسراو بەویسالّی هەتیوێکی هەژاری بێ دایک و باوک بوو. شوانی بۆ خزمەکانی کردووە چونکە نەیانویستووە بخوێنێ بۆ ئەوەی شوانییان بۆ بکا. ڕێکەوت کەسێکی جوامێر و ڕەوشت بەرزی بۆ دۆزیوەتەوە و دەستی گرتووە و لەبەر خوێندنی داناوە. ژیانی هەژاری بەچاکە بۆی گەڕاوەتەوە و تووشی گەشبینی کردووە، نیشتمانی خۆشویستووە، ئەمە هانی داوە کوردایەتی بکا. هەژارانی بەلێقەوماو ناسیوە بۆیە لەسەریانی کردۆتەوە. بەڕاستی دلّداری لەگەلّ ژندا کردووە، دووڕوو نەبووە لە پێوەندییە نهێنییەکانی دەسبازی و ماچ و مووچ، هەمووی خستۆتە ناو شیعرییەوە.

ویسالّی لە زۆربەی بابەتەکانی شیعری کلاسیکی و سەردەمی خۆی وتووە. شێوازی ئاسان و فەرهەنگی زمانی شیعری دەولّەمەندە. زۆربەی خەلّکی کورد چێژی لێ وەردەگرن.

## بەشی سێیەم

## ڕەمزی

**١٩٠٢ - ١٩٧٦**

### ژیانی

لەگەڵ خۆدا هەتاکو کەی شەڕوشۆڕ
لەگـەڵ بێگانەشـا سـوڵح و تەبایی

مـحەمەد مارف کـوڕی مـەلا ڕەسووڵ کـوڕی ئەحمەد لە سـاڵی ١٩٠٢ لە سلێـمانی لە دایک بووە. لە تەمەنی پێنج سـاڵیـدا خراوەتە بەر خوێندن لە حوجرەی مـەلا سەعـیدی زەلزەلەیی، لە تەمەنی هەشت ساڵیـدا ماوەیێک لە قوتابخانەی ڕوشـدییەی عـوسمـانی خوێندوویەتی. لە خوێندندا زیرەک بووە، مامۆستاکانی خۆشیـان ویستووە، ناویان ناوە ڕەمزی، لە پاشانا بووە بەناوی ڕاستـەقینە بۆی، ئیـتر کردوویەتی بەنازناوی شیـعری و بەرهەمی بەو ناوەوە تۆمـار کردووە. لە ناو خـەڵکی بە«ڕەمـزی» و «ڕەمزی مەلا مـارف» ناسراوە.

یەکـەمین کـاری لە مووچەخـۆری میـری لە سـاڵی ١٩٢٧ بەتەحـسیلدار لە هەڵەبجـە دامەزراوە. لەوساوە تا سەردەمی خانەنشینی لە کاری دارایی ماوەتەوە و بووە بەپسپـۆر لەم ئیشـەیدا. زیاتر لە سی ساڵ لە کوردستانی عیراق و باشووری عیـراق بەبێ گیـروگرفت کاروباری وەزیفەی بردۆتە سەر. لە شارانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و نەجەف و کەربەلا زیندەگانی کردووە و وەزیفەی میری بینیووە.

پێوەندی ڕەمزی لە ناو هەموو کۆمەڵی ئەو شارانەی تیایاندا ژیاوە زیاتر لەگەڵ ڕۆشنبیر و شاعـیر و نووسـەران بووە. شیـعر خـوێندنەوە و باس و خـواسی ئەدەبی پێ خـۆش بووە، هەندێ جـار ئەمە بووە بەسەرچاوەی ئیلهـام، چونکە ڕەمـزی ئامادە بوو لە هەڵوێسـتـێکی دیاریکراودا لەپڕ شیعری بۆ بێ. لەم بابەتە شیـعرەی هەیە. لە سـاڵی ١٩٦١ خـانەنشین کـرا. لە ژیانی تازەیدا لە کـۆڕی شیـعـردۆست و ڕۆشنبیـران نزیک بوو، وەکـو شـاعـیـر و هونەروەرێک حەزی بەهاوڕێیەتی لاوان دەکرد، دڵی تەڕ بوو، کچی جوان ئیلهامی شیعری پێ دەبەخشی. بەگشـتی ژیانی ڕەمـزی هێـمن و لەسەرخـۆ و بێ قـۆرت بوو، بەڵام مـاوەی پێش مـاڵئـاوایی دادی بوو لە دەست نەخـۆشی شێرپەنجـە و ئازاری بەدەسـتـەوە چەشت تا



ڕۆژی ١٨ی تەمـووزی سـاڵی ١٩٧٦ کـۆچی دوایی کـرد و لە گـۆڕسـتـانی گـردی سـەیوان بەخاک سپێررا.

### شیعری

ڕەمزی شاعیرێکی ڕەسەن بوو. شیعری ئاسان بوو، توانای ئەوەی هەبوو بیرۆکەی ئاسایی بخـاتە قـاڵبی شـیـعـرەوە و بەرهەمی داهێنراوی لێ دروست بکا. وێنەی ڕەوانبـێـژی لە شـیـعـریدا هەیە بەڵام لە ناو تەمـومـژی سیـمـبۆلی و ڕۆمـانتـیکی نایـخنکێنێ، لەبەرئەوە زۆربەی شیـعری مـاناکانیان لە سـەرەوەیە، لەگـەڵ وشە و زاراوە و ڕسـتـە و تەعـبیر. مـانای ژێرەوە لە شیعریدا زۆر نییە.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

ڕەمزی لە قاڵبی شیعری کلاسیکی ناوەڕۆکی تازەی سەردەمی داهێناوە. تخوونی کێشی سیلابی خۆماڵی نەکەوتووە، تەنیا لەسەر بەحری عەرووز شیعری هۆنیوەتەوە. لەم لایەنەوە زۆر دەوڵەمەندە یەکێکە لە شاعیرە دەگمەنەکانی کورد کە حەوت بەحریان بەکارهێناوە: هەزەج، ڕەمـەل، موزاریع، خەفیف، موجتەس، مـوتەقاریب، ڕەجەز. لە قـافیـەشدا هەردوو بابەتی کلاسیکی بەکارهێناوە یەکێتیی قـافیە و جووت قـافیـە (مەسنەوی). زۆربەی لە جۆری یەکەمیانە، لە دە پارچە زیاتر لە جۆری دووەمیانە.

لە قـافیـەدا ڕەمزی گوێی نەداوەتە ئەوەی لەسـەر هەمـوو دەنگەکـانی ئەلفـوبێی کوردی و عـەرەبی شـیـعـر ڕێک بخـا، ئەوەی بەسـەلیـقـە بۆی هاتبێ هەر ئەوەی کـردووە، لە دەنگە تایبـەتییـەکانی ئەلفوبێی عەرەبی نیـەتی، ئەوەی کوردیش کە بەکاری هێناون هەمـوویان لە دەنگە سـوکـەکـانن، وەکـو: ا ت د ر ل م ن (ە - ـە) و ۆ ی ێ. لە پاش قـافـیـە دەوڵەمەندە. ئەم وشە و ڕسـتـانە لە شیـعـریدا بەرچاو دەکـەون: ئەکەم، بکا، نەکەی، تۆ، نەکەم، ئەکەن، بەسیـە، ئاشتی، ڕۆیی، ئەبێ، ئەخـۆم، ئێوەن، بی (ببێ)، ڕەمزی، ئەکەی، ڕۆ، تۆم، ئەگـری، ژین، بی (تۆ ببی)، بروانە، من نی، وەتەن بوو، من بوو، بـوو، ئەکـرد، کردم، خۆم، ئەم کیژە، ئەکا، بم (ببم)، چەن ڕۆژێ، زەڕین تاج، دڵ، کورد.

لە هونەرەکـانی شیـعری کلاسیـکی لە ڕووی ڕوخسـارەوە لە بەرهەمی شیـعری ڕەمزی ئەم بابەتانە دەکەونە بەرچاو:

١- دیوانی شیعری لەسەر بنچینەی لیریک دامەزراوە، شیعری کورت تا دوازدە دێڕ.

٢- قەسیدە، ئەو لیریکەی لە زیاتر لە دوازدە دێڕ پێک هاتووە. ڕەمزی هەناسەی زۆر درێژە لەم بابەتە شیعرە، قەسیدەکانی درێژن هەروەها بەژمارە زۆریشن، شاعیری کلاسیکی ئەگەر بەهێز نەبێ ناتوانێ لە هۆنینەوەی قەسیدە سەربکەوێ.
٣- لە دیوانیدا قەسیدەی بەندی شەشینی هەیە (ا ا ا ا ب ب).
٤- کۆمەڵێک چوارینی هەیە (ا ا ب ا) زۆربەیان لە تەفعیلە درێژەکانن.
٥- ژمارەی تاکەکانی لە چوارینی کەمترە، بەڵام ئەوانیش زۆریان لە تەفعیلە درێژەکانن.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

تەنیا شاری سلێمانی وەک نێوەندێکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری گرنگ کاریگەری بەسەر ڕەمزییەوە نەبووە، لە ناو بنەماڵەشیان شیعر ڕەمز بووە، بێخود خاڵیەتی و زۆر لێی نزیک بووە. هەردوو جۆرە ڕۆشنبیری کۆنی حوجرەی مزگەوت و تازەی قوتابخانەی میری سەرچاوە بوون بۆ دروستبوونی شاعیر وەک خوێندەوار. لە زۆربەی شارەکانی کوردستانی عیراق ژیاوە، هەروەها لە هەندێ لە شارەکانی باشووری عیراق. بەم هۆیەوە پێوەندیی کۆمەڵایەتی بەهێز بووە، بەتایبەتی لە پێوەندیی ئەدەبی سوودی وەرگرتووە. لەبەرئەوە ئاسۆی شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە زۆر فراوانە، یەکێکە لەو شاعیرانەی زۆرترین لایەنی ژیانی دڵداری و سیاسی و سایکۆلۆجی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی بوونەتە هەوێن و ئیلهامیان بەشاعیر بەخشیوە.

مەبەسە هەرە گرنگەکانی شیعر لە دیوانی ڕەمزیدا لەم خاڵانەدا کۆ دەبنەوە:
١- لە شیعری ئایینیدا بایەخی بەنەعت (ستایشی پێغەمبەر) داوە.
٢- دڵداری و وەسفی دلبەر مەبەسی سەرەکی شیعریەتی.
٣- وەسف بەگشتی و وەسفی سروشت بەتایبەتی جێگەی دیاری هەیە لە بەرهەمی شیعریدا. لە وەسفی شار و جێگەی جوگرافی سەرکەوتووە.
٤- لە شیعری کۆمەڵایەتیدا باس لە ژیانی خۆشی و ناخۆشیی خەڵکی دەکا، لەسەر هەژاران دەکاتەوە، لە کەموکووڕی کۆمەڵ دەدوێ. جەژن و نەورۆز و سەیران و بەهار و ڕاووشکار لە بەرهەمیدا ڕەنگیان داوەتەوە.
٥- تازەترین ناوەڕۆک لە قالبی شیعری کلاسیکی ڕەمزی مەبەسی سیاسی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتییە، لە دژی دوژمنانی کورد بووە لە هاوسێیان و داگیرکەرانی ئەورووپا.



٦- شیعری داشۆرینی هەیە، بەڵام بەزۆری تێکەڵ بەشیعری کراوە (ئیرۆتیک)ی کردووە. لە بنجدا ئەم بابەتەی تەنیا بۆ مەبەسی داشۆرین بەکارهێناوە. ئەوەی لە ئەدەبدا هەیە ئەوەیە، ئەدەبی کراوە (ئیرۆتیک، سێکس) هونەرێکە سەربەخۆ، پێوەندی بەداشۆرینەوە نییە. بەڵام لە ئەدەبی کوردی و نەتەوەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەم ڕێبازە لە داشۆریندا بەکار دەهێنرێ.
٧- ناوەڕۆکی دانایی و پەند و ئامۆژگاری لە بەرهەمی شاعیردا هەیە، زۆربەی چوارین و تاکەکانی بۆ ئەم مەبەسانە بەکارهێناوە.

## شیعری برادەرایەتی

پێوەندیی کۆمەڵایەتی ڕەمزی بەتایبەتی لەگەڵ ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەران بەهێز بووە. لەگەڵ هەندێکیاندا نامەی شیعری هەیە، هی دیکەیان بەهۆی ڕووداوێکی خۆشەوە پیرۆزبایی لێ کردوون، بەهۆی مردنی هەندێکیانەوە شینی بۆ گێڕاون. لەوانە ماتەمنامەی بۆ پیرەمێرد و مەلا ئەفەندی (مەلا گچکەی هەولێر) و ساڵح زەکی ساحێبقڕان و مستەفا مەزهەر و ئەمین زەکی و سەید ئەحمەدی خانەقا و ئەوڕەحمان بەگی نوفووس (بابان) و بێخود و هی دیکە نووسیوە. نامەی شیعری هەیە بۆ هەندێ لە نووسەر و شاعیران لەوانە: نووری شێخ ساڵح، ڕەفیق حیلمی، تۆفیق وەهبی، شێخ محەمەدی خاڵ، شێخ لەتیفی شێخ مەحموود، شێخ سەلام، ئەحمەد موختار جاف، کاکەی فەللاح، سافی، فانی (مەمەند ئاغا)، نەجمەدین مەلا و هی دیکە.

نامە و برووسکەی پیرۆزبایی هەیە بۆ ڕەشید سدقی قایمەقام و جەمال بابانی وەزیر و مەلا مستەفای بارزانی شۆڕشگێڕ و شێخ مەحموودی مەلیک و دوکتۆر کەمال عەبدوڵڵا ناجیی پزیشک و عەلی ئاگای بەڕێوەبەری قوتابخانە و هی دیکە. گەلێ کۆبوونەوە و پێوەندیی کۆمەڵایەتی و هەنگامی جەژن و خۆشی و سەیران شاعیریی بزواندووە و شیعری جوانی بۆ هاتووە. یەکێ لەوانە بەهۆی کردنەوەی «پیشانگەی هونەری قوتابخانەکانی سلێمانی» لە ڕۆژی ١٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٨، ڕەمزی لەوێ بووە، لەپڕ شیعرێکی بۆ هاتووە لە بابەت پیشانگەکەوە و لە دەفتەری یادگاری میوانان تۆماری کردووە و داویەتییە ئازاد شەوقی چاودێر و پشکێنەری پیشانگەکە.

## نموونەی شیعری

### وەسف و دڵداری

١

لە وەسفی کیژێکدا ڕەمزی دەڵێ:

مەمک فنجانە لێو مەرجانە جیسمی جانە ئەم کیژە
لە تەوقی سەریەوە تاکو بەری پێی جوانە ئەم کیژە
دەمی وەک غونچە گوڵ زولفی ئاڵۆزاوی وەک سونبول
قەدی سەروی چەمەن ڕووی وەک مەهی تابانە ئەم کیژە
بەراووردی لەگەڵ دووگی مەڕا قەت ناکرێ چونکی
لە سەر تا پا ووجوودی چەشنی گوڵمەی ڕانە ئەم کیژە
لەسەر هۆش و لە تەن تین و لە دڵ سەبر و قەراری برد
بە ئیمایێ تەماشا کەن چ بێ ئیمانە ئەم کیژە
غەمی گەورە و گرانی سەر دڵم هەر هێندە ئەی یاران
کە شەو بێ هەمسەر و ڕۆژ بێ سەروسامانە ئەم کیژە
لە قاپی دەوڵەمەندی حوسنییا هەروەک گەدا کەوتم
کە زانیم خاوەنی دەست و دڵ و ئیحسانە ئەم کیژە
ئەگەر لوتفی ببێ بۆ جائیزەی ئەم مەدحە ئەی (ڕەمزی)
بە بێ خواهیش خەڵاتێکت ئەکا شاهانە ئەم کیژە

ڕەمزی جوانیی پەرست بوو، ژنی بۆ دەسبازی و مێبازی دەخواست. بەڕاستی دلبەرێکی دیاریکراوی نەبوو، بەخەیاڵیش یاری بۆ خۆی دروست نەکردبوو. ئەو شیعرانەی بەمەبەسی دڵداری و وەسفی جوانیی ژن وتوویەتی، هەموویان دەچنە ناو وەسفی ڕووکەشی لەشولاری ئەو دلبەرە خۆشەویستە. لەم لیریکەدا وێنەی داهێنراوی هەیە لە وەسفی ئەندامە جوانەکانی ئەو کیژە، دوا دێڕی شیعرەکەی بە وتەیێکی هونەریی جوان دێنێتەوە کە دەڵێ ئەو کیژەی ئەم شیعرە کراوەیە ستایش بوو بۆی پێویستە شاعیر خەڵات بکا. خەڵاتی شاهانەی هەرە بەرزیش ماچە!.



٢

لە وەسفی مینا خانمێک ڕەمزی دەڵێ:

شیعری هۆنراوە کە وەک لەعلی بە قیمەت وایە
لایەقی گەردنی شۆخێکی وەکو مینایە
ناوقەدی هەر وەکو مەقاماتی سەروی چەمەنە
لێوی وەک لەعلی بەدەخشان و ملی مینایە
دەمی وەک نوقتەیی مەوهوومە گەر بێتە قسە
تێ بگەی ئەو دەمە وەک غونچەیێکی ساوایە
غەبغەبی نەوعە ترنجێکی حەدیقەی ڕیزوان
نەوەک ئەو چەشنە ترنجەی کە لە بازاڕایە
شکەمی دۆشەکی مەسقاڵی پڕ تووکی قووە
ناووکی جێ سمی ئاهوو بەچەیی سەحرایە
چاوی سەییاد و موژەی تیر و برۆی چەشنی کەمان
بۆ دڵی (ڕەمزی) بەدائیم لە کەمینگا دایە
سەیری ڕەشماری سەری زولفی نەکەی نازانی
کە هەتا ئێستەکە چەن خوێنی لە گەردن دایە
هەرکە دیم مەیلی لەسەر کوشتن و تالانی منە
ووتم ئەی دیدە چ حاجەت بەشەڕ و هەڵڵایە
دڵە گرتووتە لە زیندانی زەنەخدانت دا
عەقڵە بردووتە سەروماڵە لە بەرپێتایە
ئەوی مابێتەوە فیکرێکە بە تەنها کە ئەویش
ئەمە چەن ساڵە لە ژێر سێبەری گێسووتایە

کیژێکی جوانی دیکەیە ڕەمزی دیویەتی، ناوی مینا بووە، یا خۆی ناوی ناوە مینا و کردوویەتی بەبووکێکی دیکەی شیعری کوردی. جوانی بەناو مینا لە لای شاعیری تری کوردیش بووە بەسەرچاوەی ئیلهام بۆ شیعری وەسف و دڵداری. لەم شیعرەدا وەسفی هەندێ لە ئەندامەکانی لەشی مینا دەکا، لەگەڵ کۆمەڵێک دیاردەی سروشت بەراووردیان دەکا. وێنەکان ئاسایین، لە شیعری کلاسیکیدا بەرچاو دەکەون. لێرەدا تەنیا ئەوەی سەرنج

ڕادەکێشێ ناووکی دلبەر بەجێ سمی کارمامز دەچوێنێ، ئەمە جوانە بەڵام بەزۆری جێ سمی مامز لەگەڵ ئەندامی مێیینەی دلبەردا (قوز) بەراوورد کراوە.

۳

لە لیریکێکیدا ڕەمزی لە نێوان دوو دلبەردا داماوە نازانی کامەیان جوانترە:

لەمـــابەینی دوو دلبـــەردام و حـــەیرانی دوودڵ مـــاوم
کــە دڵ ئاخــۆ بەکــامــێکیــان بدەم لەم بەینەدا مــاوم
بەزۆری حـوسن و بازووی نەوجـەوانی خـۆی ئەوی ئەولام
کەمەندی زولفی خاوی خستـە ئەستـۆی فیکری شێـواوم
بەکابەی ڕوومـەت و تاقی خەمی ئەبرۆی ئەمی ئەمـلاش
لە ڕێگەی عـــەقـــڵی دەربردم لە جــادەی دینی لاداوم
لە فـیـتـنەی چاوی سـەرخـۆشی ئەوی ئەولا نیـیـە باکم
بە غـــەمـــزە و ناز و ئاوازی ئەوی ئەمـــلایە کـــوژراوم
ئەگـــــەر لوتفی ببێ یا زەڕڕەیێ ڕەحـــــمی لە دڵدا بێ
ئەزانێ بۆ بە حـــەســـرەت وا لە ڕۆژی کـــوڵمی ڕامـــاوم
بە زاهیـر گـەرچی کـوشتـەی لامل و کاکۆڵی پەخشـانم
لە مـــەعنادا ئەســـیـــــری زولفی ئاڵۆزاو و ژاکـــاوم
ئەبێ ئەم جـێـیـە جـەننەت بێ کـەوا پڕ حـۆرییـە یا خـۆ
شـــەوە و من خـــەو ئەبینم یا پەریین و دێنە بەرچاوم
بەیادی چاوی مـەسـتی بادەنۆشـیم هێندە پێ خـۆشـە
ئەڵێی ڕۆژی ئـەزەل وەک نەشـئـە هەر بۆ بادە خـولقـاوم
ئەمن تەیرێکی برسی و خاڵی دانە و زولفی هەروەک داو
بەهۆی ئەو دانەوە (ڕەمـزی) سـیـفـەت لەم داوە ئاڵاوم

ئەگەر ئەم لیریکە بکەوێتە ژێر نشتەری ڕەخنەگرێکی ئەدەبی ئەورووپی بۆ لێکدانەوە پەنا بۆ بیروڕا و تیۆریی جیا جیا دەبا لە زانستیی سایکۆلۆجی و پێوەندیی ژن و پیاو لە رووی سۆز و دڵدارییەوە بەیەکتری. لەوانەیە نەگاتە ئەنجام بەپێی ئەو بیرە سایکۆلۆجییەی ئایا پیـاو دەتوانێ بەڕاسـتی و لە یەک کـاتدا دوو ژنی خـۆش بوێ! ئەمـە لە واقـیـعی ژیـانی کۆمەڵدا هەیە. ئەو کەسانەی لە ژنێک زیاتریان هەیە.



لێـرەدا پێـویست ناکـا ئەم لیـریکە جـوانەی ڕەمـزی بەو چاوەوە تەمـاشـا بکرێ بەڵکو سەرچاوەی هەیە و لە هەڵوێستێکی تایبەتیدا وتراوە.

لەو کاتەی ڕەمزی لە ساڵی ١٩٤٤ مووچەخۆر دەبێ لە هەولێر، شەوێک عیزەدین مەلا ئاهەنگێکی ئەورووپاییانە دەگێڕێ. لە مووسڵەوە دوو سەماکەری جوانی تیاترۆخانەکان بۆ ڕابواردن بانگ دەکا. لەو کاتەی میـوانان مەستی بادە دەبن هەندێ لە دۆستان دوو ژنەکە هان دەدەن. ئەمانەش بەشێوازی خۆیان لە دەوری شاعیر دەسووڕێنەوە، دەسبازی و گاڵتە و گەپی لەگەڵدا دەکەن. ئیتر شاعیری هەست ناسک، دەروێش ئاسایی دەیگرێ و شیعری بۆ دێ و دەڵێ بنووسن! بەم جۆرە ئەم شیعرە جوانە لە دایک دەبێ. هەناسەیێکی شاعیریی دەنوێنێ لە وێنەی قەشەنگ و قسەی جوان. لەوە دەچێتە دەرەوە بەڵگەی بۆ بدۆزرێتەوە ئایا شاعیـر ئەم دوو ژنەی وەکو یەکـتری خۆشـویستـووە یا نا! مـەسـەلەکە لەسـەر ئەوە دەنیـشـێـتـەوە شـاعـیـر توانیـویەتی لە پەیکەری ئەو دوو ژنە سیـفـەتی جوانی ڕووکـەش بدۆزێتەوە و وێنەی شیعرییان لێ دروست بکا.

## نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

لە لیریکێکیدا ڕەمزی دەڵێ:

تا فـــیـــداکـــاری نەکـــەی ناوت بە بەرزی نابرێ
تا لە مـاڵ و سـەر نەبووری سـەروەریت پێ نادرێ
ڕۆح هەتا نەیخەیتە سەر دەست و بەرەو مردن نەڕۆی
ئەی برا ناوێکی مـێـژوویيت بە حـەق پێ نابڕێ
تا بە خوێنی ئاڵ و گەش چەن دەفعەیێ ئاوی نەدەیت
نەونـەمـــامی باغی ئازادی ئەبەد بەر ناگـــرێ
تا هەسانی جەرگی جاسووسانی هۆزی لێ نەسووی
تیــغی جـەوهەرداری هەوڵت مـوو لە دوژمن نابڕێ
تا بەداسی ڕاســتی پاوانی غــەش پاکــۆ نەدەی
گاگەڵی جاسووسی ئیستیعماری قەت لێ نابڕێ
تا پزشکی دووڵی شــەوقی لە ناوا دەرکـــەوێ
قـەت گـڕی کـوورەی نیـفـاقی ئەجنەبی دانامـرێ

ئاگـری نەورۆزی ئاسـۆی سـەربەخـۆیی ئەی برا
بێ دڵۆپی خـوێنی وەک بەنزینی مـیللەت ناگـرێ
میللەتێ ئاسۆی ژیانی خۆی بە خوێن سوور کردبێ
تا ئەبەد فەوتانی هەرگیز بۆ نییە و قەت نامرێ
کەی بەپێی ئەحکامی قانوونی عەدالەت جائیزە
هەر لە من قاپی کراوەی مەحکەمەی حەق داخرێ
ڕەحمەتی حەق لەو قەدیمانەی کە فەرموویانە ماف
تا بەزۆر و زەبری شەق نەیسێنێ هەرگیز نادرێ
(ڕەمزی)! ئامۆژگاریت زۆرە ئەمما کەم هەیە
گوێ کە ئیمڕۆ بۆ قسەی حەق بیژی وەک تۆ ڕاگرێ

ئەم شیعرە زادەی بیری شاعیرە لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا وتوویەتی. لە شیعرەکەدا شاعیر ئەوە دەردەبڕێ ماف وەرگرتن بەبێ خەبات و خوێن ڕشتن ناچێتە سەر. دەسکەوتی خەڵکی عیراق لەم کوودیتایە زۆر بوو، لە هەمووی گرنگتر سستێمی فەرمانڕەوایی لە مەلیکییەوە بوو بەکۆماری. لە دواییدا خۆی خواردەوە. هەرچۆنێ بێ لە دوای کوودیتا، یەکێ لە دەسکەوتەکان بەربوونی بەندە سیاسییەکانی سەردەمی مەلیکی بوو لە نیشتمانپەروەر و کوردپەروەر و پێشکەوتنخواز و ئاشتیخوازان. بەهۆی دەرچوونی ئەوانەوە لە بەندیخانە و گەڕانەوەیان بۆ سلێمانی لە کۆبوونەوەیێکی گشتی بەناوی پێشوازی کردنیان ئەم شیعرە خوێندرایەوە.

٢

لە لیریکێکیدا ڕەمزی ڕوو دەکاتە لاوان و پێیان دەڵێ:

ئەی لاوە ژیرەکانی فیداکاری ئاشتی
وەی گەورە گەورەکانی وەفاداری ئاشتی
ئیمڕۆ زەمانی دووبەرەکی و دوودڵی نییە
هەنگامی هەوڵی یەکێتییە و باری ئاشتی
شوکری خوا کە شۆڕشەکەی چواردەی تەمووز
وا بوو بەهۆی نەمانی ستەمکاری ئاشتی



ئیتر ئومێد ئەکەم کە لەمەولا وەکو برا
دەس دەینە دەست و بێینەوە سەر شاری ئاشتی

لە دوای ڕووداوەکانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ هەڵوێستێک لە کوردستانی عیراق کەوتە ناوەوە بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٥٩. لەو کاتەدا دوو هێزی سەرەکی لە ناوەوە بوو. یەکەمیان بیروباوەڕی ناسیۆنالیزمی بەناوی دیمۆکراتییەوە لە پێناوی مافی نەتەوەی کورد. دووەمیان بیروباوەڕی ئەنتەرناسیۆنالیزمی بەناوی سۆسیالیزمەوە لە پێناوی دامەزراندنی عیراقێکی سۆسیالیست. یەکەمیان لەسەر ئەو باوەڕە بوو هەموو ڕێکخراو و سەندیکا کۆمەڵایەتی و پیشەسازییەکان پێویستە بەناوی کوردستانی عیراقەوە بێ، دووەمیان لەسەر ئەو باوەڕە بوون دەبێ ئەمانە هەموویان بەناوی عیراقەوە بن و ئەوانەی کوردی لقێک بن لە ناو ئەودا. گەرمترین چوونە مەیدان لە ناو لاواندا بوو، ئەوەی بەناوی کوردستان و ئەوەی بەناوی عیراق شیر و تیریان لە یەکتری دەسوو لە ناوچەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووک. بەتایبەتی لە سلێمانی هەندێ جار هەڕەشەیان لە یەکتری دەکرد.

ئەم شیعرەی ڕەمزی ناوبژیێکە ئامۆژگاری هەردوولا دەکا، بەرژەوەندیی کورد لە بەرچاو بگرن بەتەبایی هەردوولا لە مەیدانی خەباتدا کەمتەرخەمی نەکەن لە پێناوی وەدەستخستنی مافە ڕەواکانی نەتەوەیی و مرۆڤایەتی کورد.

٣

لە چوارینێکیدا ڕەمزی دەڵێ:

بەڵێ ئەم قەومی کوردە بێ نەوایە
کە چەن ساڵێکە گیرۆدەی بەڵایە
لە ژێر زنجیری دیلی دا دەناڵێ
بە دەردی یەک نەکەوتن مووبتەلایە

شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیری کورد یەک دەنگن و بیروباوەڕیان وەکو یەک وایە لە بارەی یەک نەگرتنی کورد و دووبەرەکی لە ناو یەکتریدا لە پێناوی بەرژەوەندیی کەسێتی و چاکەی بەشێک و خراپەی بەشێکی دیکە.

٤

خووی دووبەرەکی و نەبوونی یەکێتی لە ناو کورداندا بووە بەهۆی دابەشبوونی:

پرسیم کە لە مەردێکی سیاسی زانا
پەیوەندی ئەم کوردە لەگەڵ ئێرانا
ڕووی کردە وولاتی تورکیاش و فەرمووی
نەم بیستووە سێ هەوا لە یەک سەربانا

شاعیر بیرۆکەی ئەم بۆچوونەی لە پەندێکی پێشینان وەرگرتووە دەڵێ «بانێکە و دوو هەوا»، مەبەسی ئەوەیە کورد یەک میللەتە و کوردستان یەک پارچەیە کەچی بەسەر سێ بەشدا دابەش کراوە، کوردستانەکانی تورکیا و ئێران و عیراق.

## دەردی سیاسی و کۆمەڵایەتی

١

لە بارەی ئەمپریالیستەوە شاعیر دەڵێ:

خودایا زوو بە زوو ئەم قەسری ئیستیعمارە بڕمێنی
ڕەگ و ڕیشەی درەختی زیندەگانی و عومری دەرهێنی
بە زۆری دەست و بازووی ئینتیقامی دڵ برینداران
سەر و گوێ و شان و ئەستۆی نۆکەر و ئەعوانی بشکێنی
لەسەر سەفحەی خەریتە و لاپەڕەی تاریخی عالەمدا
بە نووکی خەنجەری ئەتک و حەقارەت ناوی بکڕێنی
لە بازاڕ و تیجارەتخانەیی ئەقوامی دنیادا
ڕەواجی ئەمتیعەی نامووس و سککەی قەدری بشکێنی

لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا دەسەڵاتی مەلیکی لە عیراقدا لە ژێر باری گرانی ئەمپریالیستی بەریتانی بوو، بەناو دیمۆکراتی بوو، بەڵام مافی خەڵکی پێشێل کرابوو، بەتایبەتی مافی نەتەوەیی لە کوردستانی عیراقدا. دروشمی خەڵکی ڕووخانی ئەمپریالیزم و چوونە دەرەوەی ئینگلیز لە عیراق و جاڕدانی دیمۆکراتییەت بوو. شاعیری کورد هاواری لێ هەڵساوە، داوا دەکا ئەم دوژمنە لەناوبچێ بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی لە کردەوەی ناهەمواری ڕزگاری ببێ.



٢

لە لیریکێکیدا ڕەمزی بەکاسەلێس و دووڕووەکانی کورد دەڵێ:

لە ڕێی دەسکەوتنی چەن درهەمێ یا پاروویێ نانا
بە جارێ ئابڕووی خۆبردن و شەرم و حەیا بەسیە
لە بەرپێی ناکەسی بێگانەدا کەمتر لە مێروولە
لە ڕووی خوێش و کەس و کارا بە وێنەی ئەژدەها بەسیە
لە قاپی غەیرەدا چەشنی گەدا لالانەوە و کەوتن
لە ماڵی خزم و خوێشا دەس بە خەنجەر بۆ هەرا بەسیە
لە دیواخانەکەی بێگانەدا دەستەو نەزەر وەستان
بە وێنەی خوبزە یەعنی نۆکەرێکی خانەزا بەسیە
بە ناحەق خوێنی یەکتر تاوەکو کەی ڕشتن ئەی قەساب
تەنووری فیتنە بۆ کێ دائەخەی ئەی نانەوا بەسیە
بە سینی سینە فنجانی مەمک ئەی شەکرەژن جا تۆش
لە ماڵی غەیرەدا گێڕانی قاوە و شیر و چا بەسیە
بە شان و قۆڵی ڕووت و سنگ و مەمک ئاوا کە هەروەک بووک
لەگەڵ بێگانەدا بۆ جادە چوون و سینەما بەسیە
لە لاوی تازە نوستووی گوێ کەڕی بێ باوەڕی سەرخۆش
چ تەئسیرێ ئەکا وەعز و نەسیحەت (ڕەمزی)ا بەسیە

شاعیر لەگەڵ ئەو کوردە دووڕووانە قسە دەکا، لە سەرەوە خۆیان وەک دڵسۆز و نیشتمانپەروەر دەخەنە ڕوو. ڕاستی ڕەوشتیان لەگەڵ بێگانەیە. لە شیعرەکەدا وێنەی شیعری جوان هەیە. شاعیر ڕوو دەکاتە ژن و ناوی بەشەکرەژن دەبا ئەوەی لە ماڵی بێگانانی دوژمن قاوە و چایە دەگێڕێ. لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا لە سلێمانی کاری وا ڕووی داوە لەو کاتەی دوژمنێکی تۆرانی وەک عومەر عەلی موتەسەریفی سلێمانی بوو، هەندێ لەو کوردە دووڕووانە ژنەکانیان بەکۆڵی دیاریی زێڕەوە دەناردە ماڵی ئەو کابرایە، بەلایانەوە خۆش بوو ئەگەر کارکەرییش بۆ ئەو کاربەدەستەی دەسەڵاتی مەلیکی عیراق بکەن، بەڵکو سوودێکی بۆیان هەبێ.

## ٣

لە بابەت گرانیی جەنگی دووەمی گێتییەوە ڕەمزی دەڵێ:

هەرکە بیری وەزع و هەرزانی شتی پێرار ئەکەم
سەد تف و لەعنەت لە وێنەی هیتلەری غەددار ئەکەم
خاسەتەن ئەو ساتەی لە بازاڕا شتێکم پێ بوێ
یا کە باسی قیمەتی ئەشیا لەگەڵ توججار ئەکەم
خاسەتەن ئەو ڕۆژەی بە عەزمی چوونە سەیران و سەفەر
ئەچمە گەراج و لەگەڵ سایەق قسەی ئەسعار ئەکەم
خاسەتەن وەختێ ئەچمە سەر دوکانی شەکر و چافرۆش
سەیری چەندوچوونی بەینی بایع و کڕیار ئەکەم
خاسەتەن کاتێ ئەچمە کن خەیات و قاتێ جل ئەکەم
خاسەتەن وەختێ سەیری فەرقی نرخی ئێستە و پار ئەکەم
حاسڵی دائیم لە ناوەخت و لە وەختا ڕۆژ و شەو
هەر تف و لەعنەت لە جینسی هیتلەری سەگسار ئەکەم
خۆ کە باسی حەربی دەبابە و فڕۆکەم بۆ ئەکەن
یا کە فیکری ڕۆژی هەڵمەت بردن و کوشتار ئەکەم
گوێی هەموو عالەم لە کەللە و ڕیشی لینی هەڵئەسووم
پڕ بەدەم بەلغەم لە چارەی هیتلەری خونخوار ئەکەم

جەنگی دووەمی گێتی وەکو جەنگی یەکەم کارێکی ئەوتۆی نەکردە سەر کۆمەڵی کوردەواری لە ڕووی کوشتارەوە، چونکە ناوچەکانی کوردستان نەبوون بەمەیدانی ڕاستەوخۆی جەنگ. گرانی گەورەترین تەنگوچەڵەمە بوو. شاعیر ئەم لیریکەی لە ساڵی ١٩٤١ نووسیوە، وەک خۆی دەڵێ هەڵسوکەوتی دارایی و گوزەرانی خەڵک وەکو پێرار نەبوو، جەنگ لە ساڵی **١٩٣٩** دەستی پێ کرد. هۆی جەنگ دەگەڕێنێتەوە بۆ دەستدرێژیی هیتلەر، لە دواییدا ناوی هاوڕێکەشی بە لینی دەبا، مەبەسی مۆسۆلینی دیکتاتۆری ئیتاڵیایە. وەک دەردەکەوێ شاعیر ویستی لە دانانی ئەم شیعرە زیاتر ئەوەیە هیتلەر و مۆسۆلینی تاوانبار بکا و هەڵوێستی ڕاستیی ڕۆشنبیری کورد لە بابەت ئەو جەنگەوە بخاتە ڕوو.



## دژی دەروێشی

ڕەمزی بەلای ئەدەبی بەرزی سۆفیزم نەچووە، بەڵام لە دژی کاری پراکتیکی دەروێشیزم بووە. لەم لایەنەوە وێنەی جوانی هەیە.

### ١

لە چوارینێکیدا دەڵێ:

شێخ ئەڵێن دایم گەمارۆی نێر و دەوری مێ ئەدا
فەرقی پاش و پێشی هەرگیز بۆ نییە و هەر لێ ئەدا
چۆن ئەبێ نان و نمەک شێتی نەکات و نەیگرێ
وا کە ئازاری دڵی شۆخێکی وەک لەیلێ ئەدا

شاعیر لەم چوارینەدا ئەدەبی کراوەی (ئیرۆتیکی) بۆ مەبەسی داشۆرین بەکارهێناوە. لێرەدا مەسەلەکە ئەوە نییە ئەو شێخە یا ئەو لەیلایە کێن! بەڕاستی هەن یا دروست کراون! بەڵکو ئەو خەیاڵە داهێنەرەیە کە وێنە شیعرییەکەی دروست کردووە.

### ٢

لە چوارینێکی دیکەدا هەر لەم بابەتەوە دەڵێ:

لەوساوە کە بەو حیزە بەڵێنی داوە
لەو شێخە بەڕاستی دڵم ڕەنجاوە
نازانی کە ئەو حیزە لە ڕۆم و عەجەما
هەر حەزرەتی شێخ ماوە کەوا نەیگاوە

لەم چوارینەدا مەبەسی داشۆرینی کەسێکی دیاریکراوە، ناوی نابا، کارێکی باشی کردووە کە ناوی نەبردووە. ئیتر بەشێخ دەڵێ با شانازی بەخۆیەوە نەکا، ئەگەر دەستی بکەوێ، چونکە ئەوەندەی داوە، ئەگەر بەشێخیشی بدا نابێتە دەسکەوتێکی گرنگ بۆی.

***

محەمەد ڕەمزی مەلا مارف شاعیرێکە بەتوانا، لەو شاعیرانەیە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لاپەڕەی شیعری کلاسیکیی قوتابخانەی نالییان هەڵداوەتەوە. ئەو لە شیعر نەگەڕاوە، شیعر بۆی هاتووە. لە بەحری عەرووزی لای نەداوە زۆرترینی کێشەکانی

بەکارهێناوە. بۆ قافیە و پاش قافیە نەگەڕاوە، خۆیان بۆی هاتوون. شیعری ڕەمزی ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی کوردەوارییە بەخۆشی و ناخۆشییەوە، بەجوانی و ناشیرینییەوە. دڵداری و ماچ و مووچ و دەسبازی لەگەڵ ژنی جوان، وەسفی سروشت و کیژی ڕەنگین مەبەسی سەرەکی شیعری ڕەمزی بوو. لە کۆمەڵایەتی و سیاسەت و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی شیعری زۆرە، لە ستایش و پێداهەڵداندا مەرایی نەکردووە، ئەو کەسانەی ستایشی کردوون خۆشی ویستوون، گەورە بووبن یا بچووک. شیعری داشۆرین و کراوەی هەیە. ناوی ئەو کەسانەی نەبردووە کە بەخراپە باسی کردوون. ڕەمزی یەکێکە لە شاعیرە بەدیمەنەکانی سەدەی بیستەمی کورد.

## بەشی سی و یەکەم

### حەقیقی

۱۹۰۲ – ۱۹۹۸

### ژیانی

عەباس کوڕی عەلی کوڕی برایم ئاغای تالاّو لە عێلی دیبوکری دانیشتووی شاری بۆکان لە ساڵی ۱۹۰۲ لە گوندی مەرجان ئاوایی دەشتی حاجی حەسەن لە ناوچەی مەهاباد لە دایک بووە. لە سەردەمی ژیانی خوێندەواری و دەسکردنی بەدانانی شیعر ناوی «حەقیقی» وەک نازناو بۆ تۆماری شیعری داناوە. پێش جەنگی یەکەمی گێتی بەهۆی دوژمنایەتی عەشرەتییەوە ماڵی باوکی باریان کردووە بۆ ئاوایی مەرخوز لە ناوچەی سەقز. لەو سەردەمەدا خراوەتە بەر خوێندن و هەندێ لە بەرنامەکانی خوێندنی حوجرەی مزگەوتی تەواو کردووە. لەو کاتەی ئاگری جەنگی یەکەم گەیشتە کوردستانی ئێران و لەشکری تورک و ڕووس چوونە ناویەوە ئاژاوە و ڕەشبگیری کەوتە ناوەوە، ناچاربوون ڕایان کرد و ماڵیان گواستەوە سلێمانی لەبەرئەوە لە خوێندن داپچڕا. لە پاش ماوەیێک کە گەڕانەوە مەڵبەندی خۆیان دەستی کردەوە بەخوێندن لە لای باوکی. ئەوجا کەرەتێکی دیکە بەماڵەوە ئاوارەبوون لە ناوچەی ئێل تەیموری مەهاباد (سابلاغ) نیشتنەوە، لەوێ باوکی کۆچی دوایی کرد، کۆمەڵێک کتێبی بۆ بەجێ هێشت. لەو کاتەدا ماوەیێکی دیکە دەستی کردووە بەخوێندن لە حوجرەی مزگەوت.

لە ساڵی ۱۹۲۸ لەگەڵ سەید کامیلی ئیمامی شاعیر لە حوجرەی قوتابخانەی ئاینیی باغچە لە مەهاباد خوێندوویەتی. لە ساڵی ۱۹۳٤ لە کارگێڕیی دارایی مەهاباد بووە بەمووچەخۆر و ژنی هێناوە. لە ساڵی ۱۹٤۲ بەناوی کارگێڕی تووتن گوێزراوەتەوە بۆکان ماوەیێک لەوێ ماوەتەوە. لە ساڵی ۱۹٦۳وە لە پاش ئەم هەموو بزووتنەوەیە و جێگۆڕکێیە ئۆقرەی گرتووە. بەزۆری خەریکی کۆکردنەوەی بەرهەمی شیعری بووە و بەینێکی زۆری ژیانی لە مەهاباد بردۆتە سەر تا لە ساڵی ۱۹۹۸ لەوێ کۆچی دوایی کردووە.



### شیعری

حەقیقی لە ماڵێکی خوێندەوار پەروەردە بووە، باوکی ڕۆشنبیر و دایکی ئەگەرچی خوێندەوار نەبووە، بەڵام شارەزا و لێزان بووە. میراتی باوکی کۆمەڵێک کتێب بووە بۆی ماوەتەوە. لە تەمەنی مێردمنداڵی شیعری وتووە و تا مردن لەگەڵیدا بووە. شیعری زۆر وتووە، ئەوەی لە بەردەست دایە کەمە، بڕێکی بزر بووە و بەسووتان لەناوچووە. هەندێ جار لە کاتی پشکنیندا ناچار بوون بەرهەمی شیعری بسووتێنن.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

حەقیقی لە هەردوو بابەتە شیعری کوردی نووسیوە، شیعری عەرووزی و شیعری سیلابی خۆماڵی. لە ڕووی قافیەوە هەردوو جۆرە قافیەی یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی) بەکارهێناوە، واتە یەکێتیی قافیە بۆ شیعری عەرووزی و مەسنەوی بۆ شیعری خۆماڵی، ئینجا پێچەوانەش لە شیعریدا دیارە، واتە لە شیعری عەرووزی قافیەی مەسنەوی و لە شیعری خۆماڵیش یەکێتیی قافیەی بەکارهێناوە.

لە شیعری عەرووزیدا کێشی بەحرەکانی هەزەج و ڕەمەل و موزاریع و ڕەجەز و خەفیف و سەریع بەرچاو دەکەون. لە قافیەدا ئەم دەنگانەی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی بەکارهێناوە: ا ت چ ر ز س ق ل م ن (ە – ـە) و وو ۆ ی ێ. لە شیعری سیلابی خۆماڵیدا بەزۆری کێشی هەشت بڕگەیی و دە بڕگەیی بەکارهێناوە، لەمانە هەندێکیان وەستانیان لە ناوەڕاستدا هەیە (٥ + ٥) و هی دیکەیان وەستانیان تێدا نییە.

لە بابەتەکانی شیعری کلاسیکی لە دیوانی حەقیقیدا پارچەی کورتی لیریکی (غەزەل) و قەسیدەی درێژ دەبینرێن. هەروەها لە شیعرە میللییە خۆماڵییەکانیشدا قەسیدەی درێژ (بەیت) بەرچاو دەکەون. لە شیعریدا شاعیر ڕەچاوی هەندێ لە هونەرە شیعرییەکانی کردووە، وەکو: پێنجین، تەرجیع بەند، چوارین. هەروەها شیعری چەند شاعیرێکی کلاسیکیی گەورەی کردووە بەپێنج خشتەکی، وەکو نالی و سالم و حاجی و بێخود.

لە شیعرە عەرووزییەکانی حەقیقی وشەی فەرهەنگی شیعری ئیسلامەوی بەرچاو دەکەوێ، واتە ئەو وشە و زاراوانەی ئاسایی بوون لە شیعری کلاسیکیی کۆن، کەچی بەپێچەوانەوە زیاتر بایەخ بەزمانی کوردی پەتی دەدا لە شیعرە خۆماڵییەکانیدا. بەگشتی زمانی ئاسانە و شوێنەواری ڕەوانبێژی لە شیعریدا دیارە.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

زۆربەی مەبەس و ناوەڕۆکی هەردوو جۆرە شیعری عەرووزی و خۆماڵی لە دیوانیدا لە بەرچاون، هەندێ جار وەستایانە تێکەڵ بەیەکتری کردوون.

١- شیعری ئاینیی (موناجات و نەعت)ی گەلێ زۆرە، هەندێکیان دەبن بەقەسیدە یا بەیت ژمارەی دێڕەکانیان دەگاتە حەفتا.

٢- شاعیر بایەخی زۆری بەوەسف داوە. وەسفی دڵداری کەمە، وەسفی لایەنی دیکەی ژیانی ئادەمزادی زۆرە، وەکو وەسفی سروشت، هەر چوار کەژ؛ وەسفی شارانی وەکو بۆکان، مەهاباد، سنە، سەردەشت، سەقز، مەریوان، بانە، شنۆ، پاوە، خانە.

٣- لە ماتەمنامە حەقیقی شیوەنی بۆ ئەمانە هەیە: هێمن، سوارەی ئێلخانی زادە، حاجی ئەبووبەکری موهتەدی.

٤- شیعری نیشتمانی و کوردایەتی بایەخی پێ دراوە.

٥- جێ پەنجەی حەقیقی لە هونەری نامەی شیعریدا دیارە، کۆمەڵێک نامەی شیعری بۆ ئیمامی شاعیری نووسیوە و ئەویش وەرامی داوەتەوە.

٦- سێ کاری شیعری مەزنی هەیە ئیلهامی لە شیعری میللیی سەرزار وەرگرتووە و بەرهەمێکی ڕەنگینی لێیان دروست کردووە. یەکەمیان حیکایەتی «بزنۆکە و مەڕۆکە» و دووەمیان «فەقێ و تەپکەچی» و سێیەمیان «هەرەوەزی»یە.

## نموونەی شیعری

### وەسف و دڵداری

١

حەقیقی ئیلهامی لە هاومەڵبەندی ژیانی خۆی ئەدەب (میسباح – ددیوان) وەرگرتووە و ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە:

دەڵێن لە پەردەیی خەفا ئیرەم چەلێکی هاتە دەر
بە سەد هەزار ڕەنگ و بۆ بە زێوەری دوڕ و گەوهەر
وەلێ گوڵی بەهاری من وەرای تەسەووری بەشەر
دەسی مەشاتەیی قەدەر کراسی نازی کردە بەر
کڵاوی زێڕی نایە سەر بە تۆق و گۆشوارەوە



گەلی کچانی چاو بە کل فریشتەکانی ئاو و گڵ
دەمێ کە دەچنە گوڵ چنین بە عەینی هی خەزالی سڵ
دەسێ لە گوڵ دەدەن دمێ دەمێکی پەنجەیێ لە دڵ
هەڵاڵەکان چەپک چەپک دەبەن وەنەوشە چڵ بە چڵ
بەری بەیان و تاوپەڕان بە بەر قەد و نسارەوە
نە هەر لە خەڵوەتا بە شەو خەریکی زیکرە مورغی حەق
نە ئینس و جن و جانەوەر نە هەر مەلەک تەبەق تەبەق
وەر ببینە بێ خەبەر دەمێ بەیان ئەدا شەبەق
چیا چەمەن گوڵ و سەمەن گەڵا گەڵا وەرەق وەرەق
بەیانی کیبریایی حەق بە کێو و چێو و دارەوە
بە شەو کە دەنگ ئەداتەوە لە کێوی قاسپە قاسپی کەو
تروسکەیێ بە گوڵ دەدا نەسیم و نووری مانگەشەو
من و نیگاری نازەنین بە مەزهەبم حەرامە خەو
(حەقیقی) فرسەتی وەها قسەی دڵت مەشارەوە

بەشێوەیێکی دیکە حەقیقی وەسفی ئەو پەریبە دەکا کە ئەدەب (میسباح – ددیوان) لە وڵاتی نادیارستانەوە هێناویەتییە سەر شانۆی مەیخانەی پیری موغان. کۆرسکەی پەرییانی بەهەشتن، دەمێک لە مەیخانە و دەمێک لە ناو بەهارستان لەگەڵ گوڵ و گوڵاڵە لە ناو یەکتریدا دەتوێنەوە، لەوانەیە کەسێک نەبێ گوڵ و پەری لە یەکتری جیا بکاتەوە پیری پیرانی دنیای سۆفیزمی بێ پایان نەبێ. ئەم شیعرە هەرچەندە بۆنی ئەدەبی میسباحی لێ دێ بەڵام بەڕاستی زادەی خەیاڵی حەقیقییە و دەچێتە خانەی داهێنانەوە.

٢

لە وەسفی ئەندامە وردەکانی دلبەر حەقیقی دەڵێ:

خەت و خاڵت بە خودا فیتنەیی هیند و حەبەشە
ئافەتی دین و دڵە ڕەونەقی ئەو کوڵمە گەشە
خەلەلی چین و چ گوڵ شۆڕشی ڕۆم و عەجەمی
لەسەر ئاشووبیی زولفت لە هەمووی کەشمەکەشە

چاو ئەر نێرگسی شەهلا نییە بۆ هێندە خومار
پەرچەمت گەر شەوی یەلدا نییە بۆ هێندە ڕەشە
زینەتی کولمتە لەرزینی گولێنگی شەدەکەت
گەرچی ئەگریجە کە تەزیینی ئەویش و ئەوەشە
شەشدەری خاڵی سەری کولمەتە دڵ نایەتە دەر
سەری سەودازەدە بێ خود بەتەمای پێنج وشەشە
بەو دوو سێ شیعرە (حەقیقی) کە لە مەیدان دەرچوو
تەنگە جەولانی قسە و تەوسەنی تەبعی هەڵەشە

لەم شیعرەدا حەقیقی هەوڵ دەدا بۆنی خۆی لە وەسفەکەدا بێ. کاریگەریی ئەدەب (میسباح) پێیەوە دیارە، بەڵام ئەم جۆرە وەسفە لە پێش ئەویشدا هەبووە. داهێنانی لەم ڕووەوە تازەیە چونکە وشەی فەرهەنگی شیعری وەسف و دڵداری کلاسیکی وەرگرتووە و وێنەی تازەی دروست کردووە، لە یەکەم خوێندنەوەدا خوێنەر وا هەست دەکا یەکەم جار نییە گوێی لەم ڕستانە دەبێ، بەڵام کە هەندێ زیاتر ورد دەبێتەوە جەوهەری داهێنانەکەی شاعیری بۆ ئاشکرا دەبێ.

٣

لە وەسفی شاری پاوە شاعیر دەڵێ:
خۆشی لە خۆت شاری پاوە
ناوت لە دنیادا قاوە
کورتەی بێرووت و لبنانی
چاوی ڕاستی هەورامانی
حەول و حەوشت تاکو سنە
بابولسەر و ڕامسەر چنە
مەڵبەندێکی خوا پێداوی
وەک باغی شەددادی ماوی
بۆ گوڵ و لالە و نەسرینی
بولبول کێشکە و تۆ پەرژینی



ئەم دەم سەییاح بووم گەشتی بووم
لەگەڵ نووح سواری کەشتی بووم
دیمی لەسەر کێوی جوودی
وێنەی بەهەشتی مەوعوودی

ئەم شیعرە بەحسێب دەبێ وەسفێکی جوگرافی شاری پاوە بێ، کەچی حەقیقی ئاسۆییێکی شیعرایەتی داوەتێ. زۆر ئاساییە شاعیر جوانیی ئەو شارە بەبەهەشت بچوێنێ. بۆ ئەم مەبەسە چۆن و لە کوێ تەماشای دەکا بۆ ئەوەی جوانییەکەی بدۆزێتەوە! شاعیر خۆی لە ناو کەشتییەکەی نووح دەبینێ، لەسەر شاخی جوودی یا ئارارات نیشتۆتەوە، لەوێوە پاوە دەبینێ و جوانییە بەهەشتییەکەی دەدۆزێتەوە.

**دانایی و ئامۆژگاری**

١

لە بابەت داناییەوە حەقیقی دەڵێ:
تۆ خاوەن و خانەخێ و منیش میوانم
بۆ هەر شتێ ڕێم نیشان نەدەی نازانم
لێم سوورە دەبووری لە گوناهم چونکە
لێت سوورە کە من بە تۆ هەیە ئیمانم

لەم چوارینەدا شاعیر گەمەییێکی ڕەوانبێژی دەکا بۆ ئەوەی هەڵوێستێکی دانایی بخاتە ڕوو. خوێنەر ئەگەر وشە بەوشە لە مانای ئەو شیعرە ورد نەبێتەوە ناگاتە ئەنجام کە تێگەیشتنی شیعرەکەیە. پێوەندییەکە لە نێوان دڵدار و دلبەر، یا مامۆستا و قوتابی، دوو شتن لە یەکتری جیا نابنەوە و باوەڕیان بەیەکتری هەیە.

٢

لە ئامۆژگارییێکیدا شاعیر دەڵێ:
گوێ بگرە لەگەڵ تۆمە ڕەفیقی گیانی
ڕووخۆش و زمان خۆش بە لەگەڵ میوانی
ساردی و سڕی وو دڕی بەشی حەیوانە
خۆ دوورخەرەوە لەوانە تۆ ئینسانی

ساكارانه و بەشێوەییێكی جوان شاعیر بەئادەمزاد دەڵێ ئەو كردەوانەی ئاژەڵ دەیانكا، نابێ تۆ بیانكەی، چونكە تۆ ئادەمزادی كەسیش ئامادە نییە ببێ بەئاژەڵ.

**كوردایەتی**

لە شیعرێكیدا حەقیقی بەم جۆرە باس لە كورد دەكا:

ئازا و بەغیـرەت كـوردە و دیاری
لەعنەت لە ئاهۆی نەخـوێندەواری
بەوری بەیانە و لێی دەركـەوتووە
پڵـینگی بێشـەی شێری خەوتووە
تا خـوا حەز دەكـا ئازا و نەترسن
بۆ مەرد و ڕەندی لێـیـان مەپرسن
شـێــری شكارن ئازا و بەكــارن
ئەمما داخــەكــەم نەخــوێندەوارن

هەرچی ڕەوشتی جوان و باشە لەم دێڕانەدا شاعیر دەدا بەكورد، بەڵام ئاخ هەڵدەكێشێ چونكە نەخوێندەوارن. بەم دێڕانە كۆتایی بەشیعرەكەی دێنێ:

ئێستا ڕزگارن هەست و دەست و مست
ڕۆژ ڕۆژی كــارە ســاڵ ســاڵی زانست
زمــــانی كــــوردی چلدانـەی رازە
چاكی نیـــــــازە بـڕۆ بـخـــــــوازە
چت دەوێ تـێــــیــــدا ووردەواڵـەیە
لـێـــــــشی نـابڕێ بـنـەمــــــاڵـەیە
گـەنجی فـەرهەنگی نەغـدە و نهـێنی
نە گــــەنجــــێكی وا ناوی نەهـێنی
قــــامــــووسی واژەی دەریا دەریـایە
دوور و گــەوهەری قــەت دوایی نایە
بڕۆن بـخـــــوێنن گـــــەورە و چكۆڵە
جــەبری مــافــاتە دەســـتــێنن تۆڵە



مەكەن كـێشە كـێش بڕۆن بەرەو پێش
برا برایە برا و كــێـــشـــە كـــێش
ئاخــــر هەتاكـــەی وا بێ بەشی تۆ
كــــــەی ئاوا دەبێ ڕۆژی ڕەشی تۆ!

حەقـیـقی ئەم شـیعـرەی لە دوای كوودیتـاكەی خومەینی لە ساڵی ١٩٧٩دا وتووە. بێ گـومـان لە سـەرەتادا ئەم ڕووداوە جـێی شـادی بوو چونكە بووە هۆی ڕووخـانی ڕژێمی شاهنشاهی لە ئێرانا بەتایبەتی لای هاوولاتییانی كوردی ئەوێ. لەبەرئەوەیە شاعیر ڕوو دەكاتە خەڵكی نەتەوەكەی خۆی و پێیان دەڵێ، ڕاپەڕن، سوود لەم هەلە بەنرخە وەربگرن، خەریكی زانست بن، زمانی كوردی زمانێكی خۆشە، فەرهەنگی دەوڵەمەندە، گەنجینەیە دوڕ و گەوهەری تێدایە. ڕاستە كورد لە ئەنجامی ئەم ڕاپەڕینە قوربانی زۆری داوە، بەڵام ئەوەی پێویست بوو لەم هەلوێستەشدا چنگ نەكەوت، لەگەڵ ئەوەشدا سۆزی نەتەوەیی و بیری كوردایەتی بەهێزتر بوو. لە پێشانا ئەو سۆزە ئەگەر لە ناوچەی موكریاندا هەبووبێ، ئێستا هەمـوو دەوروبەری سنە و كرماشان و بەختیاری و لوڕی گرتۆتەوە، سوود لەو برە ئازادییـە وەردەگـیرێ بۆ دوارۆژی كـوردسـتـانی ئێـران بەتایبـەتی و كـوردسـتـانی گـەورە بەگشتی.

***

عەباس كوڕی عەلی ناسراو بەحەقیقی، شاعیرێكی بەتوانای كۆمەڵی كوردەوارییە. شاعیریەتی خۆڕسكە، دڵسۆزی شیعریەتی، ناڕاستی لەگەڵ خۆیدا نەكردووە. لە شیعرە عەرووزییەكانیدا وردە، وشە و زاراوە و لێكسیكۆنی بەهێزە، لە شیعرە خۆماڵییەكانیدا میللییانەیە. لەوانەیە ئەگەر شیعرێكی عەرووزی لەگەڵ شیعرێكی میللی بەراوورد بكرێ خوێنەر وابزانێ بەرهەمی دوو شاعـیـرە، لەگـەڵ ئەوەشـدا هەر یەكـێـك لەم دوو شـیـعـرە كەسێتیی تایبەتیی خۆی هەیە، چونكە هەریەكەیان ئەو مەرجەی بۆی دانراوە تیایدا هەیە. ئەمەش وەستایەتی شاعیر دەگەیەنێ.

# بەشی سی و دووەم

## جیگەرخوێن

**١٩٠٣ - ١٩٨٤**

### ژیانی

شێخمووس کوڕی حەسەن کوڕی محەمەد کوڕی مەحموودە لە گوندی حەسار، نزیک ماردین لە ساڵی ١٩٠٣ لە دایک بووە. کە منداڵ بووە شوانی مەڕومالات و گاوانی کردووە. هەر لەو تەمەنەدا باوکی مردووە خوشکی گرتوویەتییە خۆی و بەخێوی کردووە. سەختی ژیان ئەو ماڵە کوردەی ناچار کردووە بگوێزنەوە گوندی عاموودە.

سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت بووە، هەموو قۆناغەکانی خوێندنی زمانی عەرەبی و زانستییەکانی ئایینی ئیسلامی تەواو کردووە. بۆ ئەم ئامانجە وەکو دەستووری ئەو سەردەمە لە پێناوی خوێندن هاتوچۆی هەندێ لە حوجرەی مزگەوتەکانی کوردستانی تورکیا و ئێران و عیراق و سووریای کردووە تا ئیجازەی دوازدە عیلمی لەسەر دەستی مەلا عوبێد وەرگرتووە و ماوەییەکیش لە کوردستانی عیراق و ئێران مەلایەتی کردووە. لە سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەمدا وازی لە پیشەی مەلایەتی هێناوە و جلوبەرگی مەلایەتی داکەندووە و نازناوی «جیگەرخوێن»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. ئەم ناوە ڕەنگدانەوەی هەژاری خۆی و دواکەوتوویی میللەتەکەیەتی.

جیگەرخوێن لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد نزیک دەبێتەوە، بیروباوەڕی دیمۆکراتی و ئاشتیخوازی و ئەنتەرناسیۆنالیزمی لەگەڵ بیری نەتەوەیی دەگونجێنێ. شیعر دەنووسێ و لە ڕۆژنامەگەری کوردی و عەرەبی نزیک دەبێتەوە. لە ساڵی ١٩٥٩ تا ساڵی ١٩٦٣ دەبێتە مامۆستای موحازیر لە بەشی زمانی کوردی لە زانستگای بەغدا. لە پاشانا گەڕاوەتەوە سووریا و لە قامیشلی ژیاوە، خەریکی نووسین و سیاسەت بووە تا ساڵی ١٩٧٩. دەسەڵاتی شۆڤێنی سووریا بەرامبەر بەکورد جیگەرخوێنی ناچار کردووە وڵات بەجێ بێڵێ و ئاوارەی هەندەران بێ. ئیتر ڕووی کردۆتە سوید و لە شاری ستۆکهۆڵم نیشتەجێ بووە. لەمە بەدواوە لە ناو ڕیزی کوردی ئاوارەی هەموو لایێک خەباتی دەکرد، تا ڕۆژی ٢٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٤ کۆچی دوایی کرد. بۆ بەجێ هێنانی ڕاسپاردەی خۆی تەرمەکەیان گواستەوە قامیشلی و لەوێ بەخاکیان سپارد.



### شیعری

لە خوێندنەوەی شیعری عەرووزی بەهۆی خوێندنی زانستییەکانی مەلایەتی گوێی مۆسیقی لە لای جیگەرخوێن بەهێز بووە، لەبەرئەوە شیعری لەسەر بەحری عەرووزی داناوە، بەڵام بەهۆی بایەخ دانی بەشیعری میللی هەموو ئەو شیعرانەی دەچنە سەر بەحری عەرووزی شەقڵی میللییان پێوە دیارە نەک تەنیا لە ڕووی زمانەوە بەڵکو ئەگەر تەفعیلە عەرووزییەکان کەرت بکرێن ئەو شیعرانەش دەچنەوە سەر کێشی سیلابی خۆماڵی، چونکە لە شیعرە عەرووزییەکانیدا جیگەرخوێن کێشە سووکەکان بەکار دێنێ.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

بەگشتی لە ڕووی ڕوخسارەوە شیعری جیگەرخوێن دەچێتە ناو ئەو خانەیەوە کە شیعری میللی پێ دەڵێن. زمانی ئاسانە، وشەی فەرهەنگی قسەکردنی ناو خەڵک لە ناو بەرهەمیدا زۆرە. کێش و قافیەی شیعری میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) بەکار دێنێ. لە چیرۆکە شیعرییەکانی یا پۆیێمەکانیدا لاسایی بەیت و باڵۆرەی ئەدەبی فۆلکلۆری دەکاتەوە. هەناسەی بۆ ئەم جۆرە شیعرە درێژە.

### شیعری لە ڕووی ناوەرۆکەوە

شیعری جیگەرخوێن لە بابەت ناوەرۆکەوە دەچێتە سەر لیریک بەمانا ئەوروپییەکەیەوە. واتە سێ مەبەسی سەرەکی تێکەڵ بەیەکتری دەکا. یەکەمیان بیری نەتەوەیی کوردی، دووەمیان فیکری ئەنتەرناسیۆنالیزمی و مرۆڤایەتی، سێیەمیان ئیدیۆلۆجییەتی چینایەتی. لە شیعریدا ئەم بۆچوونانە بەرچاو دەکەون، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنی شیعری تایبەتی نییە بۆ ئەم مەبەسانەی تێکەڵی یەکتری کردوون.

جیگەرخوێن شیعری بۆ هەموو لایەنێکی ژیان وتووە، ئەگەر شیعری دڵداری بەمانا کلاسیکییەکەی و مانا سەردەمییەکەی کەم بێ لە بەرهەمیدا بەڵام پشتگوێی نەخستووە، ئەو دڵدارییەی بەڕۆژی ڕەشی میللەتەکەی بەستۆتەوە. مێیینەی کورد لای خۆشەویستە چونکە ڕەمزی دیلی و دواکەوتوویی و چەوسانەوەیە، ڕزگاریی ئەو بەندە بەرزگاری نەتەوەی کورد هەمووی.

بەڕاستی جیگەرخوێن شیعری بۆ هەموو سووچێکی ژیانی کورد وتووە، لەبەرئەوەی

بەشی زۆری ئەو ژیانە نالەبارە دەچێتە ناو گێتیی ڕەشبینییەوە، کەم خەندەیان لێ دەبارێ و زۆرتر فرمێسکیان لێ دەچۆڕێتەوە.

لە ژیانی خۆیدا جیگەرخوێن بەرهەمی شیعری لە ناو حەوت کتێب بڵاوکردۆتەوە، لە کات و جێگەی جیاواز بەچاپی گەیاندووە. هەوڵی داوە هەر کۆمەڵە شیعرێکی شارەزاییێکی ئەدەبی کوردی پێشەکیی بۆ بنووسێ. کۆمەڵە شیعرەکان ئەمانەی لای خوارەوەن، هەمووشیان بەناوی تایبەتی خۆی و ناوی دیوانەوە چاپ کراون:

١- دیوانا یەکان لە ساڵی ١٩٤٥ لە شام چاپ کراوە و جەلادەت بەدرخان پێشەکیی بۆ نووسیوە.

٢- سەورا ئازادی لە ساڵی ١٩٤٥ لە شام چاپ کراوە و عوسمان سەبری پێشەکیی بۆ نووسیوە.

٣- کیمەئەز؟ لە ساڵی ١٩٧٣ لە بێرووت چاپ کراوە و حەمید دەرویش پێشەکیی بۆ نووسیوە.

٤- ڕۆناک لە ساڵی ١٩٨٠ لە ستۆکهۆڵم چاپ کراوە و کەمال بورقای پێشەکیی بۆ نووسیوە.

٥- زەند ئاڤێستا لە ساڵی ١٩٨١ لە ستۆکهۆڵم چاپ کراوە و قەناتی کوردۆ پێشەکیی بۆ نووسیوە.

٦- شەفەق لە ساڵی ١٩٨٢ لە ستۆکهۆڵم چاپ کراوە و جاسمی جەلیل پێشەکیی بۆ نووسیوە.

٧- هیڤی لە ساڵی ١٩٨٣ لە ستۆکهۆڵم چاپ کراوە و ئۆریخانی جەلیل پێشەکیی بۆ نووسیوە.

## پەخشانی

مەبەس لە پەخشان ئەو نووسینانەن دەچنە ناو داهێنانی هونەرییەوە، لەم بابەتە جیگەرخوێن بایەخی بەچیرۆک داوە. چیرۆکەکانی لەگەڵ ڕەچاوکردنی لایەنی هونەری و دوورکەوتنەوەی لە حیکایەتی میللیی سەرزار نووسەر ناوەرۆکی چیرۆکی لە بەسەرهاتی ناو کۆمەڵ وەردەگرێ. لەوانە چیرۆکی «جیم و گولپەری» لە ساڵی ١٩٤٧ لە شام بڵاوکراوەتەوە. چیرۆکی «ڕەشۆیێ داری» لە ساڵی ١٩٥٦ لە شام بڵاوکراوەتەوە. چیرۆکی «سالار و میدیا» لە ساڵی ١٩٧٣ لە بێرووت بڵاوی کردۆتەوە.



## نووسینی دیکەی

جگە لە شیعر و چیرۆک کە کاری بنچینەیی جیگەرخوێن بووە، لە کاری زانستی لە بابەت زمان و ئەدەبی کوردییەوە جێ پەنجەی دیارە. لە سەرەتای شەستەکاندا کە لە بەغدا ژیاوە کتێبی «ئاوا و دەستوورا زمانی کوردی» لە ساڵی ١٩٦١دا بڵاوکردۆتەوە، ئەم کتێبە لە بابەت دەستووری زمانەوەیە. دیارە ناوەرۆکی کتێبەکەی بەوانە لە بەشی زمانی کوردی لە زانستگای بەغدا وتۆتەوە. هەروەها کتێبی «فەرهەنگا کوردی» لە دوو بەرگدا لە ساڵی ١٩٦٢دا لە بەغدا بڵاوی کردۆتەوە.

لە پێش ئەم کارە زانستییانەدا کۆمەڵێک پەندی پێشینانی بەناوی «گۆتنێن پێشییا»ی لە ساڵی ١٩٥٨ لە شام بەچاپ گەیاندووە. بەم جۆرە جیگەرخوێن نە تەنیا بەکاری داهێنانی ئەدەبی کوردی (شیعر و چیرۆک) خزمەتی ڕۆشنبیری کوردی کردووە، بەڵکو بەشداری کردنی لە لایەنەکانی دیکەی خوێندەواری کوردی لەبەرچاوە.

## نموونەی شیعری

١

لە شیعرێکیدا جیگەرخوێن دەڵێ:

دەستی شێخ ماچی مەکن ئەو شێخ نە قوتبێ رازییە
تاج و شەوکەت تەڤ خەباتا دەستێ سار و تازییە
ئەو نەدینە دبن مەبە دین سەرخوە بوونا میللەتێ
سەر مەبە بەر لنگێ شێخ کەنگێ خوەدێ ژ رازییە
ما ژ بۆ دین شەر دکن خورتێ فرەنسە و ئینگلیز!
وا ل مسرێ خوین درێژن بوون شەهید و گازییە
گەر نەخوونن دێ بەگ و ئاغا مە تم تالان دکن
ئەڤ نەزانی جانگرانی کارەکێ ناسازییە
رێنجبەرێ شێخ و مەلایی کارەکێ ئاغا وو بەگ
یێ هنان پێ کارنە لێ یێ هناک جانبازییە
ئەو کەسێ زانا دڤێت تم وەک (جەگەرخوون) بکن گیر
راستە وی زنجیر د ملدا تم ب گیر و گازییە

لەم شیعرەدا جیگەرخوێن لە شێخی تەریقەت دەدوێ بەناوی ئاین و دەروێشیزمەوە لە لایێک خەڵکی دەڕووتێنێتەوە، لە لاییکی دیکە فێری تەمەڵی و باوەڕکردن بەئەفسانەیان دەکا. بەخەڵکی دەڵێ کاری ئەوان ئاین نییە، ئێوە شێت مەبن. ئاینی بەڕاستی داواکردنی ئازادییە بۆ میللەتی ژێردەست. لە شیعرەکەدا ئاماژە هەیە بۆ دەستدرێژییەکەی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیسرائیل بۆ سەر میسر لە ساڵی ١٩٥٦دا. شاعیر دەڵێ شەڕی ئەمانە لە پێناوی ئاین نییە، بۆ چاکە و بەرژەوەندی خۆیانە.

ئینجا شاعیر دواکەوتوویی کورد لە کردەوەی هەندێ دەرەبەگ و دەوڵەمەند و شێخ و مەلا دەبینی. خوێندەواری نەبێ هیچ کارێکی دیکە چارەسەری ئەم دواکەوتووییە ناکا.

٢

لە شیعرێکیدا جیگەرخوێن بەناوی «سەرخوە بوون»ەوە دەڵێ:

کوردینۆ! مەردینۆ! پر خوەشە سەرخوە بوون
ئەو دەمێن تار و تەنگ کو د ناڤێ چوون
رۆژ ل مە هاتە دەر زووشیار بن ژ خەو
ئەڤ دەما جەنگ و شەر پاش کەتن پێدی هەو
من دڤێ ئۆل و بەخت، من دڤێ پێشڤەچوون
من دڤێ تاج و تەخت، من دڤێ سەرخوە بوون
دەست بدن هەڤ هەمی پێشکەڤن ئەم هەمی
دا بچن بۆ وەلات یان مرن یان فەلات

لە ڕووی ماناوە جیگەرخوێن باس لە سەربەستی دەکا، ژیانی سەربەستی هەوێنی بەختیارییە. بانگی کورد دەکا هەوڵ بدەن بۆ دەستخستنی سەربەستی بۆ ئەمە دەسەڵاتی دەوێ، دەسەڵاتێک بەدەست کورد خۆیەوە بێ. بەڵام گومانیش لەوەدا نییە ئەو دەسەڵاتە دەبێ دادپەروەر بێ، بەیەکسانی فەرمانڕەوایی بکا و بۆ چاکەی زۆربەی چین و توێژەکانی میللەت بێ. لە ڕووی هونەری شیعرییەوە ئەم پارچە شیعرە نوێکردنەوەییێکە لە تەرکیب بەند یا تەرجیع بەندی کوردی، چونکە قافیەی شیعرەکە مەسنەوییە، بۆ ئەم جۆرە شیعرە پێویستە قافیە یەکێتی بێ، دێڕی دوایی کە تەرجیعەکەیەتی کردوویەتییە بابەتێک لە بابەتەکانی تەرجیع بەند یا تەرکیب بەند.



٣

لە لیریکێکیدا جیگەرخوێن بەناوی «مەهرەجان»ەوە دەڵێ:

پێکڤە ئەم خورتێ جوانین
تێن ژ هەر شۆپ و جە
مەهرەجان بۆ مە جوانین
هەر بژی ئەڤ مەهرەجان
دۆزا مە هەر ئازادییە
دۆزا مە دیمۆکراتییە
دۆزا مە هەر ئاشتییە
گەر بڤین و گەر جڤین
یا خەبات و کەفەرات
هەر دڤێ ئەم هەرنە پێش
بۆ فەلات و بۆ وەلات
ئەم هەمی دۆست و هەڤالین
بۆ چ بەند و بەربەری
تێکدا نووهاتی دەلالین
ئەم چ جەنگ و شەرکەری
دۆزا مە دەولەمەندییە
دۆزا مە سەربلندییە
دۆزا مە هەر ئاشتییە

جیگەرخوێن ئەم شیعرەی بۆ یەکێ لە میهرەجانی لاوانی دیمۆکراتی گێتی وتووە. لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمەوە تا دەورووبەری ڕووخانی دەسەڵاتی سۆڤیەت بەناوی دیمۆکراتی و ئاشتی و ئاسایشەوە میهرەجان و کۆنگرەی لاوان و قوتابیان و ژنان دەبەسترا، ڕێکخراوی دیمۆکراتی کوردی بەشدارییان لەو میهرەجانانە دەکرد بۆ ناساندنی مەسەلەی نیشتمانی کورد بەخەڵکی ڕووی ئەم زەوییە. لەم شیعرەدا جیگەرخوێن دڵسۆزانە لاوی کورد بەبەشێک دادەنێ لە لاوانی گێتی و سوورە لەسەر ئەوەی کوردیش لایەنگری ئەوەیە سەربەستی و دیمۆکراتی و ئاشتیخوازی باڵی بەسەر مرۆڤایەتیدا بکێشی.

٤

له شیعری «کەچا کورد» جیگەرخوێن دەڵێ:

کەچێ رابە! سەری هلدە د ڤێ چاخێ وەها نابی
بنێر ژن چوونە ئەزمانا هەتا کەنگی د خوە دابی
دخوازم زوو بخوونی خوەش ژ سەر روو راکی چارا رەش
تو گاڤان پێشدا باڤێژی وەکی ئاندەر و بەندا بی
چنە ئەڤ چارک پێچی د رەختادا خوە راپێچی
ب دەستێ تە کەلاشنیکۆڤ بە رازانە وو خوەندا بی
ژ دژمن دا تو مەر کوژ بی د هندوردا تو پاگژ بی
نە خاڤ و بێ خویی و رژ بی مەگەر جەندان ل گوندا بی
بەرێ گوندی وو رەجبەر بی وەلاتپارێز و پەروەر بی
سپی بی یان تو ئەسمەر بی وەکی فانۆس و فندا بی
وەکی فندێ دکی رۆنی ل باژێر یان ل گوند روونی
دییا شێر و پلنگا بی هەڤالا سەربلندا بی
ئەرێ شۆخێ ئەرێ شەنگێ ب هەڤرا ئەم هەرن جەنگێ
گریدایی هەتا کەنگی بمینی دل و وونـدا بی
دخوازم کو وەکی من بی ب دژمنرا تو دژمن بی
د جەنگێدا وەکی جن بی نەرەنگێ بووم و کوندا بی
وەرە خوشکێ تو زوو رابە د شەردا رەنگێ شێرا بە
بەری ئالآمەیە رەنگن ل سەر شاخان تە هلدا بی
د رۆژێن شاهی وو جەژنێ بنێرم ئەز ل وێ بەژنێ
ب هەڤرا ئەم هەرنە دانسێ تو پادشاهێ رندا بی
شرین و نازک و رندیی شەکەر لێڤ و سپی زەند بی
وە ئەم هەڤ بکن هامێز بەرە فەتوا خوە من دابی
کەچا زانا وو ژێهاتی ببە پارتی دیمۆکراتی
بەرا دیسا تو شێرینە دلێ خورتا وو سەیدا بی



لەم شیعرە جوانەدا جیگەرخوێن ئامۆژگاری کچی کورد دەکا، لە بەندیخانەی ماڵ بێتە دەرەوە، عەبا و پەچە فڕێ بدا و بەشداری لە دروستکردنی شارستانییەت بکا. ئەو کچە کوردە بەلای شاعیرەوە هەموو شتێکە، ئەوەی پیاو دەیکا دەبێ ئەویش بیکا. داوای لێ دەکا فێر ببێ، بخوێنێ. ژنان بوون بەفرۆکەوان و لە ئاسمانا دەسووڕێنەوە. داوا لە کچە کورد دەکا ببێ بەجەنگاوەر تفەنگی کەلاشنیکۆڤ بەکار بێنێ. ئەمە تفەنگێکی ئۆتۆماتیکی ڕووسی باش بوو، ناوی لە گێتییدا دەرکردبوو. لە دوای ئەوەی دەیکا بەجەنگاوەر. لەم هەموو درشتییەوە دێتە سەر نەرم و نۆڵی، ئەو دەکا بەدلبەرێکی ناسک و خۆشی دڵدارە. لە دوایی وەک خوشکێک قسەی لەگەڵدا دەکا. شاعیر چەندە دڵخۆش و بەختیار دەبێ لە ئەنجامی خەباتی کوڕ و کچی کورد کە ئالای نەتەوەیی لەسەر شاخەکاندا هەڵدەکرێ. لە پاش سەرکەوتن کچی کورد دەبێتەوە دلبەری شاعیر و داوای لێ دەکا لە ئاهەنگی ئازادییدا دانسی ئەوروپایی لەگەڵدا بکا، دەست لە ملی یەکتری بکەن. دەبێ بەلای شاعیرەوە کەس هەبێ لەو کچە کوردە جوانتر بێ! لە دواجاردا داوای لێ دەکا ببێتە پارتی دیمۆکراتی. لێرەدا جیگەرخوێن مەبەسی ئەوە نییە ئەو کچە کوردە ببێتە ئەندام لە پارتییێک یا ڕێکخراوێک بەناوی دیمۆکراتییەوە، بەڵکو مەبەسی ئەوەیە هەڵگری بیروباوەڕی دیمۆکراتیزم بێ.

٥

لە شیعرێکیدا بەناوی «خوەندن» جیگەرخوێن دەڵێ:

خوەندن نەبی کەس ناچە پێش
پەیدا دبن پڕ دەرد و ئێش
هەردەم دەبن دەستێ نەیار
ئەم دێ بدن خووکی وو بێش

***

هەرچی نەخوەندی ڕێنجبەرە
یێ کو بخوێنە ڕێبەرە
هەر دەم دنێڤ خان و سەرا
سەرکارە یانا سەروەرە

***

خوەندن دڤێ هەم پر خەبات
بۆ ملله‌تێ کورد و وەلات
کوردینۆ! ژ خەو رابن هەمی
مزگین ل وە رۆژامە هات

***

ئەڤ تاج و شەوکەت خوەندنە
ئەڤ دین و دەولەت خوەندنە
ئەڤ سەربلندی خوەندنە
ئەڤ دەولەمەندی خوەندنە

ئەم سرووده یەکێکە لە سرووده زۆرەکانی جیگەرخوێن کە بۆ فێربوون و خوێندنی وتووە. بەشێوەی بەندی چوارین و ڕەنگاوڕەنگی قافیە و بەکارهێنانی کێشی هەشت بڕگەیی خۆماڵی هۆنیویەتییەوە. ئەمەو بەشێکی زۆر لە بەرهەمی شیعری دەچێتە خانەی شیعری پەروەردەیییەوە سوودی بۆ بەشێکی فراوان لە کۆمەڵی کوردەواریدا بووە بەتایبەتی لاوان و قوتابییان.

***

جیگەرخوێن یەکێکە لە شاعیرە ناودار و بەدیمەنەکانی کورد. ناوبانگی لە شاعیرییەت و نیشتمانپەروەری و هەڵگری بیری کوردایەتی هاتووە. خوێندنی ئاینیی بووە، لە سەرەتادا مەلایەتی کردووە، ئینجا وازی هێناوە و هەموو ژیانی بۆ شیعر و نووسین تەرخان کردووە، لە ژیانی هەژاری خۆیەوە بیری لە کورد کردۆتەوە، دیویەتی هەردووکیان هەژارن، ئینجا لە کۆمەڵی مرۆڤایەتیش هێشتا هەژار زۆرن و دەوڵەمەند کەمن. بەپێی بیروباوەڕی سەردەمی ژیانی خۆی بیری کردۆتەوە، لایەنگری دیمۆکراتیزم بووە، شیعری بۆ ئاشتی وتووە، هەموو مرۆڤایەتی خۆشویستووە، بەڵام مەبەسی سەرەکی ڕزگاریی نەتەوەی خۆی بووە.

بەرهەمی شیعری جیگەرخوێن کەم نییە، هەموو لایەنێکی ژیانی مرۆڤایەتی گرتۆتەوە، بەتایبەتی مەسەلەی نیشتمانی و خەباتی ڕزگاریی میللەتی کورد. شیعری ڕەوان و سوارە، فەرهەنگی شیعری دەوڵەمەندە، سوودی لە وشەی فەرهەنگی میللی کوردی وەرگرتووە. زۆربەی خەڵکی کورد لە شیعری دەگەن، تا دەگاتە نەخوێندەوارەکانیش لەبەرئەوە شاعیرێکی دیارە لە ناو شاعیرانی سەدەی بیستەمدا.

## بەشی سی و سێیەم

## ئاوات

## کامیلی ئیمامی

**١٩٠٣ - ١٩٨٩**

### ژیانی

کامیل کوڕی سەید عەبدولحەکیم کوڕی سەید عەبدولکەریم لە ساڵی ١٩٠٣ لە ئاوایی زەنبیل لە دایک بووە. لە بنەماڵەی شێخانی زەنبیلی مورشید و بەڕێوەبەرانی هەردوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی بووە. لە ساڵی ١٩١٢ لە لایەن کەسوکارییەوە دەستی بەخوێندن کردووە لەسەر پرۆگرامەکانی زانستییە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی. لە گوندەکانی جەمیان و توورجان و کانی سێو قۆناغەکانی قوتابیەتی و فەقێیەتی بەڕێ کردووە. لە پاشانا لەگەڵ حەقیقیی شاعیر لە گوندی باغچەی نزیک مەهاباد خوێندوویەتی. لە ساڵی ١٩٣٠ بەهۆی نەخۆشیی باوکیەوە وازی لە خوێندن هێناوە و لەسەر خواستی ئەو بووە بەخاوەن ژن و ماڵ و لەم ماوەیەدا باوکی کۆچی دوایی کردووە.
لە ژیانی شیعریدا نازناوی «ئاوات»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، بەم ناوە ناسراوە و لە شیعریدا تۆماری کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ناوی تایبەتیی خۆی «کامیل» و ناوی «ئیمام»یشی وەک نازناو لە شیعریدا بەکارهێناوە.

ئاوات لە دوای مردنی باوکی ماڵی گواستۆتەوە گوندی ئاشی چۆمی (زەنبیل) و خەریکی کشتوکاڵ بووە، لە پاش ماوەیێک گواستوویەتییەوە گوندی گەردیگلان. لە ساڵی ١٩٤٦ دەسەڵاتی شای ئێرانی دیکتاتۆری لەسەر بیری کوردایەتی و باوەڕی ئاینزایی سوننیەتی گرتوویەتی و ماوەی دوو ساڵی لە بەندیخانەکانی بۆکان و سەقز و ورمێ و مەهاباد بردۆتە سەر و لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٨ لە زیندان ئازاد بووە.

لە ساڵانی ١٩٥٠ - ١٩٥٤ چەند جارێک ماڵ دەگوێزێتەوە، لە ئاواییەکانی جەمیان و زەنبیل و چۆچان ژیانی دەباتە سەر، لە پاشانا لە گوندی قاقڵاوەی نزیک زەنبیل نیشتەجێ دەبێ و لەسەر کشتوکاڵ گوزەرانی بەڕێوە دەچێ. تا دوایی ژیانی لەو جێیە ئۆقرە دەگرێ. لە ڕۆژی ٢٧ی ئاغستۆسی ١٩٨٩ کۆچی دوایی دەکا.



### شیعری

ئاوات شاعیرێکی ڕەسەن و ڕەندی کوردییە، لە منداڵییەوە ئیلهامی شیعر وتنی بۆ هاتووە، بەدرێژایی تەمەنی لەگەڵ شیعردا ژیاوە، لەبەرئەوە بەقەوارە کەم نییە و بەناوەرۆک بەرزە. دڵسۆز بووە لەگەڵ بەرهەمی شیعری بۆیە بووە بەوێنەی ڕاستەقینەی چێژ و خەیاڵی. لە شیعریدا ڕاستگۆ بووە لە هەر بابەتێکی کە نووسیویەتی، جا ئەو بابەتانە پێچەوانەی یەکتریش بووبن گرنگ نییە.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری ئاوات لەم لایەنەوە فراوانە. لە کێشی شیعریدا بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە، وەک لەم تێبینییانەی لای خوارەوە دەخرێتە ڕوو:

١- لە شیعرە عەرووزییەکانیدا بەحرە سووکەکانی بەکارهێناوە وەک هەزەج و ڕەمەل و هی دیکە، نیوە دێڕی هەندێ لەو کێشانە ئەگەر کەرت بکرێن لەگەڵ کێشی سیلابی خۆماڵییش ڕێک دەکەون.

٢- شیعری کێشی خۆماڵی هەیە بەتایبەتی دە بڕگەیی لە هەندێکیاندا وەستان لە ناوەڕاستدا هەیە (٥ + ٥) لە هەندێکی دیکەیاندا وەستان نییە.

٣- لە قافیە و پاش قافیە وەستایە. شیعرە عەرووزییەکانی هەموویان لەسەر یەکێتیی قافیە هۆنراونەتەوە، شیعرە خۆماڵییەکانی، لەسەر سیستێمی جووت قافیە (مەسنەوی) دامەزراون.

٤- شاعیر لە بەکارهێنانی دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی دەوڵەمەندە، کەچی خۆی لە دەنگە تایبەتییەکانی ئەلفوبێی عەرەبی لاداوە. ئەو دەنگانەی لە شیعریدا بەکاری هێناون ئەمانەن: ا ت ج خ د ر ز س غ ک گ ل م ن و وو ۆ (ە - ـە) ی ێ.

٥- شاعیر بایەخی بەپاش قافیە داوە، وشە و ڕستەی تەواو و ناتەواوی بەکارهێناوە. هوشیارانە ڕیتم و مۆسیقاییێکی تایبەتی داوەتە قافیەی شیعری. لە شیعریدا ئەم پاش قافیانە دەکەونە بەرچاو: تۆم، تۆبە بێ، شەو، دەچم، نەچی، نەگری، نەکەم چبکەم، بم، کردووە، بسووتێم، چبکەم، بێ، منە، هێنا، بوو، وا بە، شەونم، لەیەک، ئەمشەو، بسووتێم، چ خۆشە، من، تۆ، دەکەی، کامیل، بەسە، ناکەی، خۆم، منە، دی، دڵ، لێم، دلبەرە، بابت (باوکت)، ڕۆیی، چوو، بوو، دەچێ، حاجی بابە شێخ، بەتەنیایی،

بێن (ببین)، کرد، عیشق، هەیە، نایە، ئیمامی، بەخێر، بووە.

ئینجا لە بابەتە هونەر و ژانرەکانی شیعری کلاسیکی بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی لە بەرهەمی ئەم شاعیرە بەتوانایە بەشێکی زۆر دەکەونە بەرچاو. وەکو لە لای خوارەوە ڕوون دەکرێتەوە:

١- شاعیر بایەخی بەلیریک داوە، زۆربەی شیعری لەم جۆرەی حەوت دێڕییە، پێڕەوی ژمارەی دێڕەکانی کردووە، وەکو نۆ دێڕی یا دە دێڕی. لە بابەتەکەی دیکە ئەوەی قەسیدەی پێ دەوترێ، واتە زیاتر لە دوازدە دێڕ شیعری زۆرە.

٢- کۆمەڵێک قەسیدەی پێنجینی هەیە (ا ا ا ا ب) بەو ناوەرۆکانەی لە سەرانسەری بەرهەمی شیعری بەکاری هێناون.

٣- بەشێک لە دیوانی لە بابەتی تەرجیع بەند پێکهاتووە، بەدەگمەن لە ناو شاعیرانی کورد یەکێکی وەکو ئاوات بەرچاو دەکەوێ تەرجیع بەندی بۆ مەبەسی ئاینیی (موناجاتی خودا و نەعتی پێغەمبەر و ستایشی گەورەپیاوانی ئاینیی و سۆفیزم) و دڵداری و وەسفی سروشت بەکار هێنابێ.

٤- دیوانی ئاوات بابەتی چوارین و تاکی گرتۆتە خۆ، لە یەکەمیان زۆری هەیە، هەرچی دووەمیانە زۆر کەمە.

٥- شیعری کێشی سیلابی و هەناسە میللییانەی زۆرە، بەپێی دەستووری ئەو جۆرە شیعرە قافیەی مەسنەوی بەکارهێناوە، هەندێ لەو شیعرانە جار ناجار دەچنەوە سەر بەحرە سووکەکانی کێشی عەرووز، بەتایبەتی ئەو قەسیدە درێژانەی «بەیت»یان پێ دەوترێ. ئەمەی بۆ زۆربەی ناوەرۆکی شیعری ئاینیی و دڵداری و بەهارنامە و کورتە حیکایەتی میللی بەکارهێناوە.

ئاوات کوردیزانێکی باش بووە، وشە و زاراوەی دیالێکتی ناوچەیی موکریانی بەکارهێناوە. زمانی ئاسان و ڕەوانە، ئەگەر هەندێ جار وێنەی ڕۆمانتیکییانە و سیمبۆلییانەی هەبێ، لەوەشدا خوێنەر دەتوانێ بەئاسانی لە مەبەسی بگا. بەڵگەی ڕەوانبێژی شیعری کلاسیکی و بەیتی خۆماڵی لە بەرهەمیدا ئەگەرچی زۆر نییە بەڵام هەیە.



## شیعری لە ڕووی ناوەرۆکەوە

ئاوات لە بنەماڵەیێکی خوێندەواری نزیک لە هەردوو تەریقەتی دەروێشی قادری و نەقشبەندی گەورە بووە. ئەمە کاری کردۆتە سەر مشتومال کردنی خەیاڵی شاعیریەتی، لەو کاتەی کە نەبووە بەشاعیرێک بچێتە ڕیزی ئەو شاعیرانەی داهێنانی هونەرییان بووە لە سۆفیزمی کۆزمۆسیدا، بەڵام لە شیعری وەسفی سۆفیزم و تێکەڵ کردنی هەندێ بەڵگەی ئەم فەلسەفەیە بەگێتی دڵداری سەرکەوتوو بووە.

بەدرێژایی ژیانی ئاوات لە شیعر نەپچڕاوە، بەبێ شیعر ژیان لە لای ئەو بێ بایەخ بووە. پێوەندیی گیانیی بەکەڵەشاعیرانی کوردەوە بووە، وەکو نالی و مەحوی و وەفایی و حەمدی، ئەمانە کاریان لێ کردووە، بوون بەسەرچاوە بۆ داهێنانی نوێ. هەروەها پێوەندی لەگەڵ شاعیرانی سەردەمی ژیانی خۆیدا بووە، شیعریان بەسەر یەکتریدا هەڵوتووە، نامەیان بۆ یەکتری نووسیوە، لەمانە شاعیرانی کوردی وەکو شێخ عەلی سوننەتی (خەمین) و محەمەد ئەمینی بەرزنجی (خاڵەمین) و عەباسی حەقیقی و ئیبراهیم ئەفخەمی و سەید عەبدولقادری سەیادەت (سەیید) و هی دیکە. جگە لە شاعیر و ڕۆشنبیرانی کورد ئاوات لە گۆرانیبێژە هونەرمەندەکانی کوردیشەوە نزیک بووە، هاوڕێیەتی کردوون، لەوانە حەسەن زیرەک و محەمەدی ماملێ و ئەحمەدی ئیسلامی و محەمەدی وەلەدی، شیعری بۆ وتوون و ئەوانیش بەئاوازی میللییەوە شیعرەکانیان چڕیوە.

ناوەرۆکی بەرهەمی شیعری ئاوات لە دەوروبەری ئەم مەبەسانە دەسووڕێتەوە.

١- شیعری ئاینی: لەم بابەتەی زۆرە بۆ موناجاتی خودا و نەعتی پێغەمبەر و ستایش و پێداهەڵدانی پیاوانی ئاین و شێخ و مریدانی تەریقەتی سۆفیزمی وتووە.

٢- شیعری دڵداری: شاعیر وەستایانە شیعری لاسایی قوتابخانەی نالی لە سەدەی بیستەمدا دەوڵەمەند کردووە.

٣- وەسف و بەهارنامە: ئەم بابەتە شیعرە ئەگەرچی لە ئەدەبی کوردیدا زیاتر پێوەندی بەشیعری دڵدارییەوە هەیە، بەڵام ئاوات لەو کاتەی ئەم نەریتەی پاراستووە، بایەخێکی یەکجار زۆری بەوەسفی سروشت داوە، لە ناو کەژەکانیشدا دیمەنی گوڵ و بەهار هەمیشە لە شیعریدا چاوی خوێنەر ڕەنگین دەکا. ئاوات گرفتاری گوڵ و بەهاری کوردستان بووە لە زۆربەی شیعریدا دەجووڵێتەوە، جگە لەو شیعرانەی بەتایبەتی بۆ گوڵ و بەهار وتراون.

٤- شیعری کۆمەڵایەتی و پەند و ئامۆژگاری: ئاوات شیعری تایبەتی بۆ ئەم مەبەسە نەنووسیوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی و دانایی و پەند و ئامۆژگاری لە کەلێنی هەندێ لە شیعرەکانیدا بەرچاو دەکەون.

٥- شیعری شین و ماتەم: لەسەر دەستووری شیعری کلاسیکیی کۆن بە شیعر شینی گێڕاوە بۆ دۆست و برادەر و نزیکەکانی لە شێخانی تەریقەتی دەرویشی. ستایش و پێداهەڵدانی تێکەڵ بەسۆزی مرۆڤایەتی خۆی کردووە بەرامبەر بەو کەسەی شیعری ماتەمینی بۆ داناوە.

٦- شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی: ئاوات لە سەرەتای ژیانیدا لە سیاسەت نزیک بووە، بەتایبەتی لە دەوروبەری جەنگی دووەمی گێتی و دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، لەسەر ئەوە ئازار و دەردی بەندیخانەی چەشتووە، ئەمە ڕەنگی لە هەندێ بەرهەمەکانیدا داوەتەوە. لە دواییدا وازی لە جموجۆڵی سیاسی هێناوە تا کۆتایی ژیانی.

## نموونەی شیعری ئاوات

### وەسف و دڵداری

١

لە لیریکێکیدا بەناوی «دڵی وام ناوێ» ئاوات دەڵێ:

دڵێکی وام ئەمن ناوێ بە ناڵەی بێدڵان نەگری
وەکو شەونم لەسەر غونچەی گوڵان و بولبولان نەگری
وەکو بولبول نەبێتە عاشقی گوڵ دڵ بەکار نایە
ئەگەر شێتانە سبحەینان نەچێتە سەرچڵان نەگری
لە بەهرە و شەوق و زەوق و خێر و خۆشی دوورە ماڵ کاول
دڵی وا بێ ئەڤین جارێک بە حاڵی عاشقان نەگری
شەوێ تا ڕۆژ دەناڵێنن لەگەڵ تەیری شەوا جووتن
دڵی وام بۆ چییە بۆ وان شەوێ تا بەربەیان نەگری
شەوانە مەل دەخوێنن بۆ ئەوانەی دڵ بریندارن
دڵم ناوێ بەدەنگی پڕ لە سۆزی وان شەوان نەگری



بەهاتوچوونی شێت و پێتی دڵ با پێکەنین گەر شەو
بە ئامۆژگاری زانایانی پیر و عاقڵان نەگری
لە ماڵێ قەت شەوانە ئۆقرە ناگرێ ناسرەوێ تاوێ
(ئیمامی) تا سبەینێ زوو نەچێتە نێو گوڵان نەگری

لە لای ئاوات ڕەمز و کانگەی دڵداریی سۆفیزمییە، هەمیشە پڕ لە جموجۆڵی و بزووتنەوەیە، بێ ئۆقرەیە، دەستووری لا نییە. شاعیر هەندێ کەرەستە و ڕەمزی دڵداری کۆ دەکاتەوە وەکو گوڵ و بولبول و شەونم، ئاواز و حیکایەتی باڵداران شەو تا بەیانی، های و هووی دەرویشان بۆ ئامۆژگاری مورشید و سۆفییانی تەریقەت. شاعیر لە شتێک دەگەڕێ دەستکەوتنی ئاسان نییە، لەبەرئەوە دڵی هەمیشە مەڵبەندی بیرکردنەوە و دانانی بەرنامەییکە لە پێناوی شۆڕشێک گۆمی مەندی بێ مانای ژیان بهەژێنێ.

٢

لە لیریکێکی دیکەیدا شاعیر دەڵێ:

بە یادی شەمعی ڕوخسارێکی دڵ ئیحیا نەکەم چبکەم
بە شەوقێکی وەها چاری شەوی یەڵدا نەکەم چبکەم
وەکو مەجنوونی ماڵ کاول دەرودەشت بۆتە مەئوای من
لە حەیفی عاقڵان خۆم شێتی ڕووی لەیلا نەکەم چبکەم
لە کۆڕی عیشقبازان دا نەماوە قەدری ڕووح و سەر
وەکو پەروانە بۆ ڕووی ئەو بە ڕووح سەودا نەکەم چبکەم
دەڵێن یار خاکی بەرپێی سورمەیە بۆ چاومی دێنم
بەکوێرایی ڕەقیبی لامەزەب ئەو وا نەکەم چبکەم
بەشەرتێ بێتە لام شەرتە سەرم دانێم لە پێناوی
ئەگەر بۆ گا وو گەردوون ڕووح و سەر ژێر پا نەکەم چبکەم
لە دووری وی گەدام و دێتە لام وەک شا دەبینم خۆم
لە چوون و هاتنی خۆم وەک گەدا وەک شا نەکەم چبکەم
ئەگەر با بۆنی تۆ بێنێ (ئیمامی) وا دەڵێ گیانە
کە من ڕووح و سەرم قوربانی ڕێگەی با نەکەم چبکەم

کاریگەریی مەحوی بەسەر ئەم لیریکەی ئاوات ڕوون و ئاشکرایە، ئەمە تەنیا پێوەندی بەکێش و قافیە و پاش قافیەوە نییە، بەڵکو لە ناوەڕۆکیشدا تەواوکەری شیعرێکی مەحوییە. هەروەها لە لاییێکی دیکەوە شیعرەکە پێوەندی بەلیریکەکەی ڕابردووی شاعیرەوە هەیە. بۆ ئەو ئامانجەی پێشوو، واتە شڵەقاندنی گۆمی مەندی ژیان، وێنەی نوێی شیعری دیکە دەدۆزێتەوە. خاوەن قانوون و دەستوورەکان گاڵتەیان بەدڵداری دێ و گۆیا ئاقڵن، ئەگەر شاعیر وەکو مەجنوون بۆ لەیلا خۆی شێت نەکا، چی دیکەی پێ دەکرێ! ئینجا دێتە سەر پێوەندیی پەپوولە و ڕووناکی، مۆم و شەوی یەڵدا، درێژترین شەوی ساڵ، با و هێنانی بۆنی تۆزی بەرپێی دلبەر، ئەمانە هەموویان ڕەمزی جموجۆڵی و بزووتنەوەن، لە دژی مەندی و وەستان کە کارەساتێکە لە ژیانی ئادەمزاددا.

**٣**

لە وەسفێکی دڵداریدا بەناوی «نان و خوان»ەوە ئاوات دەڵێ:

دڵی من موبتەلای باڵا بڵندی نەوجوانێکە
لە دەوری دێ و دەچێ داییم عەجایب پاسەوانێکە
برۆی چەشنی کەوان برژۆڵی تیرە بسکی زنجیرە
ئەسیری تەپکەیی بسک و کوژەی تیروکەوانێکە
لە ئێش و ئۆف و ناڵین و هەناسەی خۆی هەراسانە
هەمیشە گوێ بە ئاوازی شنەی کاتی بەیانێکە
هەموو گیانم وەکو قامیش هەڵۆڵ و کونکونە کاکە
ئەگەر ڕاستت دەوێ ئامادە بۆ بلوێری شوانێکە
کزەی کاتی بەیان هەروەک کزەی جەرگی بریندارە
کەچی دڵ وا دەزانێ مەلحەمی هەر ئێش و ژانێکە
وەریوە مووی سەر و ڕیشم لەبەر پیریی و غەمباری
لە باغی عومری فەوتاوم ئەویش بۆ خۆی خەزانێکە
(ئیمامی) جەرگی برژاوی مەزەی فرمێسکی چاوی بوو
ئەویش وا خاوەنی سفرە و کەباب و نان و خوانێکە

دلبەری شاعیر لەم لیریکەدا لە دوو وێنەی جیاواز دەکەوێتە ڕوو، لە لاییێک کچێکی جوانی شۆخ و شەنگە لە قالبی پەیکەرێکی باڵا بەرز دایە، لە لایێکی دیکە تارماییی



بتێکە لە ناو هەیوولای تەمومژاویدا تواوەتەوە. شاعیر گرفتاری ئەم خۆشەویستەیە و نایگاتێ، لەبەرئەوە زار و زەلیلە وەکو قامیش ڕزیو و کون کونە. داهێنانی وێنەی هونەری نوێ ئەوەیە ئاوات دەڵێ ئەو قامیشە تەنیا بۆ ئەوە دەست دەدا ببێتە بلوێری شوانێک، ئەمە هەرچەندە بەچاوێکی سووک و نزم لێرەدا تەماشا دەکرێ، بەڵام بەڕاستی دیاردەییێکی زیندوو و نەمرە، ئەو قامیشە ئاواز و بیر و فیکری وا دادەهێنێ هەموو شتێکی مەتریاڵی لە «بوون»دا کۆتایی دێ و ئەو ئاوازە هەر دەمێنێ، وەکو شاعیرانی سۆفیزمی پێشوو بۆی چوون.

**٤**

لە وەسفی شەودا ئاوات دەڵێ:

نووری ڕوخسارت وەدەرخە دەردی بێ دەرمانە شەو
زوڵمەتی زولفت لەسەر ڕووتە لە ڕۆژ میوانە شەو
دوێ شوکور مەردانە من ڕێم بردە ناو زولفی ڕەشی
تا بزانن خەڵکی موڵکی دڵ قەڵای مێردانە شەو
هەر لە مەغریب تا بەیانی بێ ووچان دێت و دەچێ
هەر لە دووی خورشیدی خاوەر وێڵ و سەرگەردانە شەو
کوێر و نابینایە ئێستا ئەو لە داخی ڕۆژی ڕووت
بۆیە ڕەشپۆش و فەقیر و مات و بەستەزمانە شەو
قەدری شەو چا بگرە چاوم شەمع و پەروانە دەڵێن
سۆز و گریەی شەمع هەر شەو سۆتنی پەروانە شەو
عاشق و مەعشووق لە ڕۆژدا خۆ دەپارێزن لە خەڵک
گەر پەنای چاکت دەوێ بۆ ئەو دووە بڕوانە شەو
هەستە (کامیل) بەسیە بێداری بڕۆ لێی دەرکەوە
تا وولات بێ دەنگوباسە و تا لە ڕۆژ میوانە شەو

شاعیرانی کورد زۆریان لەسەر شەو نووسیوە، بینین و هەڵوێستیان جیاواز بووە، داهێنانی هونەرییان ڕەنگاوڕەنگ بووە. ئەم لیریکەی ئاوات یەکێکە لە وەسفە ڕەنگین و سەرکەوتووەکانی بۆ شەو وتراون. لیریکەکە بەهەناسەییێکی سۆفیزمییانە نووسراوەتەوە. خەیاڵی نالی و مستەفا بەگی کوردی تێیدا بەدی دەکرێ. هەروەها هەندێ وێنەی

شاعیرانی پێش خۆی دووبارە کردۆتەوە، بەڵام بەشێوەیێکی نوێ و داهێنانی هونەرییان تێدایە.

۵

لە وەسفی گوارەدا ئاوات دەڵێ:

چییە گوارە بە گوێ هەڵتاوەسیوە
سەرەوژێر و موعەللەق لەو نەدیوە
زەعیف و بێکەس و بێیار و هاودەم
بەبێ دەنگ و سەدا هەروەک هەتیوە
بەگوێ گیراوە وا زەرد هەڵگەڕاوە
وە یا لەو دەرک و بانە گوێت بڕیوە
لە ترسی ماری زولفت هەڵدەلەرزێ
لە بۆیە زەرد و زار و ڕاچەنیوە
عەجایب گیری کرد لەو جێگە سەختە
بەجێماوە بە تەنیا لەو پەسیوە
بەگوێ هەڵتاوەسیوە ئەو نەفامە
کەچی پێی وایە تۆ بۆ گوێت کڕیوە

ئەم وەسفە جوانە بێ وێنەیەی ئاوات بۆ گوارەی دلبەر لە شیعرێکی نالیدا بۆ وەسفی گوارە هاتووە. بەڕاستی پێویستە بووترێ شاعیر ئیلهامی لە ئیشارەتێکی نالی وەرگرتووە، بەڵام ئەوەندە وەستایانە ئیلهامەکەی دارشتۆتەوە وێنەی نوێی دروست کردووە، لە ڕووی هونەرییەوە گەیشتوونەتە وێنە هونەراوییەکانی نالی بۆ ئەم مەبەسە.

## ژیانی پڕ لە ئازار و نائومێدی

۱

لە شیعرێکیدا ئاوات بەناوی «سکالا»وە دەڵێ:

گەر دەپرسی چۆنە (کامیل) کاکە دەردی کارییە
برسییە بێ هێزە گێژ و وێژە کاری زارییە



ڕۆژ حەواسی پێ نییە شەو خەستە وو تەنبەڵ دەڵێی
کۆڵەکێشی کردووە تاکو سەحەر هاوارییە
وا بڵاو و دەرهەم و لەتلەت بوو وەک زولفی بوتان
فیکر و ئەحواڵ و حەواسی عەینی تۆوی شارییە
غەیری کوندی ماڵ خراپ و ووشکەسۆفی ڕیش درێژ
کێ دەڵێ ئەم وەختە خۆشە گەرچی ئەمری بارییە
مام مەلاش ڕەببی کوتوپڕ بێ هەدادانی نییە
کاری هەر قوولە و هەرایە ئەم سەرە و ئەو خوارییە
خۆشییە لەو چونکە مانگی خێرە سەرفترەی هەیە
دەک بەزووخاوی ڕەشی بێ هەر بەفیکری زارییە
نان دەخۆم ئەمنیش بەقوزلقورتە جا زووخاوەمە
گەر دەپرسی چۆن دەژی (کامیل) ئەویش بێعارییە

ئەم شیعرەی ئاوات دوو مانا هەڵدەگرێ، یەکێکیان مانا ئاشکراکەیەتی، بێ گومان لە سەردەمی ژیانی ئازار و کەساسی و هەژاری دیوە ئەمە لایەنی مەتریاڵی ژیانەکەیەتی، هەر لەو کاتەشدا ناخۆشی لە ژیانیدا هەیە بەجۆرێکی دیکە، واتە ژیانی گیانی، لە هەردوو باردا شاعیر خۆشی و بەختیاری بەخۆبەوە نابینێ. سەرچاوەی ئەم مەینەتییەی لە مەلادا دەبینێ نوێنەری شەریعەت، لە لایێکی دیکە لە دەروێشی دەبینێ نوێنەری تەریقەت، بەلای ئەوەوە بەمانا تیۆرییەکانی شەریعەت و دەروێشی هەردووکیان بەهەڵە ڕۆیشتوون.

۲

لە لیریکێکی دیکەیدا دەڵێ:

بێ پاس و وەڕ و خوێڕی وەک سەگ لە قەسابخانە
بێ هۆش و سەراسیمە وەک مەستێ لە مەیخانە
بێ مەنزڵ و بێ جێگا شێواو و پەرێشانم
دانیشتوو لە جێگەی چۆڵ وەک کوندێ لەوێرانە
بێکارە وو بێچارە پەیتارە وو ئاوارەم
هەر تاوە لە لایێکم بێ جێگە وو بێ لانە

بێ زیکر و بە بێ تاعەت بێ فیکر و خەیاڵم من
دەخولێمەوە ڕۆژ و شەو لەو چۆڵ و بیابانە
بۆ پیری لە کارکەوتوو لێبووردن و بەخشینە
بۆ (کامیل)ی بێچارە چاوپۆشییە دەرمانە

لە شیعری پێشوودا ئاوات هۆی پەژمردەیی خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ وەعزی مەلا و هایی و هووی دەرویش، لەم شیعرەدا وا خۆی پیشان دەدا پێویستە دژی هەموو کردەوەیێکی ئاسایی بێ، بەلای ئەوەوە شتی ئاسایی وشکە، بێ تامە، بەئارەزووی عەقڵ و لۆجیکە، هەر شتێک بەئارەزووی چێژ و دڵ نەبێ کردەوەیێکی نابەجێیە، لەبەرئەوە شاعیر هەژار و شێت و سەگە بەڕەڵلا و دوور لە هەموو ڕەوشتێکی بەقانوون وەک کاری چاکە ژمێرراوە.

## نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «هەڵاتنی شا» ئاوات دەڵێ:

سەد بەهار ئێستە بە قوربانی چلەی زستانە
ڕۆژی ئازادی هەڵات کاتی لە خەو هەستانە
نیشتمان بۆتە بەهەشت سەوزە وولات و دەرودەشت
گەرچی زستانە بەڵام چەشنی بەهارستانە
دوژمن کەوتووە هەستانی مەحاڵە و ئەستەم
هەروەکو پیرە گەماڵ کەوت و لە بەردەستانە
دەستیان بەستن ئەوانەی وەکو سەگ یانیگرن
با لە چاڵیان بخەن ئەو تاقمە چاوبەستانە
کەوتە دووی تەرمی ڕەزاخانی کەسیفی بابی
لێی گەڕێن خوێنمژە هەر جێگەیی گۆڕستانە
ئەی مەلاکانی بەڕێز ئەی گەلی ئازا وو نەبەز
با لە بیرو نەچێ قەت کردەوەی ئەو پەستانە

لەگەڵ سەرکەوتنی کوودیتا ئیسلامییەکەی خومەینی لە ساڵی ١٩٧٩ ئاوات ئەم شیعرەی نووسیوە. میللەتانی ئێران ئەوەندە لە دیکتاتۆریەتی محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی



بێزار بوون، پێشوازی گەرمی هەموو جۆرە گۆڕانکارییێکی ڕژێمی ئەو شایەیان دەکرد، لەبەرئەوە پێشوازیی کورد لە کوردستانی ئێران بۆ ئەم گۆڕانکارییە گەرم بوو. ئاوات ڕوو دەکاتە مەلا و ئاخوندانی ڕێبەری گۆڕانکارییەکە و ئامۆژگارییان دەکا خراپەی ڕژێمی شا لە بیر نەکەن و کردەوەیان لە چاکەی میللەت بێ.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «شەهیدانی بانە» ئاوات دەڵێ:

نیشتمان ئەمڕۆکە ڕەشپۆشی شەهیدی بانەیە
داغداری کردەوەی ئەو تاقمە خوێنڕێژانەیە
بۆ شەهیدی شاری بانە پیر و لاو گریانییە
نیشتمان ئەم ساڵە کە بۆ لاوەکان گۆڕخانەیە
کوردەکان! ئەی کوردەکان ئەی لاوی پڕ هێز و قەوەت
ڕۆژی سەندنی خوێنی ئەو جووتە شەهیدە جوانەیە
نیشتمان بانگو دەکا ئەی ڕۆڵەکەی کاوەی نەبەز
وەرنە مەیدان کاتی پردان و شەڕی پیاوانەیە
هەرکەسێ بۆ سەندنی تۆڵە لە مەیدان حازرە
نێوی ئەو هەر قارەمانە و مەردی ئەو مەیدانەیە
با بڕۆین پێی ناوێ ئیتر بیری داهاتوو بکەین
تانک و تۆپی ڕژێمی شای بێ شەرم هەمبانەیە

لە دوای سەرکەوتنی کوودیتا ئیسلامییەکەی ساڵی ١٩٧٩ لە ئێران، بەشی زۆری میللەتی کورد داوای مافی نەتەوەیی و مرۆڤایەتییان دەکرد، بەشێکی زۆر کەمیش لایەنگری دەسەڵاتی ڕووخاوی شا بوون، ئیتر هەردوو بەشی ئەم میللەتە لە لایەن دەسەڵاتدارانی تازە و لایەنگرانی شاوە بەربەرەکانی دەکران. لەبەرئەوە لە زۆر شوێنی کوردستان دەستدرێژی کرایە سەر کورد و گەلێکیان گوللەباران و تیرۆر کردن. یەکێ لەو کارەساتانە لە شاری بانە بوو. ئاوات ئەم شیعرەی بەم هۆیەوە هۆنیوەتەوە.

له چوارینێکیدا ئاوات دەڵێ:

نامەکەت هات و دڵ گەشایەوە
ئاگری دەروونم بەو کوژایەوە
یەکجار گرنگ بوو گرێ پووچکەی دڵ
بە ووتەی خۆشی تۆ کرایەوە

شاعیر چاوەنۆڕی نامە بووە لە خۆشەویستێکییەوە، وەرامی ئەو نامەیە خۆشییێک بووە بەم شێوە ساکارە شاعیر دەری بڕیوە. دڵی گەشاوەتەوە، ئاگری دەروونی کوژاوەتەوە، گرێی ناو دڵی کراوەتەوە.

له چوارینێکی دیکەیدا شاعیر دەڵێ:

یاخودا کوێر بم لەمەولا گەر بە خۆشی دەرکەوم
یا بە ڕۆژ ساتێ بە بێ یادی شەوانت بسرەوم
ڕۆژهەڵات هەڵدێم وەکو دێوانە چونکە ڕۆژی من
موودەتێکە وون بووە لێم ئێستە مەمنوونی ئەوم

شاعیر بەشەو لەگەڵ دلبەر دایە، یاخود یادی دەکا، بۆیە ڕۆژی پێ خۆش نییە، بەناچاری ئەگەر تووشی ببێ هەمیشە یادی شەوانی تێدا دەکاتەوە. شاعیر لە ڕۆژ ڕادەکا، لێی دوور دەکەوێتەوە، ماوەییێکە ڕۆژ لە ژیانی نەماوە، واتە دلبەر لێیەوە نزیکە، کە دلبەر لێی نزیک بێ هەموو کاتێکی شەوە.

له تاکێکیدا ئاوات دەڵێ:

وێستا بە تەرزی سەروێ لەرزی بە بای هەناسە
دەڕژا لە بەژنی بەرزی عیشوە بە جام و کاسە

پێش وێنەی شیعری ڕیتم و مۆسیقا و کێشی سووک سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشێ، ئەوەی ئاوازی شیعرەکەی سووکتر کردووە گەمە ڕەوانبێژییەکانی هەندێ لەو وشانەیە کە دێڕە شیعرەکەیان دروست کردووە. تیپەکانی «ز» و «س» ئاهەنگێکی تایبەتییان داوەتە وشەکان.





شاعیر دەڵێ:

واعیزێ دەیگوت کەسێ زانا بێ تۆبەی کردووە
دڵ بە وەعزی وا کەچی تۆپەی لە تۆبەی کردووە
ئەو دەڵێ دوور بە لە یاری شۆخ و شەنگ و نازەنین
دوور لە یار شێتە کەسێ وەعزی لە گوێچکەی کردووە
هەرکەسێ بۆی دەس بدا ساتێ لە ئامێزی گرێ
تا لە دونیادا دەژی دڵخۆشە ئۆخەی کردووە
من شەوێکی گرتمە ئامێز و کەچی زەینم کەدا
وا ڕەقیبی بەدمەزەب لەولاوە کۆشمەی کردووە
تێکی دا عەیشم شکاندی هەم دڵم هەم پیاڵەکەم
ماوەییێک بوو مارزەلیم ڕوون بوو سووسەی کردووە
واعیز و سۆفی و ڕەقیب هەرسێ لەگەڵ من دوژمنن
خاسە مام سۆفی لە کاری ئێمە ڕەخنەی کردووە
دڵ وەکو تەیرە کە دێتە دەرکی یار سۆفی دەڵێ
بیکوژن وەیشووم لەسەر وێرانە لانەی کردووە
کوندەبوو بۆ خۆیەتی بەو ڕیشەوە بەو تیشەوە
ڕیشەکەی تیشەی هەزار دەست و پەلی پەی کردووە
هەر کەسێکی گەر ئەڤیندار و بریندار بێ دڵی
سۆفیانی ڕیش درێژ خوێنیان لە کاسەی کردووە
بۆ (ئیمامی) واعیز و سۆفی و ڕەقیب فەرقی نییە
دڵ بە دەست ئەو سیانەوە گوێت لێیە وەیوەی کردووە

لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم شیعرە جوانە شیعرە ڕەنگینەکەی نالی دێتەوە یادی خوێنەر:

گوڵبونی قەددت لە قوبەی سینە غونچەی کردووە
غونچە بەم شیرینییە قەت نەیشەکەر نەیکردووە

پێوەندی نێوان ئەم دوو شیعرە ئاواز و ڕیتم و مۆسیقایە، لە مانادا دوو بەرهەمی

شیعری جیاوازن. نالی وەسفی سنگ و مەمکی تازە پشکووتووی کچێکی نەونەمامی تازە پێگەیشتوو دەکا، بەڵام ئاوات تەنیا خەریکی هێرش بردنە بۆ سەر واعیز و سۆفی و ڕەقیب، ئەمانە دوژمنی ئەو جۆرە دڵدارییەن کە شاعیر باوەڕی پێی هەیە. شاعیر وەستایانە هەندێ ڕستەی نالی گۆڕیوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو وێنە و مانایانەی دەیەوێ بگونجێن، چونکە ناوەڕۆکی هەردوو شیعرەکە جیاوازن، ئەوەی نالی وەسفی دلبەرە، ئەوەی ئاوات لە دژی واعیز و سۆفی و ڕەقیبە.

**دیالۆجی دڵ و عەقڵ**

ئاوات لە شیعرێکیدا بەناوی «شاری دڵ» دەڵێ:

من دەڵێم شاری دڵم باغ و گوڵستانە دەچم
عەقڵ دەڵێ نا قەسەبەی شۆڕشی مەستانە نەچی
من دەڵێم نوختەیی ئەو ڕەوزەیی ڕیزوانە دەچم
ئەو دەڵێ نا ڕەشە جێڕاوگەیی شەیتانە نەچی
من دەڵێم مەسکەن و ئارامگەیی جانانە دەچم
ئەو دەڵێ سەربەسەری تێکچووە وێرانە نەچی
من دەڵێم جێگەیی هەر شێت و جونوونانە دەچم
ئەو دەڵێ نا زەدەیی پەنجەیی پەریانە نەچی
من دەڵێم مەرکەزی ئەسراری حەریفانە دەچم
ئەو دەڵێ جێتەمەعی چاوی حەسوودانە نەچی
من دەڵێم وەختی خەتەر مەئمەن و قەڵغانە دەچم
ئەو دەڵێ کونکونە جێگەی سەرە پەیکانە نەچی
لەم هەمموو چوون و نەچوونە سەری سوڕما (کامیل)
من دەڵێم جوانە بچم ئەو دەڵێ وا جوانە نەچی

دڵ ڕەمزی سۆفیزمە، عەقڵ ڕەمزی ئاینە، یەکەمیان سەربەستی و ئازادییە، دووەمیان قانوون و دەستوورە. لەم شیعرەدا ئاوات دیالۆجێکی دروست کردووە، شاعیرانە هەندێ لایەنی ئەم دوو ئیدیۆلۆجییەتە ڕوون دەکاتەوە. بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکا یا نەیکا لایەنگری فەلسەفەی سۆفیزمی کلاسیکیی کۆزمۆسییە، ئەگەرچی ئەم شیعرە و هەندێ لە



شیعرەکانی دیکەی ناچنە ناو داهێنانی سۆفیزمی کۆزمۆسییەوە، بەڵام لە مێژووی مەسەلەکە گەیشتووە، لەبەر ئەو توانیویەتی وەسفی بکا و هەندێ لایەنی ڕوون بکاتەوە. بۆ ئەمە شاعیر لە نیوە دێڕی یەکەمی هەموو دێڕە شیعرێک هەڵوێستی خۆی دەخاتە ڕوو وەکو سۆفییێک، لە نیوە دێڕی دووەمی هەموو دێڕە شیعرەکان هەڵوێستی لایەنگری ئاین یا عەقڵ، یا واعیز دەخاتە ڕوو بەزمانی کەسێکی لە دژی بیروباوەڕی سۆفیزم بێ و لایەنی عەقیدەی ئاین بێ، هەر ئاینێک. بەم جۆرە دڵ لە لای سۆفی دەبێتە مەڵبەندی باغ و گوڵستانی بەهەشت و وڵاتی خۆشەویستان و شێتان و جێگەی نهێنیی دڵداران و پەنای خۆشاردنەوە و لە بەرچاو ونبووان. کەچی عەقڵ دەڵێ دڵ جێگەی شۆڕشی سەرخۆشان و مەڵبەندی شەیتان و حەسوودانە.

ئەم شیعرە و هەندێ شیعری دیکەی ئاوات وەکو شارەزاییێک لە فەلسەفەی سۆفیزمی کۆزمۆسی دەیخەنە ڕوو. ئەم بەشە شیعرانەی هیچ جۆرە تەنگوچەڵەمەیێک دروست ناکەن لەگەڵ شیعرە ئاینییەکانی کە لە ڕووی داهێنانی هونەرییەوە لە پلەیێکی بەرز دان و هەمموو مەرجێکی جوانکارییان تێدا هەیە.

**لەگەڵ وەفایی و شیرین تەشی دەڕێسێ**

ئاوات لە قەسیدەیێکی پێنجین بەناوی «یارم تەشی دەڕێسێ» بەم پێنجینانە دەست پێ دەکا:

زولفی ڕەشی لەسەر ڕوو وەک نیلۆپەڕ لە ئاوا
پەخش و بڵاو و ئاڵۆز لوول و درێژ و تاتا
هاوریشمێکی خاو بوو بە ناز و عیشوە بای دا
وەک ماری زامدار بوو هاڵا لە بەژن و باڵا
کۆشی دەکرد بەلادا یارم تەشی دەڕێسێ
کوانێ خوری شەکی کاڵ بکرم بە ڕووحی شیرین
بیدەم بە دەستی یارم بایدا بە ناز و تەمکین
شی کاتەوە بە شانە بە قامکی نەرم و ڕەنگین
بیدا ئەویش بە نووکی تەشی جوان و نەخشین
بۆ پارچەیێکی پەشمین یارم تەشی دەڕێسێ

مەحبووبی نازدارم گرتی تەشی بە دەستی
ڕیسی مەحەببەت و مەیل خاو بوو بە گرژی ڕستی
گریی دڵان پساندی بە لێو و دەستی بەستی
تووڵی ئەمەل درێژ بوو سەنگینی کرد و خستی
بۆ دانەوی بە چوستی یارم تەشی دەڕێسێ
لە باغی سێو و هەرمێ قەدەم قەدەم بە نەرمی
دەچێتە پێش لە گوڵزار بە سەبری جوانە شەرمی
لە باوەشی بە پیتی دەگرێ دڵان بە گەرمی
بولبول دەهاتە سەیری لە کاتی بەزم و ڕەزمی
بەو لارولەنجەی حەتمی یارم تەشی دەڕێسێ

ئاوات ئەم پێنجینەی لەسەر هەوای پێنجینە بەناوبانگەکەی وەفایی داناوە و ئیلهامی لەو وەرگرتووە:

تایێکی ڕیشەیی دڵ بە نووکی غەمزە دادا
دەستێکی بۆ سەما برد ڕووبەندی ماهی لادا
نافەی گوڵی بەدەر کەوت عەتری بەدەم سەبادا
باریک و لووس و نازک وەک زولفی خاوی بادا
وەک شاخی گوڵ بەلادا شیرین تەشی دەڕێسێ

لەیەکچوون لەم دوو شیعرەدا لەوەدا دەبینرێ هەردووکیان لەسەر سیستێمی پێنجین دانراون لەسەر یەک کێش هۆنراونەتەوە، ڕستەی دووەمی نیوە دێڕی دوایی هەموو بەندەکان لای وەفایی «شیرین تەشی دەڕێسێ»یە و ئاوات کردوویەتی بە«یارم تەشی دەڕێسێ». بەناوەڕۆک هەردووکیان دەچنە ناو خانەی وەسف و دڵدارییەوە، بەڵام لای وەفایی وێنەی شیعری کراوەی مێبازی (ئیرۆتیک) هەیە. لەبەرئەوەی هەردوو شیعرەکە پێوەندییان بەبزووتنەوەی دینامێکی تەشی ڕستنەوە هەیە، هەردوو شاعیر وێنەی جوانی ڕستنیان دروست کردووە لە بزووتنەوەی دەست و ڕان و بادانی تەشی و دروستکردنی داو لە لایەن شیرینی دلبەری وەفایی و یاری ئاوات. وێنەکانیان لە بابەت کارێکەوەیە، کەچی لە یەکتری جیا دەبنەوە.

ئاوات پێنجینەکەی بەم بەندانە کۆتایی پێ دێنێ:



کۆڵان و کووچەیی دێ دەڕوا بە ناز و عیشوە
دەگرێ لە پیر و لە جوان ئەو شۆخە باج و ڕیشوە
جحێڵ بە زولفی لوولی دەکا لغاو و ڕەشوە
بەو مەکر و فێڵ و حیلەوە دیارە مەیلی بە شوە
فیکرێکی بیکری کردووە یارم تەشی دەڕێسێ
هۆنراوەکەی من ئەو حەل خاوێن و بی بنووکە
وا ڕیسەکەی بە دەستی مەستێکی تازە بووکە
ڕازیم بە سەردڕی وی دا پێی بڵێن بە سووکە
دەیکەم بە چۆغە بۆ خۆم بیرێسە هەستە زووکە
تۆزێ بە نووکە نووکە یارم تەشی دەڕێسێ
کاکی (ئیمامی) ڕەنگە چۆغەت هەموو دڕا بێ
بەشێتی ڕیسی ڕستی مەعلووم دەبێ پسا بێ
پرسە لە کاکی جۆڵا داخوا لە بۆی کرا بێ
دوێنێ گلەم کە لێ کرد ڕەنگە دڵی شکا بێ
قەی ناکە بێ بەڵا بێ یارم تەشی دەڕێسێ

لەم بەندانەدا شاعیر هەندێ لە بزووتنەوەی تەشی ڕستن لادەکەوێ و دەکەوێتە سەر وەسفی یارە جوانەکەی و ئەوە دەردەبڕێ شۆخی نازەنین ئارەزووی شووی هەیە و لە دڵدار دەگەڕێ، بەڵکوو یەکێک لەو هەرزانەی ناو کۆڵان کە بۆی شێت بوون دەستی بکەوێ. ئینجا شاعیر لەمەش لادەدا و بیر لە ڕانک و چۆغە دڕاوەکەی دەکاتەوە بەڵکوو لەو داوانەی یاری نازدار دەیانڕێسێ جۆڵا پارچە قوماشێکی بۆ بچنێ و بیکا بەڕانک و چۆغە.

## خاسە کەو

«خاسە کەو» ناوی شیعرێکی ڕەندە، ئاوات بەم جۆرە دەستی پێ دەکا:

خاسە کەوێ لەو کەژە هەڵنیشتووە
خاڵی ڕەش و سووری بە جووت ڕشتووە
ڕاوچی هەموو لەو کەوە دەرکەوتووە
بۆچی دزە جەردەیە کێی کوشتووە!

کێهە کەسی ئەو لە ژیان خستووە

ماڵ و مەڕ و زێوەری کێی بردووە!

باعیسی قەتلی چییە بیستوویەتی

ژینی بە سەربەستییە ویستوویەتی

داوی چەقاند تاوەکو ئەو پێوە بێ

چاڵ کە نە خۆی پێوە دەبێ جێ بەجێ

خاسە کەو لە کوردەواریدا بەکەوی ڕەسەن دەوترێ، ئەم باڵندەیە ڕێزێکی تایبەتی هەیە لە لایان. ئاوات جوان بۆ ئەوە چووە کە کەوی کردووە بەڕەمزی سەربەستی و ئازادی ئەوەی میللەتی کورد کۆشش و خەباتی بۆ دەکا، ئەم هەڵبژاردنەی سەرکەوتنێکی هونەروەرانەیە، چونکە باڵندەی کەو و میللەتی کورد هەردووکیان ڕەسەنن. ڕاوچی دوژمنی کوردە، کە بۆ ڕاوی کەو هاتووە، ئەگەر بەسەریدا زاڵ بێ مانای لەناوچوونی ئەو میللەتەیە.

شاعیر لەسەر شیعرەکەی دەڕوا:

چاکە کە داودۆزە شوکور خاسە کەو

دیوبیە وورپایە بە ڕۆژ و بە شەو

بۆچی کەویش مافی ژیانی نییە

حەققی کەژ و کێوی جوانی نییە

بۆچی ئەویش بۆتە برا کوردەکان

نابێ هەڵێنێ نەفەسێکی ژیان!

بێتەوە بەردەست بە بێ باڵ و پەڕ

پێبکەنێ بیبەنە قەسری قەجەر!

دەک نەفەسو بگری ئەجەل جێ بەجێ

وا کە نەتان بێ قەوەتی دەست و پێ

لەم دێڕانەدا شاعیر کورد و کەو بەیەک دیاردە حسێب دەکا، ڕاوکردنی کەو دیل کردنی کوردە، هەر لەو کاتەشدا لە یەکترییان جیا دەکاتەوە بەمەبەسی دوژمن زیاتر بۆ دیل کردنی کورد هەوڵ دەدا، بەسەرسوڕمانەوە دەڵێ ئەگەر کورد خەتای هەبێ، خەتای کەو چییە، ڕەمزی کوردەوارییە! بۆ لە ناو ببرێ. لە ناو دێڕەکاندا ئاماژە هەیە بۆ قەسری قەجەر، ئەمە بەندیخانەییێکی ترسێنەری دۆزەخ ئامێزە لە تاران لە هەموو دەور و ڕۆژگارێکدا کورد و



ئازادیخوازانی دیکەی ئێرانی تێیدا ئازاریان چەشتووە و لە سێدارە دراون. ئیتر شاعیر ئەوە دەردەبڕێ دوژمن یا ڕاوچی لەو کاتەی کورد زیندانی دەکا لە قەسری قەجەر، دەیەوێ کەوی ڕەمزی شاخەکانی کوردستانیش لەوێ بەند بکا.

ئاوات بەم دێڕانە دوایی بەشیعرەکەی دێنێ:

خاوەنی ئەو کێو و کەژە هەر کەوە

نەزم و نیزامی کەژ و کێو هەر بەوە

لێی گەڕێ با باڵ و پەڕی جوان بکا

لەو کەڵە با بانگی ڕەفیقان بکا

بێنەوە کانیاوێ بخۆن ئاوی ساف

بۆ گوڕەیی سەر بنێ بێنە مەساف

لێی گەڕێ دەندووکی بە بەرد تیژ بکا

غوڕڕە بکا و بانگی کوڕ و کیژ بکا

کوڕ بە گوڕە گوڕ وەکو شێر و پڵنگ

کچ بە شنە شن بە خرینگە خرنگ

بێن و بڵێن خاوەنی کێوان ئەمەین

سوورە دەنووکمان بە دەنووک شەڕ دەکەین

خاوەنی ئەم خاسە کەوەش هەر دەڵێ

ڕاوچی دەبێ لەم کەژ و کێوە هەڵێ

لە دواییدا ئاوات گەشبینانە کۆتایی بەشیعرە جوان و پڕ سۆزەکەی دێنێ، بەوەی تەلیسمی ئەفسانە سیمبۆلییەکە دەشکێنی و ئەوە دەردەبڕی کەو هەیە، کوردیش هەیە، هەردووکیان یەکێکن و خاوەنی ئەم شاخ و هەردانەن کە کوردستانیان پێ دەڵێن، هەردووکیان جەنگاوەرن، کورد بەخەنجەری سووری دەستی، کەو بەدەنووکی سووری بەهەسانی شاخ تیژی دەکا، هەردووکیان بانگی یەکتری دەکەن، خاسە کەو بانگی کیژ و کوڕ دەکا، کورد بانگی خێڵی کەو دەکا. بەم جۆرە دوژمن و ڕاوچی دەرەقەتی خێڵی کورد و کەو نایەن، بۆیە پێویستە هەڵێن و ئەو کەژ و کێوانە بەجێ بێڵن.

***

کامیل کوڕی سەید عەبدولحەکیم ئیمامی زەنبیلی ئاوات، شاعیرێکی ڕەسەنی کوردە،

لە سۆزی ناو دڵ و ڕاستیی ناو مێشکی نەچۆتە دەرەوە. شیعری بۆ ئەوە وتووە کە بەدڵی بووە.

بەڕوخسار و ناوەرۆک شیعری بۆ هەموو بابەتەکانی کۆمەڵی کوردەواری وتووە. شارەزای مێـژووی ئەدەبی کـوردی بووە، شاعـیرە گەورەکـانی کـورد کـاریان لێ کردووە، لە نزیکەوە شاعـیرانی دەوروبەری سـەردەمی ژیـانی خـۆی ناسـیـوە. بۆ زۆربەی مـەبەسـە گـرنـگەکـانی شیعری کلاسیکیی کۆن و شیعری میللی وتووە، بەتایبەتی لە وەسف و دڵداری و شیعری ئاینیی و وەسفی سۆفـیزم و شـیعری نیـشتـمـانپـەروەری و کـوردایەتی سەرکـەوتوو بووە. بەدرێژایی ژیـانی بەبێ شـیـعر هەڵی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشـدا ئەو شیـعـرەی لە بەردەست دایە ئەگەرچی کەم نییە، بەڵام هێشتـا تەواوی بەرهەمی شیعری ئەو نییە. ئاوات یەکێکە لە شاعیرە بەدیمەن و بەرچاوەکانی میللەتی کورد لە سەدەی بیستەمدا.

# بەشی سی و چوارەم

## گۆران

## ١٩٠٤ – ١٩٦٢

### ژیانی

عەبدوڵڵا کوڕی سلێمان بەگ کوڕی عەبدوڵڵا بەگە، باوکی بەسلێمان بەگی کاتب فارسی ناوبانگی دەرکردبوو. لە ساڵی ١٩٠٤ لە هەڵەبجە لە دایک بووە. بنەماڵەی بەبنەچە دەچێتەوە سەر ناوچەی مەریوان. باپیری هاتووە بۆ هەڵەبجە و ئەوێی کردووە بەجێگەی بنەماڵە و خۆیان بەعەشرەتی جاف دەزانن. لە سەردەمی باپیرییەوە بەخەڵکی هەڵەبجە و سلێمانی ناسراون. عەبدوڵڵا لە سەردەمی بوونی بەشاعیر ناوی «گۆران»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە وەک نازناوی شیعر. وا باوە ڕەشید نەجیب (فەرامەرز) ئەم ناوەی بۆ دۆزیوەتەوە وەک نوقوڵانەیێکی پیرۆزی هۆزی گەورەی گۆرانی کورد. بەم ناوە ناوبانگی دەرکردووە کەچی وەک نازناو زۆر کەم لە شیعریدا بەکاری هێناوە.

خوێندنی بەرایی لای باوکی و لە دواییدا لە حوجرەی مزگەوتی پاشا بووە لە هەڵەبجە. تا قۆناغی فەقێیەتی بەرنامەکانی حوجرەی مزگەوتی تەواو کردووە. لە سەردەمی داگیرکردنی هەڵەبجە لە لایەن ئینگلیزەوە لە ساڵی ١٩١٩ ماڵیان گواستۆتەوە بیارە، زۆر لەوێ نەماونەتەوە و گەڕاونەتەوە هەڵەبجە. لەو ساڵەدا باوکی کۆچی دوایی کردووە، لە قوتابخانەکانی دوای داگیرکردنی ئینگلیز خوێندوویەتی. لە ساڵی ١٩٢١ کە پۆلی چوارەمی قوتابخانەی سەرەتایی تەواو کردووە برای کوژراوە، بێ کەس ماوەتەوە ناچار لەگەڵ عەبدولواحید نووری خاڵۆزای چۆتە کەرکووک و لە قوتابخانەی عیلمییەی ئەو شارە خوێندوویەتی. نەیتوانیوە لەم خوێندنەدا بەردەوام بێ و لە ساڵی ١٩٢٢ وازی لە خوێندن هێناوە، ماوەی سێ چوار ساڵ دەسکورتی بەخۆیەوە دیوە تا ساڵی ١٩٣٧ بەمامۆستا دامەزراوە و لە هەندێ لە ئاواییەکانی ناوچەی هەڵەبجە مامۆستایی کردووە، لە پاشانا جێی کاری گواستۆتەوە کارگێڕی ڕێگەوبان بووە بەچاوەشی کرێکاران، لەمەدا تۆفیق وەهبی یارمەتی داوە.

لە ڕۆژگارانی جەنگی دووەمی گێتی بۆ ماوەیێک لە ئەیلوولی ١٩٤٢ تا کۆتایی ساڵی



١٩٤٤ لەگەڵ ڕەمزی قەزاز و ڕەفیق چالاک لە ئێسگەی ڕادیۆی ڕۆژهەڵاتی نزیک لە شاری یافا لە فەلەستین کاری کردووە. ئەم ئێسگەیە لە لایەن ئینگلیزەوە بۆ پڕۆپاگەندەی جەنگ لە دژی ئەڵمانیای هیتلەری دامەزرابوو. لە دوای جەنگ گۆران گەڕایەوە سەر کاروباری خۆی لە کارگێڕیی ڕێگەوبان لە هەولێر. لە ساڵی ١٩٤٩ لەو کاتەی قاسەی ئەم کارگێڕییەی بەدەستەوە دەبێ ڕۆژێک لەپڕ پشکێنەری دارایی لە وەزارەتی ڕاگەیاندنەوە لە بەغدا دێتە هەولێر و لە قاسەی بەردەستی گۆران دەپێچێتەوە، هەندێ پارەی لەوەی پێویست بووە لە ناو قاسەکەدا پێ کەم بووە. بەپێی دەستووری ئەو کاتە دەستی گۆران لە کاروباری ڕەسمی دەکێشرێتەوە، لە ماڵ دادەنیشێ تا ئەنجامی دادگا. بەڵام نیوەی مووچەی وەردەگرێ تا بڕیاری دادگا دەردەچێ. شاکر فەتاح هەوڵی زۆری بۆ دەدا حوکوومەت بەوە ڕازی بێ هەرچۆنێ بێ ئەو پارەیە کۆ بکرێتەوە و بخرێتە ناو قاسەکەوە بەڵام ئەمەی بۆ ناچێتە سەر.

ماوەی دوو ساڵێک بێ ئیشوکار گۆران بەهەژاری ژیانی لە ماڵ دەباتە سەر، پەرێشانترین سەردەمێکی هەموو ژیانی بووە تا ساڵی ١٩٥١ لە هەولێر دادگایی دەکرێ، پاش ئەوەی خۆی دان بەکردەوەکەی خۆی دادێنی و فەرمانی بەندکردنی بۆ دەردەچێ، هەر ئەو ڕۆژە پاش نیوەڕۆ دەست بەکەلەپچەوە لەگەڵ دوو پۆلیس ڕەوانەی بەندیخانەی مووسڵ دەکرێ. لەوێ دەکەوێتە ناو دز و پیاوکوژانەوە، بەڵام زوو بەندە سیاسییەکان بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر ئاشتیخوازی تاوانبار کرابوون، دەگەنە فریای و کارێکی وا دەکەن کەسێکی ڕۆشنبیر و شاعیرێکی دیاری وەک گۆران لە بەندیخانەدا بگوێزرێتەوە لای ئەوان و لەگەڵیاندا بژی.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٢ لە بەندیخانە ئازاد دەبێ و ڕوو دەکاتەوە سلێمانی و لە ڕۆژنامەی «ژین» دادەمەزرێ. لەو ڕۆژنامەیەدا دەمێنێتەوە تا ئەیلوولی ١٩٥٤ بنەماڵەی پیرەمێرد بەسیاسەتی گۆران ڕازی نابن وەکو کەسێکی ئاشتیخواز و هەڵگری بیروباوەڕی مارکسی، لەبەرئەوە دووری دەخەنەوە. لە ١٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٤ لەگەڵ هەندێ لە ئاشتیخوازانی سلێمانی دەگیرێ و لەسەر سیاسەت فەرمانی ساڵێک بەندکردنی بۆ دەردەچێ. ماوەکە لە بەندیخانەکانی سلێمانی و کەرکووک و کووت و بەعقووبە و نوگرەت سەلمان دەباتە سەر. ساڵێکیش لە ژێر چاودێریی پۆلیس لە بەدرە دەژی و لە ١٢ی ئەیلوولی ١٩٥٦ ئازاد دەبێ. ماوەیێک لە بەغدا ژیانی دەباتە سەر لە ئەمینداریی پایتەخت (شارەوانی بەغدا) بەهۆی ڕەفیق حیلمییەوە دەکرێ بەچاوەشی

کرێکارانی بیناسازی. هەر لەو ماوەیەدا لە پایزی ١٩٥٦ ئاشنایەتی لەگەڵ شاعیری ناسراوی عیراقی بەدر شاکر سەییاب پەیدا دەکا. لە ١٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٦ بۆ دواجار دەگیرێتەوە و دادگای عورفی کەرکووک فەرمانی سێ ساڵ بەندکردنی بۆ دەردەکا. ماوەکە لە بەندیخانەکانی کەرکووک و بەعقووبە دەباتە سەر تا لە ڕۆژی ١٠ی ئاغستۆسی ١٩٥٨ پاش کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی بەغدا لە بەندیخانە ئازاد دەبێ. گۆران زیاتر وەک نیشتمانپەروەر و خەباتگێڕێک لە دوای دەرچوونی لە بەندیخانە لە سلێمانی پێشوازی دەکرێ. بۆ ماوەییێک لە کۆواری «شەفەق» کار دەکا، لە کەرکووکەوە گواسترابووەوە سلێمانی بەناوی «بەیان» بڵاودەکرایەوە. لەو سەردەمەدا گۆران بەڕەسمی لەگەڵ نوێنەرانی ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی عیراقی سەردانی یەکێتیی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە و کۆماری چینی میللی و کۆریای دیمۆکراتی کردووە.

لە ساڵی ١٩٦٠ کراوە بەموحازیری ئەدەبی کوردی لە کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای بەغدا، لە ڕۆژنامەی «ئازادی»یش بووە بەئەندامی دەستەی نووسەران. لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٢ تووشی نەخۆشیی شێرپەنجەی گەدە بووە. لە نیسانی ئەو ساڵە بۆ تیمارکردن چووە بۆ مۆسکۆ. ماوەی چەند مانگێک لەوێ ماوەتەوە و ئینجا گەڕاوەتەوە نیشتمان. لەو سەردەمەی لە مۆسکۆ بوو ئارەزووی دەکرد ڕێگەی بدەن بۆ ساڵێک یا دوو ساڵ وەک کارگەری زانستی لە بەشی کوردناسی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی لە سانت پیترسبورگ (لنینگرادی ئەوسا) وەربگیرێ. بەشی کوردناسی و ئەنجوومەنی زانایانی ئامۆژگا لە سانت پیترسبورگ و ئەکادیمیەی زانستی لە مۆسکۆ هەموویان بڕیاریان دا ئارەزووی گۆران بهێننە دی، بەڵام مەسەلەکە سەری نەگرت لە دوای ئەوەی زانییان نەخۆشییەکەی کوشندەیە و بەوەڕا ناگا ساڵێک یا دوو ساڵ لە ڕووسیا بژی. گۆران بەمە زۆر دڵگیر بوو، هەڵوێستیشی ڕەشبینیی تێ کەوتبوو بەرامبەر بەدەسەڵاتی سۆڤیەت. ئیتر تا کۆتایی ژیانی نەیزانی مەسەلەی جێبەجێ نەکردنی ئارەزووی لەبەر نەخۆشی بوو.

لە دوای گەڕانەوەی لە مۆسکۆ ماوەییێکی کەم لە بەغدا دەمێنێتەوە، ئیتر ئەویش بەجێ دێڵێ و دەگەڕێتەوە سلێمانی و لە ڕۆژی ١٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٢ لە سلێمانی کۆچی دوایی دەکا.



## قۆناغەکانی بیری شیعرایەتی گۆران

گۆران لە ساڵی ١٩٢٩ لە مەشقی شیعر نووسین لەسەر پێ وەستاوە، لەوکاتەوە تا کۆچی دوایی لە شیعر وتن نەوەستاوە. ژیانی شاعیر لە ڕووی بیری شیعرایەتییەوە دەکرێ بەدوو بەشەوە:

١- شاعیری ئافرەت و جوانی: دەتوانرێ ئەو وەسفەی نێوەندی ئەدەبی بۆ گۆرانی کردووە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا «شاعیری ئافرەت و جوانی» بێ بەپێوانە بۆ ناسینی ئەم شاعیرە. لە بنەڕەتدا شاعیرییەتی گۆران لە بازنەی ئەم ڕستە کورت و جوانەدا کۆدەبێتەوە. شاعیر بەشیعر پەیکەری ژن دروست دەکا. کارەکەی وەکو هونەروەری شێوەکارە کە پۆرترێتی ژن بەفڵچەی ڕەنگاوڕەنگ دەکێشێ، یا پەیکەرتەراش هەیکەلی ئەو ژنە دەتراشێ. ئەو شیعرە، ئەو وێنەیە، ئەو پەیکەرە یەک سیمای هەیە کەچی لە هەر خوێندنەوەییێکدا مانایێک دەبەخشێ. ماناکە ڕووکەشە جوانیی مەتریالیی ژن ڕوون دەکاتەوە. قووڵی تێدا نییە، بنەوەی نییە، خوێنەر تووشی دڵداریی زەینیی یا مەجازی دەکا. خەیاڵ ئەو شیعرە وەردەگێڕێتە واقیع و وێنەی مەتریالی لە مێشکدا دروست دەبێ، لە دواجاردا دەبێتە سەرچاوەی ماچ و مووچ و چوونە ناویەکی نێر و مێ. سروشت لای گۆران لە لایێک پەین و هەویرترشی دروستکردنی پەیکەری ژنی جوانە، لە لایێکی دیکەوە بۆ خۆی دەبێتە مایەی بیناسازییێکی تازە گۆران وەک میعمارێکی هونەروەر و هەڵکەوتوو دەکەوێتە بەرچاو.

گۆران پارێزگاری هەندێ نەریتی کوردەواری کردووە، هەروەها هەندێ نەریتی ئەورووپای وەکو خۆی وەرگرتووە، هەندێ جاری دیکەش تێکەڵ بەهی کوردی کردووە، بەهەموو جۆرێک هونەرێکی نوێی لە ئەدەبی کوردیدا دروست کردووە لە ڕووی وەسفی ژن یا وەسفی سروشت و لە دواجاردا تێکەڵ کردنیان. نوێکردنەوەکەی زیاتر لەمەیاندا دەکەوێتە بەرچاو.

٢- شاعیر و ئیدیۆلۆجییەتێکی دیاریکراو: گۆران تا ساڵی ١٩٤٩ شاعیری «ئافرەت و جوانی» بوو، تا دوایی ژیانی ئەم سیفەتەی لە دەست نەدا. لەگەڵ ئەوەشدا شاعیری کوردایەتی و هۆگری سروشتی کوردستان بوو. ژیانی کۆمەڵایەتی و زەبروزەنگی دەسەڵاتی کاربەدەست و دەرەبەگ ڕەنگی لە شیعری دابووەوە و بەرهەمی شیعری درامی کەم نەبوو.

لە ساڵی ١٩٤٩ شاعیر «بووکێکی ناکام» و «شەوێک لە عەبدوڵڵا»ی هۆنیوەتەوە. یەکەمیان باس لە شەڕی کوڕی جووتیار دەکا لە دژی ئاغا لە پێناوی کچی جوانی

رەنجبەر. دووەمیان وەسفی کابێرێییێکی ئوروستوکراتیی ئەوروپاییانە دەکا لە بەغدا. لەو ساڵەدا لە دوای نووسینەوەی ئەم دوو بەرهەمە نایابە گۆران گەیشتە لووتکەی داهێنانی شیعری. لە ساڵی ١٩٤٩ بەملاوە گۆران لە لووتکەی پیرناسی بارەگەی خواوەندی شیعری ئەفسانەی گریک هاتە خوارەوە.

لە دوای ئەمە بەرهەمی ئەو دە دوازدە ساڵەی قۆناغی دووەمی شیعری گۆران دەکرێ بەدوو بەشەوە. بەشێکی کەمی بەرهەمی دەچێتە خانەی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتییەوە، لێرەدا پارێزگاریی ئەو جوانکارییە بەرزەی کردووە کە لە سەرانسەری شیعری گۆراندا بەدی دەکرێ. کەچی بەشی زۆری شیعری ئەم قۆناغەی دەچێتە خانەی شیعری سیاسییەوە وەک دروشمێک بۆ پرۆپاگەندە لە پێناوی چاکەی پارتییێک یا دەوڵەتێک یا ڕێژێمێک، دوور لە گیانی جوانکاری و داهێنانی وێنەی بەرزی شیعری. ئەو بۆچوونانەی گۆران لەم جۆرە شیعرانەدا هەموویان ڕەت ناکرێنەوە، لە بەشێکی کەمیاندا جوانکاری هەیە و ئەدەبی کوردی دەوڵەمەند کردووە. ئەو زۆرەی ڕەت دەکرێنەوە گیانی شیعرایەتییان تێدا کەمە، لەبەرئەوە لە شیعری پەروەردەیی (تەعلیمی، دیداکتیکی) نزیک دەبنەوە.

### شیعری گۆران لە ڕووی ڕوخسارەوە

گۆران یەکێکە لەو شاعیرانەی زۆرترین بەحری عەرووزی لە کێشی شیعردا بەکارهێناوە، هەروەها پارێزگاریی یەکێتیی قافیە و پاش قافیەی کردووە. لە بەحرە عەرووزییەکاندا ئەمانەی بەکارهێناوە: هەزەج، موجتەس، موزاریع، ڕەمەل، خەفیف، موتەقاریب، ڕەجەز. زیاتر لە چل پارچە شیعری لەم بابەتەی هەیە.

لە کێشی شیعری سیلابی خۆماڵیدا دەوڵەمەندە، هەموو جۆرە کێشەکانی بەکارهێناوە، بەتایبەتی کێشەکانی دە و هەشت و حەوت بڕگەیی و ئەوانی دیکەش. لە ناو ئەمانەدا بەزۆری دە بڕگەیی بەکارهێناوە. گۆران یەکێکە لەو شاعیرانەی دەوری گرنگیان هەیە لە بەپەتی کردنی زمانی کوردی لە نووسینی ئەدەبیدا (شیعر و پەخشان). هەروەها وشەی ساکار و مانا لە ڕوو و ڕستەی کورت و ئاسان بەکار دێنێ. ئەم کارەی تەنیا زمانی ئەدەبی دەوڵەمەند نەکردووە بەڵکو زمانی ستانداردی کوردی بەگشتی کەڵکی لێ وەرگرتووە.

لە ڕەوانبێژیدا گۆران داهێنانی دەست خستووە. هەندێ جار پەنای بردۆتە بەر ڕەوانبێژیی کلاسیکیی شیعری کۆن، بەڵام زیاتر خەریکی ڕەوانبێژیی خۆماڵی بووە، جگە لە داهێنانی خۆی لەم لایەنەوە.



گۆران لە هەموو بابەتەکانی شیعری کلاسیکی هەیە وەکو غەزەل (لیریک) و قەسیدە، هەروەها پۆیێم (لە ئەدەبی میللیدا بەیت)، جگە لەوەی دەستێکی باڵای بووە لە لاساییکردنەوەی شیعری نوێی عوسمانی کە کەوتبووە ژێر کاریگەریی شیعری ڕۆمانتیکیی ئەوروپا. سەرەڕای ئەمانە گۆران دەورێکی گرنگی بووە لە هێنانی هەندێ بابەتی تازە لە ئەدەبی ئەوروپاوە بۆ ناو شیعری کوردی، هەندێکیان لە پێشانا لە ئەدەبی کوردیدا نەبوون، لەوانە ئۆپێرێت و پیەس و ساتیر و گاڵتەوگەپ و کۆمیدیای کۆمەڵایەتی و هەڵهێنی سیاسی و سروودی نیشتمانی و شیعری منداڵان و هی دیکەش.

### شیعری گۆران لە ڕووی ناوەرۆکەوە

زۆربەی شیعری گۆران شێوەی لیریکی ئەوروپایی وەرگرتووە، لەبەرئەوە زۆرجار لە یەکێتی ناوەرۆکی تایبەتیی کلاسیکی، یاخود یەکێتیی دێڕە شیعر دەچێتە دەرەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ شیعری بناسرێتەوە لە ڕووی ناوەرۆک یا ئەو بابەتەی شاعیر مەبەستیەتی. لەبەرئەوە وێنەی زۆر لەو ناوەرۆکەی پێوەندی بەژیانەوە هەیە لە شیعریدا بەرچاو دەکەون.

گۆران مەشقی غەزەل و قەسیدەی شیعری کلاسیکی هەیە، وەسف و دڵداری، ناوەرۆکی ئەم بابەتەی بەقاڵبی شیعری لاسایی عوسمانییش دەربڕیوە. جگە لەوە زۆربەی بەرهەمی دەچێتە خانەی «شیعری نوێ»ی کوردییەوە. بەمە خۆی بووە بەیەکێک لەو شاعیرە سەرەکییانەی دەوری گرنگیان بووە لە کۆششی نوێکردنەوەی شیعری کوردی. بەم شێوازە تازەیە دڵداری کردووە لەگەڵ ژن، وەسفی سروشتی کوردستانی کردووە. گیانی کوردایەتیی گۆران گەرمە لە هەندێ لەو لیریکانەی وەک سروودی تایبەتی دایناون بەئاوازەوە بەگۆرانی بووترێن. لە وێنەکێشانی ژیانی کۆمەڵایەتی تابلۆی جوانی هەیە، هەندێکیان ناوەرۆکی دراميیان تیایە.

لە قۆناغی دووەمی ژیانی ئەدەبیدا بایەخێکی زۆری بەشیعری سیاسی داوە. بەزەقی لایەنی بلۆکی ڕۆژهەڵات یا یەکێتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستیی کۆن بووە. ستایش و پێداهەڵدانی کوودیتاکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدای زۆرە. بۆ کۆریا شیعری داناوە، ستایشی لینینی کردووە، وەسفی شاری مۆسکۆی هەیە. لەو کاتەی ئەمانە هەموویان دەچوونە ناو بەرەی «پێشکەوتنخوازیی»یەوە. بەرامبەر بەمە هەڵوێستی شاعیر تووڕەبوون و داشۆرین بوو بەرامبەر بەبلۆکی ئەمپریالیستەکان کە بەریتانیا و ئەمەریکای دەگرتەوە.

## بەرهەمە شیعرییە گرنگەکانی گۆران

کۆمەڵێک شیعری گۆران لە ژانرە شیعرییەکانی ئەوروپایین، بەقەوارە هەندێکیان لە شیعری درێژ پۆیێم (قەسیدە) حسێب دەکرێن، هی دیکەیان لە شیعری کورت (لیریک) دەژمێررێن. بەگشتی لەم وێنانەی لای خوارەوە بەرچاو دەکەون:

### پۆیێم (قەسیدە)

بەشێک لە پۆیێمەکانی گۆران لە جوانترین بەرهەمی شیعری دەژمێررێن لە بزووتنەوەی شیعری نوێی کوردیدا:

١- گوڵی خوێناوی: دیالۆجێکی درامییە لە نێوان دڵدار و دلبەرێک وێنەی دڵداریی ئوروستوکراتییانەی ئەوروپا دەنوێنێ.

٢- بووکێکی ناکام: بەسەرهاتێکی درامییە. لە دڵداریی چینی ڕەنجبەران دەدوێ، ئاغای دەرەبەگ دلبەر داگیر دەکا.

٣- ئاهەنگێک لە ناو ڕان: دیالۆجێکە لە نێوان شوان و ڕێبوارێک لە ناو مێرگ و مێرغوزاری بەهار لە جوانیی سروشت و بەختیاریی ژیانی ئادەمزاد دەدوێ.

٤- گەشت لە هەورامان: وەسفی سروشتی ناوچەی هەورامان و بەشێ لە ژیانی کۆمەڵایەتیی خەڵکەکەی دەکا.

٥- گەشت لە قەرەداغ: وەسفێکی سروشتە جوانەکەی ناوچەی قەرەداغە.

گۆران هەندێ پۆیێمی دیکەی هەیە لە پڕۆپاگەندەی سیاسییەوە نزیکن، جوانکارییان زۆر نییە و لە شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) دەکەن. لەوانە «لاوکی سوور بۆ کۆریای ئازا» لە ساڵی ١٩٥١ دایناوە؛ «پەیامی کورد بۆ میهرەجانی گەنجان و قوتابییان لە بوخارست» هەمووی بەشان و باهووی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو هەڵدەڵێ و لە دژی ئەمپریالیستی ئینگلیزی و ئەمەریکییە.

### پیەس

لەو ماوەیەی گۆران بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی «ژین» بوو لە سلێمانی کۆمەڵێک پیەسی (شانۆی یەک پەردەیی) بەشیعر نووسییەوە و لە ژمارەکانی ساڵی ١٩٥٣ بڵاوی کردنەوە. هەرچەندە بەگشتی لایەنی جوانکاری لەو بەرهەمانەدا بەهێز نەبوو، بەڵام هەندێکی جوانی



تێدا بوو. دەکرێ لەم ماوەیەدا پەنجە بۆ ئەم پیەسانە درێژ بکرێ: دوژمنانمان مێشوولە، شیوەنی دارستان، ماستاو، ووڵاتی ئاوا، مام چەوەنەر، نق و جق، خۆزگە هەژار.

### ئۆپێرێت

١- ئەنجامی یاران: دیالۆجێکی دڵدارییە، لە خۆشەویستیی نێوان کوڕێکی کورد بەناوی برزوو و کچێک بەناوی وەنەوش دەدوێ. کۆرسی کچان و کوڕان بەشداری تێدا دەکەن، لە ساڵی ١٩٥٣ نووسراوەتەوە.

٢- ئەنجامی ئەژدەهاک: پرۆژەی ئۆپێرێتێکی درێژ بووە، گۆران بەئومێدی ئەوە بووە تەواوی بکا و قادر دیلان مۆسیقای بۆ دابنێ. لە دوای نووسینی پەردەی یەکەم بۆی تەواو نەکراوە. ئەکتەر و بەشدارانی پەردەی یەکەمی ئۆپێرێتەکە ئەم کەسانەن: جارچی، کۆمەڵێک یاساوڵ، سەرکردەی یاساوڵان، کاوەی ئاسنگەر، کۆمەڵێک لاو، کۆمەڵێک کچ، شاگرد، کرماییل.

## گۆران و ڕۆشنبیر و نووسەران

گۆران شیعری موناسەبەتی زۆرە، لە ناویاندا ماتەمنامە جێگەی دیاری هەیە. بەکوڵترین ماتەمنامەی ئەوانەن بۆ کوڕ و کچی خۆی دایناون کە بەمنداڵی جوانەمەرگ بوون. جگە لەمە نووسینی ئاسایی و ماتەمنامەی بۆ کۆمەڵێک لە کەسانی بەناوی کورد هەیە، لەوانە: سالم، دەروێش عەبدوڵڵا، مەولەوی، مەحموود جەوەدەت، بەدرخانییەکان، نووری شێخ ساڵح، ڕەشید نەجیب (فەرامەرز)، پیرەمێرد، بێکەس، ڕەفیق حیلمی و هی دیکە.

## پەخشانی گۆران

گۆران کوردیزانی چاک و پەخشان نووسێکی ڕەند بوو. بەزۆری وەستایی خۆی لە مەیدانی وەرگێران خەرج کردووە. وتاری هونەری و چیرۆکی نەنووسیوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا وتارەکانی لە بابەت مێژووی ئەدەب و ڕەخنەوە توانای شاعیر دەخەنە ڕوو لە نووسینی پەخشاندا. لەم لایەنەوە وەرگێڕانی زۆرە لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردی. ئەو وەرگێڕانانە زۆربەیان پێوەندییان بەزانستییە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە، وەکو سیاسەت و دیپلۆماسییەت و کۆمەڵایەتی و ئەدەب و مێژوو هی دیکە. بێ گومان ئەم بەرهەمانەی گۆران سەرچاوەییێکی گرنگ بوون بۆ بەپەتی کردنی زمانی کوردی و بەهێزکردنی لە ڕووی وشە و زاراوەی فەرهەنگی و لێکسیکۆنی زمانی نووسینی کوردییەوە. هەندێ لە کتێبە

وەرگێڕدراوەکانی لە زمانی عەرەبییەوە بۆ کوردی ئەمانەن: هەڵبژاردە لە چیرۆکی بێگانە، لە بەغدا لە ساڵی ١٩٥٣ بڵاوکراوەتەوە؛ ئومەمییەت و نەتەوایەتی، لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٦٠ بڵاوکراوەتەوە؛ گیروگرفتی ئەڵمانیا، لە بەغدا لە ساڵی ١٩٦١ بڵاوکراوەتەوە.

## لە گێتیی داهێنانی شیعری گۆران

### گۆران شاعیری ئافرەت و جوانییە

١

لە شیعرێکیدا گۆران دەڵێ:

ئەی شەوقی گەلاوێژی بەیان نووری نیگاهت
ئەی عەتری سەبا بۆی نەفەسی زولفی سیاهت
ئەی حوسنی تولووع وێنەیێکی فەیزی حوزوورت
ئەی حوزنی غورووب ڕۆژی ڕەشی دووری تەباهت
ئەی کۆشک و سەرای باغی بەهەشت مەیلی سەوابت
ئەی ئاگری دۆزەخ شەرەری خەشمی گوناهت
ئەی عیففەتەکەت داغی حەسەد بۆ دڵی جیبریل
هەر بۆ هەوەس و عیشوەیە خۆ لارە کولاهت
چۆن مەحکەمەیی عەشق نەدا حەق بە جەمالت
خەندەی لەبی مەعسوومە ئیفاداتی گەواهت
وەک بلبلەکەی فەجری ئەزەل ویردمە ئەی یار
بۆ ئەو گوڵە وا خەڵقی ئەکا حەمدی ئیلاهت
بێ عەشقی هەوای پاییزە بۆ قەلبی فسردەم
ئەی ڕۆژی بەهار مەرحەمەتی تینی پەناهت
بیدارییەکەم زوڵمەتی شەو بردی قەراری
توو زولفی پەشێو دەربخە سا چەهرەیی ماهت
ئەستێرە هەموو داغی سەمای سینەتە (گۆران)
ئەی عەرشی عەزیم نارەحەتی دووکەڵی ئاهت



ئەم لیریکەی گۆران هەموو مەرجەکانی شیعری کلاسیکی تێدایە، ژمارەی دێڕەکانی نۆیە، لەسەر بەحری عەرووزی و یەکێتیی قافیە ڕێک خراوە، تەنانەت لە دوا دێڕی شیعرەکەدا نازناوی خۆی تۆمار کردووە. زیاد لەسەر ئەمە نوێگەرییێکی تەنکی پێوە دیارە، بەوەی هەندێ وشەی عەرەبی بەکارهێناوە کە لە شیعری نوێی ڕۆمانتیکی تورکی عوسمانی بەکار دەهێنران و چووبوونە ناو فەرهەنگی شیعرییانەوە.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا گۆران دەڵێ:

ژنە کە جیلوەیی حوسنی بە عەشق ئەکا پەرواز
ژنە کە قووەت ئەخاتە خەیاڵی ڕەقس ئەنگیز
ژنە مووەللیدی عەشق و ژنیشە عەشق نەواز
ژنە کە تاری ڕەبابی حەیات ئەکا تەهزیز

***

سەمایی واسیعی دڵ گەر لە ژن بکەی خاڵی
تەجەللیاتی بەدایع غرووب ئەکا دەیجوور
بەسەر سەمایی تەهی دا گوشا ئەکا باڵی
لە کەوکەبی ئەمەلت وون ئەبێ تەبەسسومی نوور

***

ژنە کە گەوهەری سەر تاجی ئیحتیرامە ژنە
بە نووکی نەشتەری ئەڵماسی تیژی عەشق و غەرام
خوتووتی قودسییەتی حەککراوی قەلبی منە
بە سیحری خاریقی ژن پڕ قەریحەمە ئیلهام

***

لە کونجی خاتیرەما تا ژنێکی شۆخ نەکا
پەری سیفەت بە پەلوپۆی جەماڵەوە جیلوە
لە کوێ لە سەتحی زەمینا لە سینەیی فەلەکا
ئەبێتە مەنبەعی شیعرم بەدایعی ئەشیا

لەم غەزەلەدا گۆران نوێکردنەوەی بەدەست هێناوە، لە ڕووی ڕوخسارەوە لەسەر بنچینەی بەندی چوارین شیعرەکەی ڕێکخستووە و قافیەی تازەی داهێناوە. هەر بەندێکی لەسەر بنچینەی (ا ب ا ب) دامەزراوە. لە ڕووی ناوەرۆکەوە شاعیر ژنی کردووە بەسەرچاوەی دڵداری، ئەگەر ئەو نەبێ دڵداری نابێ. دیارە ئەگەر دڵدارییش نەبێ داهێنانی هونەریی لە ناوەوە نابێ، بەتایبەتی لە شیعردا. هەروەها گۆران بەتێڕوانینی فیکری کەڤالێرەکانی (سوارچاکانی) سەدەکانی ناوەڕاست تەماشای ژن دەکا. ئەوە ڕاستە لەوانەیە لە ئەدەبی کوردیدا زیاتر ڕێز لە ژن گیرا بێ بەوەی شاعیر خۆی کردووە بەکۆیلەی ژن بەو مانایەی ئەو ژنە لە پلەی کردگار دایە. بێ گومان ئەم شێوازە جیایە لەگەڵ شێوازەکەی ئەوروپا کە گۆران لاسایی کردۆتەوە.

### ٣

لە لیریکی «جوانی بێ ناو»دا گۆران دەڵێ:

قژ کاڵی لێو ئاڵی پرشنگی نیگا کاڵ
ئەی کچە جوانەکەی سەر گۆنا نەختێک ئاڵ
ئەی کچە مەندەکەی بە دەنگی چپە دوو
گەندەمووی دەم و چاو مەچەک هەڵنەگرتوو
ئەی ئەندام ووردیلەی نەرمونۆڵەی ئێسک سووک
ئەی بەرگی ساکارت دڵگیرتر لە هی بووک
ڕاستە من ڕێبوارم سەرپێیی ئەڕوانم
بەڵام وا جوانی تۆ کاری کرد لە گیانم
ئەڵێی نەک هەر ئێستا عومرێکی درێژە
بەودەست و پەنجانەت برینم ساڕێژە
ئەی کچە کاڵەکە جوانی تر با زۆر بن
لە باغچەی بەهارا گوڵباغی بەرخۆر بن
با ڕەنگیان پەرداخت بێ و جێگەیان سەرچڵ بێ
بەواتەی خەڵکی تر با ناویان شاگوڵ بێ
گیانی من بۆ تەلێ وەنەوشە پەرۆشە
کە لە ژێر سێبەری تووترکا خامۆشە



لە هەموو ئاسمانا ئەستێرەی بەربەیان
ئەخاتە دڵی من هەستێکی سپی و جوان
لە تەختێک هەڵدەستێ هەزار و یەک نەغمە
ئەوەیان شیرینتر دێتە گوێم زۆر نزمە
کانییێکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو
لە بنیا بلەرزێ مرواری زیخ و چەو
جوانترە لە لای من لە دەریای بێ سنوور
شەپۆلی باتە بەر تیشکی ڕۆژ شڵپ و هوور
قژ کاڵی لێو ئاڵی پرشنگی نیگا کاڵ
ئەی کچە جوانەکەی سەر گۆنا نەختێک ئاڵ
دەربەست نیم ڕێبوارم دەربەست نیم ڕەوتەنیم
ئەزانی شپرزە و دەربەستی ئێجگار چیم
هی ئەوەی نیگارێک لە یادم کێشراوە
شۆخێکی نایابە بەڵام ئاخ بێ ناوە

ناوەرۆکی ئەم شیعرە جیاوازی نییە لەگەڵ ناوەرۆکی دوو شیعرەکەی پێشوو، بەڵام لە شێوازی ڕوخساردا ئینقیلابێکی بنچینەییە گۆران کردوویەتی لە وەسفی جوانی ژندا. لێرەدا پێویستە ئەوە بزانرێ گۆران لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتی کە لە یافا بووە ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە. شاری یافای فەلەستین لەو کاتەدا بەشاری تەل ئەبیبەوە نووسا بوو، ئێستا بووە بەگەڕەکێک لە گەڕەکەکانی. ژیانی ئەو جێگایە ئەوروپاییانە بوو، جوولەکەی هەموو لایێکی ئەوروپا بەلێشاو لە پێش جەنگدا ڕوویان دەکردە فەلەستین. دیارە گۆران لەسەر شەقامێک چاوی بەنازەنینێک کەوتووە، ناوی نەزانیوە بەڵام ئیلهامی لە جوانییەکەی وەرگرتووە و کەوتۆتە وەسف کردنی. گۆران وێنەی هونەریی جوان دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی بڵێ ئەو شۆخە جوانە بۆ ئەو نابێ. مەسەلەکە لەوەوە دەست پێ دەکا ناوی نازانێ لە چاوقوچانێکدا دیویەتی و لە پێش چاوی ون بووە، ئیتر وێنەی شیعری دادەهێنێ، ئەو کچە لە شارێک دەژی لەسەر زەریای بێ سنوور، گۆران چاوی بەکانی ڕاهاتووە، ئەم دوو ئاوە دەریا و کانی هەردووکیان جوانن، بەڵام چەندە لە یەکترییەوە دوورن! ئەم شیعرە بووە بەرەمز بۆ ناوی گۆران، تەنیا پێی ناڵێن «شاعیری ئافرەت و جوانی» شاعیری «قژ کاڵی لێو ئاڵی»یشی پێ دەڵێن.

٤

گۆران شیعری «شەوێک لە عەبدولّلا»ی لە هاوینی ساڵی **١٩٤٩** نووسیوەتەوە لە کاتێکدا دەستی لە مووچەخۆری میری کێشرا بووەوە و چاوەنۆڕی دادگا بوو. بۆ مەسەلەکەی خۆی چووبوو بۆ بەغدا وێڵی ئەوە بوو بەئەنجامی بگەیەنێ. لەو کاتەدا لە هەڵسوکەوتێکی دەروونی وا بوو بەهەموو جۆرێ دەبوو ڕەشبین بێ. لە بەغدا ئێوارەیێک عەونی یووسف میوانداری شاعیری هەست ناسکی دڵ شکاو دەکا لە هۆڵی عەبدولّلا شەوێک پێکەوە ڕابوێرن. ئەمە کابێرێی ئەو سەردەمە بوو یا دیسکۆی ئێستا لە ئەوروپا.

شاعیری ڕەسەنی جوانی پەرست لەگەڵ ئەم هەموو پەستییەی ژیانی ئەو کاتەی بەم دێڕە جوانانە شیعرەکەی دەست پێ دەکا:

هۆڵ زۆر گەورە ئێجگار ڕووناک
هەموو شت جوان هەموو شت پاک
جەو لێی ئەتکێ شادمانی
بۆن خۆشی مۆسیقا جوانی
هەر مێزە و کورسی دەورەی داو
تێکڕژاون ئافرەت و پیاو
ئافرەت چرای کۆڕی ئاهەنگ
لەنجەی جوولاّن مۆسیقای دەنگ
لەسەر هەر مێز یەک دوانێ
بۆ چەشنی جوانی نیشانێ
یەکێ قژ زەرد یەکێ چاو ڕەش
یەکێک لێو وەک گوڵ غونچەی کەش
یەکێک جوانی وەک هەتاوە
تین و تیشکی لە پێش چاوە
یەکێک مانگی شۆخ و شەنگە
سیحری جوانیەکەی بێ دەنگە
یەکێک شێوەی دوان خۆشە
جوان نییە بەڵام جوان پۆشە



هەر ئافرەتە هێندە ژیرە
پەرداختر کات کوێی دڵگیرە
پێست پەمەیی لەش نەرم و شل
نیوە ڕووتی تەنکیی جل
کەم گۆشتی نەختێک کەڵەگەت
نەخشێکە بۆی شان و چاکەت
قژ ئاوریشمین بە تواڵێت
عەتر و سیحری لێ ئەتکێت
چاو ڕەش بەکل ئەوەندەی تر
بۆ تەماشاکەر گورچک بڕ
شۆخی مەڕمەڕ گەردن و سنگ
لەسەر سنگی ڕووت بوو پرشنگ
ڕستێک مرواری داناوە
مایەی ڕێشکە و پێشکەی چاوە

گۆران وەسفی دیمەنێکی ئۆروستوکراتی دەکا لە کابێرێی عەبدولّلا لە بەغدا لە ڕابواردنی شەوانی کۆشک و باڵەخانەی دەوڵەمەندانی ئەوروپا دەکا. بەزمانێکی ئاسان و ساکار وشەکان دەجووڵێنێ و گیانی تازەیان پێ دەبەخشێ. ئەو ژن و پیاوانەی ئەوێ بەزۆری ژن و مێردن، دڵدار و دلبەرن، خوشک و بران، نازەنینی واشیان تێدایە ئامادەیە دۆستایەتی لەگەڵ یەکێکدا بکا بەدڵی بێ، گۆران بایەخی بەپیاو نەداوە، چونکە نابێ و نایەوێ بایەخیان پێ بدا. ئەو ژنانە هەموویان جوانن، لەگەڵ ئەوەی جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە. بۆ یەکێکی وەکو ئەو تەنیا لە جوانی دەگەڕێ، بۆی هەیە هەموویانی خۆش بوێ، ئەمانە هەریەکەی پەیکەری جوان و ڕەوشتی دڵگیری خۆی هەیە، لە یەکتری ناکەن، بەڵام هەموویان جوانن. گۆران لە شیعرەکەی بەردەوامە:

تاک تاک مێزی وەکو هی من
دەوری داوە کوڕی بێ ژن
ئەمانەش یا بادە نۆشن
یان بە تەماشا سەرخۆشن

تاوێک چاو ئەبڕنە جوانێ
دانسێکی نایاب ئەزانێ
پێ و پل و چەرخەی هاتوچۆ
جوان جووت ئەکا لەگەڵ تانگۆ
تاوێک نەغمەی ڤالس و خەیاڵ
لەگەڵ نەشئەی ستاوتی تاڵ
دەستیان پێ ئەداتە بەرسەر
بیریان ئەڕوا بۆ دنیای دەر
تاکەی! بەڵکو تا دوایی دانس
چەپ چەپ چەپڵەی پاش نەغمەی ڤالس

گۆران لەم دێڕانەدا دیمەن دەگۆڕێ. لە ناو ئەو مێزە زۆرانەی ژن و پیاو پێکەوە لە دەوری دانیشتوون تاک تاک مێزی بێ ژن دەکەوێتە بەرچاو. وەک ئەو مێزەی ئەو لە دەوری دانیشتووە. ئیتر ئەمانەش بێ گومان سەرخۆشن، یا بەمەی یا بەتەماشا کردنی ئەم نازەنینانە. ناوە ناوە دانسی ئەوروپایی دەست پێ دەکا، ژن و پیاو پێکەوە. دەستوور ئەوەیە پیاو داوا دەکا ژنێک دانسی لەگەڵدا بکا، هەر ژنێک بێ لە دانیشتووانی لای هەموو مێزەکان. بەگشتی دوو جۆرە دانسیان هەیە «تانگۆ» لەسەرخۆیە و «ڤالس» تیژە و بزووتنەوەی زۆری تێدایە و لەسەر ئاوازی مۆسیقای تایبەتی ژن و پیاوەکان دانس دەکەن، لە دوای هەموو دانیشتنێکیش خەڵکەکە هەموویان چەپڵە لێ دەدەن.

گۆران لیریکەکەی بەم دێڕانە دوایی پێ دێنێ:

سەعات فری شەو درەنگ بوو
هێشتا نیوەڕۆی ئاهەنگ بوو
تازە باندی پشت سێپای نۆت
گەرمی هەوای فۆکستڕۆت
تازە شۆخی هەڵبژاردەم
کەوتۆتە سەرنجی دەم دەم
بە دوو چاوی وەک دەریای شین
پڕ لە زەردەخەنەی شیرین



بەڵام منی بێگانەی کۆڕ
شەونشینم لێ نایە زۆر
ناچار لەگەڵ هاوڕێم هەڵساین
خەو ئەم بەهەشتەی لە کیس داین

تا نیوەی شەو گۆران لەم بەهەشتەدا بوو وەکو خۆی دەڵێ. ڕابواردنی شەوانی کابێرێکان وەک دیارە تا بەیانی بووە، لەبەرئەوە لە نیوەشەوا تیپی مۆسیقا تازە گەرم بوو و لەسەر ئاوازی فۆکسترۆت ئامێرەکانی خستە کار. مۆسیقا جریوەی دەدایە چاوی شین و بزەی لە لێوی نەرم هەڵدەفڕاند. ئیتر گۆرانی بەلەنگاز ناچار بوو لەگەڵ هاوڕێی ڕۆشنبیر و دەوڵەمەندی عەونی یووسف ئەم بەهەشتە بەجێ بێڵن.

## ٥

لە پێش دادگایی کردنی یەکەمی گۆران لیریکی «شەوێک لە عەبدوڵڵا»ی هۆنیوەتەوە. بەڵام لە دوای دادگایی کردن یەکسەر لیریکی «دوا سەرنج»ی داناوە و پێشکێشی ئەو قژ زەردەی کردووە کە لە بەردەرگای یەکێک لە ماڵەکانی ڕێگەی مووسڵ لە هەولێر وەستاوە و گۆران یەکەم نیگای لێ دزیوە و بوو بەسەرچاوە بۆ دانانی ئەم لیریکە:

ئەی قژی زەرد ئەی بەژن و باڵا کەڵەگەت
بۆ کز ڕاوەستاوی بەرامبەری من
بۆ دەستت ناوەتە ژێر چەنەی خەفەت
لە عاستی دیمەنی دەربەدەری من

***

وا ئێستا ئەبینی گیرۆدەی داوم
لە بەردەم جوانێکی وەک تۆی دڵ نەرما
لەگەڵ گارد لە پاس دا ڕاوەستێنراوم
تا داخی گرانتر خول با لەسەرما

***

ئەی قژی زەرد ئەی گەردن بە ناز لارگرتوو
دیوێکم لە پاسا تۆی دیوێک باخە

ئەکەمە هەچ دیوێک نیگای ئارەزوو
بۆ گیانی قەفەسیم سەرچاوەی ئاخە

***

بەڵام ئاخ دوو گاردی چاو لێم داپچڕاو
چەپ و ڕاست وەستاون بۆم دوژمنانە
کەلەپچەی لە دەسما توند کلیل دراو
نیشانەی ڕێگامە کە بۆ زیندانە

***

بۆ ئەوەی بتوانم لە پەردەی بیرم
نیگارێ هەڵکەنم شێوەی لێت بچێ
تا هەرچەن گازی گرت لە لەش زنجیرم
ئازارم سووکتر کا خەیاڵی کچێ
کە شۆخە و قژ زەردە و باڵا ڕێک و بەرز
غەمخواری نەناسە وەک فریشتەی عەرز

لە دوای دادگایی کردنی گۆران لە هەولێر، ئەو کاتە دادگا لە قشڵە (سەرا)ی هەولێر بوو. لە پاش نیوەڕۆ گۆرانی دەست بەکەلەپچە سواری پاسێکی لە تەختەکان کرا و لەگەڵ دوو پۆلیس ڕوویان کردە مووسڵ. پێش ئەوەی لە شار دەربچن لە بەردەرگای ماڵێک چاوی بەو نازەنینە دەکەوێ. ئەم شیعرەی بۆ دەنووسێتەوە. شاعیر لەم لیریکەدا ڕاستگۆیە، فیکر و هەستی لەگەڵ جوانییە. لەودەمەدا هەڵسوکەوتی لە ئەوپەڕی نالەباری و پەژمردەیی دابوو، فەرمانی بەندکردنی دەرچووبوو، دەست بەکەلەپچە دەبوو لە زیندانا بناڵێنێ، ماڵ و منداڵی بێ کەس و هەژار لە هەولێر مابوونەوە، لەگەڵ ئەم هەموو کارەسات و ماڵ وێرانییە گۆران ئەم لیریکە دەهۆنێتەوە کە زیاتر تەعبیر لە خەیاڵ و هەستی شاعیرێکی دڵ ناسک و دەوڵەمەندی کوڕی خاوەن قەڵاکانی ئەورووپا دەکا. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە گۆران ڕاستگۆیە، شیعرەکە ڕەنگدانەوەی ڕاستی دڵ و دەروونی خۆیەتی.

گۆران لەم کچە جوانە هەولێرییە قارەمانێکی دڵسۆزی دروست کردووە، وای پیشان دەدا ئاگاداری میحنەتی گۆرانە ئەوەی لەودەمەدا دەیبەن بۆ بەندیخانەی مووسڵ. شاعیر باکی بەوە نییە ئەگەر لایێکی ژیانی شین بێ ئەنجامی قەفەسی بەندیخانە بێ، لایەکەی دیکەی



سوور بێ، چونکە قژ زەردێکی جوانی وەک ئەو نازەنینە هەولێرییەی دیوە و حەزی لێ کردووە. گۆران لەسەر ئەوە سوورە کە دڵداری بەهێزترە و هەموو ئێش و ئازارێک بسڕێتەوە. بۆ ئەو کیژە قژ زەردە هەیە پۆلیس و کەلەپچە و بەندیخانە لە بیر گۆران بباتەوە.

**لە بەندیخانە**

گۆران لە بەندیخانەی مووسڵ قەسیدە بەناوبانگەکەی بەناوی «بەندیخانە» هۆنیوەتەوە. قەسیدەیێکی درێژە هەست و نەستی بەرامبەر ئەو ڕووداوە گرنگەی ژیانی دەگێڕێتەوە. تووشی گرێییێکی سایکۆلۆجی کوشندە بووە، چونکە خەڵکی هەر چۆنێ بێ بەتاوانبار و دز لە قەڵەمیان داوە، مەگەر ڕۆشنبیر و دڵ ناسکەکانی وەک خۆی نەبێ ئەوانیش کەمن.

ئەم شیعرە یەکێکە لە بەرهەمە بەرزەکانی گۆران لە ڕووی داهێنانی جوانکاری و ڕەنگدانەوەی دەروونێکی تێکشکاوەوە. کارەساتی گۆران ئەنجامی شێوانی کۆمەڵە. دزە ڕاستەکان دەبن بەسەردار و پیاوچاکان دەبن بەدز، وەکو خۆی لە هەندێ لە دێڕەکانی ئەم قەسیدەیە باسیان لێوە دەکا.

لەم ماوەیەدا گوڵبژێرێک لە باغی ئەم شیعرە بەرزەدا دەکەین.

گۆران بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

تاوانم کرد گەل پێوەی نام مۆری ناپاکی
بۆ زیندانە کۆچی ژینم دنیای ڕووناکی
کار تەواو بوو قۆچی دزی بوو بەسندووق بڕ
مێشک ماندوو دڵ بریندار گوێ لە توانج پڕ
لوولەی تفەنگ لە بڕبڕەی پشتی قایم بوو
تەقەی پۆستاڵ بەسوێنەوە هەر هات و هەر چوو

لەم دێڕانەدا گۆران وەسفی خۆی دەکا لە دوای بڕیاری دادگا بەبەند کردنی و بوونی بەپیاوخراپ لە ناو کۆمەڵدا، سزای پیاوخراپی بەندیخانەیە. ئینجا دەکەوێتە وەسفی ناو بەندیخانە و دەڵێ:

بەڵام من و وەک منەکانی بەندیخانە
دروست بوونمان لە قورێکە ئەهریمەنانە

بۆ تاریکی بۆ شەرم و عار بۆ غەم خولْقاوین
لە بەهەشتی ئەودیو دیوار بێبەش کراوین
مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەی خواش لەگەڵ دەشت و دەر
قانوون ئەڵێ قەدەغەیە بەدەرچەق تاوانکەر

لەم دێڕانەدا لە وەسفی خۆی و هەموو بەندییەکانی دیکە ئەوە دەردەبڕێ ئەمانە هاوولاتی پلە دووەمین، لە قوڕێکی ئەهریمەنانە دروست کراون. دەرەوە بە بەهەشت دادەنێ، واتە ناوەوەی بەندیخانە دۆزەخە. لەم دۆزەخەدا لە هەموو شتێک بەدوورن تەنانەت لە تیشکی ڕۆژ و تریفەی مانگیش. ئەوجا شاعیر ڕوو لە مانگ و ڕۆژ دەکا و پێیان دەڵێ:

ئەی مانگ و ڕۆژ ئەی ئەستێرەی شەو هەڵمەیەن ئیتر
بۆ ئەودیوی بە نهێنی لە تاوانکەر پڕ
بۆ ئەو دیوی بە ئاشکرا فەزیلەت فرۆش
لە پەناوە پاسکەری دز و واعیزی سەرخۆش
بۆ ئەودیوی شێخ و مەلا بەشی زۆر جاسووس
زۆربەی ئاغا بە پیست مەرد و بە ئێسک بێ نامووس
بۆ زۆر ناوخۆ دڕو لە لای بێگانە
دەست لەسەر سنگ لەبەر ئەکەن جلی ژنانە
بۆ ئەودیوی کە زۆر پیاوی گەورە و ناوداری
گیانی چەور و چڵکنە وەک لەشی هەژاری

گۆران داوا لە مانگ و ڕۆژ دەکا بەدزییەوە بەسەر بەندیخانە هەڵنەیەن، چونکە تاوانبار تیایدا دەژین. بەڵکو بەئاشکرا تیشکیان بۆ دیوی گێتیی ئازاد بنێرن، لەوێ چاکە دەفرۆشرێ، پاریزگاریی دز و واعیز و سەرخۆش دەکرێ. هەندێ شێخ و مەلا جاسووسن، زۆربەی ئاغای دەرەبەگ بێ ناموسن، زەبروزەنگیان بۆ بێ دەسەڵاتانی ناوخۆیە، غولام و پێش خزمەتی بێگانەن.

لە دواییدا ڕوو دەکاتە مانگ داوای لێ دەکا تریفەی لە دەرکی دەلاقەوە نەنێرێ بۆ کوردی عیراق:

ئەی تریفەی مانگی سپی دەرکی دەلاقە
با پیس نەبی خۆت مەدە لەم کوردی عیراقە



وولاتەکە داگیر کرا و نەتەوە دیلە
باو لای دوژمن نامەردێتی مەردی زەلیلە
کای لەبەر سەگ دانراوە ئێسقان بۆ ئەسپە
سەر لە جێی کلک بەند کراوە کلک لەسەر چەسپە

شاعیر بەتریفەی مانگ دەڵێ ئەگەر بەسەر کوردی عیراقدا هەڵێی پیس دەبی، چونکە خاک داگیر کراوە و میللەت دیلە، لای دوژمن نامەرد و بەرز و مەرد نزمە. لەو کۆمەڵە نالەبارەدا کا لەبەر سەگ و ئێسقان بۆ ئەسپ دانراوە.

ئینجا ئاوڕدانەوەیێکی داهێنراوی هونەرییانە دەداتەوە و ڕوو دەکاتە دنیا و پێی دەڵێ:

ئەی دنیای جوان دنیای بەهار دنیای ڕووناکی
تاوانم کرد گەڵ پێوەی نام مۆری ناپاکی
فرێی دامە پشتی دەرگای ئاسن و پۆلا
لە ژوورێکی تەنگەڵانی تاریک و چۆڵا
لەگەڵ ئەوەی گیانم تیایە بە هەناسە و نەبز
ئەڵێی مردووم خزاومەتە ژێر ئەلحەدی قەبز
بەقەد کونی دەلاقەکەم ئاسمان دیارە
ئەمە هەموو ناونیشانی ڕۆژی بەهارە

گۆران گازاندەی خۆی بۆ دنیای بەهار و جوانی دەکا، شاعیرێکی هەست ناسکی خەیاڵ فراوانی وەستای قسەی جوان کە دەبێ هەموو سروشت لە پێش چاوی بێ، لێی قەدەغە کراوە و ئاخنراوەتە ناو قەلاییێکی ئاسنین بەئاستەم لە کونی دەلاقەی زیندانەکەوە چۆڕە بەهارێک دەبینێ، لەو کاتەی پێویستی بەهەموو بەهار هەیە، چونکە وەک شاعیرێک ئەو لە هەموو کەس زیاتر شارەزای ئەو بەهارەیە.

لە ئەنجامدا گۆران بەم دێڕانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

بۆ بەندییێک کە هیچ نەبێ تا بەرەڵڵا بێ
بەپێی قانوون کۆشێ منالْ منالی نابێ
کوڕی خەرجی لێ وەرناگرێ کۆشی نابینێ
کچی ساوا کێ چوزانێ هەتا بمێنێ

لەم دێڕانەدا شاعیر لە خۆی و هونەر و شیعرایەتی دوور دەکەوێتەوە، ئاوڕ لە لایەنی

ئەرکی کۆمەڵایەتی باوکێک دەداتەوە بەرامبەر بەماڵ و منداڵی. لە ماوەی بەندیخانەیدا تا ئازاد دەبێ، کێ نانیان دەدا! کێ خەرجییان پێشکێش دەکا! منداڵی ساوا سەریان دەخەنە سەر کۆشی کێ!.

## بووکێکی ناکام

بووکێکی ناکام پۆێمێکی درامییە، بەرۆخسار ئەوروپاییانە و بەناوەرۆک کوردەوارییانەیە. چیرۆکێکی مەلحەمییە، کات و شوێن و قارەمانیی تێدایە، ڕەنگدانەوەی لایێکی ژیانی گرنگی کۆمەڵی کوردییە لە زەبروزەنگی دەرەبەگی زۆردار دەدوێ بەرامبەر بەرەنجبەری هەژاری بێ دەسەڵات.

گۆران ڕووداوەکە بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

هەی سوار سوار بێ هەی تفەنگچی دەس باتە تفەنگ
هەی ژنی جوان ئارایشتی خۆی کا بۆ ئاهەنگ
لە ژێر تارای سورمەچنا هەرە جوانی دێ
کچی جووتیار بەرەو کۆشکی ئاغا کەوتە ڕێ
کۆشکی ئاغا گەچ کارییە ئاوێنە بەندە
کەس نازانێ بە ژمارە پەنجەرەی چەندە
حەوز و فوارەی حەوشی مەرمەڕ باغچە و چیمەنی
بەسەرناچێ هەرگیز سەوزی و گوڵی دەگمەنی
جوانی لادێی ڕووتی وەکو تەلی وەنەوشە
بە ئاوریشم و بە ئاڵتوونی ئەم کۆشک و حەوشە
لە تەوقی سەر تا بەری پێ پەرداخت و پۆشتە
سوار کراوە شۆخ و نازدار وەکو فریشتە
خراوەتە ڕێ بۆ پەردەی ئەتلەس و گووروون
بۆ باغەڵی ئاغای پێش چاو بە چلچرا ڕوون
ئاغای خاوەن هێز و شکۆ خاوەن سامداری
لە کاتێکا درێژ ئەکا دەستی دڵداری
بۆ گەردنی گوڵی کێوی لە جێ هەڵکەنراو
نمی فرمێسک بەدی ئەکا لەسەر کلی چاو



شاعیر لەم دێڕانەدا وەسفی ژن گواستنەوە دەکا بۆ ئاغا. سواران تفەنگ بەشانەوە خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئاهەنگ، جوانترین کیژی گوند کچی جووتیارە. بووکی ڕازاوە بەرەو کۆشک و سەرای ئاغا کەوتۆتە ڕێ. باڵەخانەی ئاوێنە بەندە. باغ و باغچە و چیمەن و فوارەی ئاو و حەوز شایانی ئەو بووکە جوانەیە کە لە ناو بەرگی ئاوریشم و خشڵی زێڕ و مرواری نوقوم بووە. ئەم پەرییە کەوتۆتە ڕێ بۆ ناو باوەشی ئاغای خاوەن دێ. زاوا هەناسەی خۆشی هەڵدەکێشێ، دەست دەبا بۆ گەردنی ئەو نازەنینە، لەباتی ناز و نووزی شادی چاوی بەنمی فرمێسکی قەتیس ماو لە ناو کلدا دەخاتە ڕوو. گۆران لە هۆنینەوەی شیعرەکەی بەردەوامە:

مووچڕکەیێک بەسەرتاپای لەشیا ئەگەڕێ
ئاگادارە فرمێسکی سۆز دێتە خوار بۆ کێ
کچی جووتیار بۆ بەهەشتی ژین و دڵداری
لەگەڵ کوڕی شوان بەستبووی پەیمانی یاری
کوڕی شوانی برژاوی ئیش لەبەر هەتاو قاڵ
مەچەک ئەستوور لەش کەڵەگەت دەفەی ناوشان چاڵ
تیری خوای عەشق هەتا شاپەڕ دڵی سمی بوو
کچی جووتیار لە بەرچاوی بت بوو پەری بوو
ئەم نازدارەش بە شەو و ڕۆژ نەخشی خەیاڵی
کوڕی شوان بوو باڵای بەرزی ناوشانی چاڵی
ئیتر ڕێگای دارستان و ناوڕان و دێبەر
بوو بە شانۆی سەرگروشتەی دڵدار و دلبەر
هەر بن دارە بن دەوەنە هەر بستە خاکە
ئاگاداری چەن بەندێک بوو لەم عەشقە پاکە

ئاغا فرمێسکی ناو چاوی بووک دەبینێ، مووچڕکێک بەلەشیدا دەگەڕێ، دەزانێ ئەم فرمێسکە پڕ لە سۆزە بۆ کێیە! کچی جووتیار پەیمانی دڵداری لەگەڵ کوڕی شواندا بەستووە. ئەو کوڕە ڕەنجبەرە بەکارە سوارچاک و کوڕی ئازای خەیاڵی کچی جووتیار بوو. بۆ کوڕی شوانیش ئەو کچە لە پەرییانی بەهەشت بوو. هەموو جێیێکی گوند، دارستان و ڕێگەوبان و ناوڕان شانۆی ئەم دڵدارییە بوون و بەسەرهاتی ژوانی دڵدار و دلبەریان دەگێڕایەوە. ئەم دوو خۆشەویستە چاوەنۆڕ بوون بەیەکتری شاد بن.

گۆران لەسەر شیعرەکەی بەردەوامە:

هەتا ڕۆژێ بۆ کلۆڵی ئاغای شکۆدار
لەسەر ڕێی ڕاو کاسەیێک دۆی وەرگرت لە نازدار
گری لەشی دامردەوە بە دۆی سەر تەزێن
بەڵام کوورەی دڵی کەوتە بەر بای باوەشێن
دەست و کاسە و پەنجەی دۆگێڕ نیگای چاوی ڕەش
هەستی ئاغای فڕێ دایە ناو ئاگری گەش
پیاوماقووڵی ڕاسپێری کرد تارەک ساز بکرێ
زوو ئەم شۆخە نەرم و نۆڵەی بە بووک بۆ ببرێ

ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاغای دەسەڵات بەدەست، لەسەر ڕێی ڕاووشکار جامێک دۆ لە نازدار داوا دەکا. دەستبەجێ حەزی لێ دەکا و گرفتاری دەبێ، یەکسەر پیاوماقووڵان ڕادەسپێرێ بەزووترین کات ئەو کیژەی بۆ بەبووک ببەن.

گۆران لەسەر گێڕانەوەکانی دەڕوا و دەڵێ:

کوڕی شوانە کە ئەمەی بیست شێت بوو دایە کێو
زەوی داگرت بە تف کردن ئاسمان بە جنێو
چەن جارێ شەو ماڵی ئاغای دایە بەر تفەنگ
دەغڵی سووتان باغی بڕی بۆ ئەتک و بۆ پەنگ
کلک و یاڵی چەن چارەوێی قەل کرد بە خەنجەر
بەسەر ڕانی ئاغایا دا و مەڕی دایە بەر

کوڕی شوان شێت و شەیدا بوو، کەوتە تاوانبارکردنی ئەرز و ئاسمان. ماڵی ئاغای دایە بەر تفەنگ، دەغڵی سووتاند، باغی بڕی، کلک و یاڵی چارەوێی بەخەنجەر قەل کرد، بەم جۆرە دنیا لە پێش چاویدا تاریک بوو.

بەم دێڕانە گۆران کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

تاکو دوایی ڕۆژێ بەختی نۆکەری ئاغا
خەوی لێ خست لە سێبەری درەختی باغا
پەنجەی کینە لەسەر پیلکەی تفەنگ کەوتە کار
کۆستی دڵی بۆ ئێجگاری کەوت کچی جووتیار



ئێستا ئەوا هەرچی بڵێی نیعمەت و نازە
هەمووی ئەدا بەیەک دڵۆپ فرمێسکی تازە
لە بەردەرگای چاوی ڕەشا بلەرزێ و بڵێ
دەستی زۆردار سەد سەر ئەکا ناگاتە دڵێ

ئەم چیرۆکە دراماتیکییە بەتراجیدیا کۆتایی پێ دێ. بۆ بەختی ئاغا ڕۆژێ لە ڕۆژان کوڕی شوان لە ناو باغدا لە ژێر سێبەری دارێک خەوی لێ دەکەوێ. هەل بۆ نۆکەری ئاغا هەڵدەکەوێ و بەگوللەیێک کۆتایی بەژیانی ئەو کوڕە دێنێ، بەدبەختی بۆ کچی جووتیار دەمێنێتەوە. هەرچی ناز و نیعمەت و خۆشیی ژیان هەیە ئەوەی بۆ کچی جووتیار ماوەتەوە هەمووی بایی یەک دڵۆپ فرمێسکی تازەیە لە ناو چاویدا قەتیس ماوە و دەڵێ: دەستی زۆردار سەد سەر ئەکا ناگاتە دڵێ.

## کوردایەتی

١

لە قەسیدەی بەناوی «کوردستان»ەوە گۆران دەڵێ:

کوردستان! جێگامی جێی هەزار ساڵەم
پەروەردەی ئەم دۆڵ و سەرلووتکە و یاڵەم
هەناسەم تێر بوونی بای کوێستانتە
دوو لێووم پاراوی بەفراوانتە
سەرنجم ڕاهاتووی زیوی زەرکەفتە
بە زەردەی سەر بەفری ئێوارە وەختە
گوێم فێرە بیستنی خوڕەی قەڵبەزە
لەو عاستەی ژوور بەفرە داوێن گیای سەوزە
زمانم پشکووتووی قسەی جوانتە
قسەی ناو گۆرانی شاخەکانتە
هی ناو چیرۆکی گوێ ئاگردانتە
هی ناو لایلایەی مناڵانتە
قوڵپێ با خوێنی ناو دەمارەکانم
بە زەبری عەشقی تۆ ئەیدا ئەزانم

عەشقی تۆ ئەی دایکی خۆم و هاوخوێنم
هەر لە پشتی باوکا چووە هەوێنم
ئەشچیتە هەوێنی کوڕ و کوڕەزا
تا تاقێ کورد مابێ لە چیای بەرزا

ئەم شیعرەی گۆران موناجاتێکە لەگەڵ خاکدا دەیکا. ئەو خاکەی لە پێش گۆراندا بووە. چارەنووس وای کردووە لەو خاکەدا پەیدا ببێ و بەهەموو جەوهەرەکانی ئەو پەروەردە ببێ. سروشتی کوردستان دروستی کردووە و پێی گەیاندووە. هەناسەی بای کوردستانە، گوێی فێری ئاوازی قەڵبەزی ئەوێیە، زمانی بە وشەی جوانی کوردی کراوەتەوە. گۆران دەڵێ کورد لە پێشانا بووە، باب و باپیرانی بەڵگەی ئەون، ئێستاش خۆی ڕەمزی ئەوانە، لە دوارۆژیشدا دەمێنێ و گیانی کوردایەتی دەچێتە ناو خوێن و دەماری منداڵەکانییەوە.

ئەوجا دێتە سەر وەسفی دواکەوتوویی ئەو کوردستانە:

کوردستان! ئەگەرچی دوورە دنیای تۆ
دۆڵ و دارستانی چۆڵ و تەنیای تۆ
دووری لە شارستان لە ژینی تازە
لە شەوی ڕووناک و پڕ لە ئاوازە
پڕ لە پێکەنین و پڕ لە نەنوستن
پڕ لە سوورانەوە و پڕ لە کۆڕ بەستن
ئەگەرچی تۆ دووری لە ڕۆژی شاران
ڕۆژی پڕ لە گەردش هات و چۆ و جوولان
ڕۆژی پڕ لە زانست پڕ لە فەننی جوان
کتێب و ڕۆژنامە هەیکەل و مەیدان
ڕۆژی پڕ لە خۆراک بۆ گیان و بۆ لەش
ڕۆژی پڕ لە ئافرەت پڕ لە باغچەی گەش
ئەگەرچی تۆ دووری لەم گشت جوانییە
جوانییێکی تر هەیە کوردستانییە
جوانییێک کە دەستی هونەری یەزدان
نەخشی کێشاوە نەک سەلیقەی فەننان



جوانییێک کۆن نابێ هەرگیزا و هەرگیز
زستان و بەهار و هاوین و پاییز
جوانی شاخی سەخت و دۆڵی قووڵ و مەنگ
ملەی بەرز پلەی خز دەربەندانی تەنگ
مێرگی سەوز چەمی خوڕ دارستانی چڕ
دێی بناری دەشتی پەناگردی خڕ
دەعبای ناو ئەشکەوت و ماسی گۆمی شین
باڵداری ڕەنگاوڕەنگ پەپوولەی نەخشین

لەم دێڕانەدا گۆران بەراورد لە نێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیریی میللەتی کورد و سروشتی خۆڕسکی کوردستان دەکا، هەرچەندە لە یەکەمیاندا دواکەوتووە، بایی خۆی بەختیاری لە ژیاندا وەرنەگرتووە، بەڵام ئەمە لای گۆران خۆشەویستی بەرامبەر بەخاک زیاتر کردووە، چونکە جوانییەکە خۆڕسکە و هونەری یەزدانی دروستی کردووە و هەرگیز کۆن نابێ. شاخ و دۆڵ و مێرگ و چەم و دارستان، تەنانەت لە ئاژەڵی کێوی و مەل و باڵندە و پەپوولەش دەوڵەمەندە.

گۆران بەم دێڕانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

بەڵێ ئەگەر بێتو ڕۆژێ لە ڕۆژان
لە کۆشتا لێک بدەن جوانی هەردووکیان
ئەو حەلە سەرانسەر ئەبێتە بەهەشت
لە لووتکەی شاخەوە تا پانایی دەشت
کوردستان! کوردستانی جوان
درەنگیش بێتە دی ئاواتی (گۆران)
دەربەست نیم سێبەری پیرە دار بەڕووم
ئەو تاوەی ئەشکێنێ تاسە و ئارەزووم
کە ماویە ڕۆژی زەرد بگاتە دەم کەل
لای ژوورووی سەرتەوە ئەجریوێنێ مەل
پۆلی ژن زەرد و سوور ئەکشێ بۆ ناوڕان
شوان ئەڵێ بە شمشاڵ: هەوری لار ئامان

بەڵام ئەگەر بێتو بە دووچاوی خۆم
بتوانم ببینم بەری هیوای تۆم
ئەو حەلە کوردستانی جوان!
هەڵپەڕین لە من و بەستە لە ژیان

لەم دێڕانەدا جوانیی شیعرەکە دەگاتە لووتکە، لەو کاتەی گۆران دەڵێ ئەگەر بێتو لە دوارۆژدا ئەم دوو مەرجە لێک بدرێن کوردستانێکی ئاوەدان دروست دەبێ. مەرجەکان یەکێکیان دەسکردە، سازدان و بیناکردنی کۆمەڵێکی پێشکەوتوو و بەختیار لە هەموو لایەنێکی ژیانەوە. ئەو جوانییە بێ هاوتایەی سروشت داویەتییە ئەو خاکە، ئەو کاتە ئاواتی دێرینی گۆران دێتە دی. ئەمەیان گرنگ نییە ئەمڕۆ بێ یا سبەی. گۆران ئارەزوو دەکا لە ژیاندا ئەو کوردستانە سەربەستە و میللەتی کوردە بەختیارە ببینێ، ئەگەر خوا و ڕاستان ئەمە لە ژیانی گۆراندا بێتە دی ئەو کاتە لە خۆشیانا هەڵدەپەڕێ و ژیانی ئازادی و بەختیاری گۆرانییان بۆ دەڵێ.

## ٢

گۆران لە خاک و نەتەوەوە ڕوو لە سامانی هونەری دەکا و نەمری دەداتە کاری شمشاڵ ژەنێک بەناوی «دەروێش عەبدوڵڵا»وە:

بە ڕەنگی زەرد و شێوەی دەست و شمشاڵی کزا دەروێش
حەزم کرد بەستەیێک ببیەم سەراسەر حوزن و ماتەم بێ
لە سیماتا بە دیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێش
وەها دیارە کە بەختت ئاشیانی بلبلی غەم بێ

***

بەڵێ دیارە لە ناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەتکار
وەکو عەکسی قەمەر وایە لە ناو حەوزێکی لیخندا
بەڵام تەختی ڕەفاه و تاجی حورمەت میللەتی هوشیار
بە ئوستادێ ئەدا وەک تۆ لە ناو شمشاڵی کونکوندا

***

سەحەر بێنێتە گریان و قسە سیحری پەری نەغمە
برای دەروێش! ئەزانم بۆ مەعیشەت وێڵ و ئاوارەی



بە زەهری ناعیلاجیتە لە ناکەس ویستنی لوقمە
بە مردنتە کە گوێی ناشی ئەخنکێنێ خرۆشی نەی

***

بەڵام چی بکەین لە ناو چاوی ڕەشی بەعزێ زکای گەورە
وەکو تۆوی گوڵی دەم با لەسەر بەردێکی ڕەق ئەڕوێن
ئەگەر خیلقەت نەسیبی عومری تۆی مەحکوومی ئەو دەورە
نەکردایە خوا عالم لە کام عەرشت ئەسوو داوێن

***

نە حەرفی مەکتەبێکت خوێند نە ئوستادێ پەلی گرتی
سیرف بەرزی زەکا ئەم سنعەتەی فێر کرد بە شمشاڵت
هەموو وەزنێکی گۆرانی لە توولانی هەتا کورتی
بەسەر پەنجەی هونەر کردت بە دیلی کۆششی زاڵت

***

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقا خرۆشی ڕووحی بێگانە
میزاجی کوردەواریم تێکچووە دەروێش عەبدوڵڵا
دەخیلت بم دەسا بەو لاوک و ئای ئای و حەیرانە
شەپۆلی زەوقی میللی پڕ دەروونی مات و چۆڵم کە
لە بیتەهۆڤن گەلێ زیاتر بە ڕووحم ئاشنای وەڵڵا
دە ئەی دەروێش سکالایێک لەگەڵ ڕووحی کڵۆڵم کە

لەم شیعرە ڕیالیزمییە تازەیەی قانگ دراو بەڕۆمانتیزم گۆران گەیشتۆتە لووتکەی داهێنان. سەنگی تای لایێکی تەرازووەکەی هونەری مۆسیقایە، لایەکەی دیکەی دواکەوتوویی میللەتی کوردە.

دەروێشێکی نەخۆشی ڕەنگ زەرد شمشاڵ دەژەنێ، لە ناو کۆمەڵدا نرخێکی وای نییە، بەهونەرەکەی بەڕێوە دەچێ. ئەگەر لە میللەتێکی پێشکەوتوو بوایە خودا خۆی دەیزانی چی هونەرمەندێکی گەورەی لێ دەردەچوو. دەروێش نەخوێندەوارە بەڵام بەهرەی هەیە. ئەگەر خوێندەوار بوایە نەک تەنیا شمشاڵی دەژەنی، بەڵکوو دەبوو بەمامۆستای مۆسیقای شمشاڵ لە ئەکادیمییەی هونەرە جوانەکاندا.

لەم شیعرەدا گۆران لە بەراوردە هونەرییە جوانەکانی ناکەوێ. لەو کاتەی لە دەروێش عەبدوڵڵا دەدوێ ناوی بیتهۆڤن دەبا. چونکە لاوک و حەیرانی دەروێش دەبیزوێنێ ئەمەش مانای ئەوە نییە ئاوازەکانی بیتهۆڤنی پێ خۆش نییە، بەڵکو ئاوازی میللی دەروێشی پێ خۆشترە، چونکە کوردانەیە و لە گیانی نزیکترە.

٣

لە شیعرێکیدا گۆران ئاوڕ لە مێژووی کۆنی ئەرکیۆلۆجی و مێژووی ئەفسانەیی نەژادی کورد دەداتەوە:

ئەژدەهاک! زیندانت قەڵا قەڵایە
دیواری کۆنکرێت دەرگای پۆڵایە
ئەژدەهاک! کون بڕە سەختە زیندانت
ناڕووشێ بە بڕەبڕ بەندی گرانت
هێزی لەش مرینە کۆت و زنجیرت
کارییە لە دەمار ناپاکی بیرت
دڵ ڕەقییت هەر تاوە چەشنە سزایە
بۆ بەندی خاوەن هۆش ئەخاتە کایە
هێند چەشن سەربڕ و زیندانەوانت
سەرخۆشن بە خوێنی گشت بەندییەکانت
ئەژدەهاک! ئەی دێوی لە بیر زراو چوو
ئەی ناشتای مارانت بە مێشک کردوو
ئەو مێشک تازانەی زنجیرت کردوون
لە لێوی پێچاڵی مەرگا ڕاتگرتوون
چاوەڕێی فەرمانن بەڕێی نەهاتا
ببڕێنە بەر تەناف لە نۆرە و کاتا
مێشکیان ئامانجیان هیوا و تاسەیان
لە پەتا بتاسێ وەک هەناسەیان
ئەمانە گشت ئەڕۆن ئەیانڕەوێنی
هیچ نەبێ لە بەندا ئەیانڕزێنی



لەم لیریکەدا گۆران بەسەرهاتی چیرۆکی ئەفسانەیی کاوەی ئاسنگەر و زەحاک دەگێڕێتەوە. ئەو شاهە خوێنڕێژە دوو مار لەسەر شانی ڕوابوون، هەموو ڕۆژێ دەبوو مێشکی دوو لاو بکرێ بەخۆراکی مارەکان. گۆران لەو زیندانانە دەدوێ کە لاوانی تێدا بەند کردبوون، وەسفی ئەو وەردیانە خوێنڕێژ و پیاوکوژانە دەکا کە ئازاری خەڵکیان دەدا. شاعیر ڕوو دەکاتە زەحاک و پێی دەڵێ ئەوەی ئارەزووی دەکەی لە خراپە بۆت دەکرێ، دەکوژی دەبڕی، بەڵام هەتا سەر نییە:

بەڵام تۆ ئەژدەهاک! لە هەڵپەی خۆراک
ناتوانی بکەوی بۆ ماری ناپاک
هەر ئەگری ئەکوژی ئەدەی لە گەردن
مێشک دەرخوارد ئەدەی بەماری نەوسن
تا ڕۆژێک ئەو خوێنەی بەناهەق ڕشتت
ئەو بیرەی وات زانی ئێجگاری کوشتت
تاو ئەدەن تەنووری دەماری کاوە
ئەو چەکوش وەشێنەی ڕۆڵە کوژراوە
ئەخرۆشێ ئەجۆشێ و کۆمەڵ یەک ئەخا
هەر هەڵساو ئەبینی زیندانت ڕووخا
ئەو حەلە هەر لاوێ لە زیندانتا مرد
ئەبێتە مایەی بەخ بۆ نەتەوەی کورد
لە بنکەی پەیکەریا ئەنووسرێ ناوی
لەگەڵ گشت کردەوەی پەسەندکراوی

گۆران لەوە دڵنیایە ئەم زۆرداری و کوشتن و بڕینە تا سەر نابێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان چەکوش وەشێنێکی وەکو کاوەی ئاسنگەر پەیدا دەبێ و گەل دوای دەکەوێ و خەڵکی لەم ڕۆژە ڕەشانە ڕزگارییان دەبێ. گۆران مەبەسی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەخاتە قاڵبی جوانکارییەوە. گێڕانەوەی ڕووداوی ئەفسانەیی شۆڕشگێڕی، بەڵگەیێکە گۆران دەیهێنێتەوە بۆ ئەوەی بڵێ ڕزگاریی نەتەوایەتی لە سەردەمی ئێستاش بەشۆڕش نەبێ سەرناکەوێ. ئەم بیروڕایانە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا تا پلەیێک ڕاست بوون، بۆ ئێستای هەموو پارچەکانی کوردستان وەکو یەک لەوانەیە ڕاست نەبێ.

## ستایشی مەلیک فەیسەڵی یەکەم و عەبدولکەریم قاسم

لە ژیانی ئەدەبیی گۆران و دیوانی شیعری ئەو ڕاستییە دەکەوێتە بەرچاو جگە لە هەندێ هاوڕێی نزیک و چەند شاعیر و ڕۆشنبیرێکی سەردەمی خۆی ستایشی کەسی دیکەی نەکردووە لە گەورەپیاوان و ناودارانی مێژوو، کەچی لە ڕاستیدا ستایشی دوو کەسی ناوداری کردووە لە بەڕێوەبەرانی دەوڵەتی عیراق، یەکەمیان مەلیک فەیسەڵی یەکەم و دووەمیان عەبدولکەریم قاسم.

١

لە شیعرێکیدا بۆ مەلیک فەیسەڵی یەکەم دەڵێ:

فەیسەڵی ئەووەل مەفخەری دووەل
هەروەکو ڕۆژە لە بورجی حەمەل
جالیسی تەختی خولەفای عەبباسی
بە عەدل و ئینساف بە خوا شناسی
بانگی نکیسا و نەغمەی داوودی
لە بۆت دەخوێنن بە کوردی پەتی
هەر بژی وەتەن هەر بژی عیراق
یاخوا وەشمان دوور بێ لە نیفاق

لە کاتی خۆیدا کە مەلیک فەیسەڵ چووە بۆ هەڵەبجە گۆران لەوێ مامۆستای قوتابخانە بووە، ئەم شیعرەی بۆ پیرۆزیی هاتنی مەلیک هۆنیوەتەوە. دوو قوتابی فێر کردووە و پێیانی لەبەر کردووە، لە کاتی هاتنی مەلیک خوێندوویانەتەوە. ئەم شیعرە لەو دوو قوتابییە وەرگیراوە.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا بۆ عەبدولکەریم قاسم دەڵێ:

گوللەی ناپاک گوللەی نامەرد
ویستی سەوزیم بکا بە زەرد
ویستی ڕۆژی چواردەی تەمووز
ڕەش کاتەوە و بیکا بە گەرد



ویستی درەختی جومهووری
ڕیشەکێش کا
دڵی گەلی وولاتەکەم خوار و ژووری
پڕ لە ئێش کا

***

بەڵام گەل کەریمی ئەوێ
مایەی دڵخۆشیمی ئەوێ
بەو ئارەقی ڕەشەی ڕشتم
گەشەی جومهووریمی ئەوێ
گەل ئەیەوێ هەر درێژ بێ
عومری زەعیم
سێ زامەکەی شان و باڵی زوو سارێژ بێ
عەبدولکەریم

***

مژدەی سارێژی برینە
ئەم ئاهەنگ و پێکەنینە
سەرانسەری خاکی عیراق
گەرمی شایی و هەڵپەڕینە
کام گۆرانی زۆر شیرینە
لەم سەردەمە
تا چریکەی لێ هەڵبڕین ئەی کوردینە
هێشتا کەمە

گۆران ئەم شیعرەی لەو کاتەدا هۆنیوەتەوە کە لە ساڵی ١٩٥٩ دەست درێژی کرایە سەر عەبدولکەریم قاسم و لە ئەنجامدا بریندار بوو، بەڵام زوو برینەکەی سارێژ بووەوە. ئەم شیعرە دوایی لە لایەن هونەرمەندی مۆسیقار قادر دیلانەوە ئاوازی بۆ دانرا و بوو بەگۆرانی.

لەم شیعرەدا ماکی جوانکاری هەیە، بۆ ئەو کاتەی لە ڕووی سیاسییەوە گلەیی لە گۆران

ناکرێ بۆ دانانی ئەم شیعرە، چونکە عەبدولکەریم قاسم پیاوی چاک بوو، کە لە دواییدا گۆڕا، ئەمە کارێکی دیکەیە. لەبەرئەوە نازانرێ بڵاوکەرەوەکانی دیوانی گۆران ئەم شیعرەیان لەبەرچی تۆمار نەکردووە! (بۆ یەکەم جار لە کۆواری «بڵێسە»، ژ ٣، ساڵ ١، تشرینی یەکەم ١٩٥٩ بڵاوکراوەتەوە).

### بۆ ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨

گۆران یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی زۆرترین شیعری بۆ ستایش و پێداهەڵدانی کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی بەغدای وتووە. لە یەکەمین پێشوازی کردنی بەشیعر لەم ڕووداوە لە لیریکێکیدا بەناوی «لە زیندانا چواردەی تەمووز» شاعیر دەڵێ:

دەنگێکی دوور
دوور ئێجگار دوور
بە ئاستەمێک ئەگاتە ژوور
ئەی دەنگی دوور
بە ئاستەمێک ئەگەیتە ژوور
ئاخۆ سپیت یان ڕەش یان سوور!
وەرە پێشتر
چۆن ئاو ئەڕژێتە ناو ئاگر
لە ڕێی گوێوە بڕژێرە گیان
زیندانم پڕ کە لە کوڵ دان
زنجیری پێ
کپ بە تاوێ وەک لۆکەی گوێ
هەوای شڵەقاوی زیندان
بنوو وەک بەر مەمکان ئەنوێ
با دەستڕێژی ئەم دەنگەی دەر
گوللەی مانای گوێم بپێکێ
بەڵکو گڕەی تینوێتی سەر
وەک تۆپ ناڵەی بێ و بتەقێ

***



لە لێشاوی غەڵبە غەڵبا
بانگێکی دا لە گوێچکەم با
(ڕژێمی جومهووری بژی)
خەو ئەبینم جومهووری چی
نەء خەو نییە
شایلۆغانی جومهوورییە
ئەم دەنگە مژدەی دوورییە
سا لەشی زیندانی مردوو
بێرە سەما
ئەی لە بستێ گۆڕا زیندوو
مردن نەما

لە کاتی هەڵگیرسانی کوودیتاکە گۆران لە بەندیخانەی بەعقووبە بوو، کە گوێی لە هەواڵەکە بووە بەڕادیۆ بەم شیعرە پێشوازی کردووە. شاعیر یەکێک بووە لەوانەی بەکوڵ لایەنگری گۆڕانی بنچینەیی بوون لە عیراقدا، چونکە لە پێش هەموو شتێکدا دەرگای بەندیخانەکان لە پێش خۆی و هاوڕێکانی دەکرێنەوە و دەگەڕێنەوە گێتیی ئازادی.

ئەو ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوە فەنتازیا بوو، لەبەرئەوە شیعرەکەی گۆرانیش بوو بەخەیاڵ، یا خەونێک ئەگەر زۆر خۆشیش بووبێ کابرا کە لە خەو هەڵساوە هەموو گیانی قورس بووە. گۆرانیش ئەم ڕووداوەی بەخەون زانیوە، بەڵام لە دواییدا کە هوشیار بۆتەوە ڕاستی بۆ دەرکەوتووە لەو کاتەی گوێی لە ڕادیۆ بووە وتوویەتی: «ئێرە ڕادیۆی جومهوورییەتی عیراقە».

### کۆمیدیای دادگاکردنی مام چەوەندەر

یەکێ لە پیەسە کورتەکانی گۆران ئەو پیەسە ساتیرییەیە بەناوی «موحاکەمەی مام چەوەندەر». پیەسەکە لە ساڵی ١٩٥٣ لە سلێمانی نووسراوەتەوە:

«پەردە هەڵکشا و سالۆنی موحاکەمە
بەدەستەی تەواوەوە کەوتە بەرچاو»

## ١- موحاکەمە

ناوت چییە؟ — مام چەوەندەر
لە کوێوە دێی؟ — لە دەشت و دەر
بەچی هاتی؟ — بەپشتی کەر
کێ هانیتی؟ — لالە ڕەنجدەر
چۆنی هانیت؟ — بەدەردی سەر
بۆ کێی هانیت؟ — ئاغای سێبەر
ئاغا چی ووت؟ — ئیللا گێزەر
کەڵکی نەگرت — تکای ڕەنجدەر
بەر شەقیان دا — دەستەی نۆکەر
ئیللا گێزەر — ئیللا گێزەر

## ٢- بڕیار

بەڵێ مادام لالە ڕەنجدەر
بۆی نەگونجا لە چەوەندەر
بارە گێزەر بێنێتە بەر
وا دامان نا بە تاوانکەر
یەڵڵا پۆلیس بیدەنە بەر
لەشی کوت کەن بەخەنجەر

«پەردە داکشا و ئیتر کەس نەیزانی
مام چەوەندەریش چی بەسەرهات»

ئەم پیەسە نموونەیێکە لەو جۆرە شیعرەی گۆران لە ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپاوە گواستوویەتییەوە ناو ئەدەبی کوردی. بەشێک لەو پیەسانەی سیاسی بوون لە خزمەتی دروشمی ڕۆژانەی هەندێ ڕێکخراویان دەکرد زیاتر لەوەی داهێنانی هونەرییان تێدا بێ. هەندێکی دیکەی جوان بوون، پێکەنینیان دەهێنایە هەموو لایێک، کێش و قافیەی سووکیش بەزمی دەگەیاندە گوێی منداڵان.



## شیعر بۆ منداڵان

گۆران شیعری زۆری وتووە بۆ منداڵان، هەندێ لە سروودە نیشتمانییەکانیش دەچنە ناو ئەم بەشەوە:

١

لە سروودی «گۆرانیی کەو»دا شاعیر دەڵێ:

قەقبە قەقبە قەقبە قەق
شاخی بەرز و بەردی ڕەق
جێگای چێڵە و جێگا بەق
قەقبە قەقبە قەقبە قەق
بەفری تازە و بەفری پار
نابڕێ لە لووتکە و نزار
نە پاییز و نە بەهار
قەقبە قەقبە قەقبە قەق
بەر بەرۆچکەی ئەشکەوتم
زستان جێگای سرەوتم
مەڵبەندی چینە و ڕەوتم
قەقبە قەقبە قەقبە قەق
ڕائەپەڕم بەربەیان
هەڵئەکێشم بۆ لووتکەی جوان
ئەخوێنم ڕوو لە ئاسمان
قەقبە قەقبە قەقبە قەق
مەهی هەزار بە هەزار
بە یەک گڤەی بەرەو خوار
ئەبەڕم لە ترسی زۆردار
قەقبە قەقبە قەقبە قەق
فجووق! لە داڵی چاو زەق

قغ! لە ڕاوکـــــــەری دڵڕەق
لە تفـــەنگ و تەقـــە تەق
قـەقـبـە قـەقـبـە قـەقـبـە قـەق
گشت ئێوارە و گشت شەبەق
شـاخ پڕ ئەکـەین چێڵ و بەق
لە جیرکە جیڕ قەق قەق قەق!

لەم شیعرەدا گۆران بەزمانی یا «قەقبـە»ی کەو قسە دەکا. نیوە دێڕێک دەکا بەناوی دەنگی کەو. بۆ ئەم مەبەسە کێشی خۆماڵی حەوت بڕگەیی بەکارهێناوە، ئەمە کێشی گـۆرانیی منداڵانە، کـێـشی «هەلوور بەلوور تەکـامـە»ی ئەدەبی مـیللیی سـەرزاری بەناوبانگە. لەو شـیـعـرەدا گـۆران ڕەچاوی ئەوەی کـردووە کـێش سـووک بێ، هەروەها دووبارەکـردنەوەی نیـوە دێڕی دوایی هەمـوو چوارینێک کـە پڕە لە دەنگی «ق» جـۆرە مـۆسـیـقـاییێک دەگەیەنێـتە بەر گوێی منداڵ. شـاعـیـر بایەخی زۆری بەناوەرۆک نەداوە. بەگشتی ناوەرۆکی ئەم جۆرە شیعرانەی سەرنج ڕاکێشەر نین.

٢

لە شیعری «بەفر»دا گۆران دەڵێ:

ئای بابە گیان! بەفر ئەبارێ تەماشا
جێگا نەما پێیێک دانێی لە حەوشا
کڵۆ کڵۆ دێتە خوارێ سپی و جوان
دەنکە دەنکەش با ئەیهێنێ بۆ هەیوان
ئەڵێی ووردەپەڕی سـپی دەعـبـایە
یا لێـشـاوی پەپوولەی ناو هەوایە
ئەها بابە! ئەو ڕیشـــۆڵە هەژارە
کز کز نیشتۆتەوە لەو بن پاسارە
ئێستا مشتێ گەنم دێنم ڕۆی دەکەم
بابێ بیخوا و نەجاتی بێ لە ماتەم

ئەم شیعرە قشتۆکە جوانە یەکێکە لە لیریکە نایابەکانی گۆران بۆ منداڵان هۆنراوەتەوە. ئەم پارچەیە یەکێکە لەو شیعرانەی لە کاتی خۆیدا دانراون لە ماوەی جەنگی دووەمی



گێتیی سەدەی بیستەم لەو کاتەی گۆران لە ئێستگەی ڕۆژهەڵاتی نزیک لە شاری یافای فەلەستین کاری دەکرد. شەوێکی چلەی زستانی هەولێر بەفر دەباری، ڕێکەوتێکی سەیر بوو، ڕادیۆ وتی: قوتابیانی کوردی خۆشەویست، قەڵەم و کاغەز ئامادە بکەن. لە پاش ماوەیێک لەسەرخۆ ئەم شیعرە خوێندرایەوە و قوتابییانی منداڵ تۆماریان کرد.

## یەکەم نامەی شیعری لە کەرکووکەوە بۆ دایکی

گۆران ئەم شیعرەی لە ساڵی ١٩٢١ لە کەرکوکەوە بۆ دایکی ناردووە:

ئەی دایە ئەگـــەر ئەپرسی حـــاڵم
ئێ! تۆیش وەکو باقی بێ ڕەحم نیت
تۆزقـــاڵێ کـــەمی ڕەحم ئەزانیت
ڕاســـتی شـــەو و ڕۆژ هەر دەناڵم

***

دەگـریم و دەسـووتێم هەروەکـو مـۆم
ئاهم ئەگـاتە گـۆشی گـەردوون
مـات و کز و مـەلوول و مـەحزوون
بۆ حـاڵی غـەریبی بێکەسی خـۆم

گۆران کە ئەم شیعرەی نووسیوە مێردمنداڵ بووە، هەموو مەرجێکی شیعری تێدا هەیە، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە بەرهەمی هونەری بەکامڵی لە دایک دەبێ. پەرەسەندن و گۆڕان و پێشکەوتنی تێدا نییە لە چێژ و خەیاڵ، تەنیا لە ناوەرۆکدا هەیە. ئەم شیعرە بەرزە، چونکە هەست و نەستی تێدایە، فرمێسکی ئاوارەیی و دوورکەوتنەوەی تێدایە، زانست و زانیاری و عەقڵی تەرکیبی تێدا نییە، چونکە گۆران منداڵ بووە کە ئەم شیعرەی وتووە.

***

عەبدوڵڵا سلێمان گۆران لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم و سەرەتای نیوەی دووەمی یەکێک بوو لە شاعیرە دیارەکانی ئەدەبی کوردی. لە ڕووی ئەدەبییەوە ئەو سەردەمە گرنگەی بەسەر کردەوە، لە هەرسێ قۆناغی دامەزراندن و گواستنەوە و نوێکردنەوە دەوری باڵای هەبوو. بەپێچەوانەی شاعیرانی دیکە بوو ئەوانەی تا دوایی قاڵبی کۆنیان هێشتەوە و نوێگەرییان لە ناو ئەو قاڵبەدا کرد و بەرهەمە شێوە کلاسیکییەکەیان زاڵ بوو بەسەر نوێگەرییەکەیانەوە. گۆران لە سەرەتادا دەری خست شاعیرێکی بەتوانای قوتابخانەی

نالییە، هەندێ شیعری باشی هێنایە ناو ئەدەبی کوردییەوە. چاکی کرد ئەو شیعرەی کەم بوو. ئینجا قۆناغی گواستنەوە کە خۆی ناوی نابوو لاسایی شیعری نوێ یا ڕۆمانتیکی عوسمانی، لەم مەیدانەشدا ئەوەی دەرخست کە وەستایە. باش بوو لەم جۆرە شیعرەش زۆری نەووت. ئیتر کەوتە سەر نوێگەری، زۆربەی شیعری دەچێتە ئەم خانەیەوە.

گۆران بەبڕیار لە کێش و قافیەیێک نەگەڕاوە لە شیعریدا بەکاریان بێنێ. زمانی بەهێز بووە، ئەگەر هەندێ ڕستە و وشەی نەبیستراویشی بەکارهێنا بێ لە شیعریدا لە دواییدا دەبوون بەئاسایی. پارێزگاریی ڕوخساری شیعری کلاسیکی کردووە، هی تازەی دروست کردووە و هەندێکی ئەوروپاشی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

شێوازی شیعری گۆران ئاسان و ساکارە، مانای ڕستە لە وشە وەردەگیرێ، بەزۆری بەمانا فەرهەنگییەکەی، لە ژێر مانا گشتییەکە هیچ جۆرە ماناییێکی نهێنی نییە. ڕاستە وەسفی ژن و سروشت لای گۆران مەتریالییانە یا فۆتۆگرافیانەیە، بەڵام ئەو لە پەیکەری ئەو ژنەی وەسفی دەکا یا ئەو دیمەنەی وێنەی دەکێشێ پەیکەرێک و وێنەییێکی تازەی هونەراوی دروست دەکا. لەبەرئەوەیە دڵداریی گۆران لە سۆفیزم دوور کەوتۆتەوە و دەچێتە خانەی دڵداریی مەجازییەوە.

گۆران شاعیری ژیانی کوردەواری بوو، هەموو لایەنێکی دەور کردبووەوە. ژنی شۆخ و جوانیی سروشت و چارەنووسی کورد و ناگزووری و نایەکسانی ناو کۆمەڵ گرێی هونەری ئەم شاعیرە بوو. لە داهێنانی شیعریدا گەیشتە لوتکەی شاخی پیرناس. بەرهەمی بەرزی لە جوانیی ژن و سروشت و کوردایەتی و ناگزووریی ناو کۆمەڵ لە ساڵانی **١٩٤٩ – ١٩٥٠** گەیشتە پۆپە.

«بووکێکی ناکام» و «شەوێک لە عەبدوڵڵا» بوون بەرەمزی لووتکەی شیعری گۆران. لە دوای ئەمە گۆران بەرەو خوار بووەوە کە لە ناوەرۆکە بنچینەییەکەی خۆی لای دا و ناوەرۆکی تازەی بۆ خۆی دۆزییەوە. هەرچەندە ئەمەش بەرهەمێک بوو داهێنانی تێدا بوو، بەڵام کاری گۆران نەبوو. ئەو بۆ ناوەرۆکی «ئافرەت و جوانی» و سروشتی کوردستان و خەیاڵی ڕۆمانتیکی خوڵقا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمی قۆناغی دووەمی گۆران هەموویان ناچنە ناو خانەکانی خوارەوەی «قژ کاڵی لێو ئاڵی»یەوە. بەڵکو هەندێکیان لە لوتکە دەمێننەوە. هەندێ لە شاعیرە هەرە گەورەکانی گێتی وەکو ولیەم شکسپیر و جۆن میلتۆن لەو شاعیرانە بوون لە «هاملێت» و «بەهەشتی وون بوو» گەیشتنە لوتکە و لە دوای ئەوە بەرەو خواربوونەوە.



هەرچۆنێ بێ گۆران یەکێکە لەو شاعیرە گەورانەی دەوری باڵایان بووە لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە نێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی گێتیی سەدەی بیستەم لە کوردستانی خواروودا.

# لیستی ناوی کەسان

# لیستی ناوی جوگرافی

## بیبلیۆگرافیا

ناوی کۆمەڵێک سەرچاوە لەم لیستەیە و لیستەی بەرگی داهاتوو (حەوتەم) هاتووە بەزمانی کوردی لە قەفقاسی ڕووسیا (ئەرمەنستان) بڵاوکراونەتەوە. ئەوانەی پێش جەنگی دووەمی گێتی چاپ کراون بەئەلفوبێی تیپی لاتینی نووسراون، ئەوانەی پاش جەنگ بەتیپی سلاڤی (کیریلی). لێرەدا ئەو سەرچاوانە بەئەلفوبێی عەرەبی نووسراونەتەوە.


- ئۆرخانی غالب، نەمریی لە ئەدەبدا، سوێد، ١٩٩٨.
- بارانی سلێمانی، بەرهەمی بڵاونەکراوە و لە یادکراوی محەمەد ساڵح دیلان، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، هەولێر، ٢٠٠١.
- باغی کوردا، سەرجەمی دیوانا ئەحمەدێ ناڵبەند، پێداچوون و ڕاستڤەکرن ڕەشید فندی، ئیسماعیل بادی، محەمەد عەبدوڵلا، پێنج بەرگ، دهۆک، ١٩٩٨.
- پاشمەرگەی قانیع، کۆکردنەوەی وریا قانیع، سلێمانی، ١٩٧٠.
- تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٢٩.
- تۆفیق وەهبی، خوێندەواری باو، بەغدا، ١٩٣٣.
- تۆفیق وەهبی، قسنێک لە کوردستاندا، بەغدا، ١٩٤٧.
- تۆفیق وەهبی، بەیان حقیقەت، بەغدا، ١٩٤١.
- پۆیێمێد کوردایە سۆڤێتی بێ، حازرکر ئەمینی عەبدال، یەریڤان، ١٩٦٢.
- دیوانی ئاوات، سەید کامیلی ئیمامی زەنبیلی - کامیل شا، لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی سەید نەجمەدینی ئەنیسی، مەهاباد، ٢٠٠٢.
- دیوانی ئەسعەد مەحوی، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی عەبدوڵلا ئاگرین، هەولێر، ٢٠٠٤.
- دیوانی ئەسیری، کۆکردنەوەی مستەفا عەسکەری، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٧؛ بەرگی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- دیوانی ئەمین ئوشنوییی، لەسەر ئەرک و تێکۆشانی ئەحمەد بەلەدی، ورمێ، ١٩٩٨.
- دیوانی ئەوڕەحمان بەگی بابان (بابە)، ئامادەکردنی مەحموود ئەحمەد محەمەد، بەغدا، ١٩٨٩.
- دیوانی بێخود، کۆکردنەوە و ڕێکخستن و لەسەر نووسینی محەممەدی مەلا کەریم، بەغدا، ١٩٧٠.
- دیوانی چروستانی، ئامادەکردن و لێکدانەوەی عەبدولڕەحیم چروستانی و ساڵح چروستانی، سلێمانی، ١٩٨٥.
- دیوانی حەقیقی، (مرکز نشر فرهنگ وادبیات کردی)، ورمێ، ١٩٨٨.
- دیوانی خادیم، ئامادەکردن و ساغکردنەوەی جەمال محەمەد محەمەدئەمین، بەغدا، بەرگی یەکەم ١٩٨٠؛ بەرگی دووەم ١٩٨١.
- دیوانی سەلام، بەغدا، چاپی یەکەم، ١٩٥٨؛ چاپی دووەم، ١٩٩١.
- دیوانی شاهۆ، ئامادەکردنی محەمەدئەمین کاردۆخی، سلێمانی، بەرگی یەکەم ١٩٧٦؛ بەرگی دووەم ١٩٨٠.
- دیوانی قانیع، کۆکردنەوەی بورهان قانیع، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٤؛ چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٧٩.
- دیوانی کانی، کۆکردنەوەی موەفەق ئەکرەم کانی، بەغدا، ١٩٨٠.
- دیوانی کەمالی، ئامادەکردن و ساغکردنەوەی کەمالی عەلی باپیر، بەغدا، ١٩٨٦.
- دیوانی گۆران، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی محەممەدی مەلا کەریم، بەغدا، ١٩٨٠.
- دیوانی مەلا حەسەنی جەوهەری، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی عومەری خوسرەوی، مەهاباد، ١٩٥٦.
- دیوانی مفتی پێنجوینی، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا و عەبدولکەریم مفتی، پێداچوونەوەی عوسمان هەورامی، بەغدا، ١٩٩٠.
- دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح، کۆکردنەوە و ساغکردنەوە و لەسەر نووسینی ئازاد عەبدولواحید، بەغدا، بەشی یەکەم، ١٩٨٥؛ بەشی دووەم، ١٩٨٩.
- دیوانی ویساڵی، ئامادەکردنی جەمال محەمەدئەمین، بەغدا، ١٩٨٦.
- ڕەفیق حیلمی، پاش تەمووز (کۆمەڵە شیعر)، بەغدا، ١٩٦٠.
- سدیق ساڵح، حوکوومەتی کوردستان لە سلێمانی (١٩١٨ - ١٩٢٤)، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- سۆزی نیشتمان (شیعری مفتی پێنجوینی)، بەغدا، ١٩٥٩.
- سروەی بەیان، بەندی شەشەم لە دیوانی قانیع، کۆکردنەوەی بورهان قانیع، هەولێر، ٢٠٠٢.
- شیعرەکانی شێخ نووری و شێخ مستەفا، بەکۆششی کاکەی فەللاح، سلێمانی، ١٩٧٢.
- شەوکەت تاهیر سندی، هۆزانڤان و نڤیسڤانی کورد عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، دهۆک، ١٩٩٩.
- شێخ مەحموود لە شیعری کوردیدا، ئامادەکردنی لەتیف بەرزنجی، هەولێر، ١٩٨٩.
- شێخ نووری، دەنگی ڕەسەنی شیعر، ئامادەکردنی موسلیح مستەفا جەلالی، بەغدا، ١٩٨٤.
- عەرەبی شەمۆ، بەربانگ (ڕۆمان)، یەریڤان، ١٩٥٨.
- عەرەبی شەمۆ، ژینا بەختەوەر (ڕۆمان)، یەریڤان، ١٩٥٩.
- عەرەبی شەمۆ، دمدم (ڕۆمان)، یەریڤان، ١٩٦٦.
- عەرەبی شەمۆ، بەرەڤۆک (هەڵبژاردە)، یەریڤان، ١٩٦٩.
- عەفراندنا ئەولن، یەریڤان، ١٩٣٢.
- عەفراندنێد نڤیسکارێد کوردێد ئەرمەنستانیا سۆڤێتی یێ، حازرکر و ریداکتۆرێ لێ کرن قاچاغی

مراد و جاسمی جەلیل، یەریڤان، ١٩٦١.

- عومەر مەعرووف بەرزنجی، لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی (١٩٢٥ – ١٩٦٩)، بەغدا، ١٩٧٨.
- غەفوور میرزا کەریم، کۆمەڵی زانستیی سلێمانی، بەغدا، ١٩٨٥.
- غەفووری میرزا کەریم، کێومالێ بەناو بیرەوەرییەکانمدا، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- قانیع، گوڵاڵەی مەریوان (شیعر)، بەغدا، ١٩٥١.
- قانیع، چوارباغی پێنجوین (شیعر)، بەغدا، ١٩٥٣.
- قانیع، شاخی هەورامان (شیعر)، بەغدا، ١٩٥٤.
- قانیع، دەشتی گەرمیان (شیعر)، بەغدا، ١٩٥٥.
- کوردستانی عیراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە سەلمان عەلی، پێشەکی و پێداچوونەوە سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- کامل حسن عزیز البصیر، شێخ نووری شێخ ساڵح، بەغدا، ١٩٨٠.
- کامیران بەدرخان، دلێ کوڕێن من (شیعر)، تیلی ئەمین ژ تیپێت لاتینی گوهاستییە و لێ ڤە کۆلایە، بەغدا، ١٩٩١.
- کامیران بەدرخان، چارینێن خەیام، شام، ١٩٣٩.

(د. عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی لە تیپی لاتینییەوە گواستوویەتییە سەر تیپی عەرەبی و لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٤ چاپ کراوە).

- گۆران، بەهەشت و یادگار، بەغدا، ١٩٥٠.
- گۆران، فرمێسک و هونەر، بەغدا، ١٩٥٠.
- گۆران، هەڵبژاردە لە چیرۆکی بێگانە، بەغدا، ١٩٥٣.
- گۆران، پەیامی کورد، سلێمانی، ١٩٥٤.
- گۆران، ئومەمییەت و نەتەوایەتی (وەرگێڕان)، سلێمانی، ١٩٦٠.
- گۆران، گیروگرفتی ئەڵمانیا (وەرگێڕان)، بەغدا، ١٩٦١.
- گۆران، سروشت و دەروون، سلێمانی، ١٩٦٨.
- گۆران، لاوک و پەیام، سلێمانی، ١٩٦٩.
- گۆران، نووسین و پەخشان و وەرگێڕانەکانی، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، هەولێر، ٢٠٠٢.
- مارف ناسراو، یادکردنەوەی ئەستێرە گەشاوەکانی ئەدەب و هونەر، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- محەمەدی مەلا کەریم، هەندێ لاپەڕەی ئەو دیوی بیرەکانی قانیع، بەغدا، ١٩٧٢.



- نڤیسارکارید کورمانجا سۆڤێتی یێ، حازرکر جاسمی جەلیل، یەریڤان ١٩٥٤؛ بڵاوکراوەیێکی دیکە بەم ناوەوە و فراوانتر لە ساڵی ١٩٥٧.
- یادی قانیع، کۆکردنەوەی بورهان قانیع، بەغدا، ١٩٧٨.
- یادی مفتی (١٨٨١ – ١٩٥٢)، لەسەر ئەرکی عەبدولکەریم مفتی، بەغدا، ١٩٧٩.
- هۆنراوەی نووری شێخ ساڵح، سلێمانی، ١٩٥٨.

# ناوەڕۆک

# تاريخ الادب الكردي

## ١٩٤٥ - ١٩٧٥

A

يتناول هذا الجزء من الكتاب والجزء الذي يليه مسيرة الادب الكردي منذ انتهاء الحرب العالمية الثانية وحتى نهاية الربع الثالث من القرن العشرين. وهو غني بمضامينه العصرية، يُعكس صورة واضحة لآمال الشعب، ويعبر عما يجول في فكر الانسان الكردي وما يحرك قلبه. ويتناول حياة ونتاج حوالي ثلاثين شاعراً وكاتباً منهم بيخود وشاهۆ وكمالي وسلام وعرب شاميلوف ونوري الشيخ صالح وقانيع، وگۆران وغيرهم.

الجزء السادس

**الدكتور معروف خزنەدار**

أربيل ٢٠٠٥

# The History
# of Kurdish Literature

1945 - 1975

**A**

vol. VI

*By*
**Prof. Dr. Marouf Khaznadar**

Arbil 2005